# کاتژمێر بیست و پێنج



کۆنستانتین گۆرگیۆ

وەرگێڕانی: سلێمان دلسۆز

ڕۆمان




# کاتژمێر بیست و پێنج

کۆنستانتین گیۆرگیۆ

وەرگێڕانی: سلێمان دڵسۆز



هەولێر - ٢٠١١





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


- **کاتژمێر بیست‌وپێنج**
- نووسینی: کۆنستانتین گیۆرگیۆ

وەرگێڕانی: سلێمان دڵسۆز

- **نەخشەسازی ناوەوە:** ئالان
- **بەرگ:** جێگر عەبدولجەبار
- پیتچن: شاناز پیرۆتی‌نیا
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی دووەم:** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠دانە
- **چاپخانە:** وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی(١٣٣)ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٥٢١)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

# کتێبی یەکەم

## (١)

**فانتانا**

سۆزانا خۆی لە یوهان مۆریتس نزیکتر کردەوە و گوتی:

"هێشتا باوەڕ ناکەم دەڕۆی.

ئینجا دەستی بە سەریدا هێنا و پەنجەکانی خستنە نێو کاکۆڵی ڕەشی. لاوەکە کشایەوە:" بۆ باوەڕ ناکەی.؟"

دەنگی تۆزێک تووڕەیی پێوە دیار بوو:" دووسبەی لەگەڵ تاوهەڵات دەڕۆم.

لە لای پەرژینەکەوە راوەستابوون و تەزووی هەوا سارد ببوو. لاوەکە بە ئارامی دەستی کچەکەی لە سەر سەری خۆی لابرد و گوتی:" دەی، ماڵئاوا:"

کچە گوتی:" نا مەڕۆ:"

بەڵام کوڕە بە لێبڕاوییەوە گوتی:" زۆر درەنگ بووە و سبەینێش هەزار و یەک کارم هەن: "کچە دەنگی نەکرد، بەڵام پتری خۆ پێوەنووساند. سەری وە سینگی رووتی لاوەکە کرد و چاوی لە ئاسمان بڕی ئەو ئەستێرانە دەبینی، چەند جوانن؟"

لاوەکە پێی وا بوو شتێکی گرنگی پێدەڵێ بۆیە هێشتا نەرۆیشتبوو، بەڵام ئەو ئێستا باسی ئەستێرەی بۆ دەکرد. خۆی لە کچە پچرییەوە و ملی رێگای گرت، کەچی لە پڕ بیری کەوتەوە کە دووسبەی بە سەفەر دەچێ و لە ماوەی سەفەرەکەدا کە لانیکەم سێساڵی پێدەچێ سۆزانا نابینێتەوە. بۆیە سەیری ئەستێرەکانی کرد تا بە دڵی کچە بجووڵێتەوە:" ئەمە راستە کە هەر کەسەو ئەستێرەی خۆی هەیە و کە مرد ئەستێرەکەی دەکشێ؟"

لاوەکە وەڵامی دایەوە:" من چووزانم؟"

ویستی ئەمجارە بە راستی بروا... بە پەلە گوتی:" دیمانە بە خێر!"

سۆزانا پرسی: "ئاخۆ ئێمەش لە ئاسمان ئەستێرەی خۆمان هەیە؟"

یوهان وەڵامی دایەوە: "ئێمەش ئەستێرەی خۆمان هەیە، جا چ لە ئاسمانی بێ و چ لە ناخی خۆماندا: پاشان بەڕێ کەوت. کچە لە حاڵێکدا پەنجەکانی لە پەنجەی کوڕەکە ئەلقاندبوو تا سەر جادە لەگەڵی رۆیی. هەر چاوێکی لە ئەستێران و چاوێکی لەو دەکرد. گوتی:" سبەی چاوەڕێتم." کوڕە بە دەم رۆیشتنەوە گوتی:" ئەگەر باران نەبارێ دێم."

سۆزانا زۆری حەز لێبوو دوای بکەوێ و لێی وەپاڕێ کە "ئەگەر بارانیش باری هەر بێت و بیبینێ." بەڵام لاوەکە بە چەند لۆقاوی درێژ دوور بۆوە و یەکدا بە دوو لە نێو دارەکاندا نەدیو بوو. کچە هەروا راوەستابوو، تۆز و خۆڵی جلەکانی تەکاند و پێش ئەوەی بگەڕێتەوە حەوشەی ماڵێ چاوێکی لە چیمەنی بن دارگوێزەکە کرد کە شێلابوویانەوە.

هێشتا بۆن و بەرامەی کوڕەی بۆ دەهات، بۆنی کۆتەرەی دار، بۆنی تووتن و بۆنی دەنکی گێلاس.

یوهان مۆریتس بە نێو کێڵگەدا تێپەری. لەبەر خۆیەوە فیتووی لێدەدا.

شەرواڵی رەشی سەربازی و کراسێکی سپیی ئێخەکراوەی لەبەر بوون. پێخواس بوو. چەند جارێ باوێشکی دا و فیتوولێدانەکەی پچڕا. بیری لەو کیژە دەکردەوە کە چەند چرکەساتێ لە مەوبەر جێی‌هێشتبوو. پرسیارەکەی لەمەڕ ئەستێرانی بیر کەوتەوە و پێکەنی:

"وەک منداڵ وان! ئەم ئافرەتانە پرسیاری چۆن دەکەن!"

پاشان بیری بەرەو سەفەرەکەی چوو کە دەبوو رۆژێکی دی بچێتە ئەمریکا.

بە زەحمەت خۆی بە سەر پێوە دەگرت. دەبوو لە گەڵ کازیوەی بەیانیش راست بێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوە دوایین رۆژی کارکردنی بوو. چەند کاتژمێر پتری بۆ ئەو کاتە نەمابوو. زیاتری لە لاقان وەینا.

## (٢)

تاریک و روونی بەیانی یوهان مۆرتیس لەسەر کانی بوو. ئێخەی کراسەکەی تا ئەو جێیەی دەکرا ئاوەڵا کرد و چەند شڵپە ئاوی ساردی کانییەکەی بە دەموچاو و ملیدا کرد. کەس لەوێ نەبوو. گوندییەکان هێشتا لە خەو هەڵ نەسابوون. کەوتە رێ. بۆ ئەوەی دەستان وشکبکاتەوە بە قژیدا هێنان. ئینجا کراسەکەی راستە و پاستە کرد، بەڵام دوگمەکانی دانەخستنەوە. چاوی لە گوندەکەی خواروو کرد کە لە ناو تەمومژێکی سپیدا نوقم ببوو. ئەو دەڤەرە "فانتانا"یان پێدەگوت و لە نێو خاکی "رۆمانیا"دا بوو. هەر لێرە بیست و پێنج ساڵ بەرێ ، یوهان مۆرتیس چاوی پشکووت. لە کاتێکدا سەیری هەر سێک کڵێسەی دێیەکە ـ کڵێسەی کاتۆلیک، پرۆتستان و (ئۆرتودۆکسەکان)ی دەکرد کەوتەوە بیری سۆزانا کە هەمیشە دەیپرسی یوهان بڵێی لەوێ هەست بە غوربەت بکەی؟ ئەویش پێ پێدەکەنی و بە فیزەوە دەیگوت: تەنیا ژنان هەست بە غوربەت دەکەن و ئەم پیاوە، بەڵام لەم ساتەوەختەدا خەمێکی نامۆ سینگی رێکدەگوشی. دەستی بە فیکە لێدان کردەوە و چیدی چاوی لە ئاواییەکە نەکرد. ماڵی قەشە "ئەلیکساندەر کۆرۆگا" لە سەر جادە و لە پەنا کڵێسەی ئۆرتۆدۆکس بوو. دەرگەی دەرێ داخرابوو. یوهان داهاتەوە و کلیلەکەی کە لە ژێر بەردێکدا شاردبوویانەوە، دەرهێنا. کلیلەکەیان هەمیشە لەوێ دەنا بۆ ئەوەی بەیانیان پێی بێتە ژوورەوە. سەگەکان هەڕایان کرد و بە دەوریدا ملیان لە هەڵبەز دابەز نا. سەگەکان پێی نەدەوەڕین. لەبەر ئەوەی شەش ساڵ بوو لای قەشە کاری دەکرد. بڕیار وابوو ئەو رۆژە سێو بڕنن. پاشان هەقدەستی خۆی وەربگرێ و بە قەشە بڵێ کە "دەچێتە ئەمریکا". تا ئەو رۆژە لە بارەی سەفەرەکەیەوە هیچی پێ نەگوتبوو.

یوهان مۆریتس چووە عەمبارەکە. بەرچنەکانی دەست دانێ و لە سەر عارەبانەی دانان. لەو دەمەیدا قەشەش، هەروا کە لە جێگا هاتبووە دەر بە خۆ و کرس و پانتۆڵی سپی کەتانەوە لە هەیوانێ دەرکەوت. یوهان بە بزەوە سڵاوی لێکرد. دوا بەرچنەشی دانا و بە دەم خۆ تەکاندنەوە بەرەو هەیوان

بزووت. دۆلکە ئاوەکەی لە پیرە پیاوەکە وەرگرت و بەوپەڕی ڕێزەوە ئاوەکەی لە دەستی کرد و گوتی:" گەورەم ئیزن بدە با من بە دەستتدا بکەم:" سەرنجی دا ئەنگوستی باریک و ناسک و هەندێک ژنانەی قەشە و کەیفی بەوە هات کە دەیدی قەشە چۆن ردێن و ئەوک و تەوێلی داوەتە بە سابوون. وای نوقمی چاو لێکردنی ببوو لە بیری چووبۆوە ئاوی بە دەستیدا بکا و قەشە هەر وا دەستی درێژ کردبوون و بە دەموچاوی کەفاوییەوە چاوەنۆڕی ئاو بوو.

یوهان لە پڕ وەخۆی هاتەوە و لە بەر ئەوەی بە وەخت ئاوی بە دەستیدا نەکردبوو بە خۆیدا شکایەوە. ئەلیکساندر کۆرۆگا قەشەی کڵێسەی ئۆرتودۆکسی فانتانا بوو. تەمەنی نەگەیبووە پەنجا ساڵ، بەڵام سەر و ریشی بۆز ببوو. کەڵەگەت و رەقەڵە بوو، بە جۆرێک دەتگوت مساڵێکی گۆشت پێوە نییە. لەشی هەر لە نیگاری پیاوچاک و پیرۆزان دەچوو. بە لەش پیر بوو، بەڵام کاتێ چاوی لە کەسێک دەبڕی یان لە تەکی دەدوا زۆر گەنجتر لە خۆی دیار بوو. ئینجا دەموچاو و ئەستۆی بە خاولییەکی زوور وشک کردەوە. یوهان هەر وا کە لە پەنای راوەستابوو و دۆلکەکەی بە دەستەوە بوو گوتی: "گەورەم دەمەوێ شتێکت لەگەڵ باس بکەم: "راوەستە باخۆم دەبەر کەمەوە." قەشە دۆلکە بەتاڵەکەی لە یوهان وەرگرت و بردییەوە ژووێ. لە نێو دەرگادا هەڵوێستەیەکی کرد و گوتی: "منیش دەمهەویست شتێک بە تۆ بڵێم."

پاشان بە زەردەخەنەوە گوتی: "شتێک کە خۆشحاڵت دەکا. جارێ بارگینەکان لە عارەبانەی بێخە."

دانی بەیانی قەشە کۆرۆگا و یوهان خەریکی رنینی سێو و لە فەردە کردنیان بوون و لەو ماوەیەدا ئەوەندە سەرقاڵی کار بوون نەپەرژانە سەر ئەوەی پێکەوە بدوێن. کاتێ قرچەی هەتاو پشتی زووراندنەوە قەشە دەستی لە کار هەڵگرت و بە جۆرێک کە نیشانەی ماندوو بوونی بوو، خۆی لە بەر یەک کێشایەوە و گوتی :" کەمێک پشوو دەدەین."

یوهانیش ئەو وچاندانەی بە کەیفێ بوو. قەشە و یوهان چوونە لای سێوەکان و هەر یەک لەسەر تایەک دانیشتن.

هێشتا هەر دووکیان بێدەنگ بوون. قەشە گیرفانی پانتۆڵەکەی بۆ ئەو پاکەتە جگەرەیە دەپشکنی کە بۆ یوهانی هێنابوو. یوهان جگەرەیەکی داگیرساند و دەنکە شقارتەیەکی هاویشتە نێو فریزەکە. ئینجا چاوی لێبوو کە چۆن کوژایەوە. لە نەکاو هەستی بەوە کرد زۆر لەبەری گرانە بە قەشە بڵێ کە بە تەمای ڕۆیشتنە. حەزی دەکرد ئەو بابەتە بۆ کاتێکی تر هەڵبگرێت. قەشە گوتی: "سەرەتا دەمەوێ هەواڵێکی خۆشت بدەمێ." یوهان بەوە خۆشحاڵ بوو کە جارێ باسکردنی سەفەرەکەی لە کۆڵ بۆتەوە.

"هۆدە بچووکەکەی کن مدبەقەکە چۆڵە. بیرم لەوە کردەوە تۆ دەتوانی تێیدا دانیشی. هاوسەرەکەم سپیی کردۆتەوە. پەردەی وە پەنجەرەکان خستوون و نوێنەکەشی نوێ کردۆتەوە. ئێوە جێگا و ڕێگاتان کەمە. تۆ و دایک و باوکت هەمووتان لە ژوورێکدا دەژین. سبەی کە هاتی نێوماڵی خۆشت بێنە."

"من سبەی نایەمە سەر کار."

"قەیدی نییە دووسبەی. بەهەرحاڵ هۆدەکە لە ئێستاوە هی تۆیە."

"من لەمەودوا هەر نایەم. سبەی دەچمە ئەمریکا."

قەشە چاوی زەق بوون و پرسی "سبەی؟"

"بەڵێ سبەی لەگەڵ تاو هەڵاتێ."

دەنگی یوهان هەندێکی بۆنی بڕیار و ئیرادە لێوە دەهات، بەڵام هێشتا هەستی پەشیمانی و کەمێک شەرمی پێوە دیار بوو: "بیستوومە پاپۆڕێک لە "کۆنستانس"ە و تەنیا سێ ڕۆژ لەو بەندەرە دەمێنێتەوە."

قەشە دەیزانی چ شتێک یوهان بەرەو ئەمریکا ڕادەکێشێ. گەلێ جووتیاری دیکەش دەچوونە ئەمریکا و دوای چەند ساڵ بە پارەیەکی باش و ئەزموونەوە دەگەڕانەوە و ملک و خانوویان دەکڕی.

گشت ئەوانەی چووبوونە وێ لە فانتانا دەوڵەمەند ببوون. قەشە بەو بڕیارەی یوهان دڵخۆش بوو. دوای چەند ساڵ ئەویش دەیتوانی لە فانتانا ببێتە خاوەنی ملک و ماڵێکی گەورە، بەڵام سەری لەوە سوڕمابوو کە یوهان چ خێرا بڕیای ئەو سەفەرەی دابوو و تا ئەو ڕۆژە لەو بارەوە هیچی پێ نەگوتبوو، لە کاتێکدا ڕۆژ هەتا ئێواری پێکەوە بوون. یوهان گوتی: "تازە، دوێنێ نامەکەم پێ گەیشتووە."

"بەتەنێ دەڕۆی؟"

"نا لەگەڵ گیتزا یون، دەبینە کرێکاری پاپۆڕ، بەو جۆرە سەرو پێنجسەد "لای"مان دەچێ. ئەو کارەش برادەرێکی گیتزا بۆی پێکهێناوین کە لە بەندرەی کۆنستانس ـ ە."

قەشە هیوای خۆشی و بەختەوەری بۆ خواست، بەڵام خەفەتی لەوە دەخوارد کە یوهانی لە کیس دەچێ. یوهان مۆریتس لە هەرەتی لاویدا بوو. ئازا و راست، بەڵام رووت بوو. بستێکیشی زەوی نەبوو. پاشماوەی رۆژەکەیان بە سێو رنین بردە سەر و چیتر پێکەوە نەدوان. کە لێبوونەوە قەشە لەبارەی ئەمریکا دوا و یوهانیش گوێی راداشت. شەوێ، کاتێ یوهان هەقدەستی وەرگرت ماوەیەک سەری لە بەرامبەر قەشە دانواند. ملی خێچ کردبوو، دڵی نەدەهات جێی بهێڵێ. پیرەمێردەکە دەستێکی لە شانی دا و گوتی: "کە گەیشتییە ئەمریکا نامەم بۆ بنووسە، سبەی کە بێرەدا هاتی هەندێکت خواردن بۆ دادەنێم لەگەڵ خۆت ببیە. ژنەکەم نەزانێ باشترە. ژن تۆزێک لەچەرن. من ئەمشەو تێشووەکە ئامادە دەکەم. هەر بەراست کەی وەرێ دەکەون؟

"کە خۆر هەلات لە بەر دێ لەگەڵ گیتزا یەک دەگرینەوە."

"زۆر چاکە، کەوابوو کە بێرەدا هاتی هەگبە خواردنەکە هەڵگرە، دەنا دەڵێی ئەوشۆ وەرە."

یوهان بیری کەوتەوە کە سوزانا چاوەڕوانیەتی: "سبەی باشترە."

## (٣)

قەشە هەگبە خواردنەکەی لە سەر پەنجەرە دانا. ئینجا لە جێگا خزا و چراکەی کوژاندەوە. بە چاوی زەقەوە راکشابوو و بیری لە سەفەرەکەی یوهان دەکردەوە. کاتی تێکەوەپێچانی هەگبەکە، تووشی هەستێکی وا ببوو کە دەتگوت خۆی دەچێتە سەفەرەکە. ئەویش سی ساڵ بەرێ، بار و بنەگەی سەفەری تێکنابوو. ئەودەم تازە ئیجازەی وەرگرتبوو و راسپێردرابوو وەک رەوانبێژی کڵێسەی ئۆرتۆدۆکس بچێتە میشیگان. حەفتەیەک پێش سەفەرەکە

بە تەلەگرافێ داوای لێبوردنی کرد کە ئەو ئەرکەی پێ وە ئەستۆ ناگیرێ. قەشە ئەو ژنەی ئێستاشی ناسیبوو و خواستبووی و لەو دەمەوە ببووە قەشەی فانتانا. کوێرەدێیەک و ژیانێکی پڕ چەرمەسەری. دواتر بۆ ئەو سەفەرەی بۆی هەڵکەوتبوو پەشیمان ببۆوە، بەڵام تازە درەنگ ببوو و چوونە ئەمریکا بۆی ببووە خەونێکی ئاڵۆز. هەموو جارێ کە جووتیارێک بڕیاری دەدا سەفەری ئەوبەری دەریاکان بکا، خواردن و پارەی رێگە و یارمەتیی خۆی لە قەشە وەردەگرت. قەشە داوای لێدەکردن نامەی بۆ بنووسن. هەموو ئەو کارانەشی لە ژنەکەی دەشاردەوە، لە بەر ئەوەی پێی وا بوو خولیای سەفەری ئەمریکا و ئەوەی کە رۆژگارێک دەیتوانی بچێتە ئەوێ ناپاکی کردنێکی ناڕاستەوخۆیە لە ژنەکەی. ئاخر ئەو لە بەر ژنهێنان وازی لە سەفەرەکەی هێنابوو، بەڵام چەنگەپرچەی ئەو دوو هەستە لێکدژە هێشتا لە دەروونیدا درێژەی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا رۆیشتنەکەی یوهان شتێکی تر بوو. یوهانی زۆر لێ نزیک بوو، بۆیە دەتگوت بەشێکی وجوودی قەشە خۆی، لەگەڵ یوهان دەچێتە دنیای نوێ. مانگی چاردە، خڕوپڕ، لە ئاسمان تریفەی داویشت. خەو تخوونی چاوی قەشە نەدەبوو. قیت بووە و چراکەی هەڵکردەوە. کەمێک بە نێو کتێبەکاندا گەڕا کە لە قەفەزەکەدا بە سێ ریز تا بن میچ چندرابوون. کتێبێکی دەرهێنا. بەر لەوەی لێکی بکاتەوە، چاوێکی پڕخۆشەویستی بە کتێبەکاندا گێڕا. کتێبی ئەڵمانی، ئینگلیزی، فەرەنسی و ئیتالیایی بە پەنایەکەوە ریز کرابوون. لایەکەی دی کتێبی یۆنانی و لاتینی لێبوو. هەرکام لەو کتێبانە لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی لە فانتانا دەژیا ببوونە هاوڕێی. جاری وابوو لە خۆی دەپرسی: باشە بۆ لە زانکۆ خەریکی وانە گوتنەوە نابێ. زۆر دۆستی وای هەبوون کە ئەگەر چووبایە زانینگەی یاسی یان بوخارست پێ خۆشحاڵ دەبوون، بەڵام ئەم دوو جار بۆ وانە گوتنەوە دەستی بە رووی زانینگەوە نابوو، لەو کارەشی پاشگەز نەبوو. لێرە، لە فانتانا رۆژانی پشوودان رێورەسمی ئایینی بەڕێوە دەبرد و کاتی دی بە کاری باخ و مێشهەنگوین و بێستانەوە خەریک دەبوو، شەوانەش کتێبی دەخوێندەوە.

قەشە لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانە رێککەوتبوو کە چارەنووس نابوویە بەردەمی. تەنیا جارێک بڕیاریدا بوو چارەنووسی خۆی بگۆڕێ، ئەویش ئەو جارەیان بوو کە دەیوست بچێتە ئەمریکا. تەواوی هەوڵی خۆی دا بۆ ئەوەی ئەو سەفەرە بکا، بەڵام ریسەکەی لێ بۆوە خوری. پاشی ئەوە ئیدی پلان و گەلاڵەی بۆ داهاتوو لە بیر خۆی بردنەوە. قەشە لە بەر خۆیەوە گوتی: "ئەرێ من خەمی ئەوەم نییە کە سی ساڵ لە مەوبەر نەمتوانی سەفەر بکەم؟ ئەگەر وا نییە بۆچی ئەمڕۆ لەگەڵ یوهان دڵم بۆ سەفەر دەکورکێنێ؟" لێفەکەی بە خۆی دادا و گوتی:" نا، ئەو خەمە لەبەر ئەوە نییە کە لێرە ماومەوە. خەمەکە بە هۆی نەدیتنی ئەو شتە نوێیانەیە کە پێم وابوون هەن و هەرگیز نەیانگەیشتمێ. رەنگبوو ئەگەر گەیشتبامە ئەو شتانە زۆر زوو بۆم دەکەوتبا ئەوە ئەو شتە نییە کە من لێی دەگەڕێم. ئەوە تەنیا بیانوویەکە بۆ تێکدانی ئارامی. ئەوە تەنیا هەڵقوڵاوی حەز و ئاواتەکانمانە. رەنگە نەدیتن و نەناسینی حەقیقەتی ئەوە یەکجار کەمتر لە دیتن و ناسینی، مرۆڤ تووشی فریو خواردن بکا." قەشە خەوی لێ زڕابوو. دڵەڕاوکەی بوو. وەها چاوەنۆڕ بوو رۆژ ببێتەوە، دەتگوت بڕیارە خۆی و گیتزا لە بەر دێ یەکتر بگرنەوە و بچنە کۆنستانس. شوێنێک کە کەشتییەکە تەنیا سێ رۆژ لەوێ دەمایەوە. کە قەشە سەرلەنوێ لە جێ راست بۆوە، هێشتا تاریک بوو، بەڵام قووقەی کەڵەشێران نزیک بوونەوەی بەیانیی رادەگەیاند. پەنجەرەی کردەوە و سەیرێکی دەرەوەی کرد. جادە چۆڵ و هۆڵ بوو. گوند لە نێو تەمێکی سپیدا بزر ببوو. هەگبەی سەر پەنجەرەکەی کردەوە و پاکەتە جغارەیەکی دیکەشی تێ بەست. بیری کردەوە:" پاشی یوهان کێ هەیە جغارە بکێشێ؟" وردە وردە رووناکی لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوور. لە جادەدا دەنگە دەنگێک بەر گوێ دەکەوت. دەنگەکان بە پێش دەرگای ماڵێدا بە هەوایەکی تایبەتەوە رەت دەبوون و دەبڕانەوە. بە ئەسپایی گوتی:" پەلە نەکا، وە درەنگی دەکەوێ." قەشە هاتە حەوشە و دەموچاوی بە ئاوی سارد شورد. یوهان ئیدی لەوێ نەبوو ئاوی لە دەستی بکا. خۆر گزینگی دا، بەڵام یوهان دیار نەبوو. قەشە تا نیوەڕیە هەر چاوەڕوانی کرد. سەرەنجام لە بەر خۆیەوە گوتی: "لەوانەیە لە خەو مابێ

و وێرانەگەشتبێ خواردنەکە لەگەڵ خۆی بەرێ. حەیفێ، لانیکەم بەشی سێ حەفتەی دەکرد. تەنانەت تا چەند رۆژ لە ئەمریکاش خواردنی لێنەدەبڕا."
بە لای قەشەوە دوا دەرفەتی چوونە ئەمریکا، هەر نەبێ بە هۆی کەسێکی دیکەوە، لە کیس چووبوو. راست وەک سێ ساڵ لەمەوبەر. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر یوهان هەگبە خواردنەکەی بردبا وامدەزانی بۆخۆم ئەو سەفەرەم کردووە. بە داخەوە نەهات."

## (٤)

یوهان کە لە ماڵی قەشە گەڕایەوە، لە سەر کانی راوەستا. خۆی شۆرد و ئینجا بەرەو گوند بۆوە. جووتیارێک بە ناوی "نیکۆلای پرۆفیر" کێڵگەیەکی لە لای لێڕەوار هەبوو دەیویست بیفرۆشێ. یوهان چووە ماڵەکەی و گوتی: "سبەی دەچمە ئەمریکا. لەوسەر کە هاتمەوە ئەوەندەم پوول پێدەبێ بتوانم کێڵگەکەت لێ بکڕم، بەڵام پێش ئەوەی برۆم حەز دەکەم هێندێک پارەم وەک پێشەکی لێوەرگری بۆ ئەوەی زەویەکە نەفرۆشییە کەس."
پرۆفیر پرسی: "لە ئەمریکا چەندت پێدەچێ؟"
"تا پارەیەکی باشم دەست دەکەوێ دوو سێ ساڵ دەخایەنێ."
"ئەوەندە لەوێ بە بەسە. بە سێ ساڵ پارەیەکی باش پەیدا دەکەی. کەس لەوەندە زیاتر لەوێ نەبووە. بەڵێ لە ئەمریکا پارە زوو پەیدا دەبێ."
"دەی دەبێ چەندت پێشەکی بدەمێ؟"
"پێشەکیم ناوێ، دوای سێ ساڵەکە کە گەڕایەوە پەنجا هەزار بێنە و کێڵگەکە ئی تۆیە. دڵنیا بە نایدەمە کەس، تا تۆ دێیەوە." بەڵام یوهان سەفتە دراوێکی لە باخەڵی دەرکێشا، ژماردنی، دایە پرۆفیر و گوتی:" ها ئەوە سێ هەزار لای، ئاوها باشترە. ئەوە پێشەکیی زەویەکەتە." دەستیان لە دەستی یەک نا و بەو جۆرە سەودا سەری گرت. یوهان خاتری خواست. وڵات هێشتا تەواو تاریک نەببوو. بڕیاریدا بچێتە سوێی ئەو کێڵگەیە کە هەر ئێستا پێشەکیی دابوو. پێشتر سەد جاری کێڵگەکە دەیبوو و دەیزانی لە کوێوە تا

کوێیە، بەلام ئێستا مەسەلەکە بە جۆرێکی دیکە بوو. ئێستا ملکی خۆی بوو. تەنیا دەبوایە پاشماوەی پارەکەی پەیدا بکا و بیداتە کابرا.

## (٥)

یوهان مۆریتس بە مەزرایەدا رۆیی. توند دەرۆیی. لەشی رەسەر ئارەقی خۆشی کەوتبوو و کراسەکەی بە لەشیەوە دەنووسا. لە خۆشییان نەیدەتوانی سەبر بڕوا. لە کن لێرەوار راوەستا. کێلگەکەی لەوێوە تا لێڕەوار دەکشا. سەرانسەری بە گوڵەگەنم داپۆشرابوو و گەلاکانی وە شانی یوهان دەکەوتن. زەوییەکی گەورە نەبوو، بەلام دەکرا خانوویەکی لێ دروست کەی و حەساریشی هەبێ. بێ لەوە بەشی باخچە و شیناوەردێکی چکۆلەشی لێ دەمایەوە. بە تێڕوانینێک زەوییەکەی پێوا. درێژایی و ئینجا بەرینایی. هاتە بەر چاوی چۆن بانی خانووەکەی بە نێو گوڵە پێغەمبەراندا سەر وەدەر دەنێ. ئینجا دەرگای گەورە لە دار بەڕوو و چالاوێک و تەویلەی هاتنە پێش چاو. یوهان زۆر جار چاوی لەو زەوییە دەبڕی و دڵی خەبەری دابوو کە لە داهاتوودا ئەو زەوییە دەبێتە هی ئەو، بەلام قەت ئاوا بە روونی هەموو شتێکی نەهاتبووە بەرچاو. بە دیتنی دیمەنی گەنمەشامییەکان کە بە دەم باوە رادەژان و خشەخشیان لێوە دەهات زەردەخەنەکی هاتێ. دانەوی و بە دەستی چەپ مستێکی خۆل هەلگرت. خۆڵەکە گەرم بوو. هەستی کرد شتێکی زیندوو لە دەستیدایە. تینی خۆڵەکە وەک تینی لەشی چۆلەکەیەک وابوو کە لە نێو دەستی مرۆدا باڵەفرکەی بێ. دیسان داهاتەوە و بە دەستی راستیش مستێکی خۆڵ هەلگرت. ئەویش گەرم بوو. هەر دوو دەستی رێکگوشین و خۆڵەکەی بە هەوای وەرکرد. بە نێو درەختاندا رووەو دارستان تێیتەقاند. لە نزیک دارستان دووبارە راوەستا و هێندێکی دیکە خۆڵی زەویەکەی لە مست گرت. لەوێش خاکەکە گەرم بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "سەرتاپای کێڵگە وەک بوونەوەرێکی زیندوو گەرمە." خۆڵەکەی بردە پێش دەموچاوی و بۆنی پێوە کرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: "بۆنی چەند خۆشە! دەڵێی بۆنی تووتنە. هەر بە

راست ئەو زەوەییە بۆنی چەند خۆشە!" سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی. دەستەکانی لێک کردنەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. پاشان ڕێ و ڕێ گەڕایەوە. سۆزانا چاوەنۆڕی بوو.

## (٦)

سۆزانا کچی "یۆرگ یۆردان" بوو. باوکی، لە سەر جادە، خانووبەرەیەکی گەورەی بە بانی سواڵەتەوەی هەبوو. یوهان بە نێو باخەکاندا خۆی گەیاندە نزیک حەوشەی ماڵی سۆزانا. لەوێ ڕاوەستا و لە کەلێنی پەرژینەکەوە چاوی لە ژووری کرد. لەو کاتەدا یۆرگ یۆردان هاتە دەرێ تا هەموو دەرک و بان بەسەر بکاتەوە. چاوی بەملا و ئەولادا گێڕا. پەنجەرەکانی داخستن و قفڵەکانی تاقیکردنەوە. یوهان بە وردی سەرنجی دابۆیە. دوای ئەوەی دەرگا و پەنجەرەکان داخران یۆرگ یۆردان بە دردۆنگییەوە چاوێکی لەملا و ئەولای خۆی کرد، پاشان بە پێپیلکەی هەیواندا کە لە ژێر قورسایی لەشی ئەودا وە جیرە جیڕ کەوتبوو، هاتە خوارێ. یۆرگ هێندی دێوێک دەبوو. هەموو باخچەکە گەڕا و بەرەو دەرگاکەی چوو. بە رقەوە پاڵی پێوەنا و کلیلی لە ناو قوفڵەکەیدا سووڕاند. بە هەنگاوی قورس بەرەو ژوورێ هاتەوە. هەروا بە دڕدۆنگییەوە لێرە و لەوێی دەڕوانی. دەتگوت بۆنی کردووە کەسێک لەو دەورو بەرانەیە. پاشان دەرگای پشتەوەی ماڵەوەشی گاڵە دا. بێدەنگی بەسەر هەموو لایەکدا زاڵبوو. یۆرگ یۆردان چووە ژووری خەوێ. سەرتاپای ژوورەکە بە چەک و چۆڵی ڕاو و نێچیری جۆراوجۆر داپۆشرابوو. سەری دەباغی کراوی کەڵەکێوی و گورک و ورچ بە دیواردا کرابوون. لە نێوان سەری خامۆشی کوندێک و ئاسکێکدا چەند تفەنگ بە دیوارەوە هەڵواسرابوون. دوو کەوڵە ورچی گەورەش لە سەر عەرزی و لە پەنا قەرەوێڵەکەی ڕاخرابوون. یۆرگ یۆردان بە سەر کەوڵە ورچەکاندا تێپەڕی، تفەنگێکی لە دیوار کردەوە، لە نێزیک سەری خۆی بە دیواریەوە هەڵپەسارد. دەمانچەیەکی چکۆڵەی لە چەکمەجەی مێزەکەی

دەرهێنا، شەمچە و چراشی لە بەردەستی خۆی دانان. ئەو کەلوپەلانەی هەموو بە وردی لە پەنا خۆی دانان، بە جۆرێک هەر دەستی درێژ کردبا دەیتوانی هەر کامێکیانی بوێت هەڵیگرێ. ئاخیری بە مشەمشێکی زۆرەوە چووە سەر تەختەکەی و پۆستاڵەکانی داکەندن. وا راهاتبوو شەوانە پۆستاڵەکانی لە پەنا تەختەکەی دادەنان تا بەیانی کە هەستا زوو بیانبینێتەوە. ئینجا جلەکانیشی داکەندن و وەک ورچێک کە سەری لەنێو بەفر دەنێ، سەری خستە نێو سەرینەکەیەوە.

چرای ژووری یۆرگ یۆردان کوژابۆوە. یوهان مۆریتس لە کەلێنی پەرژینەکەوە چاوی لێبوو. شوقی چراکە چەند جار پرتەپرتی کرد و دواجار کوژایەوە. پەنجەرەی ژوورەکەی لە چاوێک دەچوو لە تاریکیدا بێ. لە ژووری "یولاندا" ژنی یۆردان، هێشتا چرا دەئایسا. شوقی چرای هۆدەکەی ئەو کزتر بوو و هێندێک خەماوی دەهاتە بەر چاو. خەڵک دەیانگوت یولاندا بەختەوەر نییە. یولاندا بیست و پێنج ساڵ بەرێ لەگەڵ یۆرگ یۆردان بە سواری ئەسپ هاتبووە ئەو گوندە و سەرەتا لە مەیخانەی دێ لایاندابوو. کەس نەیدەزانی لە کوێوە هاتوون، بەڵام لە سەر و سەکوتیان‌را دیار بوو لە جێیەکی دوورەوە هاتوون. ژنەکە خەڵکی رۆمانیا بوو، بەڵام پیاوەکە نا. دوایە دەرکەوت هەردووک لە مەجەڕستانەوە هاتوون. هەر دووکیان باڵاپۆشی فەروەیان لەبەردا بوو. دوای خواردن و خواردنەوە - پیاوەکە بە قەد دوو کەسانی خوارد کەچی ژنەکە وەک چۆلەکە تەنیا لێوێکی گەیاندە خواردن و شەراب - لە مەیخانەکەدا خەوتن. سێ رۆژ دواتر دەرکەوت بە یەکجاری لەو دێیە دەمێننەوە. چەند حەفتە پاشتر یۆرگ یۆردان خانووی مەیخانەکەی بە نرخێکی باش کڕی. لەو رۆژەوە بوونە خەڵکی فانتانا. یۆرگ یۆردان پێشتر تاقە وشەیەکیشی رۆمانی نەدەزانی. کاتێ سۆزانای کچیان لەدایک بوو نەیانهێشت بچێتە قوتابخانەی گوند. پێیان خۆش نەبوو کچەکەیان لەگەڵ منداڵانی دێ تێکەڵاو بێ. سۆزانا لە شار خوێندی.

گوندییەکان یولاندایان تەنیا یەکشەممانە لە کڵێسە یان جاروبار لەگەڵ مێردەکەی لە ناو فایتووندا دەدی. یولاندا سوور و سپی بوو. قژی وەک ئاوریشم و چاوەکانی کاڵ بوون. سۆزانا لەگەڵ دایکی دەتگوت سێوێکن لەت کراون.
ئەوە هەموو ئەو زانیارییە بوو کە خەڵک لەبارەی یۆرگ یۆردان و ژن و منداڵەکەیەوە دەیانزانی. با، شتێکی دیکەشیان دەزانی، لە زستانێکی سارددا یۆرگ یۆردان پیاوێکی کە هاتبووە ماڵەکەی، کوشتبوو. گوللەیەکی لە تەپڵی سەری دابوو. ژاندرمەکان گوتیان یۆرگ یۆردان هەقی بووە. پیاو بۆی هەیە کەسێک کە بۆ دزی دەچێتە ماڵی بیکوژێ، بەڵام خەڵکی دێ رایان وا نەبوو. بە لای ئەوانەوە پیاو کوشتن هەر پیاو کوشتنە. بەهەرحاڵ ئەو رووداوە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو.
یوهان بە نێو تەیمانەکەدا بینی کە چرای ژووری یولانداش کز بوو. بۆ ساتەوەختێک مچورکێکی پێداهات و دواجار هێور بۆوە. دەستی لوول کرد و وەک کوند خوێندی. هو! هو! هو! دەنگی کوند رۆیشت و ئاوازەی دایەوە. بۆ ماوەیەکی کورت وڵات کش‌ومات بوو. ئینجا پەنجەرەی رووکاری باشووری خانووەکە کرایەوە و سۆزانا لەوێوە بازیدا دەرێ. بە نەرمی، لەسەر پەنجەی پێی، هاتە نێو باخەکە و بە کەلێنی تەیمانەکەدا لە حەوشە چووە دەر و خۆی گەیاندە یوهان.

## (٧)

گوتی: "بۆ دەنگی کوندت وەدەرنا." کوڕەکە ویستی دەستی لە گەردنی بکا، بەڵام سۆزانا نەیهێشت و گوتی: "من هەمیشە پێت دەڵێم نابێ وەک کوند بخوێنی." دڵەکوتەیەکی توندی بوو و دیار بوو چاک ترساوە.
"ئەدی چۆن بانگت بکەم؟"
"کوند شوومە. لە هەر جێیەک بخوێنێ ئەو شوێنە وێران دەبێ."

"مەکری ژنان! ئاخر باڵندەیەکی دیکە نییە کە بە شەو و بە ڕۆژ، بە باران و بە سامال، بە هاوین و بە زستانێ بخوێنێ. تەنیا کوند هەمیشە دەخوێنێ. تۆ باڵندەیەکی باشترت پێ شک دێ؟ بولبول هەر بەهاران دەخوێنێ. ئەگەر وەک بولبول بخوێنم باوکت زوو دەزانێ ئەوە دەنگی ئینسانە. نەکا پێت خۆش بێ باوکت بزانێ منم کە وەک باڵندان دەخوێنم!"

"نا حەز ناکەم بەو سرە بزانێ، بەڵام کوند بەدشوومە."

"ئەوە ئیدی خەتای من نییە کە خوا باڵندەیەکی دیکەی نەخوڵقاندووە کە هەموو وەرز و دەمان بخوێنێ و بەدشوومیش نەبێ. هەر چۆنێ بێ ئەو دەمەتەقەیەمان بێکەڵکە. ئەوشۆ دوایین جار بوو بۆم خوێندی. لەوەی وێوە ڕەمزێک لە گۆڕێ نییە. سبەی دەچمە ئەمریکا و کە گەڕامەوە تۆ دەبیە ژنی من. ئەوەدەم پێویست ناکا بۆ دیتنی تۆ وەک کوند بخوێنم."

لاوەکە سۆزانای لە باوەش گرت. کچە بە گەرموگوڕی خۆی پێوە نووساند. ئەو دووە وەک دوێشەو و وەک هەموو شەوانی دی لە چوار مانگی ڕابردوودا کە بۆ یەکەم جار هاتنە ژوان، لە ژێردارگوێزەکە بوون. کچە زیاتر خۆی بە باسکی یوهانەوە نووساند. یوهان کچەی بە هێمنی لە سەر چیمەنەکە درێژ کرد و لە پەنای ڕاکشا. وەک مار تێکئاڵان. بێدەنگ بوون. تەنیا لە تاریکیدا دەستیان لێکدی دەگێڕا. چاویان لێکنابوون. دەمیان لە ناو دەمی یەکتردا و لەشیان جووت. کراسە شینەکەی سوزانا، لەو لای، لە سەر چیمەن کەوتبوو. جلەکانی داکەندبوون تا پیس و گنجاوی نەبن. هەورە ڕەشەکان بەر مانگیان بەردا و مانگ ئازاد بوو. شانی رووتی سوزانا لە بەر تریفەی مانگەشەو دەدرەوشایەوە. یوهان کراسەکەی خۆی بۆ سۆزانا ڕاخستبوو.

لە پەنا شانی سپی و سۆڵی سۆزانا لەشی گەنم ڕەنگی یوهان وەک کۆتەرە دارێک دیار بوو. کچەکە گوتی:" بەیانی مەڕۆ." کوڕە بە هەڵچوونەوە گوتی: "چۆن شتی وا دەڵێی؟ نازانی ئەگەر نەچمە ئەمریکا ناتوانم زەوی بکڕم و ئەگەر زەویم نەبێ تۆشم نابێ؟ ئاخر بێ ملک و ماڵ چیمان پێدەکرێ؟ تەنیا سێ ساڵ... ئەودەم بە دراوەوە دەگەڕێمەوە و دەتخوازم. پێت خۆش نییە بتخوازم؟"

"با، بەڵام پێم خۆش نییە بچییە ئەمریکا." کوڕەکە بە دەم لە فکر ڕاچوونەوە پێکەنی و گوتی: "ئەدی بە چی زەوەیەکە بکڕین؟ هەر بە ڕاست دەزانی پێشەکیم داوەتە نیکۆلای پرۆفیر؟ کە گەڕامەوە پووڵەکەی دیکەشی دەدەمێ." یوهان لە نووکەوە ئاخاوتنی خۆی و نیکۆلای بۆ سۆزانا گێڕاوە و گوتی دەتوانم خانوو، تەویلە و بە کورتی هەموو پێداویستییەکی ماڵ بکڕم، بەڵام سۆزانا ئەو قسانەی بە گوێدا نەدەچوون و گوتی:" ئەگەر بڕۆی تازە من بە زیندوویی نابینییەوە."

کوڕە بە تەواوی تووڕە بوو:" قەت ئەوە قسەیە؟ ئاخر چ رووی داوە؟"

"هیچ، تەنیا دەمەوێ پێت بڵێم دڵم سوارە. تۆ کەیفی خۆتە بڕوا دەکەی یا نا، بەڵام کە گەڕایەوە من بە زیندوویی نابینییەوە."

"دەتبینمەوە. تۆ لێرە هەر لەلای دایک و بابت دەبی. دڵم لەو بارەوە ئاسوودەیە." کچە لە پرمەی گریانی دا. یوهان ماچیکرد و گوتی: "چ بووە؟ چ رووی داوە؟" لێوی کچە وشک و سوێر ببوون.

"تۆ ئەوجاریش دەڵێی ئەوە قسەی پڕوپووچی ژنانە، دەنگ نەکەم باشترە."

"من قەت بە قسەی تۆ ناڵێم پڕوپووچ."

"دەترسم بابم بمکوژێ."

"ئاخر کێ ئەو خەیاڵەی لە مێشکی تۆ ئاخنیوە؟" کەمێک تووڕە بوونی بە دەنگییەوە دیار بوو: "بابت چۆن دەتوانی بتکوژێ؟"

"دەمزانی بڕوا ناکەی، بەڵام من لێی تۆقیوم. لێم سوورە دەمکوژێ. بابم دەبێ شکی کردبێ شتێکمان لە بەیندایە. چۆنی شک کردووە، نازانم. ئەوەندە دەزانم دەمکوژێ."

"شکی چی کردووە." یوهان کەمێکی لێ دوور کەوتەوە. لەشی کچە لە نێو ئەو شینکەیەدا درەوشانەوەیەکی تایبەتی هەبوو.

"بابت هیچی گوتووە؟"

"نا."

"جنێوی پێداوی؟"

"نا."

"ئەدی چۆن دەزانی شکی کردووە؟"

"دڵم خەبەری داوە." کچە بە کوڵ گریا و گوتی: "هەر دڵیشم نییە بە تەنیا. ئەورۆ نیوەڕۆیە کە خواردنم بۆ لەسەر میز دانا بە دڕدۆنگییەوە چاوی لێدەکردم. مۆڕەیەکی لیکردم و نەڕاندی: "دادەی بسووڕێ و روو لە پەنجەرە بکە." ئینجا لە تەنیشتەوە تێی هەڵڕوانیم. بە تایبەت لە زگ و کەلەکەم ورد بۆوە. دەتگوت چاو لە ئەسپێک دەکا. پاشان بە سەرمیدا قیژاند:" بڕۆ لە بەرچاوم ونبە قەحپە: دەمی لە چێشتەکە نەدا. من هاتمە دەرێ و بۆم دەرکەوت بە مەسەلەکەی زانیوە. هەموو شتێکی زانیوە. بابم هەمیشە جوێنی داوەتە من، تەنانەت بە منداڵی زۆریشی لێداوم و لە بەر خوێنی هەڵیناوەم، بەڵام قەت پێی نەگوتووم قەحپە. بەڵێ قەت بە یەکەوەی نەدیتووین، بەڵام ئاگاداری هەمووشتێکە."

"باشە چۆن؟"

"هەر کە چاوی لە دەموچاوی من کرد هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت."

یوهان پێکەنی و نێوچاوانی ماچکرد. بە زمانێکی منداڵانە پێی گوت: "ئەگەر بە تەلیسکۆپیش چاوی لێ کردبێ هیچی نەزانیوە. باشە چی دیتووە؟ ئایا ئەو شتە دەبینرێ. ئەوە هەموو خەیاڵی خراپی تۆن."

"منیش دەزانم ئەو شتە نابینرێ، بەڵام بابم دەیبینێ. هەر کە ماینێک ئاوس دەبێ ئەو خێرا دەزانێ. برادەرەکانی سەریان سوڕماوە کە ئەو چۆن بەوە دەزانێ."

"تۆ ... پێت وایە: منداڵت وە زگی کەوتووە."

"نا."

"دەی باشە کەواتە چ لە گۆڕێ نییە. دوو سێ ساڵی دی بە کوڵێک پارەوە دێمەوە، زەویەکە دەکڕم و دەتخوازم. مامۆستا کورۆگا لێکمان مارە دەکا. خانووبەرەیەکی گچکە بۆ خۆمان دروستدەکەین و پێکەوە بەختەوەر دەبین. وا نییە سۆزانا؟"

سۆزانا وەک ئەوەی هێشتا بترسێ، خۆی لە یوهان نزیک کردەوە. وەک مێژۆک دەلەرزی. بە یوهانی گوت: "ئەگەر تۆ لێرە بای من نەدەترسام، بەڵام تۆ بڕۆی، بابیشم نەمکوژێ، لە ترسان دەمرم. تۆ تازە نامبینییەوە. دەترسم لە دووریی تۆ بمرم. هەموو شەوێ دەرگای ژوورەکەم دادەخەم و قفڵیشی دەدەم. کە گوێم لە خشپەی پێی بابم دەبێ زراوم دەچێ و سەرم دەخەمە ژێر سەرین."

یوهـان دەسـتی بە شـان و ملی سـۆزانادا هێنـا و مـاچیکرد و بـەخۆیـەوە گوشـی. کچە متەقی نەدەکرد. لەلای یوهان هەستی بە ئارامی دەکرد. یوهـانیش خۆشـحاڵ بوو کە سۆزانا ژیر بێوەوە و ئیدی ترسـی لـە دڵـی چووبـووە دەرێ. کـاتێ یـەکەم کەڵەباب خوێندی، راست بوونەوە. سۆزانا کراسـەکـەی کە بـە شـەونم تـەڕ ببـوو، کـردەوە بـەری. یوهـانیش خـۆی خـڕ کـردەوە. دەسـتی سـۆزانای گـرت و تـا لای پـەرژینـەکـە لـەگـەڵـی چـوو. لـەوێ راوەسـتا و بینـی چـۆن سـۆزانا بـە کـەلێنـی پەرژینەکەدا خۆی خزانـدەوە حـەوشـە. هێشتا پێی لـە حـەوشـە نـەنـابوو کـە لـە زیرژنـی دا. یوهـان خـۆی نـەوی کـرد تـا بزانـێ چ رووی داوە. سـۆزانا هـەر بـە کەلێنی پەرژینەکەدا چاوی لە حەوشـە کـرد. پـەنجـەرەی ژووری سـۆزانا رووناک بـوو. پـەنجـەرەکـەش کرابـۆوە. یۆرگ یـۆردان بـە جلـی خـەوەوە لـە ژوورەکـەدا راوێچکەی دەکرد. چرایـەکی بـە دەسـتەوە بـوو. یوهـان سـۆزانای لاوانـدەوە و لـە تەیمانەکەی دوور خستەوە تا باوکی نـەبینێ، بـەڵام سۆزانا بـاوکی دیبـوو، بۆیـە گەڕابۆوە لای یوهان. لە ترسـان تـەنانـەت نـەیدەتوانی بگرییێ. نـەرە نـەڕی یۆرگ یۆردان دەهات کە جنێوی دەدا و دەیگوڕاند. یۆهان قەڵافەتی دێو ئاسای یۆرگ و قەڵافەتی ریـوەڵـەی یولانـدای لێرا دیـار بـوو. یولانـدا بـۆ سـاتەوەختێک هاتـە بـەر پەنجەرە و پاشان لە پشت پەڵافەتی زلی یۆرگ نـەدیو بـوو. لـەپڕ دەنگی قیژە و هاواری یولاندا بەرز بۆوە، بەڵام ئیدی هیـچ شـتێکیان لێوە دیـار نـەبوو. زریکـە و هاوارەکە تیژ و درێژ و پڕ ئازار بوو و قووڵترین توێی نـاخی مرۆی دەسمی. پاشان چرای ژووری سۆزانا کوژایەوە، بەڵام پەنجەرەکە هەر ئاوەڵا بوو. قیژە و هاواری یولاندا کز و کزتر بوو و تەنیـا نووزیـەکی دەهاتـە بـەر گـوێ. بـەرە بـەرە ئەو نووزە و کرووزانەوەیەش بڕا و جێگای خۆی دا بە بێدەنگی. یۆرگ یـۆردان بـە پێلەقە دایگژابۆیە و خوری‌شۆر دەیکوتا. سـۆزانا و یوهـان دەلـەرزین. سـۆزانا بـە گریانەوە گوتی: "دەیکوژێ." و خۆی راپسکاند و ویستی بچێتـەوە ژوورێ. یوهـان رۆیبۆیـە، تونـد گرتـی و لاوانـدییـەوە. لـەناکـاو دەسـتی سـۆزانای بـەردا. زانـی لـە سەرپەتی بە هانای ئەو ژنە بەستەزمانەوە بچێ کە چی وای نـەمـابوو بکوژرێ و چیدیکە راوەستابا کار لەکار دەترازا. تـەواوی ماسوولکەی لـەشـی گـرژ ببوون، بەڵام لە جێگای خۆی نەبزووت. بە بێ چەک چۆن بە گژ ئـەو دێوەدا هاتبـاوە کـە

چەکیشی پێبوو. یوهان وازی لەو بیرە هێنا بەرەنگاری ئەو دێوە بێ. شەڕی خۆترێن بوو. توند سۆزانای گرتبوو. ئینجا بەو ڕێیەی پێیدا هاتبوو، لەگەڵ خۆی برد. لە پڕ ئەو بیرەی بە مێشکدا هاتبوو کە دێوی ڕەش بە تفەنگەوە لە سۆزانا دەگەڕێ و ئەو دەبوو سۆزانا لەو مەترسییە ڕزگار بکا. بڕیاریدا سۆزانا بباتە شوێنێکی دوور. بە چاوی نیوە ئاوەڵاوە دەڕۆیی. هەستیدەکرد ئەو دەنگەی دوای سۆزانا کەوتووە، لە پاش سەریانەوەیە.

## (٨)

یوهان مۆریتس بەنێو مووچە و مەزرا و مێرگەکاندا گورج دەڕۆیی. تخوونی جادە نەدەکەوت. چەند جار لاقی لە دڕک و داڵ و پنجکە داران ئاڵا و هەڵەنگووت، دیار بوو شەکەت بووە. نەیدەزانی چەندیان ڕێگە بڕیوە. وردە وردە بڕستی لێ دەبرا. پیلی تەزیبوون. ئارەقەی نێوچاوانی دەچۆوە ناو چاوی و هیچ کوێی نەدەدی. لە پڕێکدا ڕاوەستا و کۆڵەکەی لە نێو گوڵەگەنمەکان دانا... چیدیکەی پێ هەڵنەگیرا. پێیەکانی سۆزانای لە عەردی ڕاکێشان و دامێنی کراسە شینەکەی پێدادانەوە. دەستەکانیشی لە ئاراستەی لەشیدا بۆ درێژ کردن و لە چرپی و گەڵای داران سەرینێکی بۆ دروستکرد. پاشان هەندێکی دیکەی گەڵا ڕنی و نوێنێکی نەرمی لێ دروستکرد. هەرچەندی دەستی بە دەموچاوی و لاق و دەستی سۆزانادا هێنا، ئەم مووی لێ نەبزووت. هەستا. هەموو گیانی کوترابوو. قۆڵ و ڕەفیسکی لاقانی گیرابوون و دەتگوت دەرزیئاژنت کردوون. لە دڵی خۆیدا گوتی:" دەبێ ڕێگایەکی باشمان بڕیبێ." سەری هەڵبڕی و بینی دنیا خەریکە ڕووناک دەبێ. چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، بە سەر سوڕمانەوە دیتی وا لە لای داربەڕووەکانی لێرەوارن. بڕوای نەدەکرد. دەبێ خەون بێ، بەڵام نا، ئازار و شەکەتی تێیانگەیاند خەو نابینێ. یوهان و سۆزانا لەسەر کێڵگەی پرۆفیر بوون. کەواتە کاتی ڕاکردن بێ ئەوەی مەبەستی بێ هاتبووە کێڵگەیەک کە دوێنێ پێشەکییەکەی دابوو. یوهان هەستیکرد فرمێسک لەگەڵ ئارەقەی

گەرمی دەموچاوی تێکەڵبووە و بە رووومەتیدا شۆڕاوگەی بەستووە. دڵۆپی درشتی فرمێسک و ئارەق کەوتنە سەر زەوی. ئەو زەوییەی کە لێی سوور بوو تازە نابێتە هی ئەو. نا... ئەو نەیدەتوانی سەفەرەکە بکا و پارە پەیدا بکا.

## (٩)

لە کێڵگەی پرۆفیروە گوند بە باشی دیار بوو. چاوێکی بە خانووە سپییەکانی سەرانسەری گوندەکەدا خشاند. پاشان نیگای لەسەر ئافرەتێ کە لە بەردەمی لە سەر شینکە خەوتبوو، گیرسایەوە. بیری کردەوە بیباتە کوێ؟ هیچ وەڵامێکی بۆ ئەو پرسیارە پێنەبوو. تەنیا ئەوەندەی دەزانی دەبێ داڵدە و ئەنوایەک بۆ ئەو ژنە پەیدا بکا کە چارەی لە چارەی ئەو گرێدرابوو.

وازی لە سەفەری ئەمریکا و ئەو پارچە زەوییە هێنا کە پێشەکییەکەشی دابوو. سۆزانای تارادەی پەرستن خۆشدەویست و جگە لەوە ئێستا پێویستی بە یارمەتی بوو. نەیدەتوانی سۆزانا بەو حاڵەوە بەرەڵڵا بکا. دەبوایە تا زووە ئەنوایەکی بۆ وەدۆزێ. لە نێو گشت ماڵەکانی فانتانادا تەنیا دوو جێ هەبوون سۆزانای بەرێتێ. ماڵی خۆیان و ماڵی قەشە کۆرۆگا. لێی سوور بوو خەڵکی دێ داڵدەی نادەن. لە ترسی یۆرگ یۆردان. نەیاندەوێرا. ماڵی خۆشیان تەنیا ژوورێک بوو. لای قەشەش بێ قەیدی نەبوو. لەبەر ئەوەی سۆزانا ژنی شەرعیی یوهان نەبوو. جگە لەوە حەزی نەدەکرد مامۆستا تووشی چەرمەسەری بکا. دەیزانی یۆرگ یۆردان بۆ تۆڵەکرنەوە تەنانەت پەکی پێنەدەکەوت بە زەبری زۆرداری و بە چەکەوە بچێتە ناو کڵێسە. نا، ئەوانە هیچکام کاری کردنێ نەبوون، بەلام نەشدەکرا هەروا لە مەزرایە بن. دوای هێندێک راوەستان سۆزانای لە کۆڵ نا و بەرەو دێ بۆوە. سۆزانا رەنگی بە رووانەوە نەمابوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: بەستەزمانە لە ترسان نەخۆش کەوتووە. دەم نا دەمێ بە نیگەرانییەوە گوێی لە ترپەی دڵی دەگرت. پەکو چەند بە کاوەخۆ لێی دەدا. یوهان خێراتر رۆیی تا زووتر بگاتەوە دێ.

## (١٠)

ڕۆژ هەڵات. لەو کاتەدا یوهان گەیشتە بەر دەرگە. سوزانای دانا و پاڵی پێ وە دیواری دا. چاوی لە گزینگی خۆر بڕی کە تا دەهات پتر دەبوو. بیری کردەوە ئێستا گیتزایون لە بەر دێ چاوەڕوانیەتی. ددانی لە چیرەوە بردن، وەک بیهەوێ ئیرادەی خۆی بەهێز بکا. پشتی لە پرشنگی خۆرەتاو کرد و چووە ژووری هەتا تکا لە دایک و بابی بکا سوزانا رابگرن. ئەوان هێشتا خەوتبوون. یوهان پێی خۆش بوو بە تەنێ لەگەڵ بابی باسی بکا، لەبەر ئەوە "ئارستیزیا"ی دایکی، ژنێکی ناجسن بوو، هەر پێی لە ژووری نا دایکی ملی قیتکردەوە و گوتی: "هاتووی جانتاکەت ببەی؟ لە کن دەرگایە." یوهان وەڵامی نەدایەوە، دایکی گوتی:" بۆ وەک شایەتینی لەوێ راوەستاوی؟" پاشان گوتی:" دەی باشە وەرە ماچێک بدە دایکی خۆت. ماڵاوایی لە باوکیشت بکە. لەوێ دەست بە پارەوە بگرە و هەمووی بێنەوە."

"من ناچمە ئەمریکا."

پیرەژن قیت بۆوە و گوتی: "چی؟ تۆ ناچیتە ئەمریکا؟" "نا."

"گیتزاش ناچێ؟""

ئەو، با."

ئاریستیزیا زوو زانی شتێک روویداوە. لە کاتێکدا کە لە جلەکانی دەگەڕا گوتی: "ئەدی تۆ بۆ ناچی؟ پارەکەت لێ ونبووە؟"

"نا."

"لەگەڵ گیتزا بەشەڕ هاتووی؟"

"شەڕی چی؟"

ئاریستیزیا لە جێ هاتە دەرێ. لە رقان سوور هەڵگەڕابوو. گوتی: "ئەدی بۆ؟"

لە کوڕەکەی چووە پێشەوە. یوهان گوتی: "دەمەوێ ژن بێنم. لەبەر ئەوە سەفەرەکە ناکەم." دوودڵی بە دەنگییەوە دیار بوو. نەیدەزانی چۆن دەست پێبکا و چۆن چۆنی بۆی روونبکاتەوە. ئاریستیزیا شانی گرت و رایتەکاند. یوهان گوتی: "دەمەوێ لەگەڵ باوکم قسە بکەم. ناتوانم هیچ بە تۆ بڵێم."

چی؟ ناتوانی هیچ بە من بڵێی؟ ها؟ من تۆم لە زگ و پشتی خۆم گێڕاوە نەک باوکت. باوکی یوهان لە ژێر لێفە شڕە و سیپاڵان هاتە دەر و گوتی: "ئافرەت لەسەرخۆ بە. دایکی یوهان بە هەر دوو دەست وەرگەڕابووە رانی خۆی و گوتی: "تۆ شیلەی گیانمت هەموو مژی و شیری مەمکانت هەڵچۆڕاندم، ئەوە جوابی چاکەیە دەمدەیەوە، پێم دەڵێی ناتوانم بە تۆ بڵێم." یوهان هەوڵیدا قسەکەی پینە بکا: "دایە بە تۆشی دەڵێم." پیرەژن زۆڕ زۆڕ دەگریا. یوهان دەیویست دڵی بداتەوە: "دایە بە تۆی دەڵێم. تەنیا تۆ! ئێستا مەگری.

ئاریستیزیا بە سەر قەرەوێڵەدا نووشتابۆوە و سەر و رووی خۆی دەڕنی. وەک دایکێک دڵی شکابوو، بەڵام سەرباری ئەوە هەر بێدەنگ نەدەبوو. دەمی وێک نەدەکەوتەوە.

"بە چی ژن دێنی؟"

"ئێستا هەموو شتێکت پێدەڵێم.

جارێ پێم بڵێ بزانم کێ دێنی؟ من دایکتم و دەبێ بزانم."

باوکی یوهان کە دەیزانی ئاریستیزیا لە شەڕە، رووی کردە کوڕەکەی و گوتی: "بیڵێ یانی، با دایکیشت دڵی ئاسوودە بێ."

یوهان لەوە دڵنیا بوو کە ئەگەر ناوی کچی یۆرگ یوردان بهێنێ دایکی نەک هەر دڵی ئاسوودە نابێ، بەڵکو زیاتر دەهری دەبێ.

من سۆزانا دێنم، کچی یۆرگ یۆردان.

ئاریستیزیا قەڵەمبازێکی هاویشت و وەک دێڵە شێرێک خۆی بە کوڕەکە دادا، بەڵام نەک بۆ ئەوە ونجڕ ونجڕی بکا، بەڵکو بۆ ئەوەی لە ئامێزی بگرێ. مۆجیزاتە! چەند جار لە سەر یەک گوتی: "ئێستا تێگەیشتم بۆ ناچییە ئەمریکا." لێکدا لێکدا کوڵمە و تەوێڵ و چاوی کوڕەی ماچدەکرد.

"نا تۆ هێندە گەمژە نی بچییە ئەمریکا، بە رۆژکار ئیش بکەی و دوای چەند ساڵان بە نەخۆشی و کلۆڵی و بە خۆ و چەند هەزار "لای"ەکەوە بگەڕێیەوە. نا تۆ گەمژە نی، دیارە قسەی دایکی خۆت لە گوێ گرتووە کە هەمیشە گوتوومە کچی دەوڵەمەندان بێنە.

چاوەکەمی، لەوەی ویوە بەرگی جوان لەبەر دەکەم. فەیتوونیشم دەبێ. ئەسڵەن لەمەو پاش لە ماڵە خەزووری کوڕەکەم دەژیم. ئەوە مافی خۆمە. مافی ئاریستیزیایە ئاریستیزیا، کە لاوێکی ئەوەندە زیرەکی پەروەردە کردووە ئاشقی دەوڵەمەندترین کچی ئەو گوندە دەبێ و دەیخوازێ. کچێک کە ماڵ و زەوی و کێڵگە و ئەسپ و گای هەن."

باوکی یوهان گوتی: "باشە ئافرەت، لەسەرخۆ بە." دەنگی ئەویش تۆزێکی کەیف و خۆشحاڵی پێوە بوو. خەیاڵی سامان ئەویشی وە قلە خستبوو. بێ ئەوەی لە جێگا بێتە دەر جغارەیەکی پێکرد. ئاریستیزیا بە لێبڕاوییەوە گوتی: "من دەچمە لای یۆرگ یۆردان." ڕووی لە مێردەکەی کرد و گوتی: "تۆ لە ماڵێ بە. من و کوڕەکەم پێکەوە دەچین. کێ لە من باشتر دەتوانێ ڕێنوێنی کچێکی گەنج بکا؟"

"بڵێ بەرخم، هەرچی پێت خۆشە بیڵێ، گوێم لە کوڕی خۆمە."

"دایە بەڵێن بدە بە بێدەنگی و شێنەیی گوێ بدەیە هەموو قسەکانم."

"وەی بە سەرچاو، چۆن و چت پێخۆشە با وابێ." ئینجا ئاریستیزیا بە قامکی شادە لە ڕوومەتی کوڕەکەی دا.

"دایە." یوهان ئیستێک ڕاوەستا و پاشان گوتی: "من بە بێ ڕەزامەندیی یۆرگ یۆردان لەگەڵ سوزانا زەماوەند دەکەم."

"گرینگ ئەوەیە تۆ سوزانا دێنی و من دەبمە خەسووی کچی یۆرگ. دەوڵەمەند دەبم. ڕەزامەندیی ئەو بۆ من گرنگ نییە."

"قسەی تێدا نییە دەبیە خەسووی کچەکەی، بەڵام دەوڵەمەند نابی."

"ئەدی ئەو پووڵە بۆ کێ دەبێ؟ ئەو جگە لە سۆزانا چ ئەولادی دیکەی نین. هەرچی بێ جیازێکی باش لەگەڵ کچەکەی دەخا. لەو سەفتە دراوانەی لە ژێرزەمین شاردوونیەوە. ئەوەیان لە ئەستۆی من. ئەو جۆرە کارانە بۆ من لێگەڕێن."

"دایە من سۆزانا دەخوازم نەک پارە و جیازەکەی."

"واتە کچە لە سامانەکەی بۆ تۆ گرینگترە."

"بەڵێ دایە."

"کەرێتییە! قەیدی نییە، کارەکە بە من بسپێرە، خۆم دەزانم چی بکەم. کەس منی پێ فریو نادرێ."

ئاریستیزیا بیری لە چەنەلێدان و سەودا لەگەڵ یۆرگ یۆردان دەکردەوە. یوهان دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی شەوێ دی کرد. ئاریستیزیا دەرهەڵبوو: "واتە ئیدی ناگەڕێتەوە ماڵی باوکی؟"

"نا نا، باوکی دەیکوژێ، ناچێتەوە."

باوکی یوهان قسەی کوڕەکەی پەسند کرد: "بەڵێ بێگومان دەیکوژێ. یۆرگ یۆردان گاڵتەی پێناکرێ. کچەکە چاکی بۆچووە. باوکی جانەوەرێکە لەو گۆڕەی. بێتە سەری زوو دەست بۆ چەک دەبا. لە کاتی شێتگیربوونیدا تا ئێستا باشترین ئەسپەکانی خۆی بە تفەنگ کوشتوون. ئەوە لە حاڵێکدایە لەو دنیایە ئەسپی لە هەموو شت خۆشتر دەوێن. لەسەر ڕووداوی دوێشەو کچەی دەست کەوێ بێ سێ و دوو دەیکوژێ."

"زۆر سوپاس بابە گیان کە تۆ لە دەردی من گەیشتی."

"ئاشکرایە، چۆن تێناگەم. من یۆردان چاک دەناسم."

"بەهەر حاڵ دەکرێ دوای چەند ڕۆژ کچە بنێرینەوە ماڵە بابی. ئاریستیزیا هەروەها گوتی: "خۆم لەگەڵی دەچم."

"سۆزانا تازە ناچێتەوە ماڵی باوکی، یانی من نایەڵم."

"ئەی بەبێ فلسێک پارە و جیاز چی لێدەکەی؟ دەتەوێ هەردووکتان لە برسان بمرن؟ ها؟" ئاریستیزیا دیسان توورە بوو و لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: "چ زۆرە کچ، یانی تۆ هێندە گێل نی بە بێ پارە تەنیا لە پێناوی زەعیفەیەک..." باوکی یوهان گوتی: "دایکت زۆریش هەڵە نییە. کاری وا شێتانە مەکە. سەفەرەکەت بۆ ئەمریکا تێکمەدە، کە گەڕایەوە پارچە زەوییەک دەکڕی، ماڵ و حاڵ پێکەوە دەنێی، ئەودەم دەتوانی ژن بێنی. چ زۆرە، ژن."

" من تازە سەفەر ناکەم."

" دەتەوێ بڵێی وە درەنگی کەوتووی بۆیە ناڕۆی؟ بڕۆ، گیتزا ئێستا چاوەڕوانت دەکا، پەلە بکە، دەیگەیەی. هێشتا درەنگ نییە."

"بابە بەڕاستی دڵت دێ ئەو کچە بەرەڵڵا بکەم و بۆخۆم بچمە ئەمریکا؟"

ئاریستیزیا دەیویست بزانێ کچەکە لە کوێیە. یوهان گوتی: "لە بەر دەرگایە." دایک و بابی پێکەوە تێکرابوون. دایکی لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد. یوهان نێو دەرگەی لیگرت تا نەهێڵێ بچێتە دەرەوە.

"دایە تکات لێدەکەم. سۆزانا چەند رۆژێک لەلای خۆت راگرە، تا شوێنێک پەیدا دەکەم. ئەو ئێستا وەک کچی خۆت وایە." ئاریستیزیا شیراندی:" دەفەرمووی داوای لێبکەم لەگەڵ مە بژی؟ ئەو دەم یۆرگ یوردان بێت من و باوکت بداتە بەر فیشەکان."

باوکیشی گوتی: "خۆت دەزانی جێگای سەر و قوونی خۆمان نابێتەوە! ئەو لە کوێ بخەوێنین؟ نا، یانی ئەوە مەحاڵە."

ئاریتسیزیا هەر بۆڵەی دەهات: "ئینجا هەر ئەوە ماوە لە زاری خۆمان بگرینەوە و بیدەینە ئەو."

یوهان چاوی لە عەرز بڕی. ئەو دەیزانی دایکی رایانناگری، بەڵام زیاتری لە باوکی رادەدی. پاڕایەوە:" تەنیا ئەوشۆ با لێرە بێ. سبەی جێگایەکی بۆ پەیدا دەکەم. دەیبەمە شار. لەوێ کار دەکەم. سۆزانا نەخۆشە و ئەگەر کەمێک نەیەتەوە سەرخۆ ناگاتە شار. بەستەزمانە زراوی چووە. شەوێ دی رووداوی زۆر سامناکی بە چاوی خۆی دیوە."

دایکی یوهان گوتی:" ئێمە ئەوڕۆ هیچ خواردنمان نییە بیدەینێ، ئەگەر دەتەوێ بە برسێتی لێرە بێ، با لێرە بێ." خۆم خواردنی بۆ دێنم. ئێستا ئەو پێویستە پشوو بدات، خۆی لە سەر لاق راناگرێ.

"باوکیشت نەخۆشە و دەبێ لەسەر جێگا بێ. ئەدی کچە لە کوێ دەنوێنی؟ لە پەنا باوکت؟""باشە، قەیدی نییە، ئەگەر لە ژووری جێگا نییە با لە حەوشە لە سەر کا بنوێ، وەک خۆم کە هەمیشە لەسەر کا دەنووم."

"باشە، قەیدی نییە، بەڵام فراوین لە ئارادا نییە." یوهان ویستی وەدەرکەوێ. لە ناو دەرگا راوەستا، رووی کردە باوکی کە خەریکی داگیرساندنی جگەرە بوو گوتی:" تکایەکی دەیکەشەم هەیە بابە، تکا دەکەم ئەو چەند کاتژمێرەی کچە لێرەیە دەگەڵی رووخۆش بن. تفیلە بایی خۆی قوڕبەسەری هەن." ئاریستیزیا قیراندی:" هەی بێ چاو و روو، وات لێهات دایک و بابت فێری رەوشت دەکەی؟ ئەوەیە دەڵێن:" لێت

دەردەپەڕێ و وێت هەڵدەپەڕێ. لە باتی ئەوەی بچیە ئەمریکا و شتێک بە شتێک بکەی، کۆنە فرتوفێڵێکت وە دوای خۆت داوە، دەتەوێ بە پیر و کەنەفتی وەک ئێمەی بەخێو بکەی، بە وەشەوە ناوەستی فێرمان دەکەی چ بکەین و چۆن بجووڵێینەوە؟"

ئاریستیزیا داهاتە دارێک تا لە یوهانی بئاڵێنێ. یوهان چرتەشی نەکرد، با لێیبدا. لە منداڵییەوە بەشی هەر جنێو و تێهەڵدان بووە. بە لاڵانەوەوە دیسان پرسی: لەگەڵی رووخۆش دەبن؟ من زوو دەگەڕێمەوە. دەچمە ناو دێ تا خواردنێک پەیدا بکەم."

وەدەرکەوت. سۆزانا چۆنی بە دیوارەوە هەڵپەسێرابوو هەروا بوو و نەبزووتبوو. یوهان دەستی بە قژیدا هێنا و گوتی: "من دەچمە نێو دێ و تا چەند دەقەی تر دەگەڕێمەوە. کە باشتر بووی، شتێک دەخۆین و بەرەو شار وەڕێ دەکەوین. کچەکە لە دووریی ڕێگاکە تۆقیبوو، پرسی: "لێرە نامێنینەوە؟"

"نا، ئێستا با بچینە ژوورێ". ئینجا بردییە حەوشە و لەسەر لۆدە کایەک درێژی کرد.

"ڕاکشێ با بحەسێیەوە، دەنا ناگەیە شار. ڕێگاکەی بیست کیلۆمەتر زیاترە." لەشی سۆزانا داگیرسابوو. گوێچکەی تەپ ببوون و بە حاڵ گوێی لە شت دەبوو. "ئەگەر دایکم هات و شەری پێ فرۆشتی خۆت بکە خەو. دایکم قەڵسە." یوهان ئەوەی گوت و وە دەرکەوت، لە دەرێرا ئاوڕێکی وە سۆزانا دایەوە و بۆی پێکەنی. هێشتا یوهان تەواو دوور نەکەوتبۆوە ئاریستیزیا هاتە دەرێ و رووی لە سۆزانا کرد.

دەستی دە بەر کەلەکەی نا و بە سەرنجەوە لە کچەکەی دەڕوانی کە لە سەر کا راکشابوو. سۆزانا چاوی هەڵێنا. لووتێکی بەرانی و دەموچاوێکی رەنگ زەیتوونیی چرچ و لۆچی بینی. لە ترسان چاوی نووقاندەوە.

"من دایکی یوهانم."

سۆزانا بە لەقاندنی سەری، سڵاوی کرد. داوێنی کراسە شینەکەی ئەوەندەی لە دوو دەهات بە بەلەکان دادایەوە، لەبەر ئەوەی پیرەژن وای چاو تێبڕیبوو دەتگوت بە رووتی خەوتووە.

"دەی، گەرەکتە مێرد بکەی؟"

"سۆزانا لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە. "بەڵێ"
"جا بۆ نا؟ دەڵێی ماینێ کەحلانی."
سۆزانا دەموچاوی لە نێو کایەکەدا شاردەوە. پیرەژن لێی هاتە پێشێ: "جوانکیلە، دیارە تا ئێستا کەرێکت دەست نەکەوتووە خۆی بە ئەستۆدا ببڕی، بەڵام ئەوە بزانە بە بێ جیاز پێ لەو ماڵە نانێی. ئەگەر خۆت ئاشکرا کردووە ئەوەیان تاوانی خۆتە. بەهەر حاڵ یوهان ناتخوازێ."
سۆزانا ئانیشکی دادان و کەمێک هەستایەوە، بەڵام ئاریستیزیا هەروا خۆی بەسەردا نوشتاندبۆوە. "کێ؟ ... یانی." "یانی لە کوێیە؟" ئاریستیزیا بە سەرسوڕمانەوە گوتی: "ئێمە کەسمان نییە ناوی یانی بێ." سۆزانا بە سەرسامییەوە لێی روانی. نەیدەزانی چ بڵێ. پیرەژن دووپاتی کردەوە:" یانی کێیە؟ نەکا مێشکت لەقیبێ؟ نەکا ئێرەت لەگەڵ جێگایەکی دی لێ گۆڕابێ؟"
سۆزانا لەسەرخۆ گوتی: "یانی، کورەکەی ئێوە."
"کوڕی من ناوی ئەیونە. من کە دایکی ویم ئەو ناوەم بە گوێ داداوە. کەس بۆی نییە ناوی کوڕی من بگۆڕێ. تێگەیشتی؟"
مستەکۆڵەی پیرەژن بە هەرەشە کردنەوە بە بەرچاوی سۆزانادا هەڵسووڕا.
"بەڵێ تێگەیشتم.
سۆزانا بیری ئامۆژگارییەکەی یوهان کەوتەوە کە دەبوایە لەبەری دانوێنێ. "بەڵێ یۆن یان یانی فەرقی نییە." پاکانە کردنەکەی سۆزانا پیرەژنی تووڕەتر کرد: "دەتەوێ فێری من بکەی ناوی کورەکەم چییە؟ قەحپەی حەیا تکاو."
سۆزانا جەختی کردەوە کە: "من بەڕاستی نەمدەویست بترەنجێنم." بەڵام پیرەژن بە مستان داگژا سەر و پۆتەڵاکی . سۆزانا قیژاندی. پیرەمێردەکە لێیان وەدەرکەوت. بە توێی کراس و بیجامەوە، بە نەخۆشی هاتبووە دەرێ تا بزانێ ئەو هەڵڵایە چییە. هێشتا جغارەکەی بە لالیوەوە بوو. ئاریستیزیا لە کۆڵ کچە بۆوە. هاتە پێش مێردەکە. لە کاتێکدا کە لە رکان سوور هەڵگەڕابوو، گوتی: "چاوت لێیە چ وڕوڕە جادوویەکە؟ قەحپێ لە ئێستاوە دەیەوێ ناوی کوڕەکەم

بگۆڕێ. بە گێلم تێدەگا. حەیف نییە سەری پان نەکەمەوە، وەک چۆن سەری ماران پان دەکەنەوە." پیرەمێردەکە ڕۆبووە دەستی:

"بێدەنگ بە ئافرەت." ئینجا بەرەو ژووری پاڵەپەستۆی دا و خۆی گەڕایەوە لای کچۆڵەکە، دەستی گرت و بە بەزەیی و هاودڵییەوە تێیڕوانی. سۆزانا کەمێک پشووی هاتەوە بەر. دەستی پیرەمێردەکە زل و زوور بوون. بە سۆزانای گوت: "کچەکە، دەمەوێ ئامۆژگارییەکت بکەم. ئەگەر کوڕەکەمت خۆش دەوێ بگەڕێوە لای دایک و بابت." سۆزانا ملی لە گریان نا. "تۆ نابێ لێرە وەمێنی، دەنا ئاریستیزیا سەرت بە گاشەیەک ورد دەکا، دڵنیا بە ئەو کارە دەکا و بزانە چ کارەساتێک ڕوودەدا. ئەودەم ئەیونیش دایکی دەکوژێ. چ تاوانێکی گەورە. نا، وا مەکە تووشی نەهامەتی بێ. تێدەگەی؟" لێوی سۆزانا بە زەحمەت لەبەر یەک ترازان: "بەڵێ تێدەگەم."

"بە قسەی من دەکەی هەر ئێستا هەستە و پێش ئەوەی ئەیون بگەڕێتەوە، بە لاڕێدا بڕۆوە کن دایک و بابی خۆت. ئەگەر ئەیونیش هاتەوە پێی دەڵێم بە جادەدا ڕۆیو با بەتدۆزێتەوە. دوایە یەکتر لە بیر دەکەن. ئێوە هێشتا گەنجن، گەنج زوو شت لە بیر دەکەن. دە هەستە بڕۆ."

سۆزانا رووی لێوەرگێڕا و قامی لە کونی گوێی ئاخنین تا یەک وشەی دیکەش نەبیستێ:

"ناڕۆی؟" پیرەمێردەکە زۆری حەز دەکرد هەر ئێستا دەستی بگرێ و بیباتەوە ماڵی بابی، بەڵام بیری لەوە کردەوە، ئەگەر ئەو کارە بکات ئەیون هەرگیز لێی خۆش نابێ.

"دە باشە، هەرچی ڕوویدا وەباڵ بە ئەستۆی خۆت. من لەسەرم بوو ئامۆژگاریت بکەم. ئیدی کەیفی خۆتە." سۆزانا دیسان بە تەنێ مایەوە. پیرەمێردەکە چووبۆوە ژووری. یوهان بە جامێک شیرەوە گەڕایەوە. دەیویست لەسەر تەباخ بیکوڵێنێ کە ئاریستیزیا دەستی بە بۆڵەبۆڵ کرد: "قەت شیرت بۆ دایک و بابی خۆت هێناوە، ئێستا بۆ ئەو کۆنە فرتۆڵەی لەوێ ڕاکشاوە بە غار چووی شیرت پەیدا کرد؟ سەد بریا هەر بە منداڵی ئەستۆم شکاندبای." یوهان لە پێش تەباخەکە کووڕ ببۆوە و سەیری بڵێسەی ئاگرەکەی دەکرد، هیچ بەسەر خۆی نەهێنا. ئاریستیزیا لێی هاتە پێشێ و گوتی: "هەر ئێستا ئەو

گاندەرە بۆگەنە لێرە دەبەیە دەر و لە بەرچاوم گوم دەبن دەنا لەبەر یەکی هەڵدەقەڵێشم. زووی لە پێش چاوی من لادەبەی چاکە دەنا بەو دەستانەم دەیخنکێنم. یوهان بێ ئەوەی چاو لە دەستی دایکی بکا کە دەیویست سۆزانا بخنکێنێ، گوتی: "با شیرەکەی بخواتەوە دەڕۆین. دەچینە شار و تازە چاوت پێناکەوێتەوە." "کچی ترتڕ پاشا، بە بێ شیرخواردنەوە ناتوانێ رێ بکا؟ وەڵڵا بابە شیر بۆ ئەو چاکە نەک بۆ دایکی قوربەسەرت بەیانیان بیخواتەوە."

یوهان شیرەکەی بە نەکوڵیوی هێنایە خوارێ، بەڵام شلەتێن بوو. بێ ئەوەی چاو لە دایکی بکا لە مەدبەق وەدەرکەوت. کە خشپەی پێی هات. سۆزانا راچەنی. "منم سۆزانا، شیری گەرمم بۆ هێناوی." ئینجا شیرەکەی دایە.

"پێم ناخورێ."

"تەنیا چەند قومێک."

سۆزانا قاپە شیرەکەی لێوەرگرت. یوهان چووە ژوورێ تا هەگبەکەی هەڵگرێ. ئەو هەگبەی بۆ سەفەریان پێچابووە. ئاریستیزیا لێی پرسی: "لەگەڵی دەڕۆی؟"

"بەڵێ."

ئاریتسیزیا ددانی لە چیرەوە بردن و گوتی: "زۆر باشە." و لە کاتێکدا یوهان سەرقاڵی کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانی بوو وەدەرکەوت. سۆزانا کە چاوی پێکەوت داچڵەکی. هێشتا جامەشیرەکەی بە دەستیەوە بوو. "هەستە. بزانە چۆن هەموو گیانت دەشکێنم." و هێشتا لە قسەکەی نەبێبوو خۆی پێدادا. پرچی لە دەستی ئاڵاند و وەری‌گەڕایە. سۆزانا قیژاندی. یوهان پێی وابوو دیسان دەنگی یولاندای گوێ لێدەبێ. دەرپەریە دەرێ و نەڕاندی: "دایە چی دەکەی؟" پیرەژن مۆڕەیەکی توندی لێکرد و بێ ئەوەی چاو لە سۆزانا بکا مستێکی دیکەشی تێسرەواند. ئینجا بە خێرایی بەرەو لێرەوار هەڵات. سۆزانا شەلاڵی خوێن بوو. دەموچاوی ئاوسابوو و پەڵەی خوێن و شیر بە کراسە شینەکەیەوە هەڵپڕژابوو. قاپی شیرەکە شکابوو و لێوە تیژەکانی دەستی سۆزانای بڕیبوو.

یوهان سۆزانای هەڵگرتەوە و کەوتە رێ. هەگبەکەشی هەڵگرت. کچەکە بە باوەشیەوە و هەگبەکەی بە کۆڵەوە، وەڕێکەوت.

## (١١)

لەگەڵ هەڵاتنی خۆر یۆرگ یۆردان ئەسپەکانی ئاو دان و زینی کردن. هەشت ئەسپی هەبوون. چوار هی سواری بوون، لە کالیسکەی نەدەبەستن. ئەسپی زۆر جوان و لە نەژادی عەرەبی بوون. بەرز و لووس. ئەو ئەسپانە برادەری یۆرگ یۆردان بوون و قسەی دڵی خۆی لە کن دەکردن. مەسەلەی سۆزانای بۆ گێرانەوە. ئەسپەکان بە چاوی سپی و ماتەوە تێیان ڕوانی.

"ئێستا ژنەکەم بە لەشی هەلاهەلاوە لە دالانی ماڵێ کەوتووە."

ئەسپەکان لە جێی خۆیان نەجووڵان. بێدەنگییەکەیانی بە سەرکۆنە کردن خوێندەوە و گوتی: "ئەگەر راتان وایە، باشە، دەیبەمە نەخۆشخانە."

نیو کاتژمێر دواتر یۆرگ یۆردان ژنەکەی سواری فایتوون کردبوو و دەیبردە شار. پاڵتۆیەکی لە یۆلاندا وەرپێچابوو. ئەم، چاوی لە شوێنێکی دوور بڕیبوو، بەڵام زۆر زوو گەیشتنە نەخۆشخانە. هێشتا پزیشک نەهاتبوون.

یۆرگ لە فایتوونەکدا دانیشت تا کاتژمێر بوو بە هەشت و دەرگای نەخۆشخانە کرایەوە. لەو ماوەیەشدا هەر لەگەڵ ئەسپەکانی دوا و لەبزی لە لەبزی ژنەکەی نەگەڕا. هەر چاوێکیشی لێنەکرد. کاتژمێر هەشت، یولاندی بە بالیفەکانی ژێرییەوە هەڵگرت و بردییە ژووری چاوەڕوانی.

کاتێ پەرستار یولاندای رووت کردەوە پزیشک تێگەیشت کە سەرتاپای لەشی خوێناوییە. تەنیا کراسی خەوی لەبەردا بوو کە بە لەشیەوە نووسابوو. یولاندا بێ زمان کەوتبوو. پزیشک پرسی: "کێ ئەو ژنەی وا بریندار کردووە؟"

یۆرگ یۆردان لە وەڵامدا گوتی: "ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نییە، کاری تۆ ئەوەیە دەرمانی بکەی."

بەم شێوەیە خۆی لە وەڵامدانەوە بوارد. پزیشک یولاندای چاو لێکرد. نەشتەرگەرییەکی بە پەلەی دەویست. یورگ گوتی: "من دەچمەوە ماڵێ. چی لێدەکەن لێی بکەن. ئێوە ئازادن." و کڵاوەکەی هەڵگرت و وەرێکەوت. لەنێو دەرگەڕا گەڕایەوە و گوتی: "خەرجی چەند تێچوو خۆم دەیدەم. ئەگەر ئێستا بەر لە نەشتەرگەری دەتوانن وەسڵەکەی ئامادە بکەن، با هەموو پارەکەی یا

هیچ نەبێ نیویکتان بدەمی." دەستی لە گیرفانی راکرد کە جزدانەکەی دەربهێنێ. دکتۆر گوتی: "بەڵام تۆ ئێستا ناتوانی برۆی. کەمێک دەبێ راوەستی."

"یۆرگ زۆری رق لەوە بوو بە هۆی یاساوە لە گیر و گازی بخەن. حەزی دەکرد هەرچی زووە نەخۆشخانە بەجێبهێڵێ. بۆنی دەرمان ئازاری دەدا. تارادەیەک لە کاری خۆی پەشیمان ببۆوە و زگی بە ژنەکەی دەسووتا. لەبەر خۆوە گوتی: "سەرەرای ئەو هەموو شەقەی بە پۆستاڵم تێهەڵداوە ئێستا دەیانەوێ بە نەشتەر هەموو لەشی هەڵدڕ هەڵدڕ بکەن."

تۆزێک بە خۆیدا شکابۆوە، بەڵام بە هیچ کلۆجێ وەسەر خۆی نەدەهێنا. حەزی دەکرد هەرچی زووە هەوای دەرێ هەڵمژێ. چارەگێک دواتر دادوەر بە خۆی و پاسەوانێکەوە وەژوور کەوت. یۆردانیان بردە هۆدەیەک و لێکۆڵینەوە دەستی پێکرد. ناونیشانی تەواویان لێ وەرگرت. لێیان پرسی ئایا خۆی ژنەکەی بریندار کردووە؟ بە خەفەتەوە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە. روانینی وەکو شووشە سارد بوو. تەنانەت کە داواکار پێی راگەیاند بە تاوانی توندوتیژی لەگەڵ ژنەکەی بەند دەکرێ روانینەکەی هیچ نەگۆرا، بەڵام کاتێ پاسەوانەکە دەستی لە شانی دا و ویستی وە پێش خۆی بدا، وەک مردوو رەنگی سپی هەڵگەرا و گوتی:

"لە زیندانم دەکەن؟"

"بەڵێ، زیندان."

"ئەدی ئەسپەکانم کەوا لە پێش نەخۆشخانەن چییان بەسەر دێ؟" داواکار بە نیگایەکی پرسیارئامێزەوە چاوی لە پاسەوانەکە کرد و گوتی: "کەست نییە ئەسپەکانت بۆ بەرێتەوە ماڵێ؟"

یۆردان گوتی: "هیچکەس."

پاسەوانەکە گوتی: "قەی ناکا، ئەسپەکان دەبەینە دائیرەی ئاگر کوژێنەوە. ئەوێ ئەسپی تریشی لێن. لە زیندان جێگای ئەسپمان نییە."

داواکار بە بزەیەکەوە سوپاسی پاسەوانەکەی کرد کە لەو کاتەدا بە هانایەوە هاتبوو، لەبەر ئەوەی بەراستی نەیدەزانی ئەسپەکان چ لێبکا. داواکار ناوی گێۆرگ دامیان بوو و تەنیا چەند رۆژێک بوو هاتبووە ئەم شارە.

نزیک نیوەڕۆیە کە دەیویست فراوین بخوا هەواڵیان دایە کە یۆرگ یۆردان سەراوبن تەپڵی سەری خۆی لە عەرزی کوتاوە و ویستوویە خۆی بکوژێ. راپۆرتی سەرۆکی بەندیخانە بەم جۆرە بوو: "بەندییەکە بەرێ کرایە نەخۆشخانە. لەوێ دانی بەوەدا ناوە کە بە نیاز بووە خۆی بکوژێ، لەبەر ئەوەی بەرگەی ئەوەی نەگرتووە چوار ئەسپی رەسەنی عەرەبی لە برسان بمرن، ویدەچێ بەندییەکە سەیر هۆگری ئەسپان بێ. تەندروستی باشە و جێی مەترسی نییە."

هەر لەو کاتەدا راپۆرتێکی دیکە لە نەخۆشخانەوە هات کە مەرگی یولاندای رادەگەیاند. داواکار گوتی: "بە پێی یاسا، یۆرگ یۆردان بە تاوانی دارکاری کردن کە دواجار بۆتە هۆی مردنی ژنەکەی، لانی کەم چەند ساڵ بەندیخانەی بۆ دەبڕێتەوە، بەڵام تاوانەکانی تەنیا توندوتیژی بەرامبەر بە ژنەکەی و دواجار کوشتنی و بەلایەوە گرنگتر بوونی ئەسپ لە مرۆڤ نین، تاوانی هەرە گەورەی یۆرک یۆردان دڕندایەتییەکەیەتی. وەک هەر دڕندە و بەربەرێکی تر، لای ئەو بەهای مرۆڤ تا ئاستی هیچ دابەزیوە، بەڵام بۆ ئەو تاوانە، کە هەموو تاوانەکانی دی لەوەوە سەرچاوە دەگرن، لە یاسادا سزایەک لە بەرچاو نەگیراوە."

## (١٢)

سۆزانا دوای بڕینی چەند کیلۆمەتر رێگا، ماندوو و کۆڵەوار، لە ناو قۆرتێکی قەراغ جادەدا دانیشت. ئارەقەی بە ئازای لەشیدا دەهاتە خوار. لە کاتێکدا لەسەر گیاکە رادەکشا، گوتی: "یانی من چیدی دەرنابەم."

گەیشتبوونە نیوەی رێگای نێوان فانتانا و شار. یوهان لێی گەڕا بنوێ. بە هیوا بوو کالیسکەیەک بە وێدا بێ و سواریان بکا، بەڵام جگە لە چەند سوار و چەند پیادەیەک هیچی دیکەی پێدا نەهات.

ئێوارێ، نیزیک کاتژمێر پێنج، باران دایکرد. یوهان لە ئاسمانی روانی. بارانی سارد نێوچاوانی تەڕ کرد. بیری کردەوە: "خۆزگە دوێنێ باران باریبا و نەمتوانیبا بچمە لای سۆزانا. ئەو ئێستا لای دای و بابی خۆی دەبوو و

منیش له ناو پاپۆڕدا. بەڵام کاروباری مرۆڤ هەمیشه بەو شێوەیه نابێ که بیری لێدەکاتەوە. ئەوی خوا بیهێنێ هەر ئەوە دەبێ." باران هەتا شەوێ لێی نەکردەوە. کە تاریک داهات یوهان لێبڕا کارێک بکا: "دەچمەوە گوند عارەبانەیەک پەیدا دەکەم." بە پەرۆشەوە ئاورێکی له سۆزانا دایەوە و رۆیی. سۆزانا دە ژێر بارستایی گەڵایاندا هەڵتروشکابوو. قژ و جله شینەکەی تەڕ ببوون. له سەرمان هەڵدەلەرزی.

"چۆنت پێ باشه وا بکه یانی.

"ئەگەر بزانم تۆ دەگەڕێیەوە له هیچ شتێ ناترسم."

یوهان ماچیکرد و کەوته رێ. سەرتاپای فانتانا نوقمی تاریکی ببوو. گوندییەکان له غوڕابی خەودا بوون و ئەم، ماله و ماڵ دەگەڕا. کەس به هانایەوه نەهات. هەر که دەیانزانی ئەو کچه له سەر جاده کەوتۆتەوە، کچی یوزرگ یۆردانه، هەر کام بیانوویەکی دەهێناوە. کەس جێگای نەبوو. هەموویان له یۆرگ یۆران تۆقیبوون.

شەو راشکابوو که یوهان بەرەو ماڵی قەشه وەرێ کەوت. لەبەر دەرگه ئۆتومبێلێکی رەشی زل وەستابوو که له ژێر نمه نمەی باراندا وەکو ئاوێنەیەک له تاریکاندا بریقەی دەدا.

دیوی کتێبخانەکه روناک بوو و له وێوه دەنگه دەنگ دەهات. لەبەر خۆیەوە گوتی: "مامۆستا میوانی هەیه." خەریک بوو بگەڕێتەوە: "نا، جوان نییه بچم." بەڵام له جێی خۆی نەبزووت. لێزمەی باران به توندی سەربانی دەکوتا. بیری کەوتەوە که ئێستا سوزانا به تاقی تەنێ لەبەر بارانه و چاوەنوارییەتی.

ئەو بیره غیرەتی وەبەر نا تا به ئاسپایی له دەرگه بدا.

## (١٣)

قەشه کۆرۆگا به کوڕەکەی گوت: "چاک بوو هاتییەوە، پێویستیمان پێت بوو." و پاشان به "ترایان"ی گوت کەلوپەلەکانی بێنێته ژووری. ئۆتۆمبێلی کوڕەکەی به شکۆیەکی زۆرەوه لەوێ راگیرابوو. پیاوێکی لاوی دیکەش له ئۆتۆمبێلەکه دابەزی. قەشه به کوڕەکەی گوت: "دیاره بەتەنێ نی."

"ئیزن دەدەی پێتی بناسێنم؟ گیۆرگ دامیان، کۆنە هاوپۆل و برادەرێکی باشی خۆم. ئەورۆ پاشنیوەڕۆ لە شار یەکدیمان بینییەوە. جەنابی داواکاری نوێی شارەکەمانە." قەشە داوای لێبووردنی کرد کە جلوبەرگی بەری شیاوی پێشوازی لە میوانە پایەبەرزەکەی نییە. ئینجا هەر دوو لاوی بۆ دیوەخانێ رێنوێنی کرد و خۆی وەدەرکەوت. داواکار چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا خشاند، بە کاتژمێری دیواری، بە مافووری رۆژهەڵاتی کە بە دیوارەوە بوو و بە رەفی کتێبان کە هەموو ژوورەکەیان داگرتبوو.

ترایان پێکەنی و گوتی: "دەزانم بیر لە چی دەکەیەوە. لەبەر خۆتەوە دەڵێی چۆن دەشێ نوێکارترین نووسەری ئەم وڵاتە کە لە بارەی مەکینە و فڕۆکە و وزە و ئەلەکتریکەوە دەنووسێ، سەردەمی منداڵیی خۆی لەماڵێکدا بەسەر بردبێ کە لانیکەم سەد ساڵ لە دنیای ئێستاکەی لەپاشە. وایە؟" داواکار کەمێک سوور هەڵگەڕا و گوتی: "بەڵێ وایە."

قەشە هاتەوە ژوورێ. بە دەستە نەرمونۆڵەکانی لامپایەکی نەوتی هەڵکرد. ترایان جانتاکەی کردەوە و بە ئەسپایی چەند بەستەی لێ دەرهێنان و لەسەر مێزەکەی دانان. ئینجا شووشە شەرابێکی لە باوڵەکە دەرهێنا. سەری هەڵپچڕی و دوایە گاسی دایکی کرد. لە کن دایکی گلاسەکانی پڕ کردن. پاشان جغجغەی دەوری بەستەکانی لێکردەوە: "ئەوە نوێترین رۆمانمە. دوو دانەم بۆ تۆ و دایکم هێناوە. زۆر باشە، ئێستا با لەو شەرابە بخۆینەوە کە هەمیشە دوای تەواو کردنی رۆمانەکانم لێی دەخۆینیەوە.

وەبیرتان دێ بە چ دڵخۆشی و بە خۆنازینەوە یەکەم رۆمانم لەگەڵ خۆم هێنایەوە؟ "قەشە بە رەسمیاتێکی زۆرەوە کتێبی فرزەندی خۆی بە دەستەوە گرت. هەر بەو دەستەی کە هەمیشە لە پەنا خاچ، کتێبی پیرۆزی پێهەڵدەگرت. ژنەکەشی بە سەری قامکان، زۆر بە ئەسپایی کتێبی خۆی هەڵگرت، لە سەر مێزی ئەوسەری ژوورەکەی دانا و گوتی: "دەستم چەورە، حەز ناکەم کتێبی ترایان پەڵە بگرێ."

"ئەو کتێبەش بۆ تۆ دامیان."

قەشە نێوچاوانی کوڕەکەی ماچکرد و دامیانیش تەوقەی لەگەڵ کرد و سوپاسی کرد. دایکی لاچاوی ماچکرد و بە گوێیدا چرپاند: "هێشتا پێم

نەکراوە حەوتەکەی دی بخوێنمەوە. ترایان، زوێر مەبە لێم. بابت هەمووی بۆ گێڕاومەوە، بەڵام ئەوەیان... ئەوەیان دەمەوێ بە چاوی خۆم بیخوێنمەوە. پێم خۆشە پێش مردنم یەکێ لەو کتێبانەی کوڕەکەم نووسیونی، بخوێنمەوە.
"ترایان خەنی ببوو. گلاسەکانیان لێکدان و پێیاندا کردن. پاشان دایکی داوای لێبوردنی کرد و گوتی: "من دەبێ بچمەوە مدبەق."
"توخوا دەققەیەک دایە، من شتێکم پێیە کە پێم وایە هیچ نەبێ هەقی بەشێکی کتێبەکەمە. "ئینجا ترایان دەستی لە گیرفانی راکرد، زەرفێکی دەرهێنا و دایە باوکی.
"ئەوە هەقی منە لە چاپی یەکەمی ئەم رۆمانە. حەز دەکەم بە یارمەتیی ئێوە لە فانتانا، لە دراوسێیەتی ئێوەدا پارچە زەوییەک بکڕم. دەمەوێ خانووبەرەیەک دروستبکەم و لەگەڵ ئێوە بژیم. دوور لە دنیا."
قەشە ئەوەی لە زەرفەکەدا بوو لە سەر مێزەکە هەڵیڕشت و پێکەنی. ژنەکەی بە بەرهەڵبێنە چاوی وشککردەوە و گوتی: "ترایان، من دەزانم لەبەر دڵی ئێمە ئەو قسانە دەکەی. تۆ قەت سێ رۆژ لە فانتانا هەڵناکەی. هەمیشە بەڵێن دەدەی مانگێک لێرە وەمێنی، بەڵام دوای دوو سێ رۆژ سواری ماشێن دەبی و دەڕۆی و تا چەند مانگان چاومان بە چاوت ناکەوێتەوە."
"لەمەودوا دەمەوێ لێرە بمێنمەوە.
دایکی گوتی:"تەنانەت ئەگەر لە فانتانا خانووش ساز بکەی، لێرە گیر نابی. تۆ تاقەتی ئەوەت نییە لە شوێنێک بمێنیەوە. ئارامی ئازارت دەدا، دەزانم."
ترایان چاوێکی لە باوکی و یەکێ لە داواکار کرد و گوتی: "لەچاولێکردنتانڕا دیارە کەستان بڕوام پێناکەن، بەڵام کەسێکی نەمرێ تا دوو ساڵی دی لە خانووی خۆمدا بانگهێشتان دەکەم. ئەودەم ناچار دەبن بڕوام پێ بکەن. تا ئەودەم وا چاکە باسی نەکەینەوە."
"هاوڕێی بەڕێز، زۆر خەڵکی دنیا حەزیان لە گێچەڵ نییە، سەرەڕای ئەوەش ئەو رووداوانەی تەنانەت بە خەیاڵی خەیاڵکارترین نووسەرانیشدا نایەن بە سەر هەموویان دێ."
داواکار بە گاڵتەجارییەوە گوتی: "بە بڕوای تۆ چی روو دەدات؟"

ترایان وەڵامی دایەوە: "واز لە جەفەنگ بێنە گیۆرگ، من هەستدەکەم لە دەوروبەری ئێمە ڕووداوێکی مەزن دەقەومێ، بەڵام نازانم لە کوێوە دەست پێدەکا و تاکەی دەخایەنێ. ئەو ڕووداوە مەزنە و باشتر وایە بڵێم "شتە ترسناکە" تاک تاکی ئێمە دەکاتە دیلی دەستی خۆی و گۆشت و ئێسقانمان ورد و خاش دەکا. من وەک ئەو مشکانەی پێش نقوم بوونی کەشتی لێی ئاگادار دەبن و رادەکەنە بەستێن، لە ئێستاوە هەست بەو ڕووداوە دەکەم، بەو جیاوازییەوە کە هیچ جێیەک شک نابەم رایبکەمێ. بۆ خەڵکی دنیا لە سەر زەویدا پەناگەیەک نامێنێ."

"ئەگەر زۆرت حەز لێیە ناوێک لەو کارەساتە سامناکە بنێی، دەتوانی نێوی لێ بنێی "شۆڕش"، بەڵام ئەوە شۆڕشێکی ئەوەندە بەربڵاو و ماڵ- وێرانکەرە کە ڕێگای دەرباز بوون لە هەموو مرۆڤێک دەگرێ. قوربانیی ئەو شۆڕشە کۆمەڵی مرۆڤایەتییە."

دیار بوو دامیان وتەی هاوڕێکەی زۆر بە جددی وەرنەگرتبوو، بۆیە پرسی: "ئەو شۆڕشە کەی بەرپا دەبێ؟"

"ئەو شۆڕشە هەر ئێستا دەستی پێکردووە، گیۆرگی ئازیز. ئەو شۆڕشە سامناکە سەرباری تانە و تەشەر و گاڵتەکانی تۆ زنجیری پساندووە. باوکم، دایکم، تۆ، من، هەر هەموومان وردە وردە هەست بە مەترسییەکانی دەکەین و ئینجا لە ڕێگایەک دەگەڕێین هەڵێین. خەڵکی وا هەیە وەک ئەو گیاندارانەی بەر لە تۆفان هەستی پێدەکەن، لە ئێستاوە خەریکی دۆزینەوەی ڕێگایەکن بۆ ڕاکردن. بۆوێنە من دەمەوێ پەنا ببەمە بەر دێ. شوێنەواری ترس لە مەترسییەکی وا، هەر ئێستا وەدەر کەوتوون.

کۆمۆنیست سووچەکە دەخەنە ملی فاشیستان و بانگەشە دەکەن تەنیا بە لەناوبردنی فاشیزم دەکرێ ئەو مەترسییە لە کۆڵ بکرێتەوە و نازییەکان پێیان وایە تەنیا لە ڕێگەی ڕەشەکوژیی جوولەکانەوە دەشێ مرۆڤ ڕزگار بکرێ. ئەو مەترسییە بۆ هەموو لایەکە و بۆ هەمووانیش وەک یەک وایە. تەنیا لەوانەیە دژکردەوەی تاکەکان لە بەرامبەر ئەو مەترسییەدا جیاواز بێ."

"ئەو مەترسییە کە هەڕەشە لە سەرجەم تیرەی مرۆڤ دەکا چییە؟"

"ئەو مەترسییە "کۆیلە تەکنەلۆژییەکان"ن. تەنانەت تۆش، گیۆرگ، بەو مەترسییە دەزانی. کۆیلەی تەکنەلۆژی هەر ئەو شتەیە کە رۆژانە بە هەزار شێوە خەمی ئێمە دەخوا. ئۆتۆمبێلی ئێمە وەگەڕ دەخا، چراکانمان دادەگیرسێنێ، لەشمان دەشێلێ، ئاومان لە دەست دەکا، جادە دەکێشێ، کێو هەڵدەدڕێ و کاتێ گوێ لە رادیۆ دەگرین، بە ئەفسانەی شیرین دەمانخافڵێنێ."

"ئاخ، لە سەرەتاوە دەمزانی ئەو باسە، وێنەیەکە لە وەهم و خەیاڵی شاعیرانە."

"گیۆرگ، دڵنیا بە ئەمە خەیاڵێکی شاعیرانە نییە. مەسەلەی کۆیلەی تەکنەلۆژی راستەقینەترین واقیعە و ئێمە ناتوانین نکۆڵی لە هەبوونی لە دنیای خۆماندا بکەین."

"منیش نامەوێ نکووڵی لێبکەم، بەڵام دەڵێم پێویست ناکا پێی بڵێین کۆیلەی تەکنەلۆژی، لە کاتێکدا لە هێزێکی میکانیکی بەدەر نییە."

"کۆیلەکانی سەردەمی رۆم و یۆنانی کۆن، یان باشتر وایە بڵێم هاوکووفی هەر ئەم کۆیلە تەکنەلۆژییانەش لەو سەردەمدا تەنیا وەکو هێزێکی کوێر و بێئیرادە کەڵکیان لێ وەردەگیرا. وا نەبوو؟ ئایا بە کەلوپەلی بێگیان نەدەژمێردران؟ مرۆڤ دەیتوانی بیانکڕێ و بیانفرۆشێ، بیانکاتە دیاری و بیانکوژێ. بایەخیان تەنیا لە هێزی باسک و ماسوولکەیاندا بوو، واتە هەر ئەو پێودانگەی ئێمە ئێستا لە بارەی کۆیلەی تەکنەلۆژییەوە لەبەر چاوی دەگرین."

"سەرباری ئەوە، جیاوازییەکی زۆر لەو نێوانەدا هەیە، ئێمە ناتوانین کۆیلەی تەکنەلۆژی لە جێی کۆیلە راستەقینەکان دابنێین."

"زۆر چاک دەتوانین. کۆیلەی تەکنەلۆژی سەلماندوویەتی کە گوێڕایەڵترین و لە هەمان کاتدا هەرزانترین جۆری کۆیلەیە. هەرچەندە ئەمڕۆ کەشتیی هەڵم جێگای ئەو کەشتییەی گرتووەتەوە کە سەردەمی زوو بە هێزی سەوڵی کۆیلە و یەخسیران لێدەخوڕان. ئەمرۆکە ئیدی مرۆڤ لە کەشتیدا سوود لە هێزی با وەرناگرێ و لەباتی وی کۆیلەی پیشەسازی بەکار دەهێنێ. ئەمڕۆکە پیاوێکی دەوڵەمەند کە کۆیلەی وای لە خزمەتدان بۆ هەڵکردنی چرا - وەک باپیرانی لە ئەسینا یان رۆم - دوو بەردئەستێ لێک ناخشێنێ، بەڵکو کۆیلەی تەکنەلۆژی

ئەو کارەی بۆ دەکا. ئەو کۆیلە تازەیە مالان گەرمدا دەهێنێ، ئاوی حەمام گەرم دەکا، پەنجەران دەکاتەوە و هەوای تازە بە نێو ئامێری "هەواگۆڕ"دا دەهێنێتە ژووری. ئەو کۆیلە نوێیە لەوەدا بەسەر هاوکووفە مرۆڤەکانییەوە هەیە کە بەرگی خاوێنە و هەروەها نە دەبینێ و نە دەبیستێ. کۆیلەی تەکنەلۆژی تەنیا کاتێ ئامادە دەبێ کە بانگی بکەی.

لە ماوەی چەند چرکەیەکدا نامە یان دەنگی دلداریی مرۆڤ دەگەیێنێتە جێ. ئەو کۆیلانە کاملترین جۆری خزمەتکارن. سەریان لە هەموو کاروباران دەردەچێ، چ سیاسەت، چ کشتوکال، چ شەڕ و چ بەڕێوەبردنی ولات. ئەو کۆیلانە نەخشەی خانوو دەکێشنەوە، تەرازنامە ڕێک دەخەن. نیگار دەنەخشێنن. گۆرانی دەلێن. هەلدەپەڕن. لە سەرەوەی کەش دەفڕن. دەچنە قوولایی ئۆقیانووسان. تەنانەت ئەو کۆیلەیە ئەرکی جەللادێک بە باشترین شێوە ئەنجامدەدا و لە چاو تروووکانێکدا ڕەگی ژیانی حوکمدراو هەلدەبڕێ. ئەو کۆیلەیە یارمەتیی پزیشکان دەدا تا نەخۆش تیمار بکەن و تەنانەت لە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ئایینی لە کلێسەکاندا هاوڕێ و هاوکاری قەشەکانە."

ترایان هەلوەستەیەکی کرد. لە دەرەوە خرمژنی باران دەهات. "دەبێ ددانی پێدا بنێم کە من لە دەوروبەری خۆم ئەم کۆیلە تەکنەلۆژییانە دەبینم کە بەوپەڕی چالاکییەوە سەرقالی کارن. ئەوان هەموو لەحزان ئامادەی خزمەتن. جغارەکەم بۆ دادەگیرسێنن. دوا هەوال و ڕووداوەکانی دنیام پێ دەلێن و ئەوانەش ڕێگاکەم بۆ ڕووناک دەکەنەوە.

ژیانی من شان بە شانی ئەو ئاوالە نەبەدییانە ڕێ دەکا و من وەک چۆن هەلسوکەوت لەگەل مرۆڤ دەکەم، دەبێ ئاوا هەلسوکەوت لەگەل ئەوان بکەم. جاروبار گیرۆدەیان دەبم، وەک بلێی برای مرۆڤ بن و لەو کاتەدا لە دەستم دێ هەموو قوربانییەکیان پێشکەش بکەم. هەر بەو هۆیەیە کە ناتوانم زۆر لە قاتنانا بمێنمەوە. ئێمە ئەمڕۆکە زۆر لەو هاوکووفە کۆنانەمان دەولەمەندترین کە تەنیا خاوەنی دەرزەنێک کۆیلەی گوێڕایەل بوون. ئێمە سەدان و هەزاران کۆیلەمان هەن. ئێستا دەمەوێ بپرسم بەڕای ئێوە لە سەرانسەری دنیادا چەند

کۆیلەی وا خەریکی کارن؟ زیاتر لە چەند سەد ملیار، ئەی ژمارەی مرۆڤی سەر زەوی چەندە؟"

دامیان وەڵامی دایەوە: "دەورووبەری دوو ملیار."

"بەم شێوەیە لە رووی چەندایەتییەوە ئەم کۆیلانە بێ سێ و دوو بەسەر مرۆڤدا زاڵن. ئێستا ئەگەر سەرنج بدەنە ئەو خاڵە کە ئەم کۆیلە تەکنەلۆژییانە، هەستیارترین کاربەدەستانی کومەڵگایان دەورە داوە، ئەو مەترسییەی باسی کرا تێیدەگەن. بە زمانی سەربازی، ئەو کۆیلانە تەواوی بنکە ستراتیژییەکانی کۆمەڵگای ئینسانییان بە دەستەوەن. بۆ نموونە سوپا، پەیوەندییەکان، دابین-کردنی کەلوپەل، پیشەسازی و ئیدی و... ئیدی. ئەم کۆیلە تەکنولۆژییانە بوونەتە گرووپێکی پرۆلیتاریا کە رێبەرایەتییەکەی لە دەست مرۆڤدایە، من چیرۆکی خەیاڵی نانووسم. کەوابوو نامەوێ باسی ئەوە بکەم کە چۆن ئەم ملیارانە رادەپەڕن و مرۆڤەکان دەخەنە بەندیخانە و ئۆردووگاکانەوە یان بە کورسی کارەبایی حەیاتیان لێدەبڕن. نا... ئەم جۆرە شۆڕش کردنە تایبەتی مرۆڤە کۆیلەکانە. لە راستیدا ئەم کۆیلە تەکنەلۆژییانە شۆڕش دەکەن، بەڵام نەک وەکو مرۆڤان کە لە سەردەمە جیا جیاکاندا شۆڕشیان کردووە. ئەو کۆیلانە لە چوارچێوەی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا و بە پێی بنەما یاساییەکانی خۆیان، کە بەوانە لە مرۆڤ جیا دەکرێنەوە، دەردەکەون. من لەو زنجیرە یاسایە ناوی چەند دانەیەکیان دەبەم: ئۆتۆماتیزم، ئۆنیفۆرمیتە و ئانۆنیمیتە.

لە کۆمەڵگایەکدا کە چەندین ملیار کۆیلەی تەکنەلۆژی رووبەڕووی دوو ملیار مرۆڤ دەبنەوە، تەنانەت ئەگەر حکوومەتیش بە دەست ئەو کەمینەیەوە بێ، بتهەوێ و نەتهەوێ خوو و تایبەتمەندیەتی زۆرینە پرۆلیتاریاکە هەڵدەگرێ. لە ئیمپراتوریەتی رۆمدا کۆیلەکان بە زمانی خۆیان دەدوان و خوایەکیان دەپەرست کە وێڕای گشت دابونەریتی خۆیان لە یۆنان و تورکیاوە لەگەڵ خۆیانیان هێنابوو. ئەمڕۆش کۆیلە تەکنەلۆژییەکان تایبەتمەندییەکانی خۆیان پاراستوون و بە پێی داب-ونەریت و سروشتی خۆیان دەژین. ئەم سروشتەیان باشتر وایە بڵێم "ڕیالیزمی تەکنەلۆژی"یە. لە کۆمەڵگای ئەمڕۆکەی ئێمەدا هەبوونی

ئاشکرایه و جێپەنجه و کاریگەرییەکەی تا دێ پتر دەبێ. مرۆڤەکان بۆ ئەوەی بتوانن ئەو کۆیلانە بخەنە خزمەتی خۆیان، ناچارن فێری ڕێ-وشوێن و خووخدەیان بن و لاساییان بکەنەوە، هەر وەک چۆن هەموو ئاغا و خاوەن دەسەڵاتێک ناچارە فێری زمان و خووخدەی کەسانی بەردەستی خۆی بێ بۆ ئەوەی بتوانێ بە باشترین شێوە هەڵیانسوورێنێ. جا ئەگەر ژمارەی ئاغایان لە ژمارەی بەردەستان کەمتر بوو، ئاغاکە چ بۆ خۆ زەحمەت نەدان، چ لە رووی پێداویستییە عەمەلییەکانی کارەکەی، بە پێچەوانەی ڕێسای بێ ئەملاو ئەولای ئاغایەتی و زاڵیەتی، زمان و خووخدەی بەردەستەکانی خۆی وەردەگرێ. لە کۆمەڵگای ئەورۆکەی ئێمەدا دۆزەکە ئاوایە، هەرچەند خۆمان حەز ناکەین پێی لێبنێین. ئێمە زمان و چۆنیەتیی کارکردنی کۆیلەکان واتە فەرمانبەرە تەکنەلۆژییەکانمان فێر دەبین بۆ ئەوەی بتوانین ئەمریان پێ بکەین. بەم جۆرە بێئەوەی هەست پێبکەین واز لە توانا مرۆیی و خووخدەکانی خۆمان دەهێنین. ئێمە بە وەرگرتنی شێوەی ژیانی کۆیلە تەکنەلۆژییەکان لە مرۆڤایەتیێ خۆمان دوور دەبینەوە. یەکەم نیشانەی ئەو دوور کەوتنەوەیە لە مرۆڤایەتی، سووکایەتی کردن بە بایەخی مرۆڤە، بایەخی تاکەکانی مرۆڤ بەو پێودانگە دەپێورێ کە ئایا تا چەند دەتوانن جێی ئامێر بگرنەوە. کەوابوو ئەم کۆمەڵگایە بووە بە قالبێک کە بە پێی پێداویستییە تەکنەلۆژییەکان دروستکراوە نەک بە پێی پێداویستییە مرۆییەکان.

مرۆڤ لەپڕ بۆی دەردەکەوێ کە دەبێ بە گوێرەی یاسا تەکنەلۆژییەکان بژی. یاسایەک کە بە پێچەوانەی بنەما ئینسانییەکانە. هەر کەس ڕێز لە یاسا تەکنەلۆژییەکان نەگرێ کەوا جێگەی یاسای مرۆییان گرتووەتەوە، دەبێ باجەکەی بدا. بەو شێوەیە مرۆڤی زیندوو کە کەمایەتییە، وردە وردە دەبێتە کەمایەتییەکی پرۆلیتاریایی. مرۆڤ خۆی لەناو قەڵەمڕەوی سیستەمێکدا دەبینێتەوە کە نکۆڵی لە بوونە ئینسانییەکەی دەکا و ئەمە هەستی خۆ بەکەم زانیی تێدا دەژیێنێتەوە. جا بۆیە ئارەزووی ئەوەی لا پەیدا دەبێ کە لاسای ئامێر بکاتەوە و تایبەتمەندییە مرۆییەکانی خۆی لە بیر بچنەوە، چونکە بوونی

ئەو تایبەتمەندییانە، کەسەکە لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان شل دەکاتەوە. دوورکەوتنەوە لە مرۆڤایەتی، لە چەندین ڕێگای جیاوازەوە هەستی پێدەکرێ.

وازهێنان لە هەست و سۆز، کەم بوونەوەی هامۆشۆی کۆمەڵایەتی تا کەمترین رادە کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دیاریدەکرێ و وەکو پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ئامێرێکی بەسەر دێ. ئاهەنگ و شێوەی دەربڕینی ئامێر دەبێتە سەرمەشقی ژیانی کۆمەڵایەتی، بێئەوەی سەرنج بدرێتە ئەوە کە ئاخۆ ئەم نموونەیە تایبەتی ئەدەب و نیگار و سەمایە یان حکوومەت. جەماوەر دەبنە تووتیی کۆیلە تەکنەلۆژییەکان. هەر ئێستا ئێمە لە سەرەتای ئەم شانۆیەداین و لەگەڵ یەکەم پەردەی، چیرۆکەکەی منیش دەست پێدەکا. مەبەستم لە چیرۆک هەر هەمان ژیانی باوکم، دایکم، تۆ، خۆم و خەڵکەکەی ترە."

داواکار پرسی: "واتە ئێمە دەبینە مرۆڤی ئامێری؟"

"خۆش ئەوەیە، ئێمە ناتوانین ببینە ئامێر و ئەمە خۆی کارەساتی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوە. ململانێی دوو واقیع ـ تەکنەلۆژی و مرۆڤایەتی ـ هاتۆتە دی. سەرکەوتووانی داهاتوو کۆیلە تەکنەلۆژییەکانن. مرۆڤ وەکو پرۆلیتاریا لەسەر ئاستی کۆمەڵێکدا نوشوستی دێنێ کە بە پێی پێداویستی و سروشتی لایەنی سەردەست دادەمەزرێ. مەبەستم بە پێی پێداویستی و سروشتی کۆیلە تەکنەلۆژییەکان."

دامیان پرسی: "ئینجا چ ڕوودەدا؟"

"منیش زۆر تامەزروم ئەوە بزانم، بەڵام لەو ساتەوەختەدا ترسم بەسەر تامەزرۆییەکەمدا زاڵە. چەندم پێخۆشە بمرم و ئەو تەنگانەیەی من و منەکانی دی تێیدەکەوین بە چاو نەبینم."

"ئایا هیچ ڕووداوێک هەبووە بووبێتە هۆی بەدیهاتنی ئەو بیروڕایەی تۆ؟"

"هەر ڕووداوێکی لەو سەردەمەدا، لە هەر شوێنێکی دنیا ڕوویدا قۆناغێک و نیشانەیەکی ئەو شۆڕشە دەبێ، شۆڕشێک کە بە دەستی کۆیلە تەکنەلۆژییەکان بەرپا دەکرێ. ڕاپەڕینی ئەوان، بە لەبەر چاو گرتنی تایبەتمەندییەکانی ئینسان، تەنگ بە ژیانی هەموو کەس هەڵدەچنێ. ئەو ڕاپەڕینە لە ئان و ساتێکدا ڕوودەدا. گرتن و حوکم و ئیعدام، گشتی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەڕێوە دەچن. مافی

ـێـ نە یەک یەکی تاکەکان زەوت دەکرێ. وەکو پاژی ئامێرێک لەگەڵ مرۆڤ
ـعفتـر دەکرێ. ئەو بڕوایە کە هەموو کەس مافی ژیانێکی سەربەخۆی هەیە، لە
لایەن هەموانەوە گاڵتەی پێدەکرێ. ئایا تا ئێستا لە ئامێرێکدا برغوویەکی
سەربەخۆ و خاوەن ئیرادەتان دیوە؟ بەڵێ ئەو شۆرشە سەرانسەری زەوی
ـگرێتەوە و مرۆڤ نە لە نێو لێڕەوارانداحەشارگەیەک شک دەبا و نە لە
ـوژگە دوورەدەستەکان. لە هیچ کوێ. شۆڕشێکی تا بڵێی خوێناوی دەبێ. هیچ
ـەتەوەیەکی جیهان پشتگیریمان ناکا. چی چەکوچۆڵی دنیا هەیە دەکەوێتە
ـەست ئەو بەکرێگیراوانەی کە بۆ پێکهێنانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی
ـەمیربوو تێدەکۆشن. ئەو کۆمەڵگایە ئیدی جێگای مرۆڤی تێدا نابێتەوە. جاران
سەربازەکان یان بۆ داگیرکردنی وڵاتان یان لە پێناو هەستی نەتەوەییدا و بە
پەیرەوی لە ئامانجی قەیسەر و پادشایان، شیریان دەوەشاند. ئامانجی ئەو
شەڕانە بەرفراوان کردنی خاکی وڵات یان دەست بەسەردا گرتنی سامانی خەڵک
بووە و گشتیان هانەی مرۆییان هەبووە، بەڵام لەوەی‌وێوە سوپاکان بۆ
بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی دەجەنگن. من پێم وایە ئێمە پێمان ناوەتە تاریکترین
سەردەمی مێژوو. جاران هەرگیز مرۆڤ ئەوەندەی ئێستا سووکایەتیی پێ-
نەدەکرا. بە لای بەربەرەکانەوە نرخی مرۆڤێک لە نرخی ئەسپێک کەمتر بووە.
ئەو جۆرە نرخاندنە ئێستاش لای زۆر هۆز و تەنانەت لای زۆر تاکی مرۆڤ
وەک خۆی ماوەتەوە. تۆ بۆخۆت سەربهۆردی پیاوێکت بۆ گێڕامەوە کاتێ
ژنەکەی خۆی کوشت هیچ خەم داینەگرت، بەڵام هەر ئەو کەسە لە داخی ئەوەی
نەکا ئەسپەکانیان ئاو نەدابن خۆی کوشت. ئەوە نموونەی بێ‌نرخ بوونی مرۆڤە
لای مرۆڤە بەراییەکان. قوربانی کردنی بەشەر لەم سەردەمەدا بە شێوەیەکی ترە
و کەسیش باسی ناکا. بەو جۆرە ئێمە گیرۆدەی توندوتیژترین دڕندایەتیی
بەردنجامی تەکنەلۆژیاین و ئەو دڕندایەتییە بە سەرکەوتنی یەکجارەکیی کۆیلە
تەکنەلۆژییەکان دەگاتە ئەوپەڕی خۆی."

"ئەو شۆڕشەی تۆ پێش‌بینیی دەکەی کەی دەست پێدەکا؟"

"هەر ئێستا دەستی پێکردووە و ئێمە لە پەرەگرتنیدا بەشدارین. زۆربەمان ناتوانین تا کۆتاییەکەی گیانی خۆمان بپارێزین. دەترسم لەو هەرایەدا منیش سەرم تێدا بچێ و کتێبەکەم بە نیوەچڵی بمێنێتەوە."
دامیان پێی وابوو کە "ئەو بیرورایە زۆر رەشبینانەیە."
"گیۆرگ گیان، من شاعیرم و هەستێکم هەیە کە هەمیشە لە داهاتوو ئاگادارم دەکاتەوە. شاعیران پەیامبەرن. گەلێک ناخۆشە مرۆڤ پێش روودانی کارەساتێکی دڵتەزێن لێی ئاگادار بێ."
"کەوابوو بەڕاستی ئەوی دەیڵێی بڕوات پێیەتی؟"
"بەداخەوە بڕوایەکی تۆخ."
"من پێم وابوو ئەو قسانە هەر شیعرن."
"شیعری چی و شتی چی. من هەموو شەوێ چاوەنۆڕی ئەوەم شتێکم بەسەر بێ."
"چیت بەسەر بێ؟"
"زۆر شت. لەو ساتەوە کە مرۆڤ تا ئاستی نرخاندنی مرۆڤ بە پێودانگی کۆمەڵایەتی و پیشەسازی دابەزیوە، شیمانەی روودانی هەر چەشنە رووداوێکی ناخۆش هەیە. دەشێ بەند بکرێم یان بخرێمە بێگار و کاری زۆرەملی یان لە هەموو کار و چالاکییەک بێبەش بکرێم. بۆوێنە بۆ پلانێکی پێنج ساڵە، لە پێناوی چاکسازیی نەژادی یان شتی دیکە کە لەبەر دەستی سیستەمی کۆمەڵی تەکنەلۆژیدایە. دنیای تەکنەلۆژی لەسەر پێودانگی "بە کەڵک بوون" کار دەکا و تەنیا ئامانجێکی ئەبستراکتی هەیە: بەرهەم."
"بە رای تۆ ئەگەری ئەوە هەیە ئێمەش بەند بکرێین؟"
قسەکردنی داواکار شێوەی گاڵتەجارانەی پێوە نەمابوو.
"دڵنیا بە هیچ تاکێک لەو دنیا بەرینەدا ناتوانێ دڵ بە متمانە و ئازادی خۆش بکا."
"کەوابوو هەموومان بێ ئەوەی تاوانێکمان ئەنجامدابێ لە بەندیخانەدا دەڕزین؟" "واش نا. مرۆڤ تا ماوەیەک لە ناو چرنووکی سیستەمی تەکنەلۆژیدا پەلەقاژە دەکا، بەبێ ئەوەی بمرێ. کۆمەڵگای تەکنەلۆژی لە

دابینکردنی ئامرازی حەسانەوەشدا شتی لە دەست دێ. ئەم کۆمەڵگایە تەنیا دابینکردنی حەسانەوەی ڕۆحیی لە دەست نایە. بە بێ ڕۆحیش هیچ بلیمەتییەک لە گۆڕێدا نییە. کۆمەڵگایەک کە لە رووی بلیمەتییەوە تووشی کەموکورتی بێ مەحکوومە بە سەرگەردانی. سیستەمی تەکنەلۆژی کە ئێستا جێگای دنیابینیی ڕۆژئاوای گرتۆتەوە، بەسەر هەموو دنیادا زاڵدەبێ و ئینجا لەناوی دەبا. ئەلبێرت ئەنیشتاین گۆتەنی: "تێپەڕینی دوو نەسل لە تەمەنی میللەتێک کە لە زانستی فیزیادا گەلێک بەهرەدارە، لە ناوچوونی هەموو ئەو شتەی بە دواوەیە کە ئەو زانستە دەستی خستوون."

دوای رووخان و لەناو چوونی سیستەمی کۆمەڵایەتیی تەکنەلۆژی، بەها مرۆیی و ڕۆحییەکان سەرلەنوێ سەر هەڵدەدەنەوە. بەشی زۆری رووناکیی ئەم ڕێگە تازەیە، ئەگەری زۆرە، لە ڕۆژهەڵاتی دنیاوە سەرهەڵبدا. لە ئاسیا، بەڵام نەک لە رووسیا. رووس خۆیان لە رووناکیی کارەبای ڕۆژئاوا موتوربە کردووە و بێگومان لە کەفارەتی گوناهەکانی ڕۆژئاوادا هەر بەویش تێدا دەچن. مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی لە جێگەی کومەڵگەی تەکنەلۆژی دەردەکەوێ و تیشکی کارەبا بۆ رووناک کردنەوەی ماڵ و جادان بەکار دێنێ. ئەو هەرگیز وەک نوێنەرانی دنیابینیی تەکنولۆژیی ڕۆژئاوا، بتپەرستانە بۆ کارەبا سەر وە سوژدە ناکا. هەرگیز ناکرێ ڕێگای ژیانی مرۆڤ و ڕۆحی وی، بە کارەبا رووناک بکەیەوە، بەڵکو ئەمە، تەنیا لە دەستی رووناکایی ئەبەدیی ڕۆحان دێ. مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ئامێرەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا بە یارمەتیی ڕۆحی خۆی دە کار دەکا، هەروەک چۆن مایسترۆیەک بە یارمەتیی بلیمەتیی هونەریی خۆی ڕێبەرایەتی ئۆرکێسترایەک دەکا، بەڵام بابە ئێمە ئەو سەردەمە نابینین. لە سەردەمێکدا دەژین کە مرۆڤ وەک بتپەرستان کارەبا دەپەرستێ."

"بە کورتی، مردن لە زنجیردا؟" "بەهەرحاڵ مردنی ئێمە لە زنجیری دڕندانداقسەی لێناکرێ و کتێبەکەی من لە ستایشی ئەو مەرگەدا دەبێ."

"کاتژمێر بیست و پێنج. ئەوە کاتژمێرێکە کە لەودا هەموو تەقەللایەک بۆ رزگاری بێهوودەیە. تەنانەت ئەگەر فریادڕەسێکیش لە ئاسمانەوە بێ درەنگ

هـاتووه. ئـەوه دوا کـاتژمێر نییـە. بـەڵکو کاتژمێرێـک دوای دوایـین کـاتژمێره.
زەمانی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا ئا ئەم ساتەوەختەیە، ڕاست ئەم کاتژمێرە."

## (١٥)

قەشە سەری لەناو هەر دوو لەپی دەستی گرتبوو و مات ببوو. دامیان لێی پرسـی: "مامۆسـتا، ئـەگـەر پێشبینییـەکانی ترایان وەڕاست بگـەڕێن و مـرۆڤ ناچار بێ بۆ کۆیلەتی یان مـەرگ مل بدا، کڵێسە چۆن دەتوانێ فریای مرۆڤ بکەوێ؟ ئایا کڵێسە دەتوانێ ئەرکی دەربازکردنی مرۆڤ بخاتە سـەر شـانی یان نا؟ ئەگەر لەو حاڵەدا بە هانای مرۆڤەوە نەیە ئەدی ئەرکی ئەو لە دنیادا چییە؟"

قەشە کەمێک داما و پاشـان لـە وەڵامدا گوتی: "کڵێسە نـاتوانێ سیستەمـی کۆمـەڵایـەتیی ڕزگـار بکـا، بـەڵکو تـەنیا دەتوانێ پاکی و ڕاستیی مرۆڤان کە کۆمەڵگایان لێ پێکدێ، بپارێزێ."

"مامۆستا پێت وایە ئەوەی ترایان پێشبینی دەکا وەڕاست بگەڕێت؟"

"من هەمیشە بڕوام بە وتەی شاعیران هەیە و ترایانیش بە شـاعیرێکی گـەورە دەزانم."

ترایان بە پێداهەڵدانی باوکی توزێک سوور هەڵگەڕا: "سوپاس بابە." پاشـان چاوێکی لە لای دەرگا کرد و گوتی پێم وایە کەسێک لە هەیوانە. قەشـە گوتی: "ئەگەر کەسێک هاتبا حـەوشـە بێگومـان سـەگـەکان هـەڵدڕ هـەڵدڕیان دەکرد. سـەگەکان تەنیا بە یوهان مووریتسی کاردارم ناوەڕن، ئەویش ئێستا لـەسـەر عەرشەی پاپۆڕ خەوتووە."

"بەڵام من دڵنیام لە بیلایە گوێم لە خشپەی پێی کەسێک بوو."

دامیان بە پێکەنینەوە گوتی: "لەوانەیە یەک لە کۆیلە تەکنەلۆژییەکان بێ کە لـە ئۆتۆمبێلـەکـەی تـۆ ڕایکردبێ. سـەرنج بـدە، لـەوانـەیـە شۆڕشـەکـە دەسـتی پێکردبـێ و ئـەوان هـاتبن بمـانگرن، هـەر بـە ڕاسـت، لـەوە گـەڕێ، ئـەو کۆیلـە تەکنەلۆژییانەی لە ئۆتۆمبێلەکەی تۆدا خەریکی کارن، ژمارەیان چەندە؟"

"خۆت لێکی بدەوە. ئۆتۆمبێلەکەم توانای پەنجا و پێنج ئەسپی هەڵمی هەیە و هێزی هەر ئەسپێک بە قەد هی حەوت کەسە."

"کەوابوو ئەوان ژمارەیان یەکجار زۆرە و ئێمە هەر سێ کەسین. ئەگەر هێرشەکە بکرێ ئێمە بێ تەقە دەگیرێین."

"بەبێ یارمەتیی مرۆڤ، ئەو کۆیلانە ناتوانن هێرش بکەن. کاتێک مرۆڤێک "غوڵام"ێک ـ لەبەر ئەوەی لەڕاستیدا ناوی مرۆڤی لێ خەسارە ـ هاوکارییان بکا ئەو کۆیلانە دەبنە بکوژترین دڕندە."

"مەبەستت لە غوڵام چییە؟"

"ئەو غوڵامەی باسی دەکەم مرۆڤێکە کە وەک پیستۆنی ئۆتۆمبێل بێ ڕاوەستان و بەردەوام خەریکی دووپات کردنەوەی چوونیەکی خۆیەتی. تەنیا جیاوازییەکی لەگەڵ پیستۆندا ئەوەیە، خولیای ئەوەیە کارەکەی وی ببێتە نموونەیەک بۆ خەڵکی دنیا و کارێکی وا بکا هەموو کەس چاو لەو بکەن. ئەم غوڵامە دڕندەترین ئاژەڵێکە کە لە تێکەڵ بوونی ئامێر و مرۆڤ دروستبووە. ئەو بوونەوەرە، دڕندەیی مرۆڤ و قورسی و قایمیی ئامێری لێکداون. تەواوترین نموونەی غوڵامێکی وا لە لایەن رووسەکانەوە داهێنراوە: کۆمیسێر."

به ئاستەم لە پەنجەرە درا.

"من گوتم خشپەی پێ دێ، هەستی شاعیرانە قەت بە هەڵە ناچێ."

## (١٦)

ئەلیکساندر کۆرۆگا دەرگەی کردەوە و چووە بەر هەیوان. هەوایەکی سارد خۆی بە ژووریدا کرد. کەمێ دواتر لەگەڵ لاوێک گەڕایەوە ژووری. لاوەکە تەنیا کراس و پانتۆڵێکی لەبەردابوو و هەموو گیانی تەڕ ببوو. قەشە گوتی: "ئەوەش یوهان مۆریتس." پاشان گلاسی شەرابی بۆ ڕاگرت و پێی گوت دانیشە. لاوەکە سوپاسی کرد و دانەنیشت، هەروا لەوێ لای دەرگا ڕاوەستا، پێدەچوو لەوە بترسێ فەرشەکە پیس بکا یان کورسییەکە تەڕ بێ.

ئاو لە سەر و کاکۆڵی دەچۆڕایەوە. دیار بوو لەمێژە لەبەر بارانە. قەشە لێی پرسی: "هیچ ڕووی داوە؟ پێم وایە دەتەوێ سرتەیەک لەگەڵ من بکەی."
"لە لای هەمووانیش دەتوانم بیڵێم."
"زۆرم پێ ناخۆش بوو بەیانی نەهاتبووی هەگبە خواردنەکە لەگەڵ خۆت ببەی."
"ئەمن تازە ناچمە ئەمریکا." یوهان ئەمەی گوت و چاوێکی لە دوو پیاوە گەنجەکە کرد. پاشان لە چاوی قەشەوە ڕاما و گوتی: "ئێوە دوێنێ ژوورەکەی تەنیشت مدبەقتان دامێ، وایە؟"
"بەڵێ پێم داوی و هەر کاتێ پێت خۆش بێ دەتوانی ئاوەدانی بکەیەوە."
"دەکرێ کەسێکی دیکەش لەگەڵ خۆم بێنم؟"
"بۆ نا؟"
قەشە سەری سوڕ مابوو. هەستیکرد یوهان شتێکی گەورەی لێ قەوماوە.
"ئەگەر تۆ داڵدەی کەسێک بدەی کە لێی قەومابێ، کارێکی زۆر بەجێیە." "بەڵێ لێی قەوماوە. سۆزانای کچی یۆرگ یۆردان، لە ترسی باوکی لە ماڵەوە ڕایکردووە."
"ئەگەر ژوورەکە سارد بوو سۆبەی تێدا هەڵبکە. خۆشت ئێزنگ پێدەزانی."
یوهان لە جێگای خۆی نەبزووت. دەیویست پێش ئەوەی بڕوا، هەموو شتێک لای قەشە بدرکێنێ. هەر کە قسەکەی گەیشتە ئەو جێگایە کە کچۆڵەکە ئێستا لە سەر جادەی شار و لەبەر باران چاوەڕانیەتی ترایان خێرا پاڵتۆکەی لەبەر کرد و لەگەڵ یوهان بە ئۆتۆمبیل وەڕێکەوتن. دوای نیو کاتژمێر گەڕانەوە. ئۆتۆمبێلەکە لە جێگای خۆی ڕاوەستایەوە و یوهان سۆزانای هێنایە خوارێ. داواکار لە ڕاڕەوەکەوە چاوی لێبوو کە یوهان بە یارمەتیی قەشە و ژنەکەی سۆزانایان هێنایە ژوورێ کە وەک منداڵ خەوی لێکەوتبوو.
ترایان بیریکردەوە کە لە هێنانەوەی کچەدا جگە لەوەی لەگەڵ یوهان چووبوو کارێکی ئەوتۆی نەکردووە. لە بەر خۆیەوە گوتی: "بەهەرحاڵ هاوبەشی کردنی خەمی خەڵک، ئەگەر لە کردەوەدا هیچ سوودێکیشی نەبێ، هەر پێویستە."

قەشە هاتەوە ژووری. تەڕ تەڕ ببوو و ئاوی لە سەروسەکوتی دەچۆڕایەوە. وەک کوڕی خۆی بێ، ئاوا لەبەر باران بە هانای یوهانەوە چووبوو، ئەگەرچی چوونەکەی هیچ پێویستیش نەبوو. ترایان بیری کردەوە: "خواش کاری بێسوودی زۆر کردووە. بۆ نموونە ڕۆنانی دنیا، خوڵقاندنی بوونەوەری وا کە هیچ قازانجێکیان نییە وەکو مرۆڤ، بەڵام ئەو هەوڵ و تەقەللایەی مرۆڤ، سەرەڕای بێئاکام بوونی، شتێکی بەکەڵکە."

قەشە پێی گوت: " دەترسم نەخۆش بکەوی."

"پێم وا نییە. بەڕاست، نەخۆشەکەمان وەزعی چۆنە؟"

"تای لێیە. دایکت چا و دەرمانی داونێ. خوا ئەجری چاکەت دەداتەوە کە ئەو کچۆڵەت بە ئۆتۆمبێلی خۆت هێنایەوە. خەڵکی هەژار پێویستیان پێمانە."

زەنگوڵەی کاتژمێر، نیوەشەوی ڕاگەیاند.

## (١٧)

یوهان مۆریتس بە ئاستەم لە دەرگای دا. بێ سوپاس کردنی قەشە و کوڕەکەی نەیدەتوانی بچێ بنوێ. هەستی ئەمەگداریێ هەموو ئەو ناهامەتی و ڕووداوە تاڵ و تفتانەی شەو و ڕۆژی ڕابردووی لەبیر بردبوونەوە.

یوهان بەختەوەر بوو کە دەیتوانی سۆزانا بگرێتە بن باڵی خۆی. ترایان چاوی لە یوهان بڕیبوو. قسەی بە یوهان بڕی و گوتی: "بابە گیان ئەمجارە بێمەوە فانتانا لە لای ئێوە شوێنێک بۆ مانەوەم دابیندەکەم. ئەو پارەیەی لای تۆیە بیدە بەو کوڕە. ئەو لە من زیاتر پێویستی بەوەیە لە فانتانا چاوە خانووەیەکی هەبێ. قەشە بە بزە و ڕووی خۆشەوە، بێئەوەی هیچ بڵێ، زەرفی دراوەکەی دایە یوهان.

یوهان زەرفەکەی کردەوە. بڕوای نەدەکرد ئەوەی دەیبینێ ڕاست بێ. ئەو هەموو پارەیە چاوی پێ زەق کردبوو. زۆری هەوڵدا شتێک بڵێ، بەڵام دیار بوو لە دڵیدا جێگای هیچ قسان نەمابووەوە. قەشە گوتی: "سوپاسی ترایان بکە و بڕۆ پارەکەش وە سۆزانا بدە. ژن چاکتری تاقەت دەکەن."

داواکار گوتی: "ئێستا کە یوهان بۆتە خاوەن موڵک لەوانەیە حەز بکا گلاسێک پێدا کا."

لەو نێوەدا قەشەژن هاتە ژووری. چاوی یوهان وەک نیشانەی پرسیار لەو راما. قەشەژن گوتی: کچەکە باشترە. پاشان قەشەی تاقیکردەوە و شتێکی بە گوێیدا چپاند. مامۆستا بۆ ساتێک نێوچاوانی تێکنا و پاشان بزەیەکی هاتێ. یوهان بە نیگەرانییەوە چاوی لە هەموو جووڵە و ئاکارێکی بڕیبوو.

"قەیدی چییە، خێزانم گوتی وا دیارە دەبی بە باوک، کەوابوو دەبێ تا زووە زەماوەند بکەن."

یوهان تەوقەی لەگەڵ ترایان و داواکار کرد و رۆیی. هێشتا باران دەباری. یوهان پێش ئەوەی بگاتە حەوشە زەرفی پارەکەی لە بن کراسەکەی راکرد. نەدەبوو پارەکەی تەر بێ. لە ژێر باسکیدا زەرفەکەی بە خۆیەوە گوشی. ئێستا بە ئاشکرایی خانووبەرە و تەیمان و چاڵاوی خۆی دەهاتنە بەرچاو، هەر وەک هەمیشە ئاواتی بۆ هەڵخواستبوو. سۆزانا خەوتبوو. بە ئەسپایی پووڵەکەی خستە ژێر سەری سۆزانا و بۆخۆشی لەسەر گیاکە راکشا. ئەو کاتەی یوهان بە پێش کتێبخانەدا تێدەپەڕی قەشە بە کوڕەکەی گوت: "نەدەبوو لە کاتێکی وادا باسی زەماوەند بهێنمە گۆڕێ. دایکی کچە لە ماڵی مردووانە و باوکیشی بە دەستی خوێناوییەوە لە بەندیخانەیە. نا کاتی نەبوو."

"بەڵام ئەوان ئاگایان لەو رووداوە نییە. ئەوان پلان بۆ داهاتووی خۆیان دادەڕێژن و دڵیان بە خۆشەویستیی یەکتری و بەو پارەیە خۆشە کە لەناکاو بە سەریدا کەوتوون."

"بەڵێ ئەوان بەختەوەرن، بەڵام مخابن زۆر زوو کۆستیان دەکەوێ."

داواکار گوتی: "راستە، بەڵام بە لای ئێمەوە کە ئاگامان لە هەموو رووداوەکانە، دڵخۆشیی ئەوان نابەجێ دێتە بەر چاو."

"هەموو کەیف و خۆشییەکی مرۆڤ بە بەراورد لەگەڵ هەقیقەت گەلێک نابەجێیە."

کاتژمێری سەر دیوار سەعاتێک دوای نیوەشەوی راگەیاند. هەر سێک پیاو گوێیان لە لێدانی کاتژمێرەکە گرت.

# (١٨)

دوو ساڵ دوای ئەو ڕووداوە یۆرگ یۆردانیان بەردا. ئەو دەگەڕایەوە وڵاتێک کە بیست و حەوت ساڵ پێش لەوێوە هاتبووە بۆ فانتانا. دەیوست خانووەکەی بفرۆشێ. سەرۆکی پاژگا لە کاتی سووڕانەوەدا دیتی پەنجەرەی "خانووە سوورەکە" کە دووساڵ بوو داخرابوون کراونەتەوە. بۆ سەر و سۆراغ گرتن خۆی پێدا کرد. یۆرگ یوردان لە پشتەوەی خانووەکە خەریکی بەستنەوەی ئەسپان بوو. ژەندرمەکە گوتی: "دیارە پووڵت زۆرە، یۆرگ یۆردان، حەتمەن زۆرت پارە چووە بۆئەوەی بتوانی ئاوا زوو بەر بی؟"

یۆرگ یۆردان سەری ڕاوەشاند و گوتی: "تێناگەم."

"پرسیم زۆرت پارە داوە کە زووتر لە زیندان بەرت بدەن؟ ئاخر تۆ دە ساڵت بۆ بڕابووەوە."

یۆرگ یۆردان چەکوچێکی بە دەستەوە بوو بەری دایەوە، کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا و بردیە بەر چاوی کابرای ژەندرمە و ئینجا ملی لەبەر کاری خۆی نایەوە. لە کاتێکدا بە چەکوچ سندووقی دەکوتا گوتی: "تەنیا بۆ ئەوەی بزانی لەگەڵ کێ ڕووبەڕووی، تا چەند ڕۆژی تر بەرگی دەرەجەدارێکی "ئێس.ئێس" دەکەمە بەر. من ئەڵمانیم و ئێستاش بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی خۆم دەڕۆم. ئێستا تێگەیشتی بۆچی زووتر بەریان داوم؟"

سەرۆکی پاژگا ئەمریە سەربازییەکەی یۆرگ یۆردانی خوێندەوە. دەشیزانی ئەو بە ڕەگەز ئەڵمانییانەی لە زیندان بوون، بە مەرجی سپاردنی بەڵێننامەی خزمەت کردن لە سوپادا، ئازاد دەکرێن. نامەکەی وەک خۆی نوشتاندەوە و پێی دایەوە.

یۆرگ گوتی: "ئەوەش بخوێنەوە." کاغەزێکی دیکەی لە گیرفانی دەرهێنا. نامەیەکی پێزانین، باڵیۆزی ڕایشی سێهەم لە بوخارست نامەیەکی بۆ یۆرگ ناردبووە زیندان و پێزانینی خۆی پێڕاگەیاندبوو. ژەندرمە نامەکەی کردەوە. ئەڵمانیی نەدەزانی، بەڵام نیشانەی خاچی شکاو و ئەو هەڵۆیەی لە سەرەوەی نامەکە بوو سەرنجی ڕاکێشا.

"خانووەکەت دەفرۆشی یان رایدەگری؟"

یۆرگ بێئەوەی گوێ بداتە پرسیاری ژەندرمەکە گوتی: "ئەو تانگەی بە پووڵی من کڕاوە، ئێستا گەیشتووەتە مەیدانی شەڕ. منیش بە زوویی خۆمی دەگەیەنمێ. هەر چەند ئیدی لاو نیم، بەڵام سوپای رایشی سێهەم چۆنی هەم ئاوام وەردەگرێ."

پاشان نامەکەی لە گیرفانی نایەوە و دەستی کردەوە بە چەکوچ لێدان و داخستنی سندووقەوە و ئیدی هەمێتی وە ژەندرمەکە نەدا. لە وەڵامی ماڵاواییەکەشیدا بێئەوەی سەر هەڵبڕێ بە کورتە وەڵامێک بە زمانی خۆی براندیەوە.

## (١٩)

سەرۆکی پازگا لە ماڵی یۆرگ یۆردانەوە راستەوخۆ بەرەو مەیخانە بۆوە. مانگی جۆزەردان بوو. بە فیزێکی زورەوە و لە کاتێکدا ئەوپەڕی هەوڵیدەدا پۆستاڵەکانی تۆز نەگرن، بە شەقامدا دەرۆیی. پۆستاڵەکانی کە هەمیشە وەک ئاوێنە بریقەیان دەدا، گەورەترین مایەی دڵخۆشی و سەرقاڵیی ئەو بوون. جگە لەوە زۆری حەز لە ژن و شەراب بوو. بێئەوەی پارە بدا مەشرووبی لە جوولەکەی خاوەن مەیخانە دەستاند. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەگەر هەموو رۆژێ یاسا و رێسای نوێ دانەنرابان ژەندرمەکان زۆر سووک و چرووک دەبوون." بە خۆشییەوە حکوومەت هەموو رۆژێ خەریکی دانانی یاسا و رێسای تازە بوو. مانگی رێبەندان ئەمریان پێ گەیشتبوو کە هەموو جوولەکەکان بۆ ئۆردووگا زۆرەملێیەکان رابدرێن. لە فانتانا تاقە جوولەکەیەکی لێبوو، ئەویش گۆڵدنبێرگی خاوەن مەیخانە بوو. سەرۆک پازگا ئەمری سەرووی خۆی پێ نیشاندابوو. ئەمرەکە زۆر نهێنی بوو و سەرۆکی پازگا لەوە پەشیمان بووەوە کە نیشانی کابرای جوولەکەی داوە، بەڵام دواتر گەیشتە ئەو قەناعەتە کە کارێکی چاکی کردووە. لەمەودوا سێ مانگ جارێک 'پشتگیرییەکی پزیشکی بۆ دەنارده ناوەند کە بە گوێرەی وی لەبەر نەخۆشیی کاریگەری دڵ لە بێگار قوتار دەبوو. لە بەرامبەر ئەو چاکەیەدا مانگانە سێ

هـەزار "لای" لـە گۆڵـدنبێرگ وەردەگـرت. بـەو جـۆرە داهـاتی دووقـات ببـوو و ژیـانێکی خـۆش و ئاسـوودەی بۆخـۆی پێکهێنـابوو. جگـە لـەوە کـەیفی بـەوەش دەهات کە کارێکی خێری ئەنجامداوە. پیرە جوولەکەش لەباتی ئەوەی بە کاری سەختی ئۆردووگا بپسێ لە گوند مابووەوە و خەریکی کاری خۆی بوو.

دوای خواردنـەوە بـەشـی دیکـەی بـەرنامـەکـە دەسـتی پێکـرد. سـەرۆکـی پازگـا پـەردەی نێـوان مـەیخانـە و مـاڵی گۆڵـدنبێرگی لادا. پێویـسـتی بـەوە بـوو چـاوی بـە رۆزا"ی کچەکەی گۆڵدنبێرگ بکەوێ و سڵاوێکی لێبکا. ئەوە کاری هەمیشەی بوو.

ڕۆزا کچێکـی سـپیوسـۆڵ و نـەرمونـۆڵ بـوو. پیـاو کـە لـە بـاوەشـی دەگـرت دەتگـوت مەخمەر ڕێکدەگوشێ. ڕەنگـی لـەشـی لـەگـەڵ ژنـە لادێییـەکـانی فانتانـا جیاواز بوو. ئەو ڕۆژە لاوێک لە تەنیشت ڕۆزا دانیشتبوو و پێکەوە سـەرقـاڵی ئاخاوتن بوون. ژەندرمە بە ئەمر کردنێکەوە پرسی: "ئەمە کێیە؟"

گۆڵدنبێرگی پیر سـەرەتا خۆی لە وەڵامدانـەوەی ڕاشـکاوانە دزییـەوە، بـەڵام دواجار گوتی: "مارکۆ- ی کوڕمە، تا ئێستا لە پاریس بوو.

"بینێرە لای من. سـەرۆکـی پازگا تا ئەو کاتە دەرفەتی ئاشنابوون لەگەڵ کەسـی وای بۆ هەڵنەکەوتبوو کە دانیشتووی پاریس بووبێ. مـارکۆی زۆر خوێنتـاڵ دەهـاتـە بـەر چـاو. مـرۆڤ نـاچـار بـوو دانـە دانـە وشـەی لـە زاری دەربکێشێ. کابرای ژەندرمە زانی هەڵەی کردووە. ئـەو بـە جـۆرێکـی دیکـە گـەنجـانی پـاریس‌نـشینی هێنـابووە بـەر چـاوی خـۆی، بـەڵام ئـەو لاوەی بەرامبەری زۆر گرژ و مۆن و خوێن‌تاڵ دەهاتـە بـەر چـاو. تـەنانـەت ئـەو گڵاسـە مـەشـرووبـەشـی وەرنـەگـرت کـە بـۆی ڕاداشـت. لاوێکـی ناجـسن و قۆڕدەمـاخ بـوو. سـەرەڕای ئـەوە ژەندرمـە کـاتی مـاڵاوایی گـوتی: "سـەری شەو وەرە پازگا یاریی وەرەق بکەین.

**(٢٠)**

ژەندرمەکە بەرامبەر ماڵی یوهان مۆریتس راوەستا، سۆزانا لە حەوشە خەریک بوو قوڕی دەشێلا تا خشتان ببڕێ. دوو ساڵ بوو یوهان ئەو خانووەی ساز کردبوو. خانوویەکی گەورە و خۆش بوو و بانێژەیەکی بچووکیشی هەبوو. شەو و ڕۆژ بە خۆی و ژنەکەی کاریان تێدا کردبوو. ژەندرمە لە پشت پەرژینێ‌ڕا کە حەوشەیان پێ دروستکردبوو، بە دەنگی بەرز گوتی: "خشت بۆ چی، خۆ خانووەکە تەواو بووە." سۆزانا وەڵامی دایەوە: "دەمانەوێ تەویلەیەک دروستبکەین." ئینجا توندوتۆڵ خەریکی کاری خۆی بووەوە. بەلەکی لە نێو قوڕدا بریقەیەکی تایبەتیان دەدا. سەرۆکی پازگا چەندی حەز لێبوو دەرگای حەوشە ئاوەڵا با و خۆی بە ژووڕێدا کردبا.

"مێردەکەت لە ماڵێ نییە؟"

"یانی چۆتە ئاش؟"

لەو سەری حەساری دوو منداڵەکەی سۆزانا لە بەر خۆرەتاو ڕاکشابوون. یەک لەناو لانک و ئەوی دی لەسەر زەوی. جاروبار سۆزانا سەیرێکی دەکردن. هێندێکی ئاو بە قوڕەکەدا کرد و ملی لە شێلان نایەوە. کراسەکەی کەمێک تەسک بوو و ئەستوورایی ڕانەکانی بە جوانی دەردەخست. سەرۆکی پازگا خەریک بوو بچێتە ناو باخچەکە، لە بیری نەبوو دەرگاکە لە ژووری‌ڕا کلۆم دراوە.

"نایەڵی بێمە ژوورێ؟"

"هەر لەوێ بی باشترە."

"ناکرێ جارێک بە تەنیا بتبینم؟ کاتی مێردەکەشت لە ماڵ نییە دەرگام لێ ناکەیەوە."

"چاک دەکەم. ئەرێ دەزانی لەمێژە لێرە ڕاوەستاوی؟ دوای کاری خۆت بکەوە و لە کۆڵم بەوە."

"بۆ وا خراپی؟" دەرگاکە بکەوە!"

"ئێستا یانی دێتەوە. با لێرە بتبینێ، بزانە چۆن بە پاچ وەرتدەگەڕێتێ."

"ئەگەر بە پاچ سەرم بشکێنێ تۆ بۆم نارەحەت دەبی؟"

"پرسیاری لەوە ئاقڵانەترت پێ شک نەدەهات؟ وا باشە ملت بەردەیەوە و بڕۆی. هاکا یانی هاتەوە."

"پرسیارێکی دی، جا دەڕۆم."
سۆزانا دەستی لێ دە بەر کەلەکە نا و گوتی: "فەرموو!"
"ئەگەر بتزانیبا مێردەکەت نایەتەوە، دەرگات لێ دەکردمەوە؟"
سۆزانا ملی لەبەر کارەکەی نایەوە و گوتی: "جا ئەوە پرسیارە تۆ دەیکەی؟"
سۆزانا تا ئەودەم بیری لەوە نەکردبووەوە کە ئەگەر رۆژێک یانی بڕوات چ دەکا.
"تۆ کە مێردت کردووە. دەی لە چی دەترسی؟"
"وازم لێ بێنە. لێرە بڕۆ."
سۆزانا تووڕە ببوو.
"وەڵامم بدەوە، جا دەڕۆم."
"نازانم."
"یان بڵێ ئا یان بڵێ نا! من تا وەڵام وەرنەگرمەوە ناڕۆم."
"ئاخر بۆ دەتەوێ بزانی؟ یانی هەرگیز ئێرە جێ ناهێڵێ."
"ئەی ئەگەر بەجێی هێشت؟"
"ئەودەم خۆت دەبینی کە رێگات دەدەم یان نا، بەڵام یانی ناچێتە هیچ کوێ. ئێمە وا خەریکین تەویلە ساز دەکەین و پاشان چاڵاوێک لێدەدەین. یانی چۆن ئەو هەموو کار و کوێرەوەرییە جێدەهێڵێ و لێدەدا دەڕوا؟"
چاوی سەرۆکی پازگا بریسکەی هات. لە کاتێکدا لەوێ دوور دەکەوتەوە گوتی: "دەمزانی کچی چاکی."
سۆزانا گوێی لێبوو لەبەر خۆیەوە ورینگەی دێ. چاک ترسابوو، دەستی لە کار هەڵگرت. دەست و لاقی شۆردەوە و چووە لای منداڵەکانی. منداڵە گەورەکەی لە ئامێز کرد. ختوورەی وەی بە دڵدا هات تووشی گوناهێک بووە کە نەدەبوو تووشی بێ. دەترسا. بەدبەختی بەرۆکی یانی و منداڵەکانی بگرێ. لەبەر خۆیەوە گوتی: "باشە ئەمن چ کارێکی هەڵەم کردووە؟ ئەو ترسە بە خوت و خۆڕاییە."

منداڵەکەی دانایە عەرز. داوێنی کراسەکەی هەڵکرد و دەستی بە کار کردەوە.

## (۲۱)

حەفتەیەک پتری پێنەچوو کە ژەندرمەیەک دەرگای ماڵێی کوتا. یوهان لە پشت مێز دانیشتبوو، تەماشای دەرەوەی دەکرد. چاوی بە شەپکەی ژەندرمە کەوت و گوتی: "با بزانین چ باسە."

چووە دەرێ و دوای کەمێک بە کاغەزێکەوە هاتەوە. چووەوە جێگاکەی خۆی و دەستی بە نان خوارد کرد.

سۆزانا لێی پرسی: "ئەو کاغەزە چییە؟"

یوهان پاروەکەی قووت دا و گوتی: "ئەمری دەست بەسەردا گرتنە. با نانەکەم بخۆم ئینجا دەیخوێنمەوە بزانم حکوومەت دەیەوێ دەست بەسەر چ شتێکماندا بگرێ."

هیچ خۆی شلوێ نەکرد. دەیزانی ئەو چەشنە ئەمرانە هەموو جووتیارێک دەگرێتەوە. لەبارەی لێستاندنی ئەسپ و عارەبانە و گا و شتی واوە بوو، بەڵام ئەو نە ئەسپی هەبوو نە عارەبانە، هەر باش بوو ئەمانەی نەکڕیبوون. بەوە دڵخۆش بوو. چونکە ئەگەر هەیبان ئێستا ناچار بوو لە دەستی حکوومەتیان بکا. "لەوانەشە حکوومەت فەردە گوڵەگەنمێکی بوێ. بەو دواییە دەستیان بە لێستاندنی دانەوێڵەش کردووە." نانەکەی خوارد و جوان جوان دەستی سڕینەوە تا کاغەزەکە چڵکن نەبێ. ئینجا لێکی کردەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد. سۆزانا بە وردی ئاگای لە بچووکترین گۆڕانی دەموچاوی یوهان بوو کە سوور هەڵگەڕاو و تێکچڕژابوو.

"چی تێدا نووسراوە؟"

منداڵەکان بێدەنگ بوون و لە باوکیان رامابوون. یوهان لەسەر نوێنەکان خۆی بە عەرز دادا و دەستەکانی لە پشت سەری نان. سۆزانا کە هەستی بەوە کردبوو شتێکی ناخۆش روویداوە بە ئەسپایی گوتی: "پێم ناڵێی چی تێدا نووسراوە؟"

"بێ کەڵکە، پێشت بڵێم هیچی تێناگەی. بۆخۆشم تێی ناگەم."

"یانی، زۆر ناخۆشە؟"

"ئەوی نووسیویە دەبێ بەهەڵە چووبێ."

کاغەزەکەی دایە سۆزانا: "ڕای تۆ چییە؟ ئەمە کاغەزی دەست بەسەردا گرتنە یان نا؟ من ئەو کاغەزانە دەناسمەوە. تا ئێستا دووی تریشیان لەمانە بۆ ناردووین. جارێک بۆ دانەوێڵە و جارێکیش بۆ ئەو تەلیسانەی لە "پرۆفیر"م کڕیبوون، بەڵام ئەم جارەیان کاغەزەکە نە بۆ دانەوێڵە نووسراوە و نە بۆ تەلیس، بەڵکو بۆ خودی خۆم نووسراوە. باشە چۆن دەتوانن دەست بەسەر مرۆڤێکدا بگرن؟ هیچی تێدەگەی؟"

سۆزانا بە شێنەیی وشە بە وشەی نامەکەی خوێندەوە، تا ئەوەی یوهان سەبری لەبەر بڕا و کاغەزەکەی لە دەستی رفاند و بۆخۆی بە دەنگ خوێندییەوە: "شەیتان بە نەحلەت بێ، ئاخر چۆن دەستم بەسەردا دەگرن؟ من ئینسانم، خۆ ئەسپ و ماڵ و گا نیم دەستم بەسەردا بگرن، بەڵام بڕوانە ناوی منی لەسەر نووسراوە. ئەوی نووسیویە فڕی بەسەر دنیاوە نییە."

"ئێستا چ بکەین؟"

"سبەی دەبێ بچمە پازگا."

"ڕاستە، خۆت گوتەنی لەوانەیە هەڵەیەک لە لای نووسەرەکەیەوە رووی دابێ."

"بێگومان هەڵەیەک روویداوە." هەرچەند یوهان ئاوای وەڵام دایەوە، بەڵام هەستی بەوە کرد شک و گومان دڵی داگرتووە.

"ئەگەر هەڵە نەبوو، چی؟"

یوهان وەک ئەو دەمەی دەچووە سەربازی هەموو شتێکی خۆی ئامادە کرد، ئەگەر هەڵە نەکرابێ لەوانەیە تا یەک دوو مانگ نەیەتەوە.

## (٢٢)

دانی ئێوارەکەی دوو قڕانی لەسەر بەری دەستی بوو بۆ شەڕ، بەڵام سۆزانا بیانووی نەدەدایە دەست. دەیزانی ئەو نامەیە وا توورە و تۆسنی کردووە. یوهان، ئێواری نامەکەی لە نێو پارچە رۆژنامەیەک وەرپێچا هەتا

چڵکن نەبێ. لە گیرفانی نا و گوتی: "دەمەوێ نامەکە بە مامۆستا نیشانبدەم.
ئەوەی گوت و لە ماڵ وەدەر کەوت.

قەشە کۆرزۆگا لە نێو باخەکە خەریکی خوێندنەوە بوو. چاویلکەکەی لە چاو دەرهێنا و لەسەر کتێبەکەی دانا. بە دەم بزەیەکەوە یوهانی بەخێر هێنا. یوهان وەڵامی بزەی قەشەی نەدایەوە. لە قووڵایی دڵەوە خەمبار بوو. نامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و پرسی: "باشە شتی وا هەیە ئینسان دەستی بە سەردا بگیرێ؟ ئەسپ و عارەبانەم دیوە دەستی بەسەردا بگرن بەڵام مرۆڤ چۆن..." دەنگی پڕ لە کوڵ و تووڕەیی بوو.

"پێم وایە مرۆڤ وەک خوا خوڵقێنراوە."

"دەزانم مامۆستا، بەڵام وا خەریکن دەستم بەسەردا دەگرن، لەوانەشە من خراپ حاڵی بووبم."

"یوهان گیان، تۆ دەستت بەسەردا دەگیرێ."

"وەک ئەسپ؟"

قەشە وەڵامی پێنەبوو. دەستێکی لە شانی دا. یوهان نامەکەی قەد کردەوە و لە رۆژنامەی وەرپێچایەوە. قەشە تا یوهان دوور کەوتەوە چاوی لێ هەڵنەگرت و لەبەر خۆیەوە گوتی: "کۆمەڵگایەک کە وەک شتی بێگیان هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤدا بکا یان دڕندەیە یان نەخۆش."

## (٢٣)

ئەو شەوە شەوێکی ئارام نەبوو. یوهان هێشتا نەچووبووە ناو جێگا کە بیری جۆراوجۆر هورووژمیان بۆ مێشکی هێنا. سۆزانا قۆڵی لە بەژنی ئەنگاوت، بەشکەم لەو فکر و خەیاڵەی دوور بکاتەوە، بەڵام ئەو خۆی راپسکاند و پشتی تێکرد.

هەزاران بیری ئاڵۆز لە سەریدا دەخولانەوە. لە ژیانی رۆژانەدا سەدان کار و کوێرەوەریی جۆراوجۆر دێنە رێ، کە ئەگەر مرۆڤ تەنانەت شەو و رۆژ بێپسانەوە و حەسانەوە کار بکا، هێشتا هێندێکیان بە نیوەچڵی دەمێننەوە. جا کەسێک، بێئەوەی بزانێ کەنگێ دەگەرێتەوە، دەست لە هەموو کارێکی

هەلبگرێ و هەروا بە نیوەچڵی بەجێیان بهێڵێ، تووشی دڵەڕاوکێ دەبێ. یوهان بە جارێ ورەی بەردابوو. دەتگوت خەریکە دەمرێ. هەر وا چەند رۆژ دەبوو دە بارە داری کڕیبوون. پارەکەی تەواو دابوو و لە لێڕەوار، لە لایەک لە لیژەی دابوون. ئێستا پێویست بوو بیانکێشێتەوە ماڵێ، بەلام خۆی دەبوو بڕوا. چەند دار بەڕووی بە نرخێکی کەمێک گران بۆ دارەڕا کڕیبوون. دەبوایە بڕوا و دارەکان هەروا لە دارستان بە تەمای خوای بەجێ بهێڵێ. بیری سۆزانا کەوتەوە. ئاخر نەدەکرا پیاو دار بکڕێ و هەروا لە دارستان جێیانبهێڵێ. بانگی سۆزانای کرد، بەلام هەر بەڕاست، سۆزانا ئاگادار نەبوو داری کڕیون و بە جێیەکەشی نەدەزانین. دۆزینەوەیان لە ناو دارستاندا هەروا ئاسان نەبوو.

سۆزانا خەوتبوو. یوهان بە ئەسپایی شانی ڕاتەکاند و لەبەر خۆیەوە گوتی: "من دەبێ پێی بڵێم دارەکان لە نزیک ماڵی داربڕ، چەندسەد مەترێک لەوبەر جۆگەی ئاوەکەن، ئەگەر بە وردی شوێنەکەی پێ نەڵێم سۆزانا زەحمەتە بیاندۆزێتەوە."

توندتر شانی ڕاتەکاند. ئەمجار سۆزانا زەردەخەنەیەکی کرد. ڕوخساری جوانی لەبەر تریفەی مانگەشەو دڵگر بوو. ئێستا سۆزانا بە زمان لێوی خۆی دەلستنەوە. یوهان دڵی نەهات وە خەبەری بهێنێ. سۆزانا خەوی گران بوو، وەک منداڵان. یوهان بڕیاریدا بەیانیی زووتر لە خەو هەستێ و جێگای دارەکانی نیشانبدا. دەستی لەسەر قۆڵی سۆزانا لابرد و سووڕایە سەر پشت. یوهان لەسەر پشت خەوی خۆش بوو، بەلام ئەمشەو؟ نا ئەمشەو خەوی نەدەچووە چاوان. کاغەزی دەست بەسەردا گرتنەکەی دیسان هاتەوە بەر چاو. یوهان لەپڕ تووڕە بوو. لە ناوچەکانی سەر سنوور عەسکەری کردبوو و تەنانەت زمانی "سرپیایی"ش فێر بووبوو. ڕێوشوێنی سەربازی دەزانی و ئاگادار بوو کە ڕێساکان بە جۆرێک نین ئەوڕۆیان بخەیە سبەی. خودی مرۆڤ ناکرێ دەستی بەسەردا بگیرێ. نێوچاوانی خۆی شێلا و بڕیاریدا ئیدی بیر لەو بابەتە نەکاتەوە. ڕەنگە بەڕاستی کەمتەرخەمیی نووسەری نامەکە ئەو وەهمەی دروستکردبێ. لەوانەشە نووسەرەکە ئیجازەی ئەوەی بە خۆی دابێ گاڵتەیەکی وا قێزەون بکا و لە باتی جەلبی سەربازی، ئەمری دەست بەسەردا گرتنی

نووسیبێ. کەمێک بیری هێور بووەوە و پێی وا بوو ئێستا خەو دەیباتەوە کە لەناکاو بیری کەوتەوە "ئەنتوان تالبا" پێنجسەد "لای"ی پێ قەرزدارە.

نەیدەزانی تا کەنگێ لە گوندەکەی دوور دەکەوێتەوە. لەوانەیە لەو ماوەیەی لە ماڵێ نابێ سۆزانا پێویستی بە پارە بێ. دیسان رووی لە سۆزانا کرد. سۆزانا لەسەر کەلەکەی چەپ نووستبوو و بالیفەکەی لە ئامێز گرتبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "باشە خەون بە چییەوە دەبینێ؟" ئەمجارەشیان دڵی نەهات لە خەوێ هەستێنێ و مەسەلەی پارەکەشی هێشتەوە بۆ بەیانی.

"پێش ئەوەی دیواری چاڵاوەکە تەواو بێ ئەگەر باران بباری هەمووی تێکدەتەپێتەوە. لەوانەشە تا وەرزی باران بارین بگەڕێمەوە.

هەر ئەوەندەی بیر لە چاڵاوەکە کردەوە، بەڵام ئێستا نۆرەی خشتەکانی تەویلە بوو. ئەوە ئیدی بۆ بەجێهێشتن نەدەبوو. هەشتسەد خشتی بڕیبوون. بۆ وشک بوونەوە لە فەنەری دابوون. ئەگەر لە رادەی خۆشیان پتر ویشک ببانەوە دەقەڵشین و لەبەر یەک بڵاو دەبوون. ئەمجارەش بۆ لای سۆزانا وەرسووڕا، رەنگبوو ئەو، رێگەچارەیەکی پێ شک بێ. سۆزانا بە لەشی نیوە رووتەوە خەوتبوو. بالیفەکەی توندتر بەخۆیەوە دەگوشی. یوهان بیری کردەوە کە سۆزاناش چی لە دەست نایێ. وەخەبەر هێنانی بەخۆڕایی بوو. ئەو کارە کاری پیاوان بوو. بیری لە هەموو ئەو پیاوانەی کردەوە کە لە گوندەکەدا دەر و دراوسێ و ناسیاویان بوون، بەڵام لە شتاقی رانەدەدین خشتەکانی بۆ بپێژن. هەر کەس بە کاری خۆیەوە سەرقاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر رۆژ بوایە رووی لە هێندێکیان دەنا، بەشکم مشوورێکی بۆ لەو کارەی بخۆن، بەڵام شەو بوو و کەس بەخەبەر نەبوو. ئەرێ خۆ رەنگە بکرێ بە گەڵا و هەڵاشی گەنمەشامی خشتەکان داپۆشێ بۆئەوەی زۆر وشک نەبن. یوهان لە جێگاکەی هاتە دەرێ. دەرکی بێڵایە ئاوەڵا بوو. هەر وا بە رووتی چووە دەرێ. سەرەتا ویستی کراس و پانتۆڵەکەی بکاتەوە بەر، بەڵام لە ترسی ئەوەی ژنەکەی و منداڵەکانی بەخەبەر بێن، پەشیمان بووەوە. بەرەو فەنەری خشتەکان چوو. خشتێکی هەڵگرت و لەبەر تریفەی مانگ

تەماشای کرد. ئینجا دەستی بە سەر و بنیدا هێنا. تا دوو سێ ڕۆژی دی دەبوو دەست بە پێژانیان بکردرێ.

چاڵاوەکە و پاشان هەموو حەوشەکەی بەسەر کردەوە. لە بیری نەبوو رووتە. لە دار و دیواری ماڵێی روانی. دنیا وەک رۆژ روونـاک بوو. یوهان چیدی بیری لە رۆیشتنەکەی نەدەکردەوە. لەبەر خۆیەوە پلانی بۆ هەڵخستنی هۆڵ و کڕینی یەک دوو سەر جوانەگا و مانگایەک و ئەسپێک دادەڕشت، هاتەوە ژووری. سۆزانا قیلەوقانج نوستبوو. یوهان بۆئەوەی وە ئاگای نەهێنێ لە جێگاکەی ئەو خزا. زوو خەوی لێکەوت، بەڵام هێندەی پێنەچوو لە خەو راپەڕی و بە ترسەوە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. سۆزانا هەر وا خەوتبوو. مانگ گەیشتبووە لێواری خوارەوەی پەنجەرەکە و لە شەپکەی ژەندرمەیەک دەچوو کە لە ژێر پەنجەرەکە راوەستابێ و چاوەڕوان بێ. یوهان بە ترسەوە لە دەوروبەری خۆی روانی و تا بەیانی پێڵووی لێکنەنانەوە.

## (٢٤)

بۆ بەیانی چووە پازگا. لە رێگا تووشی چەند کەسێک بوو بەرەو ئاش یان مەزراظ یان دارستان دەچوون. یوهان هەموو جارێ رووی لێ وەردەگێڕان تا نەیبینن. ئەویش هەر بەم رێگایەدا دەچووە مەزرا یان ئاش، بەڵام ئەم جارەیان دەبوو هەموو شتێک بەجێبهێڵێ و بڕوا. بەڵێ ئەو دەستی بەسەردا گیرابوو. بەوپەڕی رقەوە چاوێکی لە دەروازەی سەرەکیی پازگا کرد. ختوورەی هەڵاتنی بە دڵیدا هات.

- "بچم لە لێڕەوار خۆم بشارمەوە، هیچ ژەندرمەیەک پێی نابینرێمەوە و دەرباز دەبم."

لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەڵ و دەستەوەستان لەبەر دەرگا راوەستا. ئاخر ژن و منداڵ و ماڵ و-حاڵی خۆی هەبوو. ئینجا ورده ورده پێی نایە حەوشەی پازگا. سەرۆکی پازگا لە ژووری نووسینگە خەریکی ریش تاشین بوو. یوهان مۆریتس راوەستا تا لێبۆوە. یوهان لەسەر ئەوە سوور بوو لێی بپرسێ کە

ئایا هەڵەیەک لە نووسراوەکەدا رووی نەداوە؟ لە حەوشەی پازگا بۆنی شیری سووتاو دەهات.

لە ناکاو گرانایی دەستێکی کەوتە سەرشانی، ئاوڕی دایەوە. سەربازێک و لە لای راستیشی بە مەودای هەنگاوێک مارکۆ گۆڵدنبێرگی کوڕی جووی مەیفرۆشی چاو پێکەوتن. یوهان نەیزانیبوو کەی و چۆن هاتوونە ئەو هۆدەیە. چاوێکی لە سەربازەکە و ئینجا چاوێکی لە مارکۆ کرد. ئەو دووە پێکەوە وەک دوژمنکاران بوون. سەربازەکە دەستی یوهانی بەست و وەک کیسەیەک بۆلای سەرەوە پاڵیدا، یوهان بەرەنگاری نەکرد. پێی وابوو گەمەی لە تەکدا دەکەن. لە پڕ دیتی دەستی مارکۆش شەتەک دراون. سەربازەکە تێی ڕاخوڕین.

"یەک یەک بڕۆن." یوهان بیری کردەوە لەوەڕا کە دەستی مارکۆش بەستراون دیارە گاڵتەیەک لە گۆڕێ نییە. قۆڵی لە قۆڵی جووەکە بردە پێشەوە. ئەمجارە دەترسا. هەمیشە کە خەڵکی دەست شەتەک دراوی دەدیتن دەترسا. لە پشت سەریانەوە سەربازەکە تفەنگی خستە سەر پێ. ئێستا یوهان تێگەیی مەسەلەکە چییە و چاوی لێکنا. کاتێ لە حەوشەی پازگا دەچوونە دەرەوە جارێکی دی چاوی بە ژووری نووسینگە کەوت. سەرۆک پازگا ئاوێنەیەکی بە شووشەی پەنجەرەکەوە هەڵپەساردبوو و دەستی بە دەموچاویدا دەهێنا. گوندییەکان لەسەر جادە وەستابوون و لە پاسەوانی گرتووەکانەوە رامابوون. ژنانیش تەماشایان دەکردن.

لەپێش ماڵی "نیکۆلای پرۆفیر" چەند ژن کە لە سەراوێ دەگەڕانەوە گۆزە ئاوەکانیان دانا و وێنەی خاچیان کێشاوە. یوهان خێرا رووی لێ وەرگێڕان. شتێک لە دەروونیدا ورد و خاش دەبوو. دەیزانی ژن وان کە کەسانی قۆڵبەست کراو دەبینن رووی تفەنگیان تێکرابێ، وێنەی خاچ دەکێشنەوە. لە پاش سەرییەوە زرمەی پێی سەربازەکە دەهات. تەنیا گوێی لەو دەنگە دەبوو. شان بە شانی مارکۆ، دەچووە پێشێ. ئێستا ئیدی تەنانەت گۆشت و ئێسقانەکەشی هی خۆی نەبوو و بۆی نامۆ بوون. تەواوی ئازای لەشی تەنانەت بیریشی لەگەڵی بێگانە بوو.

## (٢٥)

سەرۆکی پازگا وەک رۆنی سەگت لە قالبی دابێ بە کەیفەوە پێی نایە حەوشەی بیناکە. بەیانییەکی خۆش بوو. ئەمری بە سەربازێک کرد ئاوی لە دەستی بکا. سەربازەکە یەکسەر تێگەیی خەریکە دوای ژنێک دەکەوێ. لەبەر ئەوەی چاوی لێبوو چەند بە وردی ـ ئەویش جووت تیغ ـ ردێنی تاشیبوو. بە بزەیەکی دڵنیاکەرەوە پرسی: "تیکەیەکی تازەیە؟" رەییس تەنیا چاوێکی داگرت. پاشان بەرگی ئەفسەری کردە بەر و لە پشت مێزەکەی دانیشت. روونووسێکی ئەو راپۆرتەی ئەمرۆ لەگەڵ دوو گیراوەکەدا بۆ فەرماندەیی ژاندرمەری ناردبوو، لەسەر مێز بوو. هەر زوو دەستی بە خوێندنەوەی کرد: بە شانازییەوە و بە پێی رێ و شوێنی یاسایی و لە سەر ئەمرەکانی پێشووی بەرێزتان لە بارەی کردەوەی ئەمنی دژی جوولەکەکان و هەر گومان لێکراوێکی تر، ئەو کەسانەی خوارەوەمان گرتوون و لەگەڵ پاسەوانەکانیان دەیان‌نێرینە خزمەتتان.

١ـ مارکۆ گۆڵدنبێرگ، دکتۆرای ماف، سی ساڵە

٢ـ ئەیوون مۆریتس، جووتیار، ٢٨ ساڵە

ئیمزا نیکۆلا دۆبریسکۆ، فەرماندەی پازگای فانتانا.

بە هەستێکی پڕ لە خۆشیی سەرکەوتنەوە راپۆرتەکەی نایەوە جێگای خۆی. یوهان لە ئاوێنەیەکی بچووکدا چاوی لە خۆی کردەوە، وردە وردە بەرەو ماڵی یوهان مۆریتس وەرێ کەوت. ئێستا دەیزانی سۆزانا بەتەنێیە.

دوو ساڵی رێک ددانی بە خۆیدا گرتبوو. کەواتە هەر دەبوایە ئەو ئاوازەی بە فیتوو لێی دەدا ئاوازی خۆشی بێ.

## (٢٦)

سەرۆکی پازگا دوای کاتژمێرێک گەڕایەوە. لە کاتی رۆیشتندا گوتبووی ئەو رۆژە تا ئێواریَ نایەتەوە و ئێستا لە پشتی مێزەکەی هەڵتووتابوو. نەیدەزانی چۆن دڵی خۆی بداتەوە. چاوی بە فایلی راپۆرتەکە کەوت و سەرلەنویَ لێکی کردەوە. جارێکی دی رۆونووسی ئەو راپۆرتەی لەگەڵ دوو گیراوەکە بۆ ناوەندی ناردبوو، خوێندەوە و دەهریتر بوو. حەزی دەکرد هەموو شتێک دڕبەدڕ بکا. ریسەکەی لیَ ببۆوە بە خوری. سۆزانا گەرچی بەتەنیَ بوو سەرباری ئەوە بە ئیرادە و بڕیاری قورس و قایمی خۆی رێگەی نەدابوو تخوونی ماڵەکەی بکەویَ. کاتێکیش ویستبووی بە زۆر بچێتە ژووریَ لێی رۆببووە کلکە پاچیک و گەفی لێکردبوو پەل ببزێویَ نێوچاوانی دەقەڵێشیَ. ئەوە گەمەی پیَنەدەکرا. ژەندرمە ژنی چاک دەناسین. بەمجۆرە باریکەی دابۆیە و گەڕابۆوە پازگا. ئەو داخە دەیکوشت شەوێکی تەواو کاتی خۆی بۆ نووسینی راپۆرتەکە تەرخان کردبوو. لە پڕێکدا یوهانی بیر کەوتەوە و پیسترین و مزرترین جنێو و تووکی بۆ هەنارد.

## (٢٧)

لە گۆرەپانی پێش فەرماندەیی ریزێکی درێژی گیراوان لەسەر رۆیشت بوو. یوهان بە دیتنی جلوبەرگی خاوێن و جوانی گیراوەکان و جانتا زلە قایشەکانی دەستیان سەری سوڕمابوو. هەستی بە ماندوویەتی دەکرد. پانیەی شل بووبوون. گۆلدنبیرگ لە رێگا متەقی نەکردبوو. ئەویش زۆر هیلاک بوو. چەند حەزی دەکرد لەو گۆڕە لێی راکشیَ. ئەفسەرێک کە بە خۆی و باقەیەک بەڵگەنامەوە بە بەردەمیاندا تێپەڕی مۆرەیەکی توندی لە گۆڵدنبێرگ کرد کە رەنگی هەڵبزرکابوو. پاشان سەیرێکی یوهانیشی کرد و بەپەلە لە پاسەوانەکەیانی پرسی:

"هەر دووک جوولەکەن؟" و بیَ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بیَ زەرفەکەی لە دەستی رفاند و ئاماژەی بە یوهان کرد بچێتە پاڵ ئەو تابوورەوە کە خەریک بوو لە گورپانەکەوە بەری دەدکەوت. یوهان بە حاڵەتێکی پرسیارکەرانەوە لە

ئەفسەرەکەی روانی. ئەفسەریش وەک فرفرەیەک سووڕاندی و بەرەو ریزەکە پاڵی پێوەنا. یوهان غاری دا و لەگەڵ گیراوەکانی دی وەرێکەوت. بە ئاوڕێک دیتی مارکۆشی لەگەڵدایە.

## (٢٨)

هەتا شەوێ رێگایان بڕی. لە پشوودانێکی کورتدا مارکۆ هاتە لای و گوتی: "دەستم بکەوە" و پشتی تێکرد. دەستی گۆڵدنبێرگ باریک و سپیلکە بوون. دەزوولەیەک خوێن بە مەچەکیدا هاتبووە خوارێ. شریتەکە بە گۆشتیدا رۆچووبوو. یوهان گرێیەکەی کردەوە. مارکۆ گوتی: "سوپاس"، بەڵام گۆڕانێک لە دەموچاویدا وەدی نەهات و بگرە هەر چاویشی لە یوهان نەکرد. پاشان لەسەر سەوزەگیاکە دانیشت و بە نیگایەکی مات لە خاڵێکی دوورەوە راما. یوهانیش لە تەنیشتی دانیشت. بۆ ئەوەی سەری قسەی لەگەڵ بکاتەوە ئەو پەتکەی لە دەستی کارکۆی کردبۆوە دایەوە و گوتی: "دەتەوێ یان بۆ خۆم هەڵیگرم؟" مارکۆ گوتی: "هەڵیگرە". شێوازی وەڵامەکەی زۆر توند و ناشیرین نەبوو. یوهان پەتەکەی کردە گلۆڵە و لە گیرفانی پانتۆڵەکەی نا: "دەڵێم لەوانەیە بۆ رۆژی خۆی بە کار بێ." مارکۆ پێکەنی. ئەوە یەکەم جار بوو یوهان دەیدی مارکۆ پێبکەنێ.

## (٢٩)

رۆژ درەنگ بوو کە تابووری جوولەکان لە کەناری نۆپێۆلیتزا راوەستا. گەیشتبوونە جێ. چەمەکە وشکبوو. تڵپاتی تەڕی تێدا نەمابوو. چەند دارە بێ

و هەندێ داری تر لە دەم ڕووبارەکە دیار بوون و تەواو. لێرە جوولەکەکان دەبوایە خەندەکێک لێبدەن. لە مەودایەکی دوورەوە کۆمەڵە خانوویەک دەبینرا. لەو دەوروبەرانە چ گوند دیار نەبوون. چەند تەویلە لەم سووچە تەریک و لە بیرکراوەی زەوی شوێنی حەوانەوەی بەندییەکان بوو. لەبەردەم بەندییەکان کامیۆنێکی پڕ لە پاچ و پێمەرە ڕاوەستا. مەنجەڵێکی گەورەی خۆراکیشی تێدابوو. بەندییەکان قوشقی بوون و تێیەوە ڕامان.

شەویان لەو تەویلانەدا بەسەر برد. یوهان وای پێخۆشتر بوو لە دەرێ لەسەر سەوزە گیاکە بنوێ. چونکە لە نێو تەویلەکە زۆر نەرمتر بوو. هەر زوو خەوی لێکەوت، بەڵام شەوێ چەند جار وە ئاگا هات. مانگ وڵاتی وەک ڕۆژ ڕووناک کردبوو. یوهان بیری لە ماڵ و حاڵی خۆی کردەوە و کە تەویلەکانی دی وە بیری هاتەوە لە فانتانا نییە.

ڕۆژی دوایی جوولەکەکانیان بە سەر دوو ڕیزدا دابەش کردن و ژماردیانن. یوهان لە پەنا مارکۆ وەستابوو. مارکۆ بە "سوپاس"ێک سڵاوی لێ ئەستاندەوە. یوهان وای هاتە بەرچاو کە مارکۆ بە چاوی دۆستێک تەماشای دەکا. سەرگوردێک پەیدا بوو و ئەمری کرد پاچ و پێمەرەکانیان بەسەردا دابەش بکەن. بە دە کەسانیش مەنجەڵی چێشتەکەیان لەسەر ماشێنەکەوە داگرت و لەبن دارگوێزەکەیان دانا. سەرگورد بە خۆ و ددانی زێڕ و ڕیشی ڕەشەوە دەستی بە ئاخاوتن کرد. جوولەکەینە! دەبێ لە پێناوی بەرگری لە نیشتمانی خۆتاندا ئەو خەندەکانە لێبدەن." کاکی سەرگورد خۆی کردە خوای جوولەکان و گوتی تەنانەت مووساش لە ئاسمان دەبێ ئەمر لەو وەربگرێ. لە کۆتایی ئاخاوتنەکەیدا ناوی خۆی بە بەندییەکان گوت: "ئاپۆستل کۆنستانتین" پاشان باسی دوو کوڕەکانی خۆی کرد کە یەکیان پارێزەرە و ئەوەی دیکەی ئەفسەر بوو. جوولەکەکان گوێیان دایێ. هەندێک فشق و هۆڕێ پێکەنینیان بوو، بەڵام هەموویان ترسابوون. سەرگورد یەک بە خۆ گوتی: "ئەمرۆ خواردن لە گۆڕێ نییە. هێشتا مدبەق دروست نەکراوە. لە سبەینێوە هەرکام چا و ڕۆژێ دوو جار نۆکاو و لەتێک نانتان هەیە."

ئینجا کار دەستی پێکرد. هەر کەس رادەیەکی دیاریکراو کاری بۆ رۆژەکەی و ئەستۆ گرت. کەی لێببایەوە دەیتوانی تا شەوێ بێکار بێ و ئەگەر کارەکەشی تەواو نەکردبا وەک کەسێکی تێکدەر و دوژمنکاری وڵات دەگیرا و تەسلیمی دادگای سەربازییان دەکرد. ئەمە هەڕوگیفی سەرگورد بوو. بەندییەکانیش هۆیەک نەبوو تا بڕوای پێنەکەن. لەگەڵ دەرکردنی ئەمری دەست بە کار بوون، یوهان لە ریزەکە جوێ بۆوە و چووە لای سەرگورد و گوتی: "من جوولەکە نیم."

سەرگورد لە وەڵامدا گوتی: "با نووسینگە دابمەزرێنین ئینجا گازندەکان تاوتوێ دەکەین."

یوهان چۆوە ناو ریزەکە، تەنیشت مارکۆ. دەیزانی لە سوپادا دەبێ ددان بە خۆتدا بگری. دە رۆژی خایاند تا نووسینگەیان ئاوا کرد. لە کەوێڵێکی تازە دروستکراودا کەلوپەلی نووسینگە وەک مێزی نووسین، کورسی و قەرەوێڵە بۆ کارمەندانی نووسینگەکە دانران. کاتێ یوهان سەردانی نووسینگەکەی کرد سەرگورد پێی گوت: "حەفتەی داهاتوو سەردانمان بکەوە."

## (۳۰)

لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا بە دەم وەشاندنی قازان لە گاشەبەردی تەختی خەندەکەکە یوهان پرسیاری ناوی لە کەسی لای راستی خۆی کرد. یوهان زۆری حەز لە قسان بوو. کابرای تەنیشتی مورەیەکی لێکرد و گوتی: "پێت شەرمە بە زمانی جوولەکان بدوێی؟"

"من ئەو زمانە نازانم."

گەنجەکەی تەنیشتی کە گوێی لەو قسەیە بوو تفێکی رۆکرد و گوتی: "شوورەییە."

"یوهان هەوڵیدا بۆی روونبکاتەوە، بەڵام کابرا گوتی: "بە زمانی جوولەکان بدوێ."

"دەمەوێ بڵێم من زمانی جوولەکان نازانم."

جوولەکەکان بە رقەوە سەیریان کرد. یوهان دەستی لە کار هەڵگرت و ئەمجارەش هەوڵیدا بۆیان شیبکاتەوە، بەڵام کەس گوێی نەدایێ. یوهان لە دڵی خۆیدا گوتی: "دیارە بڕیاریان داوە خوبەخۆ تەنیا بە زمانی جوولەکان بدوێن. باشە ئەوان جوولەکەن و زمانی خۆیانە، ئەمن بۆ؟ ئەمن چ بکەم؟

یەکیان هەڵیدایێ: "ئەگەر جوولەکەییت لە بیر چۆتەوە خۆ دەبێ زمانی عیبری بزانی." یوهان بە هەڵتەکاندنی سەر وەڵامی نای دایەوە. هەموویان دەستیان لە کار کێشایەوە. چاویان تێبڕی و وێکڕا لە قرقەی پێکەنینیان دا.

تووڕەیی هەموو گیانی یوهانی داگرت. لە رکان سوور هەڵگەڕا و چیدی خۆی پێ رانەگیرا: "ئەگەر مەسەلەکە زانینی زمانی بێگانان بێ ئەوە من دەبێ بە ئێوە پێبکەنم. من چوار زمان دەزانم و بە هەر چوار زمان وەک بولبول قسە دەکەم." ئینجا رووی لە لاوەکەی لای راستی کرد و گوتی: "ئەدی تۆ چی؟" ئەویش بە کورتی وەڵامی دایەوە: "من جوولەکەیی دەزانم."

سەرەنجام سەردەستەی جوولەکەکان "ئیساک لنگیل" یوهانی کێشایە لایەکەوە و گوتی: "لەو بارودۆخە تاڵەی گەلی جوولەکە تێی کەوتووە و تەحەمولی دەکا، ئێمە تا پێکەوەین دەبێ بە زمانی جوولەکان بدوێین."

"بەڵام من جوولەکە نیم."

"تازە نکووڵی کردن بێسوودە. پێش ئەوەی بگیرێی لەوانەبوو بتوانی نکووڵی لە جوولەکە بوونی خۆت بکەی، بەڵام تازە درەنگ بووە. ئەگەر ئێستا بتهەوێ لەسەر ئەو نکووڵی کردنە بەردەوام بی تەنیا حیسابی پەیمانشکێنی و خۆ دزینەوەت بۆ دەکرێ."

یوهان بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامی دایەوە: "ئاخر تێبگەن، من جوولەکە نیم." "کەیفی خۆتە چ دەڵێی و چ ناڵێی. رەنگە حەزت لێبێ بێبەڵێن و سپڵە بی."

یوهان مۆریتس بە تەنیا مایەوە. کەس باوەڕی پێنەدەکرد کە جوولەکە نییە. هەموویان بە درۆزنیان دەزانی و دەیانگوت رۆمانیایی نییە و تەنیا بۆ دەرباز بوون لە ئۆردووگا ئەو درۆیانە پێوە دەنێ. لە پێرستی بەندییەکاندا کە بە دەست "لانگیل"ی پیرەوە بوو، ناوی یوهان مۆریتس وەک جوولەکە و بە "مۆریتس ژاکوت" تۆمار کرابوو. لانگیل بە یوهانی گوت: "یوهان ناوی

ـجوونـەکان نییـە. ژاکوب نـاوی جوولـەکانـە. نـاوی تـۆ دەبێ ژاکوب بێ. بۆ بە
ـەیوون بانگ ناکرێی. ئەیوون وەرگێڕدراوی ڕۆمانیـایی ژاکوبە." بەندییەکانی
ـێ بە "یانکل" گازیـان دەکرد. بـەرهـەڵستی نـەدەکردن. تـەنیـا تۆزێک بـۆی
ـعەمەت بوو لەگەڵ ئەو ناوە تـازەیـەی رابێ. "بەهـەر ناوێک کە حەزتـان لێیە
ـنگم بکەن، ژاکوب یا یانکل، بەڵام زۆر خەفەت دەخۆم کە ئێوە بڕوام پێناکەن."

## (۳۱)

یوهان زۆر زوو تێگەیی گشت جوولەکەکان بە گوێرەی نووسراوی دەست بـەسـەرداگرتن بەرێ کراونەتە ئۆردووگـا. بـەمجۆرە تێگـەیشت کـە حکوومـەت نـەک هـەر دەست بـەسـەر ئـەسـپ و داشـقە و کـەلوپـەلدا دەگـرێ. بـەڵکو جوولـەکـەکـانیش راپێچ دەکـات. بـەڵام خـۆ ئـەو جوولـەکـە نـەبـوو. دەیویـست بابەتەکە بگەیـەنێتـە لای سـەرگـورد. سەرگورد قـەت پێـی نـەدەکرا و ئـەویـش نەیدەتوانی لای کەسێکی دی شکایەت بکا. سـەرەنجام رۆژێک خـۆی گـەیـانـدە لای. سەرگورد هەر کە دیتی توورە بوو: "تۆ چـوار مانگـە لێرەی و بـەردەوام کاتی من دەگری. دیارە هیچ لـە دیسپلین نـازانی." پاشـان بـەسـەریدا گـوڕانـد: "هەر کە دەرگای نووسینگە دەکەمەوە تۆ لـەبـەر دەمـم قـوت دەبیـەوە. هـەمـوو رۆژ، هەموو کاتژمێرێک تۆ شکایەتت هەیـە؟ باشـە خـواردنت کـەمـە و نـاتوانی کار بکەی؟ یا بیری ژنەکەت کردووە؟"

یوهان لێدوانێکی لای خۆیەوە ئامادە کردبوو و هـەمـوو رۆژێ پرۆڤـەی لـە سەر دەکرد. بڕیاری دابوو بۆی لە بنی کوولەکە بدا و هەموو شتێکی پێ بڵێ.

"هەرچی پێت خۆشە بیڵێ، بەڵام بە چڕی و کورتی."

"دەمەوێ بەرم بدەن. من جوولەکە نیم."

"چۆن؟ تۆ جوولەکە نی؟"

سەرگورد بە گاڵتەجاڕییـەوە تێی وەڕاما. پاشـان پێڕستی بـەندییەکانی لـەسـەر مێزەکە هەڵگرت و پیتی "م"ی دۆزییەوە. "موریتس ژاکوب، ۲۸ سـاڵە. خێزانـدار، دوو

منداڵی هەن، خەڵکی فانتانا، ناوی هاوسەر: سوزانا. ئەمە تۆ نیت؟" یوهان وەڵامی دایەوە:

"با، بۆخۆمم."

"ئەدی چۆن دەڵێی جوولەکە نیم؟

"قسەکەت زۆر سەیرە. بۆ خۆشت دەزانی دەڵێی چی؟ هەر درۆیەک واتە گرتن و حەپس. بۆ دەڵێی هەرچی لەو فایلەدا نووسراوە، ئەویش لە فایلێکی سوپاییدا، درۆیە؟ باش بیر بکەوە چی دەڵێی، خۆت زۆر چاک دەزانی چی چاوەڕوانت دەکا. دەی، ئێستاش ئیدیعا دەکەی جوولەکە نیت؟" یوهان بە لێبڕاوییەوە گوتی: "من جوولەکە نیم."

"ئەدی لێرە چی دەکەی؟"

"بۆخۆشم نازانم."

- "ئەدی بۆ ئێستا دەنگ دەکەی؟ من لە هەموو راپۆرتەکانمدا نووسیومە لەو خەندەکەدا دووسەد و پەنجا جوولەکە خەریکی کارن. نووسیومە و ئیمزام کردووە. ئێستا تۆ نکۆڵی لە جوولەکە بوونی خۆت دەکەی؟ واتە من هەڵەم کردووە؟ واتە من دەبێ بخرێمە بەند؟" سەرگورد لە رکان سوور هەڵگەڕابوو: "شەیتان دەڵێ چەند شەپلاغەی وات لە لاچاو رابکێشم، تا حەفتەیەک گوێت هاژەی بێ! لەگەڵ ئەوەشدا من وتەکانت لێ قەبووڵ دەکەم. ئەوەی باسی دەکەی زۆر گرنگە. کەوابوو دەبێ بە نووسراوێک تەسلیمی منی بکەی و ئیمزای خۆشتی پێوە بێ. ئەگەر دەربکەوێ تۆ جوولەکە نیت ئەو کەسەی تۆی ناردووەتە ئێرە دەبێ بکەوێتە زیندان. ئەگەر هەویش بیت، ئەوا سەرت دەچێتە قوڕ." یوهان لە بەر دەرگا هەستی لە خۆی بڕی. سەرگورد چەند دێڕێکی نووسی و پێی گوت ئیمزای بکا. لە داوانامەکەدا نووسرابوو یوهان مۆریتس ئیدیعا دەکا جوولەکە نییە. بۆیە دەیەوێ ئازاد بکرێ. "ئێستاش دەتوانی بڕۆی. سبەی فایلەکە دەنێرین و چاوەنۆڕی وەڵام دەبین."

یوهان پێکەنی و هەر ئەو کاتە کە لە نووسینگە وەدەر دەکەوت پێی وابوو بەرەو فانتانا کەوتۆتە رێ، بەڵام هێشتا نەچووبووە دەرێ، سیترۆل، یەک لە کارمەندانی نووسینگە، بانگیکرد و دیار بوو سەرگورد کاری پێ ماوە.

"مۆریتس گوێ بگرە، من بیست و پێنج ساڵە خزمەت دەکەم. ژن و منداڵم هەیە. بۆیە حەز ناکەم تۆ خزمەتەکەم لێ لەکەدار بکەیت. مەسەلەکەی تۆ هەروا سووک و ئاسان نییە. تۆ ناوەکەت هی جوولەکانە. ئەگەر جوولەکە نیت بۆچی ناوت "مۆریتس"ە؟ ئینجا تۆ چۆنە بە زمانی جوولەکان دەدوێیت؟ تا ئێستا کەسی رۆمانیاییت بینیوە بە زمانی جوولەکان بدوێت؟ باشە من بە زمانی جوولەکان دەدوێم؟"

"من هەر لێرە، لەم ئۆردووگایە فێری بووم جەناب سەرگورد، پیاو ئەڵمانی بزانێ و شەو و رۆژ جوولەکە لە پەنای بدوێن، زوو فێر دەبێ. زەحمەت نییە."

"گوێ بگرە، تۆ ناوت هی جوولەکانە، بە زمانی جوولەکان دەدوێی و لە فایلەکەشتدا نووسراوە جوولەکەی، من چۆن بروا بکەم تۆ رۆمانیایی؟ خۆت بڵێ شتی وا دەبێ؟"

سەرگورد هەروا کە داوانامەکەی یوهانی بە دەستیەوە بوو چەند جار بە ژوورەکەدا راوێچکەی کرد و دواجار فڕێی دایە سەر مێزەکە، وەک ئەوەی بیهاوێتە ناو تەنەکەی زبڵەوە. یوهان فرمێسکی لە چاویدا قەتیس ما.

"جەناب سەرگورد بەو خوایە من جوولەکە نیم."

"بە زوویی دەردەکەوێ. جارێ من داوانامەکەت لێوەردەگرم و لەو بارەوە هەرچی بە دڵنیایی بۆم بسەلمێ دەیکەمە راپۆرت. من دەمەوێ دادپەروەری رەچاو بکرێ. هەموو تەمەنم وا بوومە. من ئەوەندەم بە گوتەکانی تۆوە زیاد کردووە کە ناوی جوولەکانت لێیە، بەڵام نازانی چۆن بە سەرتدا براوە و بێ لەوە زمانی جوولەکانیش دەزانی، دیارە بەو تێبینییەوە کە بە پێی وتەی شایەدان، تۆ ئەو زمانە لە ئۆردووگا فێر بووی و بەر لەوەی بتهێننە ئێرە نەتزانیوە، وایە؟"

"تەواو راستە، جەناب."

"مەسەلەیەکی دی، تۆ لە سەر چ مەزهەبێکی؟"

"من ئۆرتۆدۆکسم." سەرگورد بە شک و دوودڵییەوە سەیری کرد: "تۆ دەزانی جوولە چۆن سوننەت دەکرێن؟" "بەڵێ دەزانم." "کەوابوو دەزانی و دەشڵێی وەکو ئەوان نیم؟"

"تـا مـن وەکـو ئـەوان نـیم."" حـەتمـەن؟" حـەتمـەن، جـەنـاب سـەرگـورد."
"بـڕۆ لای پـەنجـەرەکـە و نیـشانم بـدە وەکـو سـوننەت نـەکـراوی."
یوهان چووە لای پەنجەرە. قایشەکەی کردەوە و شەرواڵەکەی کەوتە دەلینگان. بە رووت و قووتی راوەستابوو و چاوی لە سەرگورد دەکرد.
"بۆ وەک ژنـان شـەرم دەکـەی؟ پێویـست ناکـا شـەرم بکـەی. روو لـە روناکاییەکە بوەستە با باش بتبینم. من دەبێ بە چاوی خۆم ببینم. لەبەر ئەوەی دەبێ لە راپۆرتەکەدا بینووسم."
سـەرگورد لـە بـەردەم مۆریتس بـەسـەر ئـەژنۆدا چـەمایـەوە و بـە وردی چاوی لە هەرامەکەی کرد. ئەوەی پێش چاوی لەگەڵ ئەوانەی پێشتر دیبوونی یان بیستبووی بەراورد کرد. کە چی وا دیـار بوو دڵی ئاوی نـەدەخـواردەوە. هەستا. لە کاتێکدا سیغارێکی لە لا لێوی دەنـا، گوتی:" تۆ بۆ من سـەرئێشە دروستدەکەی مۆریتس، پێت وایە نیشتمانە خۆشەویستەکـەمـان منی بۆ ئەوە ناردۆتە ئێرە چاو لە هێنی تۆ بکەم؟"
من سـەربازم و ئـەو کارە لـەمن ناوەشێتەوە، بـەڵام من ئـەو ئـەرکـە وە ئەستۆ دەگرم بۆ ئەوەی لایـەنـی دادپـەروەری رەچـاو بکرێ. گریمـان تـۆ جوولـەکـە نـەبـووی، ئـەودەم راگرتنـی تـۆ لێـرە کـارێکی دوور لـە دادپـەروەرییـە." سـەرگـورد دەرگـایـەکـی کـردەوە کـە بـەسـەر ژوورێکـی دیکەدا دەکرایـەوە و بانگی سـیترۆلی کـرد:" ئـەم مۆریتسـە چـاو لێبکـە و ئـەگـەر وەک تـۆ خـەتـەنـە کرابـوو پـێم بڵـێ." سـیترۆل لـەبـەردەم یوهـان داهاتـەوە. لـەبـەر ئـەوەی پێـشتر بانکـەوان بـوو بـە دیقـەت و پـارێزی ژمێریارێکـەوە چاوی لێکـرد. راسـت وەک ئـەوەی سـەروسـاختی لـەگـەڵ ژمارە و حیساب بێ. بە دەست جوان هەرامەکەی پشکنی. پاشان ئاکامی چاولێکردنەکەی خۆی بەم جۆرە بە ئاگاداریی سەرگورد گەیاند:" ئـەگـەر خەتەنەش کرابێ هەر بە ئاستەم چەرمە چەقاڵتەیەکیان لێکردۆتەوە."
"ئەمە یانی چی؟ کراوە یا نەکراوە؟" ناکرێ بە دەقیقی هیچ بڵێم. شوێنی براوێکی کەمی پێوە دیارە. بەڵام ناکرێ بە دڵنیاییەوە بگوترێ ئـەم شـوێنە براوە بۆ خەتەنە کردن بووە، هەروەک ناکرێ بڵێین بەبێ شک لـە ئاکامی

شتێکی دیکەدا بووە." مۆریتس دیوتە کارەکەت چەند ئاڵۆز بووە. سەرباری ئەوەش من فایلەکەت دەنێرم. ئێستا بڕۆ. سیترۆل تۆ لێرە بە و لە نووسینی ڕەشنووسەکەدا یارمەتیم بدە.

یوهان لە نووسینگە هاتە دەرێ و لە کاتێکدا نوقمی فکر و خەیاڵان بوو قایشی کەمەری توند کردەوە.

## (٣٢)

دوای گرتنی یوهان، قەشە کۆرۆگا بە پەلە خۆی گەیاندە پازگا. دەوروبەری کاتژمێر نۆی بەیانی بوو و سەرۆک پازگا تووڕە و دەم لە پووش گەڕابووەوە پازگا. دۆبریسکۆ بە قەشەی گوت: "من تەنیا فەرمانی دەست بەسەرداگرتنم بە دەست گەیشتووە و بە پێی ئەو ئەمرە جووڵاومەتەوە. ناتوانم هیچ زانیارییەکی ترت بدەمێ. منیش هەر بە قەد تۆی لێ‌دەزانم . پرسیار لە فەرماندەیی بکەن." "یوهان مۆریتس لەوێندەرە؟" "ئاگادار نیم. ئاگاداریش بم نایڵێم. ئەوە نهێنیی سەربازییە. بۆ لێدانی مەتەریزیان بردوون. بۆیە ئەو جێگایەی ئەوانیان بردوونێ نابێ ئاشکرا بکرێ."قەشە بۆ ئەو زانیاریانە سوپاسی کرد. دوانیوەڕۆ چووە شار و سەردانی ناوەندی فەرماندەیی کرد. یوهان مۆریتس لەوێ نەبوو. هیچکەس هیچی لە بارەیەوە نەدەزانی. ئەفسەرێکی لاو لە قەشەی پرسی: "جوولەکەیە؟"

"ئیماندارێکی ڕاستەقینەی کڵێسای من بوو." "کەوابوو نەیانهێناوەتە ئێرە. سەردانێکی پازگای گوندەکەی خۆتان بکەوە. دەبێ ئەو ژمارەیەی ئەمیان پێدا ناردۆتە ناوەند، بتاندەنێ. ئەوڕۆ و دوێنێ نەبووە. ئێمە لەو دوو ڕۆژەدا تەنیا چەند جوولەکەیەکیان بۆ ناردووین. وەک جەنابیشت دەڵێی، ئەم جوولەکە نییە، کەوابوو لەناو ئەو تاقمەدا نییە." "ئەو جوولەکە نییە." قەشە دووبارە ئەفسەرەکەی لەوە دڵنیا کردەوە. پاشان خاتری خواست و ڕۆیی. بۆ سبەی بە ژمارەی گۆڕینەوە هاتەوە. هەمان ئەفسەری دوێنێ کە مولازمێک بوو لە پێرستی ناوەکاندا لە ناوی یوهان گەڕا."

"بە داخەوە ناتوانم لەم بارەوە زانیارییەکتان بدەمێ. ئەوە پرسێکی نهێنییە. دەبێ ئیجازەنامەیەک لە وەزارەتی جەنگ وەربگری."

"من تەنیا دەمەوێ بزانم بەند کراوە یان نا و لە کوێیە. ئەمە خۆ نهێنی نییە؟" "ئەو گیراوە، بەلام ناتوانم پێت بڵێم ئێستا لە کوێیە. واتە خۆشمان نازانین. بەڕێیان کردۆتە فەرماندەیی سوپا و لەوێش هیچ زانیارییەک وەرناگیرێ."

## (۳۳)

ئەفسەرە لاوەکە هیچ بەڕێز نەبوو. بە تایبەت دوای ئەوەی ناوی یوهانی لە پێڕستەکەدا دۆزیبووەوە. بە لای لووتی وەلامی دایەوە. قەشە دیسان دەست لە چۆکان بەرەژێر گەڕایەوە. ئەفسەرکە لە پاش سەریەوە بە دەنگی بەرز گوتی: "بە گیانی ناخێری قەشەیە، کەچی بە قەد داشقەچییەک ئەقلی نییە. دوێنێ دەیگوت کابرا ئۆرتۆدۆکسە، کەچی ئەمڕۆ ناوەکەی لە پێڕستی جوولەکاندایە. ئەو جارە ئەگەر مامۆستا هاتەوە تۆزێکی مشتومال بدەن."

قەشە کۆرۆگا بە نامەیەک مەسەلەی گیرانی یوهانی لە کوڕەکەی گەیاند. تکای لێکرد بچێتە وەزارەتی جەنگ و فەماندەیی سوپا و هەوڵ بدا یوهان بەربدرێ. وەلامی ترایان دڵی حەساندەوە، ترایان نووسیبووی هەموو ناسیاوە دەست رۆیشتووەکانی بەڵێنیان داوەتێ بە زوویی یوهان ئازاد بکرێ. دوو، ئینجا سێ و پاشان چوار حەفتە بەسەر هاتنی نامەکەدا تێپەڕی. دوو مانگی پێچوو و هاوین بەسەر چوو، بەلام یوهان مۆریتس هەر نەهاتەوە. قەشە لێبڕا بۆخۆی وە دوای کەوێ. لە ڕێگەی شار تووشی گۆڵدنبێرگ بوو. پیر و زورهان و تێکشاو دەهاتە بهرچاو. قەشە فەرمووی کرد لەگەڵ ئەودا سوار بێ و پێکەوە بچنە شار. پیرە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: "لەوەتی مارکۆ گیراوە هیچ هەواڵی نازانین. من ئەو هەموو پارەیەم لێ سەرف کردووە. هەر لە قوتابخانەوە تا زانکۆی بوخارست و دواجار لە زانکۆی

پاریس. ئێستا کە بۆتە دکتۆر گرتوویانە و ناردوویانە خەندەق هەڵبکەنێ. چما بۆ ئەو جۆرە کارانە دکتۆرای مافی وەرگرتووە؟"

قەشە نانێکی گەرمە تەندووریی لە جانتاکەی دەرهێنا و لەتی کرد. لەتێکی دایە گۆڵدنبێرگ. هەر دووک بە بێدەنگی خەریکی خواردنی نانەکە بوون. جادە خلیسک بوو و ئەسپەکە هێواشتر دەڕۆیی.

"مامۆستا ئاگاداری دەستیان بە سەر خانووەکەمدا گرتووە؟ دەبێ تا چەند رۆژی دی چۆڵی بکەم، دەنا بە تۆبزی وەدەرم دەنێن. خانوویەک کە بە ئارەقی نێوچاوانی خۆم دروستمکردووە. سەرەتا کوڕەکەمیان برد و ئێستاش ماڵەکەم لێ دەستێنن. باشە من تاوانم چییە؟

پیرە بێدەنگ بوو. ئەسپەکە راوەستابوو: "تۆ شاهید بە مامۆستا، من خۆم دەکوژم، خۆم هەڵدەواسم." ئەسپەکە وەرێکەوتەوە. لە نزیک شار گۆڵدنبێرک دابەزی. قەشە چاوی لێبوو چۆن لە نێو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گەڕەکی جوولەکاندا بزر بوو.

## (٣٤)

قەشە بەرەو پارێزگا کەوتە رێ. بۆ ئەوەی ئەسپەکە ماندوو نەبێ لغاوی بۆ شل کردبوو تا بە کەیفی خۆی بڕوا. ئەسپەکە بۆخۆی بەرامبەر دائیرە راوەستا. لەبەر ئەوەی دوو مانگ بوو قەشە زۆربەی رۆژان دەهاتە ئەوێ، ئەسپەکە دەیزانی خاوەنەکەی دەچێتە کوێ. هیچکات نەدەکرا چاوت بە پارێزگار بکەوێ. یا لەوێ نەبوو یان ئەگەر لەوێ بوایە دەیانگوت سەرقاڵە. پێدەچوو قەشە هەرگیز نەتوانێ چاوی پێ‌بکەوێ. هەموو کارمەندە ئاساییەکان و پێشخزمەتەکان قەشەیان دەناسی و هەمیشە بە بزیەکی بە مانای هاودەردییەوە پێشوازیان لێدەکرد، بەڵام بزەی ئەوڕۆیان مانایەکی دیکەی هەبوو.

"جەنابی پارێزگار رێگا دەدا."

کاتژمێرێکی پێچوو تا قەشە توانی چاوی بە پارێزگار بکەوێ. هەروا کە لەبەردەم پارێزگار راوەستابوو گوتی: "لاوێکی کڵێسەکەی من شەش مانگە گیراوە. زۆر سپاست دەکەم بفەرمووی هۆی گیرانەکەی چ بووە. بیستوومە لە یەک لە ئۆردووگا زۆرەملییەکان لەگەڵ جوولەکاندایە. ئەو لاوە رۆمانیایی و مەسیحییەکی ئیماندارە، من خۆم غوسلی تەعمیدم داوە. ئێستا دەمەوێ بەریدەن."

پارێزگار لە وەڵامدا گوتی: "من بە هیچ شێوەیەک ئیجازەی دەست تێوەردان لەم جۆرە کارانە بە کەس نادەم."

"بەڵام ئەو لە خۆرا گیراوە."

"فەرقی نییە. تا ئەو کاتەی لە ئۆردووگای جوولەکانە، رێوشوێنێکی تایبەتی لەبارەوە دەگیرێتە بەر کە هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە. ئەوە لە لایەکیەوە، لە لایەکی دیکەوە کە ئەوەیان بە رای من زۆر گرینگترە و هەر بەو هۆیەش رێگام دای چاوت پێم بکەوێ، ئەوەیە کە ویستم پێتان رابگەیەنم بە هیچ شێوەیەک حەز ناکەم ببینم قەشەکان لە باتی ئەنجامدانی کار و ئەرکی مرۆیی و کڵێسایی خۆیان، بێنە دائیران، بە بڕوای من هەر کەس دەبێ لە قەدەر بەڕەی خۆی پێ رابکێشێ. ویستم لەوە ئاگادارت بکەمەوە. من پێم خۆش نییە لە بارەی ئێوەوە پەنا ببەمە بەر زەبروزەنگ یان غەرامە و سزایەکتان بۆ ببڕمەوە." "هەر کارێک کە بۆ ئاسوودەیی خەڵک بکەین خواپەرستی و خزمەت کردنە بە کڵێسا. من لە پێناوی خوا و کڵێسەدا هەوڵدەدەم یوهان مۆریتس ئازاد بکرێ. ئەمە ئەرکی منە. ئەرکی کەسێکی رۆحانی و خەمخۆری رۆحییە. زوڵمێکی گەورەیان لە یوهان مۆریتس کردووە." "ئەم زوڵم و زۆرە تەنیا لە دنیای خەیاڵی ئێوەدا بوونی هەیە." پاشان پارێزگار دەنگی لێ هەڵبڕی و گوتی: "ئێستا شەڕ لە گۆڕێدایە. ئێمە دژی دوژمن دەجەنگین. کڵێساش دژی دوژمنی مەسیحیەتە. ئێوە لە سەر ئەوە پێدادەگرن، سوود وەرگرتن لە خزمەتی تاکێکی ئەم وڵاتە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە پیرۆز و باڵاکانی نیشتمان، زوڵم و زۆرە؟"

"ئەم تاکە، مرۆڤێکە. ئازادیی ئەو کەسە بێئەوەی یاسا بڕیاری دابێ، لێی زەوتکراوە."

"قسەی قوڕ... ئەگەر ئێمە بۆ هەر کەس ئەوەندەمان کاتی خۆمان بە فیڕۆ بدەین. ئێستا بەلشەڤیکەکان دەگەیشتنە ئێرە و هەموویان لە دار دەدایین، پێش ئەوەی هەوالێیش جەنابت. ئێمە باوەڕمان بەوەیە کە لە ڕێگای خاچی پیرۆزدا دەجەنگین." "کەسێک ڕێز لە مرۆڤ نەگرێ، ناتوانێ ئیدیعا بکا لە پێناوی خاچی پیرۆزدا دەجەنگێ. کەس ناتوانێ هەم بەرگریکار و هەم دژی خاچ بێ."

"کەوابوو تۆ وات پێباشە ئەم موریتسە بەرەڵلا بکەین و ڕێگا بۆ بەلشەڤیکەکان خۆش بکەین تا هێرشمان بکەنە سەر؟ ئەمەش نێو دەنێی خەبات لە پێناوی کلێسادا؟" "تەنانەت بالاترین ئامانجیش ناتوانێ زوڵمێکی کە بە مرۆڤێک دەکرێ قەرەبوو بکاتەوە. توماس ئاکوین دەڵێ:" دادخوازی لە جیندا لە پێناوی نەزمی کۆمەڵگا ئەنجامدەدرێ و دەبێ بە تێگەیشتنی ڕاستەقینەی تاوان پشتئەستوور بێ. کەواتە کەس نابێ کەسێکی تر تەنیا بە پاساوی ڕەچاوکردنی لایەنی بەرژەوەندیی گشتی، ئازار بدات. دیل کردنی مرۆڤێک بە ناوی خاچەوە خۆی تاوانێکی گەورەیە دەرهەق بە خاچ."

"تۆ دڵنیای ئەو هەتیوە جوولەکە نییە؟" "بەڵێ." "کەواتە ئەوە دەهۆکەیە بەسەریان هێناوە. خەتابار دەبێ سزا بدرێ. کێ فەرمانی دەستگیر کردنی دەرکردووە؟"

"نازانم. شەش مانگە منیش ئەو پرسیارە دەکەم. لە پازگا و فەرماندەیی و سوپا و هەموو جێگایەک، هیچ وەلامێکم دەست نەکەوتووە. هەموو جارێ وشەی "نهێنی"م بە ڕوودا دەدەنەوە." "هەر واشە. ئەم کارانە نهێنیکارییان تێدایە. تەنانەت منیش ناتوانم لەوە زیاتر زانیاریت بدەمێ. ئێوە دەبێ سەردانی فەرماندەیی بکەن و ئینجا بە ئیجازەنامەوە بێنەوە لای من. ئەوکات فایلەکان دەگەڕێین. بزانین کێ ئەمرەکەی ئیمزا کردووە. ئەگەر نیازێکی خراپ لە ئارادا بێ دڵنیا بە خەتابار بە شێوەیەک سزا دەدرێ کە ببێتە پەند، بەلام تا ئیجازەنامەیەک لە کاربەدەستانی سەرەوە وەرنەگری، ناتوانی لەو بارەوە بچووکترین هەنگاو بنێی یان کەمترین زانیاری دەست بخەی."

خۆ جووڵاندنێکی پارێزگار نیشانیدا کە گفتوگۆ تەواو بووە، بەڵام قەشە نەبزووت. "باشە دەکرێ، جەنابی پارێزگار، مرۆڤ ئاوا کەوتبێتە زەلکاوی ورێ و نەزانییەوە کە دەنگی هاوچەشنی خۆی کە لەگەڵی دەدوێ، نەبیسێ؟" قەشە بە دەم سەر لەقاندنەوە درێژەی دایێ: "پێم وانییە تۆ لەبارەی داواکەی منەوە هیچ هاوخەمیەکت لەگەڵ من نەبێ. ئاخر تۆش مرۆڤی. مرۆڤ هەستی هەیە. مرۆڤ ئامێر نییە. باشە تێناگەم دەکرێ ئەو زوڵم و غەدرەی لە یوهان مۆریتس کراوە هیچ هەستێک لە تۆدا بێدار نەکاتەوە؟" "گوێ بگرە مامۆستا، دەبێ بڵێم بە تەواوی بەو رووداوە دڵتەنگم، بەڵام ناتوانم لەگەڵتدا بم. تۆ راستدەکەی. بۆیە ئەوە دەڵێم لەبەر ئەوەی بۆخۆشم کوڕە قەشەم، بەڵام مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە من دەست ناخەمە کاروباری لەمەڕ جوولەکە و لژێونێرانەوە. ئەوانە کاری خەتەرن و دوور مەبینە لێیان نزیک ببیەوە بە رووتدا بتەقنەوە. من ئەفسەرم، هەر بۆیە بە چاک و بە خراپ کارم بەو جۆرە کارانە نەداوە." قەشە هەستا. پارێزگار دەستی گوشی:

"پڕ بە دڵ پێم ناخۆشە بۆ ئەو کوڕەی ئێوە چم لە دەست نەهات. ئەرێ ناوی چی بوو؟ ئەگەر بیرم نەچووبێ، مۆریتس؟ بەهەرحاڵ من لە خزمەتدام، هەڵبەت بۆ کاری تر، نەک ئەمەیان."

## (٣٥)

قەشە لە پێش کڵێسەیەک لە قەراغ شار رایگرت. بیری لە ژەندرمەی فانتانا و سەرۆکی دائیرە و ئەفسەرە لاوەکە و لەو پاسەوان و کارمەندانە دەکردەوە کە لە پشت دەرگای ژوورەکانەوە رایاندەگرت و ئازادییان لە یوهان زەوت کردبوو. کڵاوەکەی داگرت و نزای کرد. دوای کەمێکی دی کڵاوەکە قژە سپییەکەی لە بن خۆیدا شاردەوە و عارەبانەکە بەرەو فانتانا وەڕێ کەوت. لەو لاوەتر گۆڵدنبێرگ وەستابوو. ئەویش لە کارەکانی ببۆوە و دەگەڕایەوە فانتانا. کاتێ

گەیشتە بەردەمی، ئەسپەکە راوەستا. ئەسپەکە کابرای مەیفرۆشی دەناسییەوە و دەیزانی قەشە سواری دەکا.

## (٣٦)

سەرۆکی پازگای فانتانا راسپێردرا بوو لیستێکی گشت ماڵ و سامانی جوولەکەکانی ئەو ناوچەیە بگرێ. راپۆرتێکی نووسی و هەموو دارایی گۆڵدنبێرگی پیری یادداشت کرد، بەڵام راپۆرەتەکەی نەنارد. لەبەر ئەوەی دەیزانی یوهان مۆریتسیش ئێستا وا لە ئۆردووگای جوولەکان. کاتی خۆی بە هیچ شێوەیەک یوهانی وەکو جوولەکەیەک نەناردبووە ناوند. بە پێی یاسا، ئەو کاتە، دوو تاقمیان دەگرتن: جوولەکە و پیاوخراپەکان. سەرۆکی پازگاش یوهان مۆریتسی بە ناوی پیاوخراپەوە گرتبوو. ئەوە کارێکی تەواو یاسایی بوو. هەموو کەس دەکرا لە لایەن پازگاوە بە پیاوخراپ لە قەڵەم بدرێ. یاساکان لەو بارەوە تەمومژاوی بوون، بەڵام لە ناوەندی فەرماندەیی ژاندرمە مۆریتس‌یان بە جوولەکە لە قەڵەم دابوو. ئەمە هەڵەی فەرماندەیی ژاندرمە یان باشتر وایە بڵێین هی خودی مۆریتس بوو. لەبەر ئەوەی ناوی جوولەکانی لێبوو. دیارە سەرۆکی پازگا پێی ناخۆش بوو مەسەلەکە ئاوا ئاڵۆز بێ. ئەو پێی وابوو یوهان چەند حەفتەیەک کاری زۆرەملێ دەکا و دێتەوە، بەڵام شەش مانگ تێپەڕیبوو و مۆریتس نەگەڕابووەوە. جا لەو دوایییەدا دەردێکی دیکەش کەوتبووە سەر دەردەکانی پێشوو. دەبوایە سامانی جوولەکان زەوتبکات. بە پێی هەق و دادپەروەری دەبوایە ماڵ و سامانی یوهان داگیر بکرێ، کەچی لەو لاوە لە قەراری فەرماندەییدا بە راشکاوی ناوی دوو جوولەکەی خەڵکی فانتانا هاتبوون: گۆڵدنبێرگ و یوهان مۆریتس. ئەگەر رایگەیاندبا کە یوهان جوولەکە نییە و نابێ ماڵ و دارایییەکەی زەوتبکرێ، لەوانەیە لێژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە پێکبێ کە مادام جوولەکە نییە بۆ بەرێ کراوەتە ئۆردووگای کاری زۆرەملێ. لە حاڵەتێکی وادا ناچار بوو رابگەیێنێ کە یوهانی بە ناوی پیاو خراپەوە

گرتووه نەک جوولەکە. دیارە دۆبریسکۆ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی لێژنەکە نەدەترسا. تەنیا لە سوزانا نیگەران بوو. سۆزانا رەنگبوو هەندێ شت لە دژی بڵێ. سەرۆکی پازگا ناچار دەبوو بۆ دەرباز بوون لەو تەنگەژەیە رێگە چارەیەک بدۆزێتەوە. ئالیرەدا بوو بۆ راوێژ چووە لای گۆڵدنبێرگ. پیرە پێی گوت: "ئەگەر سۆزانا تەلاق لە یوهان وەربگرێ، بەم جۆرە ماڵ و خانووەکەی لە دەست نادا. خۆ سۆزانا جوولەکە نییە. هەموو ئەو جوولەکانەی ژنی مەسیحییان هێناوە وایان کردووە."

ژەندرمە بیری کردەوە کە سوزانا هەرگیز مل بۆ تەلاق راناکێشێ. سۆزانا چاک دەیزانی یوهان جوولەکە نییە. دوور نییە پارێزەرێک بگرێ و ئەو بابەتە ببێتە هۆی دەست پێکردنی لێکۆڵینەوەیەک کە ئاکامەکەی بە زیانی سەرۆکی پازگا بشکێتەوە. گۆلدنبێرگ دیسان گوتی: "تەلاق وەرگرتن زۆر ئاسانە. هەر ئەوەند بەسە نووسراوێک ئیمزا بکا کە بە هۆی جیاوازیی نەتەوەیی داوای تەلاقی کردووە. بەو داوانامەیە تەلاقەکە بە شێوەی ئۆتۆماتیکی، بە ئەنجامدەگا. یاسای نوێ وایە."

## (٣٧)

سەرۆکی پازگا داوانامەیەکی تەلاقی بە ناوی سۆزانا مۆریتس ـ پێشتر یۆردان ـ ئامادە کرد و بۆ ئیمزا بردیە لای سۆزانا و پێی گوت: "مێردەکەت لە ئۆروودگای تایبەت بە جوولەکەکانە و لە هەموو فایلەکاندا ناوی بە جوولەکە تۆمار کراوە. دیارە من دەزانم ئەو جوولەکە نییە، بەڵام خەتای ناوەکەیەتی. دوێنێ فەرمانمان بۆ هاتووە ماڵەکەی زەوتبکەین. باشە بۆ خاتری خوا بۆچی ناوی مۆریتسە؟" سۆزانا لە کاتێکدا ددانی لێ دە چیرەوە دەبرد گوێی دابۆیێ. دوو دڵۆپ فرمێسکی بە چاواندا هاتە خوارێ. چاوێکی مانداری لە کابرای ژەندرمە کرد و گوتی: "تۆ مێردەکەت لێستاندم. ئێستا دەتهەوێ ماڵەکەشم لێ بستێنی؟

بابی ژەندرمەش بی بەو دەستانەی خۆم دەتخنکێنم. بەردی خاترجەمی وە بن سەرت بدە ناتوانی ماڵەکەم داگیر بکەی."

سۆزانا هەر داهاتەوە و لێی ڕۆبۆوە گاشەیەک و بەرەو دەرگا ڕەپێی نا. کابرای ژەندرمە گوتی: "من نامەوێ ماڵەکەت لێ بستێنم. من بۆیە ئەو کاغەزەم هێناوە ئیمزای بکەی تا ماڵەکەت لە دەست نەچێ." پاشان داوانامەی تەڵاقەکەی بە قەڵەمێکەوە بۆ ڕاداشت. سۆزانا وەریگرت، بەڵام نەیتوانی بیخوێنێتەوە. چاوی ببوونە گومی فرمێسک.

"چی لێ نووسراوە؟" "داوای تەڵاق. هەڵبەت ئەوە هەر تەشریفاتێکە بۆ ئەوەی ماڵەکەت لە دەست نەدەی." سۆزانا بە سەریدا قیژاند: "تۆ دەتەوێ بە تەڵاقدانم بدەی؟" دەموچاوی وەک هی دێڵە شێرێکی لێهاتبوو، دەتگوت دەیەوێ کابرای ژەندرمە لە بەریەک هەڵدڕێ. کابرا لە ناو دەرگاکە دەستی سۆزانای گرت و هەوڵیدا ئارامی بکاتەوە: "ئەوە هەر ڕۆتینیاتە، کەیفی خۆتە، ئەگینا دەبێ تا چەند ڕۆژی دی خانووەکە چۆڵ بکەی. بەو زستانە ئەو منداڵانە دەبەیە کوێ؟" سۆزانا بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست گوێی لە وشەی تەڵاق بێ: "یانی شووی منە. خۆم دەکووژم بەڵام لێی جیا نابمەوە."

کابرای ژەندرمە کاتژمێرێک لەبەر دەرگا ڕاوەستا. سۆزانا کە بە گریان شل-وکوت ببوو چووەوە ژوورێ. زۆری پێنەچوو هاتە دەرێ و خڕکە بەردێکی لە کابرای ژەندەرمە هاڵاند. ئینجا لێی ڕۆبووە پاچێک، بەڵام دواجار بیری کردەوە وا باشترە نووسراوەکە ئیمزا بکا. یانی کە گەڕایەوە خۆی هەموو شتێک دەزانێ و دەیبەخشێ. ئەو خۆی هەست بەوە دەکا کە سۆزانا پێی ئەمەگدار بووە و تەنیا لە پێناوی منداڵەکان ئەو کارەی کردووە. لە هەمووی گرنگتر "ژن بوون"ی خۆی بۆ پاراستووە. یانی کە بێتەوە خوی هەموو شتێکی بۆ دەردەکەوێ. نووسراوەکەی ئیمزا کرد. سەرۆکی پازگا پەرە کاغەزەکەی خستە نێوان دوو قۆپچەی پاڵتۆکەی و ڕۆیشت. ئێستا بە خەیاڵی ئاسوودەوە خەوی لێدەکەوت. ئیدی ترسی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەکی لە دڵدا نەمابوو.

## (٣٨)

جووله‌كه‌كان به‌ ئاسانی ده‌یانتوانی له‌ ئۆردووگا رابكه‌ن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ته‌نیا پێنج سه‌رباز ئێشكیان ده‌گرت، به‌ڵام ده‌یانزانی راشبكه‌ن ده‌گیرێنه‌وه. له‌و نێوه‌دا ته‌نیا ماركۆ جارێك هه‌وڵی راكردنی دا، به‌ڵام ئه‌ویش به‌ختی نه‌یگرت و كه‌وته‌وه‌ ده‌ست سه‌رگورد و گێڕایانه‌وه‌ ئۆردووگا. پێش ئه‌وه‌ی كار ده‌ست پێبكا به‌ندییه‌كانی كۆ كردنه‌وه‌ و گوتی: "ده‌ڵێن چی ماركۆ گۆڵدنبێرگ بنێرمه‌ دادگای سه‌ربازی؟ یان به‌ ئێوه‌ی بسپێرم چاوه‌دێری بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی تووشی ناماقووڵیی وا نه‌بێته‌وه."

به‌ندییه‌كان ئه‌و به‌رپرسیاره‌تییه‌یان وه‌ ئه‌ستۆ گرت. ماركۆ تا ئه‌و رۆژه‌ بۆ هه‌ڵقه‌ندنی خه‌نده‌كه‌كه‌ یارمه‌تی نه‌دابوون. دایم نه‌خۆش بوو. بۆیه‌ كاری نووسینگه‌یان دابۆیه‌، به‌ڵام له‌وێش كاریان نه‌مابوو. "لانگیل"ی پیر پاچێكی دا ده‌ستی و پێی نیشاندا چی بكات، به‌ڵام ماركۆ ملی نه‌دا و گوتی: "ئه‌گه‌ر پێلم له‌ بن‌را ببڕنه‌وه‌ ده‌ست له‌ ره‌ش‌وسپی نادەم. ئه‌و كاره‌ به‌ پێچه‌وانه‌ی بۆچوونه‌ سیاسییه‌كانمه."

به‌ندییه‌كان ده‌وریان دابوو- هیچ كامیان بۆ بیر و بۆچوونی سیاسیی خۆیان له‌وێ كاریان نه‌ده‌كرد. بۆیه‌ زۆر تامه‌زرۆ بوون بزانن گۆڵدنبێرگ مه‌به‌ستی له‌و وته‌یه‌ چییه: "ئه‌و خه‌نده‌كه‌ بۆیه‌ لێده‌درێ تا رێگه‌ له‌ هاتنی له‌شكری "سوور بگیرێ، من كۆمۆنیستم و به‌ هیچ شێوه‌یه‌ك ناتوانم یارمه‌تیی ئه‌و كاره‌ بده‌م."

بوێریی گۆڵدنبێرگ كاری له‌ هه‌مووان كردبوو. هه‌موو له‌گه‌ڵیدا هاوڕا بوون، به‌ڵام هه‌ر كه‌ زانیان ئه‌گه‌ر ماركۆ كار نه‌كا ده‌بێ ئه‌وان جه‌وره‌كه‌ی بكێشن ورده‌ ورده‌ هاوڕایه‌تییه‌كه‌ له‌ ناو چوو. (لانگیل)ی پیر داوای له‌ جووله‌كه‌كان كرد ده‌ست به‌ كار بكه‌ن و به‌ڵێنی دا خۆی كێشه‌كه‌ چاره‌سه‌ر بكا. كاتێ هه‌موویان سه‌رقاڵی كار بوون چووه‌ لای ماركۆ. ماركۆ ده‌ست له‌ گیرفاندا كه‌ له‌وێ دانیشتبوو. "ئێمه‌ی جووله‌كه‌ تایبه‌تمه‌ندییه‌كمان هه‌یه‌ كه‌ لای هیچ نه‌ته‌وه‌یه‌كی دیكه‌ی رۆژئاوا نابینرێ. ئێمه‌ هه‌ستی به‌راورد كردنمان هه‌یه. گه‌لی ئێمه‌ بایی ئه‌وه‌نده‌ زیره‌كه‌ كه‌ تێگه‌یشتن

و لێبوردەیی پێ لە دژایەتی و دووبەرەکی باشتر بێ. ئێمە ئەو خەسڵەتەمان لە ڕۆژهەلاتەوە لەگەڵ خۆمان هێناوە، تێدەگەی مەبەستم چییە؟ ڕۆمانیایی پەندێکیان هەیە، دەڵێ "ئاقڵ کەسێکە گورگ و مەڕ پێکەوە ئاشت بکاتەوە."[1] تۆ گوێت نەداوەتە ئەم پێوانەیەی عەقڵ، ڕێوشوێنێکی دیکەت گرتۆتە بەر. تۆ لە بیرت کردووە کە ڕەفتارێکی وا تەنیا لە خەڵکانی دواکەوتوو و دڕندە دەوەشێتەوە.

گەلانی زیرەک و شارستانی ئەو جیاوازییەیان هەیە کە دەتوانن لە زەمان و بارۆدۆخی یەکساندا باشترین ڕەفتار هەڵبژێرن و بیگرنە بەر. ئەوان دەتوانن گونجاوترین شێواز هەڵبژێرن. ئێستا ئەگەر عەقڵ و زیرەکی ژێر پێ بنێی هەڵەکە لای تۆیە. من زانیومە کە تۆ ناتەوێ یارمەتیمان بدەی..."

"بە هیچ شێوەیەک."ی "تا لەو ئۆردووگایەدای دەبێ ئەم قوڕدەماخی و خێلەسەرییە وەلا بنێی. تۆ تا ئێستا لە نەخۆشخانە بووی و لە ئەمڕۆ بە دواوە..."

"دەزانم، بەلام من لە هەڵکەندنی خەندەکدا یارمەتیتان نادەم."

"ئەگەر تۆ نەیکەی ئێمە دەبێ لە جیاتی تۆش کار بکەین. ئەمڕۆ کردمان، بەلام خۆ ناکرێ تا سەر تۆ دەست لە گیرفان بنێی و بخولێیتەوە و ئێمە جەوری تۆ بکێشین." "باشە کێ گوتوویە لە باتی من کار بکەن؟" مارکۆ بزەیەکی گاڵتەجاڕانەی هاتێ و درێژەی بە قسان دا: "ئێوە خۆتان حەز دەکەن لە جیاتی منیش کار بکەن." "خۆت دەزانی ئێمەش ئەو کارەمان پێخۆش نییە، بەلام ناشتوانین تۆ بە دەستەوە بدەین. لەبەر ئەوەی ئەودەم سەرگورد ڕاپێچی دادگای سەربازیت دەکا." "جا چ بوو، ڕاپۆرت بدەن، من گێرەشێوێنم، بۆ نایدەن؟" "گوێ بگرە مارکۆ، تۆ دکتورای مافی و دۆخەکە باش هەستپێدەکەی. ئێمە ناتوانین ڕاپۆرتی وا بدەین. ئەوە لە فاشیستان دەوەشێتەوە، لە دوژمنانی ئێمە، بەلام خۆ ناتوانین جەوری تۆش بکێشین. هەر ئەوەندەی کاری خۆمان پێبکرێ، بۆخۆی زۆرە." "ئەم خوتبە پڕسوزەی بۆ چییە؟ ئەگەر پێت وایە دەتوانی قەناعەتم پێبهێنی، بزانە کاتی خۆت بە فیڕۆ دەدەی." ئەمجارەش مارکۆ زەردەیەکی گاڵتەجاڕانەی بۆ کرد.

---

1 لە ئیدۆیۆمە سەرەکییەکەدا دەڵێ: ئاقڵ کەسێکە بزن و کەلەم پێکەوە ئاشت بکاتەوە." وەرگێڕ

"من دەبێ زۆر ساویلکە بم بمەوێ قەناعەت بە تۆ بێنم. تۆ مرۆڤێکی کۆنەپەرست و کەللەوشکی و کەسانی وەک تۆ ئاژەڵی درندەن و پیاو نابێ وێیان بکەوێ، بەڵام مارکۆ خۆ تۆ دایک و باوکت هەیە. دەزانم بیر لەوان ناکەیەوە، بەڵام ئێمە بیر لە باوک و دایکی تۆ دەکەینەوە. ئەوان چاوەنۆڕی تۆن. تۆ جوولەکەی.

ئێمە ئەو مەسەلەیە لەبیر ناکەین. تو برا و هاوخوێنی مەی. بۆیە من هەوڵمدا رێگە چارەیەک بدۆزمەوە تا کۆنەپەرستیی تۆ لەگەڵ هەستی خۆمان بگەیەنمە ئەنجامێک."

بەندییەکان بەرە بەرە دەوریان دان. بە سەرنج و تامەزرۆییەکی زۆرەوە گوێیان دابووە ئەو دەمەتەقەیە."تۆ خەندەکمان لەگەڵ لێنادەی، لەبەر ئەوەی لە بەردەم پێشرەویی هاوبیرەکانت، سەربازانی لەشکری سوور بە لەمپەری دەزانی. تۆ ئامادەی گیانت فیدا بکەی، بەڵام ناچار نەکریی ئەم کارە بکەی. زۆر باشە، ئێمە ناچارت ناکەین ئەو کارە بکەی، بەڵام هیچ نەبێ خزمەتێکی دی وە ئەستۆ بگرە. دەڵێی چی، لە باتی هەلکەندنی خەندەک ئاودەسخانەکان خاوێن بکەیەوە؟ ئێستا ئێمە بە نۆرە خاوێنیان دەکەینەوە. ئەگەر تۆ هەموو رۆژێ ئەم کارە بکەی ئەودەم هەر کەس نۆرە خاوێن کردنەوەی بوو لە جیاتی تۆ کار دەکا، بەڵام مارکۆ، دەبێ ئەوەت پێ بڵێم ئەوە کارێکی یەکجار زەحمەت و پۆخڵە."لانگیل دڵنیا بوو مەسەلەی هەڵبژادنی یەک لەو دوو رێگایە مل بە گۆڵدنبێرگ رادەکێشێ کە لە هەڵکەندنی خەندەکدا کار بکا. چاک دەیزانی کەس بەرگەی دوو رۆژ کاری خاوێن کردنەوەی ئاودەستخانە ناگری.

"دەباشە، بیری لێ بکەوە، تا شەوێ دەرفەتت دەدەمێ."" پێویستیم بە بیرکردنەوە نییە. بریاری خۆم داوە."" کامیان؟"" ئاشکرایە، کاری خاوێن کردنەوەی ئاودەستخانە، ئەمە هەولێکە بۆ بەرژەوەندی گشتی. پێم باشە ئاودەستخانەکان خاوێن بکەمەوە، نەک لە هەڵکەندنی خەندەکدا کار بکەم کە کارێکی تاوانبارانە و دواکەوتووانە و فاشیستییە و بە دەستی خۆم تەگەرە بخەمە سەر رێگای لەشکری سوور."

لانگیل رەنگی هەڵبزرکا. دەیدی پلانەکەی سەری نەگرتووە.

"پێم وایە باشترە زیاتری بیر لێ بکەیەوە، ئینجا بڕیار بدەی؟"
مارکۆ وەڵامی دایەوە: "من بڕیاری خۆم داوە." جوولەکەکان شتاق نەیاندەوێرا گۆڵدنبێرگ بدوێنن. تەنیا یوهان پێی گوت:"
مارکۆ ئەوە شێت بووی؟ دەتەوێ هەموو ڕۆژێ ئاودەستخانەکان خاوێن بکەیەوە؟"مارکۆ نەڕاندی: "لاکەوە لە پێش چاوم، خۆم دەزانم چ دەکەم":
یوهان گوتی: "بەڵام وا نییە." لەو کاتەدا تێگەیی کە چاولێکردنی مارکۆ گۆلدنبێرگ لە نیگای یۆرگ یۆردان دەکا. بۆیە فیزماڵکی دایە و ڕۆیی.

## (٣٩)

ڕۆژی دواتر ئازاری ویژدان دەردی بە لانگیل کرد. خۆی سەرکۆنە دەکرد کە بە پلانەکەی، مارکۆی تووشی ئەو کارە کردووە. دوای نیوەڕۆ بە نیازی ئەوەی کاری خاوێن کردنەوەی ئاودەستخانەکانی لە کۆڵ بکاتەوە، چووە لای مارکۆ. هەستیدەکرد ئەو مارکۆی تووشی ئەم کارە کردووە. مارکۆ هێشتا لێ نەببۆوە. تەنەکەی پڕ لە پیسایی کە لە جیاتی ئاودەسخانە بەکار دەبران لە قووڵکەکان دەردەهێنا و دەیبردن لە دووری ئۆردووگا لە مەزرایە دەیڕشتن. ڕۆژی پێشوو باران باریبوو ئێستا ئاودەستخانەکان پڕ لە قوڕ و چڵپاو بوون. مارکۆ هەمیشە دەردەدار بوو. سینگی دەئێشا و ئێستا بڕستی لێ بڕابوو. لانگیل پێی گوت: "پێم وایە ناچاری واز لەو کارە بهێنی. ئەوە کاری تۆ نییە مارکۆ."

گۆڵدنبێگ لە چاڵەکەدا بوو و بە پێمەرە پیسایی دەکردە ناو تەنەکەوە. لانگیل گوتی: "من ئەگەر لە جیاتی تۆ بام یەک ڕۆژیش نەمدەتوانی لە نێو ئەو گەندوگوەدا هەڵکەم."
مارکۆ وەڵامی نەدایەوە. بە زەحمەت خوی بەسەر پێوە گرتبوو. بە ڕکەوە لە گژ کارەکە ڕاچووبوو. تەنەکەکەی هەڵگرت و بە پەنا (لانگیل)دا تێپەڕی تا لە مەزرایە قلپی کاتەوە. کاتێ گەڕایەوە لانگیل گوتی: "بەرگ و تووکی سەرت شەوێ بۆگەنیوێکی دەدەن تا بەیانی خەوت لێناکەوێ." دەیویست ئینجا پێی بڵێ

کە لە سبەینێوە دەتوانێ سەرلەنوێ خەریکی کاری نوسینگە بێتەوە، بەڵام مارکۆ چیتر تاقەتی نەبوو گوێی لێ بگرێ. چیدی خۆی پێنەگیرا. هێشتا پێمەڕەکەی پێ-بوو. بەرزی کردەوە، چاوی نووقاند و بە توندی دایوەشاند. بە لای تیژی پێمەڕەکە سەری لانگیلی قەڵاشت. پیرە نسکۆی برد. مارکۆ پێش چاوی تاریک داهات. پەنجەکانی دەسکە پێمەڕەیان دەگوشی و جارێکی دی دایوەشاند. یەکی دیکەی داهێنایەوە. لێدانەکە بە خورایی بوو. لەبەر ئەوەی لانگیلی پیر دەمێک بوو حەیاتی رەشی لێ بڕابوو. مارکۆ پێمەڕەکەی بە دەستەوە بوو، لە جێگەی خۆی بێدەنگ راوەستا. چاوی هەڵهێنا و پیرەی دی لە بەر پێیانی کەوتووە، بە نێوچاوانی داقەڵشیوەوە. ئەمە لە رووی نائومێدییەوە و لە خەفەتان رووی دابوو، بەڵام گۆڵدنبێرگ هەستی بە پەشیمانی نەدەکرد.

## (٤٠)

چوار مانگ بەسەر ئەو رووداوەدا تێپەڕیبوو. یوهان ئەو رۆژەی هاتبۆوە بیر کە کاسەسەری پیرەپیاوی کڵۆل چۆن ببووە دوو کەرت. پاشان سەربازەکان مارکۆیان لە نێو گەمارۆی سەرنێزاندا لە ئۆردووگا وە دەر نا. هەموو ئەو رووداوانە لە بەرچاوی ئەو سەر بە رابردوویەکی دوور بوون. لە خۆی دەپرسی باشە ئەو رووداوە چەند ساڵ لەمەوبەر نەبوو؟ مردوو زوو فەرامۆش دەکرێن. مارکۆ نەمردبوو، بەڵام کەسێک لە زینداندا مرۆڤ بکوژێ دەبێ لە رێزی مردووانی دابنێی. ئەو رۆژە بەفر دەباری. سەرگورد رایگەیاند دەستەیەک بۆ لێکۆڵینەوە دێن. بڕیار وا بوو ژەنەراڵێک بێ. پاشان بە جددیەتێکی زۆرەوە گوتی: "ئێمە هەروا چاوەڕوانی تەشریف هێنانی خاوەنشکۆ پادشا دەکەین. خاوەنشکۆ پادشا حەز دەکەن ئەو خەندەکەی ئێمە لێماننداوە بەسەر بکەنەوە. خودی رێزداریان نەخشەی لێدانی خەندەکەکەی کێشاوە و ئێستاش پێیان خۆشە ئاکامی کارەکەیان ببینن. لە خەیاڵی یوهاندا بیرەوەریی مارکۆ کە لە "ئۆکناسالتز" خەریکی هەڵکەندنی عەرز بوو لەگەڵ وێنەی پادشا تێکەڵ بووبوو. پادشای دەهاتە بەرچاو لە پشت مێزێک دانیشتووە قەڵەمێکی

داری بە دەستەوەیە و نەخشەی خەندەکەکە دەکێشێ. خەندەکەکە زۆر درێژ بوو. دەیانگوت رووبەرەکەی سەد کیلۆمەترە، سەدان هەزار بەندی لە خەندەکەدا کاریان دەکرد، بەڵام هەر کەس تەنیا ئەو بەشەی ئاگا لێبوو کە خۆی کاری تێدا دەکرد. خەندەکەکە سێ مەتر قووڵ بوو و دیوارەکانی خوار و خێچ بوون. یوهان هەوڵیدا دیمەنی خەندەکەکە پاش ئەوەی ئاوی تێدەکرێ، بهێنێتە بەرچاو خۆی، دەیانگوت لە کاتی ئاشتیدا بۆ هاتوچۆی پاپۆڕان کەڵکی لێوەردەگیرێ، بەڵام هۆی سەرەکیی لێدانەکەی هەر ئەوە بوو ببێتە لەمپەرێک لە هەمبەر ئەگەری هاتنەپێشەوەی لەشکری سوور، دیارە ئەگەر وێرابایان هێرش بکەنە خاکی رۆمانیا. ئەم کارەش ئاشکرایە دەبوو بە نهێنی بمێنێتەوە. سەرگورد وای گوتبوو. یوهان هەندێ جار پادشای دەهاتە خەوێ بە چپە راوێژی بە فەرماندەکانی سوپا دەکرد. ئەوان لە بارەی ئەو خەندەکە کە خۆی، یوهان مۆریتس، کاری تێدا کردبوو، دەدوان و پرس و رایان دەکرد. بە یوهان و بەندییەکانی دیکەیان گوتبوو مافی ئەویان نییە نامە بۆ ژن و منداڵ و دایک و بابیان بنووسن. حکوومەت لەوە دەترسا نهێنیی لێدانی خەندەکەکە ئاشکرا بێ. چونکە رووس، سەرگورد واتەنی، لە هەموو شوێنێک سیخوڕیان هەن. سەرگورد دەیگوت: "پۆلیس چەندین جار سیخوڕی دوژمنی دەستگیر کردووە کە ویستوویانە وێنەی خەندەکەکە بگرن." یوهان بە ئاوات بوو دوای بڕانەوەی شەڕ، رۆژێک لەگەڵ سۆزانا بێنە ئێرە و ئەو شوێنەی کاری تێدا کردووە بە ژن و منداڵەکانی نیشانبدا. ئەودەم بێگومان خەندەکەکە پڕ لە ئاو دەبێ و دیمەنی ئەو ناوە دەگۆڕێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو شوێنەی کاری تێدا کردووە، دەدۆزێتەوە. حەتمەن منداڵەکان سەریان سوڕ دەمێنێ و ئینجا ئەو منداڵانەی باوکی وایان نەبووە تا کارێکی ئاوەها مەزن بکا، ئێرەییان پێدەبەن. سەرەتاکان بیری ماڵەوە ئازاری دەدا. بڵێی خشتەکان خراپ نەبووبن؟ بڵێی سۆزانا دارەکانی لە لێروارەوە هێنابنەوە ماڵێ، یان خەرمانی بە باشی هەڵگرتبێ؟ وەی سەرەتا ئەو فکر و خەیاڵانە نەیاندەهێشت خەو بچێتە چاوی. دواتر تا دەهات کەمتر بیری لەو مەسەلانە دەکردەوە. بێگومان سۆزانا هەموو کارەکانی راپەڕاندوون. هەر کارێکی بە دەست و مەچەکی ژنانەی سۆزاناش نەکرابێ،

بۆخۆی کە گەڕایەوە رایاندەپەڕێنێ. لەو رۆژەوە کە سەرگورد پرسیاری لێکردبوو و پاشان ئەمری پێکردبوو شەروالەکەی داکەنێ، یوهان چاوەنۆڕی دەکرد ئازاد بکرێ. لەبەر خۆیەوە وای بۆ دەچوو دەمێک فەرمانی رزگار بوونی دەرچووە، بەڵام ئەوان ناتوانن تا تەواو بوونی کاری خەندەکەکە بەری بدەن، بەڵام ئێستا کە پادشا و دەست و دایرەی بۆ بەسەرکردنەوەی خەندەکەکە دێن، دیارە کارەکە خەڵاس بووە و ئەویش بەر دەبێ. یوهان هیچ بوغز و غەرەزی لە حکوومەت دانەگرتبوو کە تووشی ئەو بێگارەی کردووە. سەرەتا رقی لەو سەربازە هەڵگرتبوو کە لە فانتاناوە هێنابوویە ناوەندی فەرماندەیی. پاشان رقی لە سەرۆکی پازگا هەستابوو کە دەستی بەسەر داگرتبوو و ئێستاش لەسەر ئەو باوەڕەی مابوو، بەڵام ئاگری توورەییەکەی دامرکابوو. ئەگەر رۆژێک لە رۆژان بگەڕایەتەوە گوند و تووشی سەرۆکی پازگا بوایە بێشک کڵاوی لەسەر دادەگرت و سڵاوی لێدەکرد. وەک جاری جاران. تێپەڕینی زەمان هەموو شتێک لە بیر مرۆڤ دەباتەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت زۆری پێناچێ دەچێتەوە گوندەکەی خۆی. گەلێکی ئارەزووی ژنەکەی و فانتانا کردبوو. بێگومان منداڵەکانی ئێستا تەواو گەورە بوونە. حەتمەن کە خۆی بە ماڵێدا دەکاتەوە "پیترۆ" بەرەو پیرییەوە دێ. یوهان خوی بە دەست خەون و خەیاڵانەوە دا. خۆی دەبینی پێ دەنێتەوە ماڵەکەی خۆی. پیترۆ لە باوەش دەگرێ و ئەوەی چووکتریان - نیکۆلای - بە خۆیەوە دەگوشێ. ئینجا سەربردەی خۆی بۆ سۆزانا دەگێڕێتەوە، بەڵام قەت باسی ئەو تێهەڵدانانە ناکا کە خواردوونی، هەروەها برسی بوونەکانی خۆی لێ دەشارێتەوە. باشە بۆ بەو قسانە سۆزانا ئازار بدا؟ بەڵام ئەوە کە چۆن لە ئۆردووگا فێری زمانی جوولەکان بوو و چۆن هیچکەس بڕوای نەدەکرد خەڵکی رومانیا بێ، ئەوانەی هەموو دەگێڕانەوە. تا ئەو ساتەوەختەی کە سەرگورد ئەمری پێکرد شەروالەکەی دابکێشێ کە بتوانێ چاو لە ... وەی کە سۆزانا چەند پێدەکەنێ. پاشان سەرگورد ئەمری بە سیترۆل کرد ئەویش چاوێکی لێ بکا، بەڵام سۆزانا خۆی پێوە دەنووسێنێ و بە گوێیدا دەچرپێنێ: "تۆ مێردی خۆمی و لای من لە هەتاو خۆشەویستتری."

بەم جۆرە یوهان لەگەڵ خەون و خەیاڵی خۆی دەژیا و چاوەڕوانی هاتنی ژەنەراڵی دەکرد. ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو ژەنەڕاڵ بێ، گوتیان سبەی دێت و بەندییەکان کە بە سێ ریز لە لێواری خەندەکەکە ریز ببوون بڵاوەیان کرد. یوهانیان بانگ کردە نووسینگە. سیترۆل پێی گوت: "سەرگورد دەیهەوێ چاوی پێت بکەوێ."

یوهان دڵەکوتەیەکی توندی وێکەوتبوو. دڵنیا بوو فەرمانی ئازاد بوونی هاتووە و لەبەر ئەوە سەرگورد داوای کردووە. گەرچی دەیتوانی خۆشی و شادمانیی خۆی بشارێتەوە، بەڵام هیچی لەبارەی کارەکەی سەرگورد لە ستیرۆل نەپرسی.

سەرگورد بەرگێکی نوێی کردبووە بەر. عەرزەکەیان بۆ سەردانی ژنەڕاڵ پاک کردبۆوە و هەر بریقەی دەهات. مێزی نووسینەکەشیان کاغەزی شینی بێ پەلە تێوە پێچابوو. یوهان چەستێکی لێدا. بە زەحمەت خۆی پێ رادەگیرا. لەگەڵ ئەوەشدا وای هەڵسوکەوت دەکرد وەک ئەوەی ئاگای لە هیچ نەبێ. وەسەر خۆی نەدەهێنا کە وەک منداڵێک بە خەبەری ڕزگار بوونی خۆشحاڵە. لەسەر کورسییەکەی دیکە نزیک سەرگورد، دکتور ساموئێل ئابرامۆڤیچی دانیشتبوو. دکتۆریش بەندی بوو، بەڵام توانیبووی برادەرایەتی لەگەڵ سەرگورد پەیدا بکا و بەم جۆرە هەموو دەمێ لە نووسینگە لە لای وی بوو. (سیترۆل)یش لە سووچێکی ژوورەکەدا لە پشت مێزێکی نوێپۆش دانیشتبوو. هەموو جددی دیار بوون. دوای کەمێک سەرگورد گوتی: "یوهان ژنەکەت تەڵاقی لێ وەرگرتووی، ئەو ئیدی هاوسەری تۆ نییە." و لە کاتێکدا لە پەستا دەستی لە ریشی وەردەدا درێژەی دایێ: "فەرمانی تەڵاقیان بۆ ئێمە ناردووە. تۆ دەبێ ئیمزای بکەی بۆ ئەوەی دەربکەوێ پێمان ڕاگەیاندووی." سەرگورد نووسراوێکی لە پێش یوهان دانا و قەڵەمێکی دایە دەست. یوهان لە جێی خۆی نەبزووت.

"لەبەر جیاوازیی نەتەوەیی داوایی تەڵاقی کردووە. ژنەکەی تۆ ئیدی نایهەوێ ژنی جوولەکەیەک بێ. سەیرە تۆ چیرۆکی مەسیحی و ڕۆمانیایی رەسەن بوونی خۆت بۆ من هەڵبەستبوو. تۆ نەتدەزانی دەگەڵ پیرە ڕێوییەکی وەک من تێکەوتووی؟ سوپاس بۆ خوا من داوانامەکەی تۆم نەنارد. چاکم کرد نەمنارد. تەماشا ژنەکەت تەڵاقت لێ وەردەگرێ لەبەر ئەوەی جوولەکەی.

"دیاره ئەو لە هەموو کەس باشتر دەزانێ تۆ جوولەکەی یان نا. وا نییە؟"
سەرگورد قاقا پێکەنی، بەڵام کاتێ چاوی بە ڕەنگی پەڕیوی یوهان کەوت، پێکەنینەکەی راگرت و گوتی: "ژن وان، هێشتا گوندەکەی خۆت بەجێ نەهێشتووە یەکێکی دیکەی بۆ خۆی دیوەتەوە. بۆ ئەو جۆرە ژنانە ژیان لە خۆت تاڵ مەکە. ژن هەموو حیزن."یوهان وەها مۆڕەی لە سەرگورد دەکرد دەتگوت هاکا پارچە پارچەی بکا. نەیدەتوانی گوێی لەوە بێ سەرگورد بە ژنەکەی بڵێی قەحبە. تووڕەیی لە هەناوی بەربووبوو. هەرچەند هەوڵیدەدا بەسەر خۆیدا زاڵبێ، بەڵام بوغز و کوڵەگرِوو ئەوکی ڕێکدەگوشی. بە سەرگوردی گوت: "ژنی من... حیز نییە.."
"ڕاست دەکەی. تۆ پیاوێکی ژن حیز نی. لەبەر ئەوەی ئەسڵەن ژنت نییە. واتە هەتبوو، بەڵام تا..."
سەرگورد کاغەزەکەی کێشا پێش خۆی و خوێندییەوە. "تا ڕۆژی دەی بەفرانبار لەو ڕۆژەوە تەڵاقەکە ڕەسمی بووە، لەو کاتەوە تۆ ڕەبەنی."
سەرگورد پێکەنی. تەنانەت گۆشەی لێوی دکتۆر ئابرامۆڤیچی‌یش بزەیەکی پێوە دیار بوو."ژنەکەم تەڵاقی لێ وەرنەگرتووم. من باش دەیناسم." "ئەوە ئیدی پەیوەندی بە خۆتانەوە هەیە. جارێ تۆ ئەم کاغەزە ئیمزا بکە بۆ ئەوەی بزانن کاغەزەکەت دیتووە و دەزانی لەوە بەدوا ڕەبەنی." "من سەڵت نیم." "چی دەڵێی بیڵێ. تۆ ئەو نووسراوەیە ئیمزا بکە." یوهان چاوێکی لە قەڵەمەکە کرد کە بە دەستی سەرگوردەوە بوو و گوتی:"من ئیمزای ناکەم."سەرگورد ئیدی قەڵس ببوو. بیری کەوەتەوە ئەم سەربازێکە و وەڵامەکەی یوهان بە دژی نەزم و دیسیپلینە. کەوابوو ئەمری کرد: "ئیمزای بکە، دەزانی لە کوێیە؟"یوهان قەڵەمەکەی وەرگرت و نێوی خۆی لە سووچێکی کاغەزەکە نووسی. دوای ئەوەی ناوەکەی ڕاست لەو شوێنە نووسی کە سەرگورد بۆی دەستنیشان کردبوو، قەڵەمەکەی لەسەر مێزەکە دانا و ویستی وەدەر کەوێ. چاوی پڕ ببوون لە فرمێسک و سەری لە گێژەوە دەهات."بیخوێنەوە با بزانی چیت ئیمزا کردووە.""پێویست ناکا. من دەزانم ئەوەی ئیمزام کردووە ڕاست نییە:"دەستی بەرەو کێلوونی دەرگاکە درێژ کرد،

بەڵام بەر هیچ نەکەوت. بە ئاشکرا دیار بوو دەستی دەلەرزێ. دکتۆر ئابرامۆڤیچی قوتووی جغارەکەی بۆ راگرت و گوتی: "ڕاوەستە. جغارەیەک بکێشە." یوهان کەمێکی بیر کردەوە. پاشان جغارەیەکی دەست دایە و دەستی بە کێشانی کرد، بەڵام نەیزانیبوو دکتۆر کەی چەخماغی بۆ لێداوە و کەی جغارەکەی داگیرساندووە. تەنیا وێنەی بڵێسەی چەخماخەکەی دەبینی کە بە هەموو لایەکدا دەگەڕا و تا دەهات گەورە دەبووەوە. دکتۆر لێی پرسی: "زارۆکت هەن؟"یوهان وەک ئەوەی لە خەو راپەڕیبێ وەڵامی دایەوە. دەنگی لە زاری نەناسیاوێکەوە دەهاتە دەرێ. سەرەنجام لە نووسینگە وەدەرکەوت، بەڵام نەیدەزانی کەی لەوێ هاتۆتە دەر. تا ئێوارێ لەسەر بەستەڵەکی لێواری خەندەکەکە بوو. هەستی بە سەرما نەدەکرد. هەر ساتێک ئەو نووسراوەی دەهاتە بەرچاو کە ناچار کرابوو ئیمزای بکا. دیسانەوە رق سەرتاپای دادەگرت. گەڕایەوە نووسینگە داوای کرد تەڵاقنامەکە ببینێ. وشە بە شە خوێندییەوە. تا ئەودەم بڕوای نەکردبوو، بەڵام ئێستا راستییەکەی بۆ دەردەکەوت. سۆزانا تەڵاقی لێ وەرگرتووە. لەبەر ئەوەی پێی وا بووە یوهان جوولەکەیە. لەوانەشە سۆزانا کەسێکی دیکەی بۆخۆی دۆزیبێتەوە. یوهان ئیدی بە وشەی رەبەن تووڕە نەبوو، بەڵام دڵی رانەوەستا. لەبەر ئەوەی هەموو شتێک راست دەهاتە بەرچاو. تووڕە بوون بە خۆڕایی بوو. ئەو بە چاوی خۆی داوانامەی تەڵاقی سۆزانای دیتبوو.

سەرگورد بۆ رۆژی دوایی بە نێوچاوانی گرژەوە پەیدا بوو. بەندییەکان تا نیوەڕۆیە چاوەنۆڕ مان. گشتیان لە لێواری خەندەکەکە بە ریز وەستابوون. ژەنەڕاڵ هەر نەهات. رۆژێکی دیکەش تێپەڕی. ئەمجارە سەرگورد بە یۆنیفۆرمە کۆنەکەوە هات و رایگەیاند ژەنەڕاڵ جارێ نایەتە سەردانی خەندەکەکە. بۆ ماوەی حەفتەیەک هەموو کارێکی ئۆردووگا راوەستا. پاشان ئۆردووگا بۆ باکوور گوازرایەوە. بەندییەکان کە ئێستا لە چاڵاندا دەخەوتن، ناچار بوون شوێنی خەوتنی تازەیان لە نیو زنار و گاشەبەردان هەڵکۆڵن. سەرگورد بە کامیۆنێکەوە بۆ هێنانی ئامێری نوێی بەرد بڕینەوە وەڕێ کەوت. لەبەر ئەوەی تاقە ئامێری بەرد بڕینەوەی لە ئۆردووگا هەیانبوو، وا دیار بوو

تەنیا بۆ هەڵکەندنی عەرزی نەرم بە کەڵک دێ. سەرگورد سێ ڕۆژ ئۆردووگای بەجێ هێشت. لە گەڕانەوەدا ئامێری بەرد بڕینەوەی دیکەی هێنابوون. یوهان بە درێژایی وەرزی زستان هەدای نەدا. خواردنیان بە کار نەدەهات. بەندییەکان یەک یەک نەخۆش دەکەوتن. گەلێکیش مردن، بەڵام یوهان عەلەمی نەگەیشتێ. تەنیا حەفتەیەک قورگی دەئێشا. کارەکە بە زەحمەت رادەپەڕی. دەیانگوت لانی کەم ساڵێکی دیکەی پێوە دەبن و ڕەنگبێ پاییزی ساڵی داهاتوو لێببنەوە، بەڵام مانگی ڕەشەمە فەرمان هات دەست لە کار هەڵبگرن. سەرگورد پێی ڕاگەیاندن کە فەرماندەی سوپا لە لێدانی خەندەکەکە پەشیمان بۆتەوە. کارلی دووهەم، پادشای ڕۆمانیا تەختی لێ تێکچووە و بە خۆی و ژەنەراڵەکانییەوە کە ڕاوێژکاری بوون، هەڵاتوونە هەندەران. زۆریان لەسەر کار لادابوون و ئێستا ژەنەراڵە نوێیەکان کە لە جێی ئەوان دانرابوون پێیان وابوو نەخشەی لێدانی خەندەکەکە هەڵەیە. دیسان جوولەکەکانیان سواری شەمەندەفەر کردن و ناردیاننە سنووری ڕۆژئاوای ڕۆمانیا. لەوێ مەتەرێزیان بەرامبەر بە مەجەڕستان لێدەدان. هەموو زەحمەت و کوێرەوەریی تا ئەو کاتەیان بە فیڕۆ چووبوو.

## (٤١)

لە لێرەوارێکی سەر سنووری مەجەڕستان(هەنگاریا) و ڕۆمانیا ئۆردووگای تازە لێدرا. بە سێ ڕۆژ و شەو گەیشتنە ئەوێ. قەرەوێڵەی سەرگورد و کەلوپەلی نووسینگە و فایلەکانیشیان بردن. هیچیان بەجێ نەهێشت. تەنانەت ئەو ئەسپییانەشیان لەگەڵ خۆ بردن کە هەر بەندییەک هەزاری پێ‌بوون. لە ئۆردووگای تازەدا کەرستە و ئامرازی هەڵکەندنی خەندەک بە کەڵکی هیچ نەدەهات. لێرە دەبوایە مووردداریان بڕیبان و دیواریان لێ هەڵچنیبا. یوهان پێشتر قەت مەتەرێزی شەری نەدیتبوو. هەموو لێرەوارەکەیان بڕی و لە شوێنێک لە سەر یەک هەڵیانچنی. هەزاران هەزار پیاو بەو کارەوە خەریک بوون.

یوهان پێی وابوو ئەو مەتەرێزانە دەبێ وەک بورجی بڵند وا بن کە لە کوتەرەی داران دروستدەکرێن. چاوەروان بوو لە نزیکەوە بیانبینێ. لە دڵی خۆیدا دەیگوت کاتێ لیدانی مەتەرێزەکان تەواو بێ لە نێو دارستانەوە بە چاکی دەبینرێن، یوهان بەر گوێی کەوت کە مەجەڕەکانیش لەوبەر خەریکی لێدانی مەتەرێزی لەو چەشنەن. یوهان بە روونکردنەوەکانی سەرگورد لەم بارەوە کە مەتەرێزی مەجەڕەکان پووشێک ناهێنێ و ئەگەر رۆمانییەکان کەیفیان لێبێ بە شەوێک لێیان تەفروتوونا دەکەن، لە دڵی خۆیدا هەستی بە ئارامی و خۆشی دەکرد. یوهان چەندین جار دەیهێنایە پێش چاوی خۆی کە چلۆن سەربازانی رۆمانیایی هێرش دەکەنە سەر خاکی مەجەڕستان. لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر تا کاتی دەستپێکردنی شەڕ لێرە بم دەتوانم لە بەرزاییەکانی نێو لێڕەوارەوە سەیری دیمەنی شەڕ بکەم. سەرگورد هەمیشە دەیگوت: "مەتەرێزی ئێمە هێندە بەرزە باڵندە ناتوانێ بەسەریدا بفڕێ." کەوابوو یوهان لە خەیاڵی خۆیدا دیمەنی ئەو مەتەرێزانەی ئێجگار بەرز دەهاتە بەرچاو. لەبەر ئەوەی باڵندەی وا هەبوون کە زۆر بەرز دەفڕین تا لە خوارێڕا وەک خاڵێکی بچووک دەبینران. ئەگەر ئەو باڵندانە نەتوانن بەسەر مەتەرێزەکانی رۆمانیادا بفڕن ـ سەرگورد خۆی بە راشکاوی گوتبووی هیچ باڵندەیەک ـ کەوابوو مانای وا بوو لەودیو ئەو مەتەرێزانەوە چلووکی دارە گێوژە بڵندەکانیش نابینرێن. یوهان هەمیشە لە خۆی دەپرسی ئەو دارانەی بە دەستی ئەو دەگوازرێنەوە لە کوێ جێگیر دەبن و چیان بەسەر دێ. زۆری حەز دەکرد ئەو کۆتەرانەی ئامادەی دەکردن نیشانەیەکیان لەسەر هەڵکەنێ تا دوای تەواو بوونی شەڕ لە نێو هەزاران داری دیکەدا کوتەرە دارەکانی خۆی بناسێتەوە. لەوانەیە ئەوانەی ئەو دەیبرین لە هەموو دارەکانی دی درێژتر بن.

هەموو رۆژێ لە کاتی برینی درەختاندا بیری لەو شتانە دەکردەوە. بەم جۆرە کات هەر بۆخۆی دەڕۆیی. لە دلی خۆیدا دەیگوت ئەوانە فکری قۆڕن و ئەگەر کەسێک توانیبای فکری بخوێنێتەوە بێگومان لەبەر پێکەنین بە لادا دەهات، بەڵام ئەو بیرە بۆ ئەو سەرقاڵییەکی خۆش بوو. نەیدەویست بە هیچ

شێوەیەک بیر لە ماڵ و حاڵی بکاتەوە و بگرە فانتاناشی بیر بکەوێتەوە. کە جاروبار بیری دەهاتەوە خوێن بەر چاوی دەگرت.

ڕۆژێکیان سیترۆڵ یوهانی لە لێرەوار بانگکردە نووسینگە. لەو ڕۆژەوە کە بۆ بیستنی هەواڵی تەڵاقەکە چووبووە نووسینگە چاوی بەوێ نەکەوتبۆوە. چووبایەوە ئەوێ دیسان وە بیر دیمەنی ئەو ڕۆژە دەکەوتەوە و بیرەوەرییەکانی رابردووی لێ دەژیانەوە. ئەو مێزە و ئەو پەڕە کاغەزە نەفرەتییە کە ئیمزای کردبوو. بۆیە حەزی نەدەکرد تخوونی نووسینگە بکەوێ، بەڵام ئێستا کە داوایان کردبوو چارەی نەبوو دەبوایە بچێ.

سەرگورد لەوێ نەبوو. تەنیا دکتۆر ئابرامۆڤیچی و هۆرتیگ - ئاشپەزی ئۆردووگا - و ستیرۆڵ لەوێ بوون. زۆریان سوپاس کرد کە هاتبوو. ئینجا کورسییەکیان بۆ راکێشا. یوهان هەروا چاوەنۆڕ بوو سەرگورد ببینێ. بێگومان بانگکردنەوەی لە دارستانەوە بێهۆ نەبووە. دکتۆر ئابرامۆڤیچی جغارەیەکی دایە و گوتی: "سەرگورد لێرە نییە و ئێمە دەتوانین بە خەیاڵی ئاسوودە بدوێن." جغارەکەی دکتۆر، یەک لە گرانترین جۆری جغاران بوو. پاشان گوتی: "یانکل، ژنەکەت خیانەتی پێکردی." یوهان رەنگی بە رووانەوە نەما و گوتی: "باشە بەنگۆ چی ژنەکەم خیانەتی پێکردووم؟ ئەمە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە."" مەبەستم لەو قسەیە تەنیا ئەوە بوو بڵێم لە گوندەکەت کەس چاوەڕوانت نییە. پێم وانییە تا دوای کۆتایی شەڕ هیچکاممان رزگار بین. شەڕیش لەوانەیە دە ساڵ بخایەنێ."یوهانناڵەیەکی کرد و بیری کردەوە ئەوکات سەری هەموو سپیی دەبێ.

دکتۆر لێی پرسی: "ناتهەوێ بچیە وڵاتێکی بیانی؟"

یوهان تەمای سەفەری ئەمریکای کەوتەوە بیر کە بڕیار وابوو لەگەڵ گیتزا ئەیوون بچن. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر ئەو شەوە باران باریبا من ئێستا لە ئەمریکا بووم." ئەگەر نەچووبا ژوانی سۆزانا ئێستا لێرە، لە ئۆردووگا زۆر دوور دەبوو.

"زۆر حەز دەکەم بچم. ئینجا رەنگێکی هاتەوە بەر و گوتی: "جارێک ویستم بچمە ئەمریکا، بەڵام وەزعەکە بە لایەکی دیکەدا سووڕا."

"بەڵام ئەم جارە بە لایەکی دیکەدا نارِوا. ئەگەر حەز بکەی بە چەند مانگ دەگەیە ئەمریکا."

یوهان سەرەتا سەیری دکتۆر ئابرامۆڤیچی و ئینجا هۆرتیگ و سیترۆلی کرد. ئەوانیش لەویان روانی. دیار بوو گاڵتە ناکەن. "بەڵێ حەز دەکەم."

"کەواتە لەگەڵ ئەو سێ کەسەمان وەرە و هەقت نەبێ. ئێمە دەمانەوێ بچینە مەجەرِستان. خۆ ناترسی؟""نا."

پاشان دکتۆر گوتی: "لە مەجەرِستان یاسای دژە جوولەکە لە ئارادا نییە. من خوشکێکم لە بوودایێست مێردی کردووە، ئێستا چاوەڕوانی منە. کاک هۆرتیگیش لەوێ هەندێ خزمی هەن. ئێمە تەنیا پێویستیمان بە کەسێکە کوڵەکانمان لەگەڵ هەڵبگرێ. من چەند باوڵێکم هەن. شەش دانە، هەموو شتێکی گرانبەهام لەگەڵ خۆم هێناوە، ئێمە دوای پەڕینەوە لە سنوور دەبێ نزیکەی دە کیلۆمەتر بە پێ ببڕین. من ئەو هەموو بارەم پێ هەڵناگیرێ. جگە لەوە هیچکاممان زمانی مەجەڕی نازانین. بۆیە بیری تۆ کەوتینەوە."

"جا چۆن لە ئۆردووگا بچینە دەرەوە؟"

"سەرگورد بە ئیڤایەک لێرە دەمانباتە دەر و دەمانگەیێنێتە سەر سنوور. رێگای دیکەمان نییە. هەموو رێگاکان پاسەوانی لێن. ئەو بە ماشێنی سەربازی دەمانبا."

یوهان بەسەر سوورِمانەوە پرسی: "سەرگورد دەزانێ ئێمە دەمانەوێ رابکەین؟"هۆرتیگ گوتی: "بەڵێ، دەزانێ. ئاخر ئەو ماڵ و منداڵێکی زۆری بە ئەستۆوە بووە و پێویستی بە پارەیە. تۆ لە جێی ئەو بای نەتدەکرد؟"

یوهان بێدەنگ بوو.

"جغارەیەکی دی هەڵگرە. زوو کەلوپەلی خۆت تێکەوەپێچە، بەڵام با کەس شکنەکا.""دەبێ هەر ئێستا ساز بم؟""هەتا پەلە بکەی باشترە. لەبەر ئەوەی سەرگورد سەری کاتژمێر نۆ چاوەروانمان دەکا. زوو پرێسکەت تێکنێ و وەرەوە. ئێمە چاوەڕوانت دەبین، بەڵام شتی قورس مەهێنە. لەبەر ئەوەی دەبێ کۆڵەباری منیش هەڵبگری."یوهان رۆی و زۆر زوو بەخۆی و بە پرێسکەیەکی بچووکەوە کە کراس و شەرواڵێک و لەتە نانێکی تێدا بوو،

گەڕایەوە.هەموویان لە دەروازەی گەورە تێپەڕین. سەرگورد لە شوێنی دیاریکراو چاوەڕوانیان بوو. بە ئیڤا تا دوا خاڵی سنووری ڕۆمانی ڕۆیشتن. سەعات سێی بەرەبەیان یوهان لە ناو خاکی مەجەرستاندا خەریکی بردنی کۆڵی دکتۆر ئابرامۆڤیچی بوو. تاو هەلاتی بەیانی لەبەردەم وێستگەی شەمەندەفەر راوەستابوون. دکتور پارەی دا بە یوهان و ناردی بلیتی شەمەندەفەر بکڕێ. چوار پلە دوو بۆ بوودابێست.

## (٤٢)

لە میوانداریی باڵوێزی فینلەند لە بوخارست ترایان کۆرۆگا لەگەڵ وەزیری جەنگی ڕۆمانی، ژەنەڕاڵ "تاوتۆ" ئاشنا بوو. چەند ڕۆژ دواتر چاوی بە وەزیری جەنگ کەوت و مەسەلەی یوهانی لەگەڵ باسکرد. ژەنەڕاڵ بە هۆگری و سەرنجی تەواوەوە گوێی لە قسەکانی ترایان گرت. پاشان قەڵەمی دار و کاغەزێکی دەست دایە و ناو و شۆرەت و مێژووی لەدایکبوون و ڕێکەوتی گرتنەکەی، یادداشت کرد.

"بە لانی زۆرەوە پاش حەفتەیەکی دی ئەو پیاوە لە ماڵی خۆی دەبێ. من فەرمان دەدەم خێرا مەسەلەکە تاوتوێ بکرێ و بەندییەکەی لەمەڕ ئێوە ئازاد بکرێ. ئەمڕۆ ڕۆژی..." ڕۆژمێرەکەی هەڵدایەوە" سێی گەلاوێژە. تۆ دەتوانی ڕۆژی ٧ی خەرمانان گەورەم بکەی و فەرمانی ئازادبوونەکەی وەربگری."

ژنەڕاڵ پاشان پرسی:" ئەم مۆریتسە نۆکەری باوکتانە؟" "لە ماڵی باوکم کاری دەکرد، بەلام ئەو زیاتر کەسێکی متمانە پێکراوە لای باوکم نەک نۆکەر بە مانای تەواوی وشەکە."

ژەنەڕاڵ بێ ئەوەی سەرنج بداتە دوا رستەی ترایان گوتی: "ئەمڕۆ لە گوندان کرێکار دەست ناکەوێ. ناهەق نی کە ئەوەندە بۆ بەربوونی ئەو کوڕە بە پەڕۆشی. ئێستا لە وەرزی دروێنەدا کەسێکیش کەسێکە."

ژەنەڕاڵ هەندێ شتی دیکەشی گوت. ترایان هەوڵیدا ژەنەڕاڵ تێبگەیەنێ کە ئەو نەک لەبەر ئەوەی یوهان مۆریتس نۆکەری باوکی بووە یان لەبەر

ـپێویستی بە کارکردنی ئەو هەوڵی ئازادکردنی دەدا. بەڵکو لە بەر ئەوەی مرۆڤێکە زوڵمی لێکراوە: "ژەنەڕاڵ هەوڵەکەی من لەو بارەوە تەنیا لە رووی ئەخلاقی و ئینسانییەوەیە و لەبەر هیچ شتێکی دیکە نییە."

ژەنەڕاڵ وەڵامی دایەوە."بەڵێ منیش ئەغلەب دەبێ ئەو چاکەیە لەگەڵ جووتیاران بکەم. زۆر جار دەبێ بچمە گوندان و بۆ وێنە لە رێورەسمی خەتەنە کردنی منداڵێک یان زەماوەندی جووتیارێک بەشدار بم. ئەورۆکە لەوەیە مرۆڤ هەموو کارێک بۆ ژێردەستانی خۆی بکا، تەنانەت ئەو باوەڕەیان تێدا پەروەدە بکا کە ئێمە دۆستیانین. بەڵێ تێدەگەم مەبەستت چییە."

وەزیری جەنگ تازەترین چیرۆکی (ترایان)ی لە چەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا کە هێشتا لاپەڕەی لێ هەڵنەدرابۆوە و گوتی: "سکرتێرەکەم ئەورۆ ئەو کتێبەی پەیدا کردووە. دەکرێ لوتف بفەرموون چەند وشەیەکی بۆ کیژەکەم لەسەر بنووسن؟ کیژەکەم هەژدە ساڵانە، ناوی (ئەلیزابێت)ە و چیرۆک هەر قووت دەدات. جەنابت یەک لە نووسەرە خۆشەویستەکانی ئەوی. ئەگەر ئەمرۆ نیوەڕۆیە، کاتی فراوین پێی بڵێم لای من بووی، بێگومان لێم دەپرسی جلی چۆنی لەبەردابوو، چ ریباتێکی بەستبوو و چ سیغارێکی دەکێشا؟ گەنج وان، بڵێین چی؟"

ترایان لەوە دڵنیا بوو کە ئەم جارە توانی فەرمانی بەردانی یوهان وەربگرێ، بە قاڵدرمەی وەزارەتی جەنگدا داگەڕا. لەو گوڵفرۆشییەی بەیانی گوڵی لە کن بە رادان دابوو چەپکێکی وەرگرت و بەرەو تەلەگرافخانە وەڕێکەوت. لەوێ تەلەگرافێکی بەم شێوەیەی بۆ باوکی نارد:

"٧ی خەرمانان لەگەڵ دەزگیرانم و فەرمانی ئازادبوونی یوهان مۆریتس دێمەوە فانتانا."

## (٤٣)

ئەلیو نوورا وێست بە خۆشحاڵییەکی لە رادەبەدەرەوە لە ترایانی پرسی: "ئەها، کەواتە ئێمە رۆژی ٧ی خەرمانان لە ماڵی باوانت لە فانتانا دەبین؟ حەفتەیەکی دی، وا نییە؟ بریا هەر ئێستا لەوێ باین."

پاشان ئەو گوڵە سپییانەی ترایان هێنابوونی لێی وەرگرت و لە گوڵدانی نان. ترایان بیرمەندانە بۆ قژە ئاماڵ سوورەکانی ئەلیو نوورای روانی کە رژابوونە سەر پشتی. ئینجا سەیری بەژنی بڵند و قاچە جوانەکانی کرد.
"دەزانی نوورا من هەموو جارێ کە تۆ دەبینم چیم وەبیر دێتەوە؟"
ئەلیو نوورا رووی لە ترایان کرد و بزەیەکی هاتێ. ترایان گوتی: "من لەو بارەوە هەمیشە شتێک لە خۆم دەپرسم کە تیۆدۆر ئەرگێتزی باسی کردووە:
"ئەرێ دایکت کەمانچەیەک بووە؟
یان شمشاڵێ؟ یانژی غەزەلێکی بەژن زراڤ
کە لە هەناویدا نوتقەیەک لە خێوی شەو یان
شازادەیەک گوراوە؟
لەبەر ئەوەی تۆ زادەی وجوودێکی ئاسایی نی..."
تۆ لە رادەبەردەر جوانی. لە بنەماڵەکەتاندا، لە نێو تورەمەتاندا، قسەی تێدا نییە ئاسکێکی تێدا بووە. چاوەکانت شەرمنی و نەرمونیانی سمۆرەیەکیان تێدایە. ئەوە چاوەکانی تۆن کە نەرمونیانیت پێ دەبەخشن. تەنانەت دەبێ رەگێکی گژ و گیا دەریاییەکانت لەگەڵ بنەچەکەدا هەبێ، کە هارمۆنییەکی ئەوتۆی بە بەژنت بەخشیوە. سەرباری ئەوە وەک پڵنگێ شایی بە خۆی."
ئەلیو نوورا رووی وەرگێرا و دەم و چاوی لەناو گوڵەکاندا شاردەوە.
"ئەم قسانەم ئازات دەدەن؟"
"نا."
"بەڵام وەک خەمبار بی وایە. من ئەگەر چاوەکانیشت نەبینم هێشتا دەزانم پڕ بوونە لە خەفەت. ئەوی گوتم دڵگیری کردی؟"ئەلیو نوورا هەوڵیدا خۆی بێوەی نیشانبدا: "نا من خەمبار نیم. تەنیا بیر لە تورەمەی خۆم دەکەمەوە. لە ئاسکەکان،لە شازادەکان، لە پەری و رووەکی دەریای و سمۆرەکان..."بە جووت بۆ خواردنی فراوین لە پشت مێزێک کە لە داربەروو دروستکرابوو، دانیشتن. ژووری نان خواردن زۆر جوان رازابۆوە. ئەلیو نوورا نەخشەکەی داڕشتبوو. نەخشەی خانووەکەش خۆی کێشابوویەوە کە سەرتۆپی خانووەکانی بوخارست بوو. قەنەفە و مافوور، هەموو شتێک بە گوێرەی زەوق و بە دڵی ئەو کڕدرابوون. ئەلیو نوورا،

ـیست و نۆ ساڵی تەمەن بوو و خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری گەورەترین ـڕۆژنامەی ڕۆمانیا "ئۆکسیدان" بوو. لە زانینگە گەورەکانی ئەورووپا خوێندنی تەواو کردبوو. سەروتاری بۆ ڕۆژنامەکەی دەنووسی. چاپخانەیەک و هەفتەنامەیەکیشی هەبوون و بەم جۆرە لە هەموو کاروبارێکی سیاسی، فەرهەنگی و پەیوەندیی ـونەتەوەییدا دەوری خۆی هەبوو. ترایان چەند ساڵ لەمەوبەر ناسیبووی و ـیشتا وەک ڕۆژی یەکەم بە قووڵی و لە دڵەوە خۆشی دەویست، لەوانەشە لەو کات پتر، بەڵام نەببوونە هاوسەر. هەموو جارێ کە ترایان داوای دەکرد بیخوازێ ئەلیو نوورا دەیگوت: "من ناتوانم هاوسەرێکی باش بم. من تا ڕادەی پەرستن حەز ـە پیشەکەم دەکەم و بە لە دەست دانی، وەک ئەوە وایە بەشێکی هەرە بە نرخی وجوودی خۆم بدۆڕێنم."

ترایان گوتی: "پێم وایە ئەوجارەیان یوهان مۆریتس ئازاد دەبێ. وەزیری جەنگ بوخۆی بە ڕاشکاوی بەڵێنی پێداوم تا ڕۆژی ٧ی خەرمانان فەرمانی ئازاد بوونی دەربکا. من تێلێگرافم بۆ باوکم کردووە کە لەگەڵ دەزگیرانەکەم و فەرمانی ئازادبوونی یوهان دێمەوە فانتانا. باوکم بە هەر دووک مزگێنییەکە یەکجار خۆشحاڵ دەبێ." "کەواتە تۆ سووری لەسەر ئەوە من وەکو دەزگیران بە دایک و باوکت بناسێنی؟" "بەڵێ. ئەگەر وات پێ باش نییە چۆن دەڵێی وا دەکەم. دیارە باوکم کەمێک پەست دەبێ، بەڵام پیاوێکی تێگەیشتووە." "بۆ حەز دەکەی وەک دەزگیران بە دایک و باوکمت بناسێنی نەک ژنت؟ ئەگەر ئێمە دووسبەی پێکەوە زەماوەند بکەین پێش چوونمان بۆ فانتانا دەبینە ژن و مێرد."

ترایان پێی وا بوو گاڵتە دەکا. دوو ساڵ بوو هەوڵی دەدا ئەلیو نوورا ڕازی بکا مێردی پێ بکا، بەڵام بێسوود بوو. ئەلیو نوورا خۆشی دەویست، بەڵام مێردی پێنەدەکرد. هەر پێی خۆش نەبوو مێرد بکا. کەچی ئێستا خۆی پێشنیاری زەماوەندی پێدەکا. ترایان لە جێگای خۆی دەرپەڕی. دەستی ماچ کرد و پرسی: "بە ڕاستتە؟ چ ڕووی داوە؟ باسی مەسەلەکەی بەیانیت نەکرد. چ شتێک وای کرد لە پڕ بڕیار و ڕات بگۆڕێ؟"

"هیچ شتێ، کە ئێمە ڕۆژی ٧ی خەرمانان دەچینە فانتانا ژن و مێردین. تۆ خۆشت چەندین جار ئەو داوایەت لە من کردووە. نەکا فێڵێکی دیکەت لەبن

سەردا بێ؟"ترایان خۆی لەبەر کاریگەریی توند و خێرای ئەو بیرە پێ ڕانەگیرا کە بێشک دەبێ شتێکی گرنگ ڕوویدابێ، بۆیە نوورا بڕیاریداوە مێرد بکا، بەڵام چ ڕوداوێک"؟

هەرچەند دەکۆشا وەڵامێکی بۆ ئەو پرسیارە هەڵنەدەکڕاند.

ئەلیو نوورا گوتی: "ئێمە جارێ بە شێوەی ڕەسمی لێک مارە دەکرێین. مارە کردنی شەرعی دوایە لە فانتانا دەیکەین. خۆت هەمیشە حەزت دەکرد لە کڵێسەی باوکت ژن مارە بکەی. من لە ئێستاوە خۆم لە جلوبەرگی سپیی بووکێنیدا دەبینم. لە کاتێدا کچانی دێ دەورەیان داوم، بەرەو میحرابی کڵێسا دەڕۆم."

"نوورا تکایە پێم بڵێ چ ڕوویداوە؟ دەبێ شتێک قەومابێ؟"

"سوێند دەخۆم هیچ ڕووینەداوە. هیچ. تەنیا بڕیارمداوە ببمە هاوسەری تۆ و ئێستاش حەز دەکەم تا زووە ئەم کارە سەر بگرێ."

## (٤٤)

ئەلیو نوورا و ترایان دوای نان خواردن چوونە کتێبخانە. هەر دووکیان سەرقاڵی هەڵدانەوەی لاپەڕان و تەماشای وێنان بوون. ترایان بە ڕاستی دڵنیا بوو کە ئەلیو نوورا ڕاستی پێگوتووە. بەو حاڵەشەوە هیچکامیان باسی زەماوەندەکەیان نەدەکرد. هەر دووکیان پێویستیان بە تاراندنی ئەو فکرانە بوو کە مێشکی ئازار دەدان. تابلۆیەکی پیکاسۆ سەرنجی ئەلیو نوورای ڕاکێشا. ئەلیو نوورا لە وێنەکە ڕامابوو. وێنەی ژنێک بوو کە لە تاو ئازاری زۆر، شکڵ و بیچمی گۆڕابوو. گۆڕانەکەش بە ڕادەیەک بوو کە ئیدی لە مرۆڤی نەدەکرد. دیمەنێک بوو لە گۆشتی مرۆڤ کە پارچە پارچە کرابێ. وێنەیەک لە ڕوخساری مرۆڤ کە ئازارێکی لە سەرووی هەموو دەردانەوە ئەندامەکانی لەشی لێک جیا کردبوونەوە. ترایان چاوێکی لە ئەلیو نوورا کرد. بۆ ساتەوەختێک وای هاتە بەرچاو کە هێڵی دەموچاوی لەگەڵ هی وێنەکە لێک دەچن. هیچ وێنەیەک لەو کاتەدا لەو وێنەیە باشتر نەیدەتوانی دەربڕی حاڵەت و هەستی وی بێ. ئەلیو نوورا ئازارێکی قووڵی لە دەموچاویدا دەبینرا،

ڕاست وەک نیگارەکەی پیکاسۆ. ئەم ئازارە وەکو وزەی بەهێزی کارەبا بوو کە لە بەر زۆریی زەخت و لەرزینی، مرۆڤ ناکوژێ، ترایان لەسەرخۆ پرسی: "نوورا چی بووە؟" "هیچ... ئەرێ لەگەڵ قاوەیەک چۆنی؟" پاشان بێئەوەی چاوەنۆڕی وەڵامی ترایان بێ پشتی لە مێزەکە کرد و رۆیی تا قاوە لێبنێ.

## (٤٥)

ڕێورەسمی مارەبڕین لە مەحزەرێکی رەسمیدا بەڕێوە چوو. هەر دووکیان بەرگی ئاساییان لەبەردابوو. دوو کەس لە برادەرانی (ترایان)یش وەکو شاهید لەوێ بوون. دوای تەواوبوونی ڕێورەسمی مارەبڕینەکە بۆ نان خواردن چوونە ریستورانێک.

"بۆ ئەنجامدانی ڕێورەسمە ئایینییەکە دەبێ شاییەکی گەورە ڕێک بخەین."

"پاشان ترایان بۆی شیکردەوە کە دابی زەماوەند لە گوند چۆنە: "گوندییەکان بە سواری ئەسپ لە پێش کەژاوەی بووک و زاوا دەڕۆن. پەنجا لاو بە سواری ئەسپ و بە بەرگی نەتەوایەتییەوە، پاشان عارەبەیەک کە بە چوار گا رایدەکێشن پڕ لە دیاری و جیازی بووک، فەیتوونی بووک پڕ دەکەن لە گوڵ. دوازدە ئاوەڵبووک لەگەڵ بووک و زاوا دەچن. جوانترین و سەرنج ڕاکێشترین دیمەن کاتێکە کە بووک و زاوا لەگەڵ میوانەکان دەست تێکدەگرن و لە دەوری خاچی پیرۆز شایی دەکەن. لەو کاتەدا لە میچی کڵێساوە بارانی نوغڵان دەبارێ و منداڵانی فانتانا لەبەر پێی شاییکەران هەڵیاندەگرنەوە. دەبێ ئەوەندە شوکۆلات بکڕین وەبەر هەموو منداڵەکان بکەوێ. منیش کاتێ منداڵ بووم شەگەلاتم هەڵدەگرتەوە، بەڵام قەت لە سێ چوار دەنک زیاترم دەست نەدەکەوت، بەڵام لە شاییەکەی ئێمەدا دەبێ هەموو منداڵان گیرفانیان بئاخنن. دەستە مۆسیقاژەنێکی قەرەجیش دێنین. دەبێ ئەوەندە شەراب ببەشینەوە نوقمی شەرابی بکەین. خوانی داوەتیش لەسەر چیمەنێ رادەخەین، وەها کە بەشی سەد کەس بکا. حەوت شەو و حەوت رۆژ هەڵپەڕکێ دەکەین..."

نوورا چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد. چارەگێکی دی مەوعیدی لەگەڵ پارێزەرەکەی ـ لیو پۆلدشتاین ـ هەبوو. بە ترایانی گوت: "با بڕۆین، من کارێکی بە پەلەم هەیە."

ترایان ناچار بوو هەر لەوێدا واز لە باسی دیمەنی شاییەکە بهێنێ، هەر دووکیان هەستان.

## (٤٦)

ترایان نوورای گەیاندە نووسینگەی رۆژنامە. بارەگای زەبەلاحی رۆژنامەی "ئۆکسیدان" بینایەکی تەواو نوێ و رووکارەکەشی بەردی مەرمەڕی سپی بوو. ئەلیو نوورا وێستی ئەم خانووەی لە جێگای بینای کۆنە چاپخانەیەک دروستکردبوو. ترایان سەیرێکی شەش نهۆمی بالاخانەکەی کرد کە لەبەر تیشکی خۆر دەترووسکایەوە، بە زەردەخەنەیەکەوە و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوە سەلیقەی نوورایە." نوورا لە ماشێن دابەزی. ترایان پێی گوت: "من لە ماشێندا چاوەڕوانت دەکەم." ترایان دەیزانی نوورا وا راهاتووە کە لە دائیرە دێتە دەر بۆخۆی ماشێن بازوێ، بەلام لە دلی خۆیدا گوتی ئەمرۆ لەگەڵ رۆژانی تر جیاوازە. ئاخر ئەمرۆ رۆژی زەماوەندیان بوو. ئەلیو نوورا گوتی: "کە کارەکەم تەواو بوو خۆم دێمەوە مالێ." پاشان هەر لەوێ راوەستا تا ماشێنی ترایان نەدیو بوو. ئینجا بە پلیکانی مەرمەڕینی بیناکەدا سەرکەوت. دەرکەوانەکە بە یۆنیفۆرمەوە تا ناوقەد داهاتەوە. نوورا چووە ژووری بیناکە.

## (٤٧)

ئەلیونوورا بە مانای پڕ بە پێستی وشەکە، بە جۆرە بێباکییەکی شاهانەوە چووە ژووری کارەکەی و وای نواند ئەو پیاوەی نەدیوە کە بەرگی رەشی لەبەر دابوو و کاتی هاتنە ژووری ئەو راست ببووەوە. جانتا و دەستەوانەکەی لەسەر مێزەکە دانا و پاشان ئاماژەی بۆ میوانەکەی کرد دابنیشێ. سیغارێکی

ـە لالێوی گرت و هەوڵیدا بێئەوەی لەرزینی دەستی، شڵەژانی دەروونی ئاشکرا بکا، دایبگیرسێنی. پاشان رووی کردە پیاوەکە و گوتی:
"کاک شتاین من گوێ دەگرم."
پارێزەرەکە جانتای سەر کۆشی کردەوە. هەندێکی بەڵگەنامە لێ دەرهێنا و لە پێش ئەلیو نوورای دانا. ئەلیونوورا ئاگای لە چکۆلەترین هەڵسوکەوتی بوو.
"کارەکە کۆتایی پێهات، خاتوو وێست. ئەوەش ئەو بەڵگانەی دەتویستن."
پاشان دوو پەرە کاغەزی دەرکێشان و دایە دەستی ئەلیو نوورا.
"باشە ئەمە هەموو ئەو بەڵگەنامەیە بوو کە لە ئەرشیڤی پۆلیسدا بوو؟"
"تەنیا بەڵگەنامەیەک کە لە ئەرشیڤدا بوو. ئێستا هیچی لێ نەماوە."
ئەلیو نوورا بە سووکایەتییەوە چاوێکی لە پەرە کاغەزەکان کرد و ئینجا لە چەکمەجەی مێزەکەی هاویشتن."کاری ئاقڵانە ئەوەیە هەر ئێستا لەناویان ببەی."
نوورا چاوێکی لە پیرە پیاوەکە، لە چاویلکە قاڵب زێرەکەی، لە یەخەی شەق و بەرگە رەش و لە مۆد کەوتووەکەی کرد و گوتی:
"کاک شتاین، لەو ساتەوەی ئەم بەڵگەنامانە هاتنە ناو چەکمەجەی مێزی من ئیدی بۆئەوە نابێ بترسی."
"نەک لەبەر من بەڵکو لەبەر خۆت، باشتر وایە تا زووە بیانفەوتێنی."
"ئەو کارە چەندی تێچووە؟" بەم قسەیە ئەلیو نوورا باسەکەی گۆڕی.
هەستیکرد میوانەکەی ترسی رێ نیشتووە. ئەلیو نوورا بڕیاری وا بوو کاغەزەکان بسووتێنێ، بەڵام دەیویست سەرەتا بیانخوێنێتەوە.
شتاین لە وەڵامی پرسیاری ئەلیو نوورادا گوتی: "سەرد هەزار لای خشت." "ئەدی هەقدەستی خۆت؟"
"بە هەموویەوە."
ئەلیونوورا دوو سەفتەی پارە لە چەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا و دایە کابرا. ئەویش پارەکەی لە جانتاکەی نا و بە پێچەوانەی جاران پارەکەی نەژمارد.

"دەی، ئاوها." ئەلیو نوورا زۆری پێخۆش بوو بەتەنێ بێ و تا زووە کاغەزەکان بخوێنێتەوە، بەڵام پیرە لەسەر کورسییەکە نەدەبزووت.
"هیچ ماوە باسی بکەین؟"
"نا ئیدی، مەسەلەکە کۆتایی پێهات." "کەوابوو، هیچ ناگوزیریمان نییە."
"تەنیا، بەڵام بە لەناو بردنی بەڵگەنامەکان تەنیا بۆ ماوەیەک ئاو بە ئاگردا دەکرێ. حەزمکرد لەوە ئاگادارت بکەمەوە. ئەگەر من دۆست و هاوکاری باوکت نەبوومایە و تۆم بە منداڵی بەردەوام لە ئامێز نەکردایە ئەو ئیجازەم بە خۆ نەدەدا تۆ لەوە زیاتر ئاگاداری مەسەلەکە بکەم. دیسانیش عەرزت دەکەم کێشەکە بۆ ماوەیەک چارەسەر بووە."
"تکا دەکەم روونتر بدوێ."
"پێم وایە زۆر روون و ئاشکرایە. تۆ دەتویست بەڵگەنامەی جوولەکەبوونی دایک و باوکت دەست بکەوێتەوە. منیش ئەو بەڵگەنامەم لە دائیرەی نفووس دەرهێنا:
"کەواتە مەسەلەکە کۆتایی پێهاتووە."
"رەنگە تۆ بتوانی هەموو بەڵگەنامەیەک لە سەرانسەری دنیا کۆ بکەیەوە. بەم جۆرە تەنیا توانیوتە فایلەکان لە ناو ببەی، بەڵام هەقیقەتەکە وەک خۆی ماوەتەوە. تۆ بەهەرحاڵ جوولەکەی و ئەگەر یەکێک بیهەوێ بیسەلمێنێ کە تۆ جوولەکەی..."
"ئەگەر کەسێک بیهەوێ ئەو کارە بکا قسەکەی ناچێتە سەر."
"ئەدی ئەگەر داوای بەڵگەنامەی لەدایکبوونیان لێکردی؟" "پەیدای دەکەم، بە پارە دەکرێ هەموو بەڵگەنامەیەک دەربکەی."
"ڕاستە، بەڵام بەم شێوەیە ئێمە بە دژی یاسا جووڵاوینەتەوە و گەمەکردن بە یاسا وەک ئەوە وایە گەمە بە ئاگر بکەی. مەترسیدارە."
"مەگەر تۆ خۆت هەر ئەمڕۆکە ئەو بەڵگانەت لە ئەرشیڤی حکوومی دەرنەهێنان؟"
ئەلیو نوورا پاشان بە بزیەکی گاڵتەجارانەوە گوتی: "ئێستا هاتووی وانەی رەوشتم فێر دەکەی؟"

"نەخێر من وانەی رەوشت ناڵێمەوە. تەنیا لەوە ئاگادارم کردییەوە کە دەستت بە یارییەکی مەترسیدار کردووە و زەحمەتە بتوانی تا سەر درێژەی پێ بدەی."

"تۆ خۆشت دەزانی چارەی تر نییە." سیغارێکی دیکەی داگیرساند: "خەتای من نییە. کاتێ کۆمەڵگا مافی ژیانم لێ زەوتدەکا و نایەڵێ من خاوەنی ماڵ و حاڵ و پیشە و هاوسەر بم چارم نییە دەبێ نائومێدانە بەربەرەکانی بکەم و لەوکاتەدا دەست بردن بۆ هەر جۆرە چەکێک رەوایە. هەموو وجوودی خۆم بۆ ئەو شەڕە ئامادە کردووە."

"خاتوو وێست شەڕ کردن گرنگ نییە، لە شەڕدا گرنگ سەرکەوتنە."

"بەڕاستی پێت وایە دەتوانی تا ماوەیەکی زۆر خاوەن و سەرنووسەری رۆژنامی بی؟"تۆ تا ئەمڕۆ شاردووتەوە کە سەر بە خانەوادەیەکی جوولەکەی و ئەم کارەش تەنیا بە هۆی بیرکورتی و گەنجێتیی تۆوە بوو. تا ئێستا بەخت یاوەرت بووە، یا لە ترسان یان بە هەر هۆیەکی دی هیچکەس نەیوێراوە لێت بکۆڵێتەوە. تا ئێستا چەندین جار، بە پشتیوانی یاسای دژە جوولەکە هەوڵی دەست بەسەردا گرتنی چاپخانە و رۆژنامەکەتیان داوە، بەلام تۆ هەموو جارێ بەرپرسی کارەکەت بە پارە کڕیون و قوتار بووی. ئێستاش هەموو بەڵگەنامەی لەمەڕ بنەچەکەی خۆت لە ناو بردوون و لەو رێگایەوە دیسان تا ماوەیەکی درێژ سەری خۆت کڕیوەتەوە، بەلام یاسای دژە جوولەکە رۆژ دوای رۆژ بە شێوەیەکی توندوتیژتر جێبەجێ دەکرێ و سەرەنجام هیچ جوولەکەیەک ناتوانێ لە چنگی دەرباز بێ. جارێ ئەمە لێ‌لێیە، لۆلۆی ماوە. بۆیە تۆ هێشتا سەرنووسەری رۆژنامەیەکی گەورەی، بەلام دەبێ داهاتووشت لە بەرچاو بێ..."

"من لە داهاتووشدا هەروا سەرنووسەر و خاوەنی رۆژنامەی "ئۆکسیدان" دەبم."

لیۆ پۆلد شتاین مەنتیقی راشکاوانە و بێ هەڵەی ئەم ژنەی دەناسی، بەلام ئەمڕۆ وەلامەکانی بۆنی دەمارگرژی و رقیان لێوە دەهات. خەڵکانی دەمارگرژ و رق ئەستووریش خۆ مەنتیق ناناسن. شتاین نەیوێرا چیدی جوابەجەنگی

بکا. ناکرێ جوابەجەنگیی کەسێک بکەی ئاوەز دەخاتە ژێر پێ.
"من ئەمڕۆ مێردم بە مەسیحییەک کرد. ڕۆژنامەکەش بە ناوی مێردەکەمەوە دەکەم. ئەودەم هیچ کەس ناتوانێ "ئۆکسیدان" زەوتبکا. تەنانەت ئەگەر ڕۆمانیا لە خودی ئەڵمانیاش زیاتر دوژمنی جوولەکان بێ."
شتاین هەڵبەزییەوە: "بەڕاستی شووتکردووە؟" "من لە ئەمڕۆوە خاتوو ئەلیو نوورا کۆرۆگام. مێردەکەم ڕۆماننووسی بەناوبانگ ترایان کۆرۆگایە کە دەبێتە خاوەن و سەرنووسەری ئۆکسیدان. منیش دەبمە خاوەنی خۆی."
نوورا بزەیەکی ڕەزامەندی هاتێ. لیۆ پۆلد شتاین بێئەوەی لە شتێک بگەڕێ تەنیا بۆ ئەوەی خۆی لە قسە کردن لەگەڵ ئەلیو نوورا یان تێڕوانینی بدزێتەوە، گیرافانی دەپشکنی. پێویستی بە چەند چرکەیەک دەرفەت هەبوو تا بە باشی تێبگا چی گوێ لێ بووە.
"کەواتە تۆ دەست لە ڕۆژنامە و چاپخانەکەت دەشۆی. "ئینجا چەند جار کۆخی." "بە پێچەوانەوە، نەک هەر ڕۆژنامەکە لە دەست نادەم بەڵکو دەمەوێ پەرەشی پێبدەم. تەنیا بەناو، بەڕێوەبەرێکی دیکەم لە سەر داناوە." "بەڕاستی تەگبیرێکی بلیمەتانەیە. زۆر باش دەبێ. ئەویش مەرجەکەی تۆی قەبوولکردووە؟"
"مەبەستت تێناگەم." "ئایا جەنابی ترایان کۆرۆگا ئاگای لەو کەین و بەینە هەیە؟ پیاو هەمیشە ئەوەی لە شانی گران دێ، چونکە دەزانێ بۆ مەبەستێکی تایبەت کڕدراوە."
ئەلیو نوورا دەرهەڵبوو: "من کەسم نەکڕیوە. من بە خۆشەویستی شووم کردووە."
لیۆ پۆلد شتاین هەستایە سەر پێ و پیرۆزبایی لێکرد، بەڵام ئەلیو نوورا دەستی وێ نەدا، لەبەر ئەوەی گەمەی بە چەقۆی سەرهەڵپچڕینی نامان دەکرد و چاوی پڕ ببوون لە فرمێسک. تەنیا بە ئەسپایی گوتی:
"مرۆڤ تەنیا لە دوا کاتژمێرەکانی ژیانیدا شیاوی ئەوەن پیرۆزباییان لێ بکەی. خەڵک ئەگەر واقیعبین بن ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن، بەڵام هەر کەسێکی دەمرێ ئیدی لەوە بێبەش دەبێ پیرۆزبایی لێبکرێ. چەند ناخۆشە، بەڵام خەڵک تاقە دەرفەتێک کە بۆ قەبوولکردنی پیرۆزبایی هەیانە لە کیسیان دەچێ."

"من پێم وابوو بە خۆشەویستی مێردت کردووە!" "کەواتە تۆ بڕوا بە ڕاستگۆیی و نیازپاکیی من ناکەی"؟ تەنانەت تۆش کە پیاوێکی ژیر و تێگەیشتووی لە قسەکانی من ناگەی؟" "بۆچی متمانە و بڕوای خۆت لەدەستداوە؟"

"بەڕوای من تۆ زۆر ماندووی جەنابی شتاین. نازانم بۆ وات لێهاتووە. ئیدی لە قسەکانی من ناگەی. هیچ پێناچێ تۆ جوولەکە بی. من ترایان کورۆگام خۆشدەوێ. یەکەم خۆشەویستمە و ساڵانێکە خۆشمدەوێ. من ئاشقی ویم، بەڵام بەڕای من ئەوین هوی زەماوەند کردن نییە. من ئەو زەماوەندەم لەبەر یاساکانی نەتەوەیی بۆ ئەوە کرد تا ڕۆژنامەکە و گیانی خۆشم ڕزگار بکەم. ئێستا حاڵی بووی چم گوت؟" پێنەدەچوو شتاین هیچ حاڵی بووبێ. دەستی ئەلیو نوورای ماچکرد و بەرەو دەرگاکە ڕۆیی. ئەلیو نوورا بانگیکرد:

"کۆتایی ئەم حەفتەیە دەچمە کوێستان و چەند ڕۆژێک لەوێ دەمێنمەوە. تا دەگەڕێمەوە حەزدەکەم هەموو ماڵ و داراییم بە ناوی ترایان کورۆگا بکرێ، لەگەڵ ڕۆژنامەکەش. ئەگەر کارەکە وەک بەناوکردن سەری نەگرت گرێبەستێکی فرۆشتن بنووسن. باشترین ڕێگەی یاسایی بۆ ببینەوە، بەهەرحاڵ ئەم کارە تا زووە دەبێ بکرێ." "تۆ زۆر زیرەکی خاتوو ئەلیو نوورا." "نا، من زیرەک نیم. تەنیا ژنێکم کە بە هەموو هێزمەوە لە پێناو مافی ژیانمدا دەجەنگم. ماڵاوا جەنابی شتاین."

## (٤٨)

هێشتا شتاین بە تەواوی لە ژوورەکە وەدەر نەکەوتبوو ئەلیو نوورا لە قوڵپی گریانی دا. دەموچاوی گرتە ناو لەپی و بە کوڵ گریا. پاش ماوەیەک تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و ژمارەیەکی گرت و داوای ترایانی کرد."تکایە وەرەبمبەوە ماڵێ." "هیچ ڕووی داوە؟" "نا، بەڵام خێرا وەرە." ترایان هەستا سەر پێ تا بچێتە نووسینگەی ڕۆژنامە. چاوی بە وێنەی ژنەکەی

"پیکاسۆ" کەوت. چاوێکی وێنەکە پێدەکەنی و ئەوی تر دەگریا. دوو چاو بۆ ئەوە لێک دیار بوون تا لە یەک کاتدا بتوانن هەم پێبکەنن و هەم بگرین.

## (٤٩)

ئەلیو نوورا لە کاتێدا چاوەڕوانی ترایان بوو تەلەفۆنی بۆ شتاین کرد. شتاین ماڵی دوور نەبوو و ئێستا دەبوو گەیشتبێتەوە. "جەنابی شتاین. ڕاستم جواب بدەوە بە بێ هیچ ڕووبینییەک پێت وایە من لە پێناوی عەشقدا یان بۆ ماڵی دنیا مێردم کرووە؟ تکام وایە بە ڕاستگۆیی تەواوەوە وەڵامم بدەوە، سوێندت دەدەم."

شتاین لەسەر تەلەفۆن پرسی: "ئەی خۆت دەڵێی چی؟" "نازانم. بە هیچ شێوەیەک ناتوانم وەلامێکی تەواو بەو پرسیارە بدەمەوە. هەندێ جار وا بیر دەکەمەوە تەنیا لە پێناو عەشقدا مێردم کردووە و جاریش هەیە دەڵێم هەر دووک هوکار بو ئەو شووکردنە دنەیان داوم، بەلام ڕاستیی بابەتەکەم بۆ ڕوون نەبووەتەوە. دیارە گومانی تێدا نییە کە من لەوە زیاتر نەمدەتوانی ڕابوەستم. زۆر حەز دەکەم بزانم هۆکاری ڕاست و ڕەوانی ئەو کارە چ بووە؟" "واتە من تەنیا بۆ ماڵی دنیا مێردم کردووە؟ وەکو ژنانی.."

"نا خاتوو ئەلیو نوورا. تۆ زۆر لەوە بە فیزتری لە پێناو ماڵی دنیادا مێرد بکەی." "لەو بارەوە تەواو دڵنیای؟"ن "بەڵێ." "کەوابوو بە خۆشەویستی شووم کردووە؟" "بۆ زەماوەند کردن بە خۆشەویستی پێویستە مرۆڤ بڕوای بە داهاتوو بێ. مرۆڤ دەبێ بڕوای بە بەختەوەری بێ و لەویش قۆڕ و بێماناتر ئەوەیە بڕوای بەوە بێ کە ئەو بەختەوەریە ئەزەلی و ئەبەدییە و تەنیا لەلای یار و دڵبەر دەستدەکەوێ، بەلام تۆ خانمی بەڕێز، بڕوات بەو شتانە نییە. بیری تۆ زۆر ڕوونە. هەر بەو هۆیەش ـ ببوورە ئەگەر وا دەڵێم ـ تۆ لە پێناوی ئەوین شووت نەکردووە." "ئەدی چی؟" "ئەوە نە ئەوین بووە و نە ماڵپەرستی. بەلکو تەنیا لە ترسان بووە و بەس. تۆ لە ڕووی نائۆمێدیەکی زۆرەوە ئەو هەنگاوەت ناوە." "کەوابوو ئەوینێک لە ئارادا نەبووە؟" "با، بەلام ئەوینی تۆ لە هەستی ئەو ژنانە دەچێ کە لە چاخی دڕەندەییدا لە نێو دارستانان دەژیین و شەو و ڕۆژ ئەو ترسەیان لەسەر بوو گیانلەبەری دڕندە

ـەبەر یەکیان هەڵدڕن. ئەو کاتە بوو کە ژنان نائومێدانە خۆیان لە باوەشی
ێـوان دەهاویشت. ژنان تەنیا لە کاتی ڕووداوی گەورەی وەک بوومەلەرزە و
لافاو و شتی وادا هەست بە ئەوینێکی لەو جۆرە دەکەن. هەر جارێک کە
ـەترسییەک هەڕەشەی تێکدان و نغرۆکردنی جیهان دەکا."
"باشە بۆ ئەو کاتەی لەلام بووی ئەو قسانەت نەکردن."
"لەبەرئەوەی حەزم نەدەکرد دڵخۆشی و باوەڕ بە خۆ بوونت لەناو ببەم.
هەستمکرد دەلەرزی و دەمزانی ئەو لەرزینە لە ترسانە. زگم پێت سووتا. لە
بیرت نەچێ بە منداڵی زۆر جار لە سەر کۆشی خۆم خەواندووی."
ترایان کۆرۆگا هاتە ژووری کارەکەی. ئەلیو نوورا تەلەفۆنەکەی دانا و
ڕووەو ترایان غاریدا و خۆی لە هەمێزی هاویشت. دەتریقایەوە و ماچیدەکرد.
ترایان گوتی: "زۆرم پێ خۆشە تۆ وا بە دڵخۆشی دەبینم. کە تەلەفۆنت دەکرد
پێم وابوو دەگری."

## (٥٠)

ترایان پێش ئەوەی بەرەو فانتانا وەڕێ بکەوێ بۆ وەرگرتنی فەرمانی
ئازادبوونی یوهان چووە لای وەزیری جەنگ. هێندە خۆشحاڵ بوو دەتگوت
نووسراوی بەربوونی یوهانی وەرگرتووە. بە پەلە بە پلیکانە مەرمەڕیەکانی
وەزارەتی جەنگدا سەرکەوت. دەست و پێوەندەکانی وەزیر کە ئاگایان لە نێوانی
خۆشی ئەو لەگەڵ وەزیر هەبوو، پێش هەموویان بردیانە لای وەزیر. ترایان
نوسخەیەکی لە یەکەم چیرۆکی بە بەرگێکی جوانەوە پێبوو کە چەند وشەی بۆ
لەسەر نووسیبوو. ژەنەڕاڵ وەک حەفتەی ڕابردوو لەبەر ترایان هەڵنەستا و وای
نیشاندا سەرقاڵی خوێندنەوەیە. "جەنابی ژەنەڕاڵ کاتم نەگرتی؟" ژەنەڕاڵ بە
شێوەیەکی ڕەسمیانە گوتی: "ئۆهـ نا، فەرموو دانیشە." ترایان وای هاتە بەرچاو کە
ژەنەڕاڵ دەستی بۆ ڕانەداشت و بێ پێشەکی چووە نێو بابەتەکە و گوتی: "بەداخەوە
دەبێ هەواڵێکی ناخۆشت بدەمێ. ئەو کەسەی حەفتەی ڕابردوو لە بارەی ئازاد
بوونییەوە لەگەڵ من دوای، ئازاد ناکرێ، یان لانی کەم بەو زووانە ئازاد ناکرێ. ئێمە

دەبێ بە تەواوی لە زەمانەتەکەی ئێوە لە بارەی جوولەکە نەبوونی ئەو بکۆڵێنەوە."
ترایان بڕیاریدا ژوورەکە جێبهێڵێ، بەڵام یادی یوهان مۆریتس وای لێکرد بەسەر خۆیدا زاڵبێ.

"مەسەلەکە ئاوایە جەنابی کورۆگا، هیچمان لە دەست نایێ، جگە لەوەی سەبر بگرین هەتا ئەنجامی کاری لێژنەی لێتوژینەوە رادەگەیەنرێ."
ژەنەڕاڵ بەو رستەیە تێیگەیاند ئیدی وەدوو کەوتنی ناوێ، بەڵام ترایان لە جێگای خۆی نەبزووت. ئاخر باوکی چاوەڕوانی فەرمانی ئازاد بوونی یوهانی دەکرد کە جگە لەو هیچ پشتوپەنای دیکەی نەبوو.

"بەڕێزت حەفتەیەک لەمەوبەر بەڵێنت دا ئەمرێ فەرمانی ئازادبوونی دەربکەی و بە راشکاوی فەرمووت لەو بارەوە بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی ناوێ."

"حەفتەی پێشوو مەسەلەکە بە شێوەیەکی دیکە بوو."
"من تێناگەم چۆن مەسەلەکە لە ماوەی حەفتەیەکدا گۆڕاوە و بۆچی یوهان مۆریتس کە رۆمانیاییە دەبێ لە زیندان بێ."
"دەبێ کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوە قەبوولی بکا کە ئەو جوولەکە نییە."
"تکا دەکەم لە بیرتان بێ کە لەوانەیە کاری ئەم کۆمیسیۆنە چەندین مانگ بخایەنێ. ئەو کلۆڵە ساڵ و نیوێکە لە زیندانداییە."
"دەزانم کاری ئەو کۆمیسیۆنە لەوانەیە ساڵێکیش بخایەنێ، تەنانەت دوو ساڵ. ئێمە وەک سەردەمی ئاشتی کاتی زۆرمان بە دەستەوە نییە بەو جۆرە کارانە رابگەین." "گەورەم باشە کاتێ دەڵێم جوولەکە نییە، پشتگیریی من بۆ ئازاد کردنی ئەو بایەخی نییە؟"
"نا."

ترایان گوتی: "بە راستی زۆر بە داخەوەم کە ئێوە لە ماوەی حەفتەیەکدا رای خۆتان گۆڕیوە." ئەوەی گوت و هەستایە سەرپێ.
"خۆشم بە داخەوەم، بەڵام خەتای من نییە." "گەورەم ئایا ئەو قسەی جەنابت هیچ تانە و تەشەرێکی تێدا نییە؟" "نەخێر هیچ تەشەرێکی تێدا نییە، من تەنیا بە واقیع پشت ئەستوورم. ترایان کە لە داخان رەنگی بە روانەوە نەمابوو گوتی:

"ئەم جارەیان من ئەو مافەم هەیە کە داوای ڕوونکردنەوە لە جەنابت بکەم." "ڕوونکردنەوە، جەنابی کۆرۆگا؟ لەم کاتەدا کە هەموو جوولەکەی دنیایە شان بە شانی بەلشەڤییەکان دەجەنگن و دەیانەوێ وڵاتی ئێمە تالان بکەن، تۆ جەنابی کۆرۆگا، ڕۆمانیایی ڕەسەن و خانەدان و نووسەری بەناوبانگی ئەم وڵاتە جوولەکەیەک دەکەیە هاوسەری خۆت." ژەنەڕاڵ هەڵچوون و تووڕەیی پێوە دیار بوو: "من وەکو سەربازێک ئەم کارەی ئێوە بە خیانەت دەزانم. من چۆن دەتوانم متمانەم بە گوتەکانی ئێوە هەبێ؟ ئەو کردەوەیەی تۆ وام لێدەکا بڵێم ئەو پیاویژگە بە ڕاستی جوولەکەیە. ئەگەر ڕۆژێکی ئەم شکە ببێتە یەقین پێم سەیر نابێ. بەمجۆرە من چۆن دەتوانم متمانەت پێبکەم؟" "ڕاست دەفەرمووی، گەورەم." ترایان سەرێکی لەقاند و وەدەر کەوت. کاتێ بە پلیکاناندا دادەگەڕا، کتێبەکەی بیر کەوتەوە کە هەروا بە بن هەنگڵیەوە بوو. ئەو لاپەڕەی لەسەری نووسیبوو دڕاندی و سواری ماشینەکەی بۆوە. لە بەر خۆیەوە گوتی: "جوولەکەیە، تەنانەت بە منیشی نەگوتووە." هەستیکرد سۆز و هەستی بریندار بووە. بەرەو دەرەوەی شار ئاژوای. لەوێ ماشینەکەی کوژاندەوە و ڕاوەستا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەتا ئێستا هیچی لەو بارەوە پێ نەگوتووم. منیش لێم نەپرسیوە. بە ڕاستی شتێکی بێ مانایە پیاو پرسیاری ڕەچەڵەک و تۆرەمە لە ژنێک بکا کە خۆشی دەوێ. دوور نییە من لە رووی بێئاگاییەوە قسەیەکی وام کردبێ کە نوورا وای لێک دابێتەوە من لە ڕەچەڵەکی ئەو ئاگادارم. ئۆف، دەبێ چەندی ئازار چەشتبێ؟ بە پەلە بەرەو شار کەوتە ڕێ. وێنەی تابلۆکەی "پیکاسۆ" هاتەوە بەرچاو. دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی: "زۆرم پێناخۆشە زووتر ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبووم، ئاخ دەمتوانی چەندە خەم و خەفەتی کەم بکەمەوە. نوورای کڵۆڵ."

لە پێش یەکەم دوکانی گوڵفرۆشی ڕایگرت و چەند گوڵەباخی سپیی کڕین. فرۆشیارەکە بە بزەیەکی شیرینەوە گوڵەکانی لە جغجە وەرپێچا و دایە دەستی.

## (٥١)

نوورا بە ترایان گوت: "پێم بڵێ چ دەنووسی؟" ترایان دەستی بە نووسینی چیرۆکە تازەکەی کردبوو. نوورا هەموو ڕۆژێ دەیدی کە کاتژمێر چواری بەیانی لە خەو هەڵدەستێ، باڵاپۆش لەبەر دەکا و دەچێتە ژووری کارەکەی و تا نیوەڕۆیە نایەتە دەرەوە. دوو مانگ بە سەر زەماوەندیاندا تێدەپەڕی.

ترایان هەستیکرد نوورا تەواو تامەزرۆیە و لەوە زیاتر ناتوانێ خۆ لە قسەکردن بدزێتەوە. "من جارێک لە سەفەرێکی ژێر دەریادا بووم. هەزاران کاتژمێر لە بن ئاو بووم. ئێستاکە سەفینەکان ئامێری تایبەتیان تێدایە کە بە وردی دیاری دەکا چ کاتێک دەبێ هەوا نوێ بکرێتەوە، بەڵام جاران کە هێشتا ئەو ئامێرە پەیدا نەبووبوو مەلەوانەکان قەفەزێکی پڕ لە کەروێشکی سپییان لەگەڵ خۆیان دەبرد. هەر کە هەوا پیس و بۆگەن ببا کەروێشکەکان دەمردن و مەلەوانەکان دەیانزانی تەنیا پێنج شەش کاتژمێری دی دەتوانن بەو هەوایە بژین. ئەودەم فەرماندەی سەفینەکە دەبوو بڕیارێکی شێلگیرانە بدا، یان بە هەموو هێز و تواناوە و بە هەر شێوەیەک بێ خۆیان بگەیەننەوە سەر ئاو یان لە قووڵایی ئاوەکەدا بمێننەوە و گیان بدەن. لەو کاتەدا زۆربەی مەلەوانەکان خۆیان دەکوشت تا ئازار و ناڕەحەتیی هاوڕێکانیان بەچاو نەبینن. ئەو سەفینەیەی من لە ناویدا بووم کەروێشکی تێدا نەبوو، بەڵکو ئامێری تایبەت ئەو کارەیان دەکرد. لەو کەشتییەدا فەرماندە کە هەستی بەوە کردبوو من لە بەرامبەر بچووکترین دابەزینی ڕادەی ئۆکسیژێن دژکردەوە نیشاندەدەم. سەرەتا بەو حەساس بوونەی من پێکەنی، بەڵام پاشان پێویستی بە ئامێرەکە نەما. ئەوەندە بەس بوو چاو لە چاوی من بکا، دەیزانی هەوا بە ڕادەی پێویست هەیە یان نا، ئەوە تایبەتمەندییەکە ئێمە هەمانە. واتە من و کەروێشکە سپییەکان شەش کاتژمێر زووتر لە خەڵکی دی هەست پێدەکەین

کەی هەوا بۆ هەناسەدان دەبڕێ. ئێستا وا ماوەیەکە هەستێکی لەو چەشنە ئازارمدەدا. وا هەستدەکەم هەوا خنکێنەر بووە.

## (٥٢)

نوورا پرسی: "کام هەوا؟" "هەر ئەو کەشوهەوایەی کۆمەڵگای مرۆیی ئێستامانی تێدا دەژی. ئەم هەوایە، ئەم بارودۆخ و گوزەرانە چیتر مرۆڤ ناتوانێ تێیدا بژی. بورۆکراسی، سوپا، دەوڵەت، دایرە حکوومییەکان و دەزگاکانی شار هەموویان بۆ قڕکردنی مرۆڤ لە کاردان. کۆمەڵی ئەمڕۆ کە تەنیا بە دڵی ئامێر و کۆیلە ئامێرەکانە. مرۆڤەکان جگە لە قڕ بوون و تێداچوون ڕێگەی دیکەیان لەبەردەم نەماوە، بەڵام ئێستا هەستی پێناکەن. وەکو ئەو مەلەوانانەی سەفینەن کە هێشتا دوای مردن کەروێشکە سپییەکان شەش کاتژمێر لەو هەوا بۆگەنەدا خۆڕا دەگرن و پاشان لەناو دەچن، بەڵام من دەزانم هەموو شتێ کۆتایی پێهاتووە؟" "من دەگێڕمەوە چۆن مرۆڤەکان دەبێ لە ژێر زەخت و ئازاری سامناکی کەشوهەوایەکدا بمرن کە ئیدی بە کەڵکی هەناسەدان نایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناتوانم هەموو تاکەکانی مرۆڤایەتی بکەمە بابەتی چیرۆکەکەم، لەو نێوەدا دە کەسم هەڵبژادوون کە باشتریان دەناسم."

"ئەم خەڵکە هەموو ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە؟" "دوای مردنی کەروێشکە سپییەکان مرۆڤ بە لانی زۆرەوە شەش کاتژمێریان دەرفەت هەیە، چیرۆکەکەی من ڕووداوی ئەو شەش کاتژمێر دەرفەتەیە کە ئازاترین دۆستانی من بۆ ژیان هەیانە." "تا ئێستا چیت نووسیوە؟" "بەشی یەکەم. یەک لە پاڵەوانەکان لە ریزی مە چووەتە دەرێ؟"م "چی لێ قەوماوە؟" "جارێ ئازادی، ژن و منداڵ، زێد و ماڵ و ژیانیان لێ ستاندووە. برسیەتی و ئەشکەنجەی دیوە. سەرەڕای ئەو ئێستا خەڵکانێک خەریکن ددانەکانی لە ناو دەمیدا دەشکێنن. دواتریش نۆرەی چاوەکانی دێ و ئاخری گۆشتی لە هێسکان دەکەنەوە. دەست و قاچی وردوخاش دەکەن. لە دوا قۆناغی ئازار و

مەینەتیدا ناچارە لە هەمبەر وزەی کارەبا و ئەتۆم خۆی رابگریٚ." "باشە، ئەوانە... هەموو راستن؟" راستیی پەتین. تۆ لە چیرۆکەکەی منذا وەسفی تەواوی شار، جادە و کۆلان دەبینی. ئەدریسی تەواوی پاڵەوانەکان و تەنانەت ژمارە تەلەفۆنیشیان دەستنشان دەکەم. خۆ تۆ یەکەم پاڵەوانی چیرۆکەکەم دەناسی و دەتوانی راستیی نووسینەکەم هەڵسەنگێنی." "کێ؟" "یوهان مۆریتس." گەردی خەم لە رۆخساری نوورا نیشت. یوهان ئەوی ترایان دەیگوت هەمووی بەسەر هاتبوو. بە ترایانی گوت:

"من لە رادەبەدەر خەفەتی یوهان دەخۆم، کەواتە ئەو یەکەم پاڵەوانی چیرۆکەکەتە؟ ئەدی پاڵەوانی بەشی دووەم کێیە؟" "هێشتا ناتوانم ئەوە بڵێم. رەنگە باوکم یا دایکم. رەنگە من یان تۆ. بەهەرحاڵ یەکێکمان." "بەشەکانی دیکەش هەر وەک بەشی یوهان مۆریتس دەبن؟ باشە کتێبەکەی تۆ هیچ بەشێکی وای تێدا نابیٚ بە خێر و خۆشی کۆتایی بیٚ؟" "هیچ، دوای مردنی کەرویشکە سپییەکان ئیتر "کۆتایی خۆش نەماوە. تەنیا چەند کاتژمێرێکی ماوە بۆ کۆتایی هەموو شتێک.

# کتێبی دووهەم

## (٥٣)

دوو کاتژمێر بوو مۆریتس و هاوڕێکانی گەیشتبوونە مەجەڕستان. ماوەیەک لە پێش وێستگەی شەمەندەفەر چاوەڕوان بوون و لە ترسی ئەوەی نەناسرێن نەچوونە هۆڵی چاوەڕوانی. سەرەئەنجام شەمەندەفەر هات. دکتۆر ئابرامۆڤیچی، هۆرتیگ و سیترۆل سواری ڤارگۆنێک بوون، یوهان لە پەنجەرەوە کەلوپەلەکانی دانێ و راست ئەو کاتە شەمەندەفەرەکە وەرێکەوت خۆی لە ژووری هاویشت. هۆرتیگ دەستی گرت و یارمەتیدا. دەرگاکان تەقەتەقیان لێوە دەهات. یوهان زۆر ترسابوو. ئەگەر چرکەیەکی دی دوا کەوتبا بەجێ دەما.

ئەودەم چی بەسەر دەهات؟ بە تاقی تەنێ لە مەجەڕستان. شوکری خوای کرد کە هەر چۆنێک بێ توانیبووی سواری شەمەندەفەرەکە بێ.

دکتۆر و هۆرتیگ خێرا جێی دانیشتیان بۆ خۆیان پەیدا کرد. سیترۆل و یوهان لە راڕەوەکە لەسەر جانتاکان دانیشتن. چەند وێستگە دواتر ژنێک دابەزی و سیترۆل لە جێگاکەی دانیشت. یوهان لە دەرەوەی کووپەکە بەتەنێ مایەوە. دکتۆر دەرگای کووپەکەی کردەوە و پێی گوت: "وشیار بە خەوت لێنەکەوێ. بنووی شتەکان دەدزن." ـ "نەخێر، نانووم، بەڵام هێشتا دەرگاکەی پێوە نەدابوو یوهان خەوی بەسەر چاواندا هات و هەتا بوودابێست لە خەو هەڵنەستا. کاتێ لە شەمەندەفەرەکە دابەزین وڵات رووناک بووبوو. یوهان تینووی بوو، بەڵام هۆرتیگ نەیهێشت بچێ لە خواردنگەی وێستگەکە خۆشاوێک بکڕێ. گوتی لەوانەیە تووشی پۆلیس بن و بزانن ئەمان رۆمانیایین. هەموویان دەگیران. دکتۆر بە یوهانی گوت: "لەماڵی خوشکم ئاو بخۆوە."

تاکسی و قەیتوونێکی زۆر لە بەردەم وێستگە راگیرابوون. هۆرتیگ گوتی: "باشترە بە پێ برۆین. لەوانەیە شوفێرەکە ئاشکرامان بکا. زۆر بێتامە لەگەڵ گەیشتنمان بۆ بووداپێست بچینە بەندیخانە."

لە لاقیان وەرێنا. یوهان جانتاکانی لەسەر شان و بە دەست هەڵگرتن. زۆر گران بوون، بەڵام ئێستا لە دوێشەو، کاتی پەڕینەوە لە سنوور سووکتر دیار بوون. لە کاتێکدا بە پێخواسی بەسەر قیرەتاوی ساردی شۆستەدا دەڕۆیی لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "لەوانەیە لەبەر ئەوەی بەسەر قیرتاودا دەڕۆم، بە لامەوە سووکتر بن." تراماواکان هێشتا نەکەوتبوونە گەڕ. زوو بوو. یوهان لەناکاو هەستیکرد گڵۆپەکان هەموو کوژانەوە. لە هۆرتیگی پرسی کێ کوژاندنیەوە؟ هۆرتیگ بە توورەییەوە گوتی: "بە رۆمانیایی مەدوێ هەی بێ مێشک. یەکێک گوێی لێبێ دەکەوینە زیندان." "بۆ لێرە قەدەغەیە بە رۆمانی قسان بکەی؟" هۆرتیگ پتەت لێدابا دەقەڵشی. گوتی: قسەکردن بە رۆمانی قەدەغە نییە، بەڵام هەموو رۆمانییەکان دەنێرنە ئۆردۆگای زۆرەملی. مەجەڕستان دوژمنی رۆمانیایە. تێگەیشتی؟" "ئەدی بە چ زمانێک قسە بکەین؟" دکتۆر ئابرامۆڤیچی هەڵیدایێ: "بە زمانی جوولەکان. لە مەجەڕستان کاریان بە جوولەکان نییە. لێرە لانیکەم تا ئەورۆ یاسای دژە جوولەکە پەیرەو ناکراوە."

یوهان چیدی بە زمانی رۆمانیایی نەدوا. بە زمانی جوولەکەش نەدوا. زۆر شەکەت بوو. کاتێ گەیشتنە ماڵی خوشکی دکتۆر، یوهان لە ماندوویەتیان سەرە سمی دەدان. لەبەر دەرگای ماڵێ شمەکەکانی لە عەرز دانان. کڵفەتێکیان لێ وەدەرکەوت. رووخۆش و توندوتۆڵ کەلوپەلەکانی لەگەڵ یوهان بردنە ژوورێ. یوهان بە دوای یۆلیسکادا چووە ژووری مەتبەخ. یۆلیسکا کراسێکی شینی لەبەردا بوو. یوهان وای هاتە بەرچاو کە پێشتر لە جێگایەک ئەو کراسەی دیتووە. ئینجا وە بیری هاتەوە سۆزاناش کراسێکی وای هەبوو.

## (٥٤)

خوشکی دکتۆر ئابرامۆڤیچی تارادەیەک قەڵەو بوو. جلی ماڵەوەی لەبەردابوو. گوڵێکی بە دەستەوە بوو و خۆش خۆش قسەی دەکرد. خوشکی دکتۆر، یوهانی بانگکردە ژوورەوە. لەژوورەکەدا دکتۆر، هورتیگ، سیترۆل و ناگی (خوشکەکەی دکتۆر) لە دەوری مێزێک دانیشتبوون و سەر و گلاسە مەشرووبێکیان بە دەستەوە بوو. یوهان بە شەرمەوە لە لای خوارەوەی ژوورەکە راوەستا. چارەی دیکەشی نەبوو، چونکە کورسیی بەتاڵی لێ نەبوو. خاتوو ناگی قۆرییە چایەکی هێنا، چاوێکی لە یوهان کرد و گوتی: "لێرە جێگا نییە. برۆ مەتبەخ و لەوێ چایەکەت بخۆوە." ئیساک ناگی بە زمانی مەجەری گوتی: "چاکت کرد، لەبەر ئەوەی زۆر شت هەیە دەبێ باسی بکەین." یوهان تێگەیشت کە ئەو ئاغایانە دەعیەیان ناهێنێ لەگەڵی لەسەر مێزێک دابنیشن، بەڵام ئەو بابەتەی بە هیچ شێوەیەک لە دڵی گران نەهات. یۆلیسکاش بە ئاشکرا پێی خۆش بوو یوهان لە ژووری نان خواردن دانەنیشتووە و چا لە سەر چا بۆ تێدەکرد و شەکر و ئاوە لیمۆی بۆ دەهێنا. پاشان سێ نانی گەورەی لەگەڵ رۆنی کەرە و پەنیر لە پێش دانا. یوهان هەر زوو لرفی دان. دەتگوت برسییساڵی قاتییە. کاتێ یوهان داوای ئاوی گەرمی کرد خۆی پێ بشوا، یۆلیسکا گوتی: "دوایە خۆت بشۆ، ئێستا پێکەوە دەچینە بازاڕ."بەمجۆرە قەرتاڵەیەکی بە دەستەوە گرت و لەگەڵ یۆلیسکا کەوتە رێ. لەوەی وێوە ئەوە بوو بە کاری هەموو رۆژیان.

## (٥٥)

پاشنیوەرۆی رۆژی دواتر دکتور یوهانی گاز کردە ژووری نان خواردن: "ئەو جانتایە دەست دەیە و لەگەڵ من وەرە." یوهان زۆر دڵخۆش بوو.
دکتۆر ئابرامۆڤیچی بە ناقایلییەوە پرسی: "بۆ پێخواسی؟"

یوهان بە خۆیدا شکایەوە، بەڵام کەوشی نەبوو لە پێی بکا. چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد، ئەم سەری هەڵنەدەبڕی، بەڵام لە ژێرەوە چاوی لە پێی ڕێبوارەکان دەکرد. هەموویان یا چەکمەیان لە پێدا بوو یا پێڵاو. لە شەرمان وەختبوو داتوڵێ. ویستی داوای لێبوردن لە دکتۆر بکا، بەڵام ئەو لە کاتێکدا دەستی لە گیرفانی نابوو بە مەودایەکی زۆر لە پێش یوهانەوە دەڕۆیی. وەک هەر نەیناسی.

## (٥٦)

لە پێش خانووبەرەیەکی کۆنی بە حەوشە و باخچەوە راوەستان. دکتۆر جانتاکەی لێوەرگرت و خۆی بە تەنیا چووە ژوورێ. یوهان لە دەرێ چاوەڕێ بوو و سەیری تابلۆی "باڵیۆزخانە"ی کرد کە بە دیوارەوە بوو. پاشان لەو خەڵکەوە راما کە بە شەقامەکەدا رادەبردن. دکتۆر زۆری پێنەچوو. بەبێ جانتا و بە دەم بزەیەکەوە هاتەوە دەرێ، بەڵام کاتێ چاوی بە یوهان کەوت کە پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، بزەی لەسەر لێو نەما. لە جێی خۆی راوەستا و دەستی لە گیرفانی نا. وێدەچوو لە فکر راچووبێ. لە ڕێگایە تا گەیشتنەوە ماڵێ هەر بێدەنگ بوو. یوهان بە مەودایەکی تا رادەیەک زۆرەوە بە دوایدا دەڕۆیی.

## (٥٧)

دکتۆر لەبەر دەرگا راوەستا تا یوهان بیگاتێ: "یانکل کاری تۆ چەتی تێکەوەتووە. ئەنجوومەنی جوولەکەکانی بووداپێست کە بەڵگەی پێویستمان دەدەنێ تا سەفەری ئەمریکای پێبکەین رازی نەبوو بەڵگە بۆ تۆش ڕێک بخات. من داوام لێکرد یارمەتیی تۆ بدەن. بۆم روونکردنەوە کە لەگەڵ ئێمە بوو، بەڵام بێسوود بوو. گوتیان کاریان بە مەسیحییان نەداوە و تەنیا یارمەتیی جوولەکان دەدەن. تۆش خۆ

جووله‌که نی؟ جووله‌که‌ی؟" "ئه‌وانیش ناحه‌ق نین. زۆرم\پێ‌ناخۆشه وای ئیهات. ده‌مویست تۆ له‌گه‌ڵ خۆم ببه‌مه ئه‌مریکا و ئێستا... به‌هه‌رحاڵ حه‌ز ده‌که‌م ئه‌وه بزانی که من به‌جێم نه‌هێشتووی." پاشان دکتۆر جزدانه‌که‌ی ده‌رهێنا و ده‌ستی به ژماردنی هه‌ندێ ئه‌سکیناس کرد.

یوهان چاوی له پاره‌ی مه‌جه‌رستان کرد، پێی سه‌یر بوو وا بچووکن. "ئه‌وه بیست پیگۆیه، هه‌قده‌ستی زه‌حمه‌ته‌که‌ت. پاره‌یه‌کی زۆره. لێره ده‌بێ حه‌فته‌یه‌ک کار بکه‌ی تا بتوانی ئه‌وه‌نده پاره په‌یدا بکه‌ی، به‌لام تۆ به چه‌ند سه‌عاتێک ئه‌و پاره‌یه‌ت ده‌ستکه‌وتووه." یوهان هه‌رگیز بیری له‌وه نه‌کردبۆوه بۆ هه‌ڵگرتنی کۆڵ پاره له خه‌ڵک وه‌ربگرێ. ئه‌و بۆ پاره ئه‌م کاره‌ی نه‌کردبوو، به‌لام ئێستا که دکتۆر خۆی پاره‌که‌ی ده‌دایه لێی وه‌رگرت."گرنگ ئه‌وه بوو تۆم له ئۆردووگا رزگار کرد. ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ خۆم نه‌هێنابای ئێستاش له زیندان ده‌بووایه زمانی بکێشی. من بۆ ئه‌وه هیچم له تۆ ناوێ. من که‌سێکی وا نیم له هه‌مبه‌ر چاکه‌یه‌کی ده‌یکه‌م چاوم له پاداش بێ."

## (٥٨)

ماوه‌ی حه‌فته‌یه‌ک بوو یوهان مۆریتس له بووداپێست بوو و هه‌ر به‌و کاره‌وه خه‌ریک بوو که رۆژی یه‌که‌م کردبووی. له‌گه‌ڵ پۆلیسکا ده‌چووه شت کڕین، ئێزینگی ده‌شکاندن، سه‌تڵی زبڵی ده‌برده ده‌رێ و قاپی ده‌شورد. شه‌وانه‌ش متبه‌خی خاوێن ده‌کرده‌وه. به‌یانی رۆژی یه‌کشه‌ممه ئیساک ناگی تێی هه‌ڵه‌نگووت. ناگی به بۆڵه‌بۆڵ گوتی: "هێشتا هیچ کارێکت بۆ خۆت نه‌دیوه‌ته‌وه؟ وا حه‌فته‌یه‌که لێره‌ی. خۆ قاتی چاوت له‌وه نییه تا ده‌مری من به خێوت بکه‌م؟" یوهان زۆری پێ‌ناخۆش بوو که تا ئه‌و ساته بیری له‌وه نه‌کردبۆوه کارێک بۆخۆی په‌یدا بکا. پێی وا بوو هه‌روا له‌لای ناگی

دەمێنێتەوە. بە یۆلیسکای گوت: "من چەند گەمژە بووم کە وە دوای کارێک نەکەوتم. هەقیەتی خۆ تا سەر ناتوانن من بژێینن."

یۆلیسکا بەڵێنی پێدا کارێکی بۆ بدۆزێتەوە. ناسیاوێکی هەبوو، لە کارخانەی چاکردنی شۆکۆلات کاری دەکرد: "ئەودەم شۆکۆلاتم بۆ دێنی؟ یان بۆ کچێکی دیکەیان دەبەی؟" "چۆن بۆ کەسی دیکەی دەبەم؟"

یوهان پێی ناخۆش بوو یۆلیسکا وا بیر دەکاتەوە. "هەمووی بۆ تۆ دێنم. بۆخۆشم دەمی لێنادەم." شەوی یوهان لە خەونیدا لە کارخانەی شۆکۆلات کاریدەکرد. بۆ رۆژی دوایی دکتۆر ئابرامۆڤیچی ماڵاوایی لە خوشکی و زاواکەی کرد و رۆیی.

یوهان کەلوپەلەکانی هەتا دەرێ بۆ هەڵگرت. "لێرە زۆر دوور دەکەویەوە؟"

"بەڵێ، دەچمە سویسرا. دەمەوێ پێش چوونم بۆ ئەمریکا چەند حەوتوویەک لەوێ پشوو بدەم." دکتۆر کاتی ماڵاوایی دەستی یوهانی گوشی و یوهان کەیفی بە خۆی هات کە دکتۆر لە بەر چاوی هەمووان تەوقەی لەگەڵدا دەکا. کاتێ بەرێ کەوت دکتۆر لە پەنجەرەی ڤارگۆنەکەوە گوتی: "ماڵاوا یانکلی خۆشەویست... دڵنیا بە لە بیرت ناکەم." کاتێ شەمەندەفەرەکە لە چاوان نەدیو بوو، یوهان دەستی کردە گریان. خۆی لە دنیادا غەریب و بێکەس هەستپێکرد. هۆریگ و سیترۆل رۆیشتبوون و وا دکتۆریش بەجێی هێشت. یوهان ماوەیەکی زۆر لەوێ راوەستا. قەت ئەوەندە خۆی بە غەریب و نامۆیی نەدیبوو. ئەودەم مەسەلەی کارخانەی شۆکۆلاتی بیر کەوتەوە و خەم و خەفەتی لە کۆڵ بووەوە. گەرایەوە ماڵی ناگی. لە رێگایە لە دڵی خۆیدا گوتی: "با بچمە سەر کار دەبێ ملوانکەیەکی مرواریی دەسکرد بۆ یۆلیسکا بکڕم."

## (٥٩)

ئەم جارە یۆلیسکا و مۆریتس لە هەموو رۆژێ زووتر چوونە بازاڕ. بە پەلە گۆشت و سەوزە و وردە حاجەتی دیکەیان کڕین و خۆیان بە شەقامێکدا کرد کە ماڵەکانی ئەوێ هەژارانە بوون. یوهان قەرتاڵەی بە

دەستی راستەوە و بە دەستی چەپیش قۆڵی یۆلیسکای گرتبوو: "کارخانەی شوکولات لەوسەری شارە. پێ هەڵگرە."

لە پەلەپەلیان هەر دووکیان شەلاڵی ئارەق بووبوون. درەنگ گەیشتبانەوە ماڵی یۆلیسکا وێرا نەدەگەیشت چێشت لێبنێ. یۆلیسکا لەگەڵ کەسێکی گوندەکەی خۆیان کە لە کارخانەکە کاری دەکرد، لە بارەی یوهانەوە دوابوو. کابرا گوتبووی "با بێ، هەر زوو کاری دەدەینێ. قەدەرێکە کرێکارمان کەمن." یوهان لە رێگایە گوتی: "لەوانەیە زوو کارم بدەنێ. ئەگەر وا بێ شەممەی داهاتوو یەکەم مووچەم وەردەگرم. رەنگبێ شوکولاتیش بۆ تۆ بێنم." پاشان بە ئەسپایی دەستی یۆلیسکای گوشی. چاوێکیان لە یەکتری کرد و پێکەنین.

"ئینجا ژوورێک بە کرێ دەگرم. خۆ من ناتوانم هەتا سەر سەرباری ئاغاکەی تۆ بم. لە دەوروبەری کارخانە ژوورێک پەیدا دەکەم." یۆلیسکا گوتی: "ئەودەم میوان رادەگری؟"

یوهان گوێی لە قسەکەی یۆلیکسا نەبوو، چونکە چاوی لەو شوێنە دەکرد کە ئاپۆرایەکی زۆری لێ کۆ ببووەوە. سەد کەس پتر لە یەک شوێن تێکەویان دەهاویشت. لە پڕ بیری کەوتەوە کە کاتیان درەنگە و دەبێ پەلە بکەن: "وەرە بە لایەکی دیکەدا برۆین، دەنا وێراناگەم چێشت لێ بنێم."لایاندا و خێراتر رۆیشتن بو ئەوەی قەرەبووی ئەو دوور کەوتنەوەیە بکەنەوە، بەڵام لەوبەری شەقام دەستە پۆلیسێک راوەستابوون. سیخناخ. یۆلیسکا لە کاتێکدا دری بە جەماوەرەکە دا گوتی: "پۆلیس و پاسەوان لە هەموو کەس خوێڕیترن. قەت مێردیان پێناکەم."یۆلیسکا ئاوڕی دایەوە تا بزانێ یوهان گوێی لە قسەکەی بووە یان نا، بەڵام یوهانێ لەگەڵ نەمابوو. لە ناو خەڵکەکەدا بۆی روانی. دواجار لەلای پاسەوانەکان دیتییەوە. یوهان دەستی لێ هەڵوەشاند.

یۆلیسکا رووەو یوهان رۆیی. ئێستا تێگەیی چ روویداوە. پۆلیس ئەمبەر ئەوبەری شەقامەکەی گرتبوو بە بێ چاولێکردنی ناسنامە نەیاندەهێشت کەس بەوێدا بڕوا، بەڵام خۆیان لە ژنان نەدەگەیاند. یۆلیسکا دەیزانی یوهان چ ناسنامەی پێ نییە. ترس هەموو گیانی

داگرت. بە پەنا ریزی پۆلیسەکاندا رۆیی. یەکیان دەستی بۆ برد. خۆی راپسەکاند و خۆی گەیاندە یوهان. یوهان لەناو تاقمێکدا بوو کە لەبەر لوولەی تفەنگی پاسەوانێکدا بەرەو کامیۆنێک دەچوون. قەرتاڵەکەی بەرز کردەوە تا پۆلیسکا بیبینێ و لێی وەربگرێ. پۆلیسکا قەرتاڵەکەی دیبوو، بەڵام نەیدەتوانی شەقاوێک بچێتە پێش. پۆلیسەکان نەیاندەهێشت. پۆلیسکا هەوڵیدا تێیانبگەیەنێ کە قەرتاڵەکە وەردەگرێتەوە. هەر چەندە داد و هاواری کرد کەس گوێی نەدایە. یوهان کامیۆنەکە ببوو. هێشتا قەرتاڵەکەی پێبوو و بڵندی کردبوو. دەیوست پۆلیسکا بێ لێی وەربگرێ، بەڵام کامیۆنەکە بەڕێ کەوت. ناچار بوو قەرتاڵەکە لەسەر کۆشی دابنێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: "پۆلیسکا بە بێ قەرتاڵە بچێتەوە ماڵێ، بێگومان خانم لێی دەدا." وا چاک بوو خۆی فڕێ بداتە خوارێ و قەرتاڵەکە بداتەوە پۆلیسکا، بەڵام ئەوە کاری کردنێ نەبوو. لەسەر هەر کەرەوێتێک پاسەوانێک تفەنگی لەسەر پێ بوو. بە دیتنی تفەنگەکان قەرتاڵەکەی لەبیر چۆوە و بیری کەوتەوە کە دەستگیر کراوە.

## (٦٠)

مانگێک بەسەر ئەو رووداوەدا تێپەڕی. نەیدەزانی لە دەرەوەی سللوولەکەی چ دەگوزەرێ. پەنجەرەکانی ژووری زیندان بەسەر حەوشەیەکدا دەبوونەوە کە بەو دیوارە بۆر و بڵندانە هەموو شتێک، تەنانەت ئاسمانیشی لێ نەدیو کردبوو. چوار حەفتە بوو هەوای تازەی هەڵنەمژیبوو. بەندییەکانی تر دەیانتوانی رۆژێ کاتژمێرێک لە حەوشەکەدا پیاسە بکەن. یوهان بیستبووی لە سللولی خۆیان دێنە دەر و دوای کاتژمێرێک دەگەڕێنەوە. هێشتا رۆژ نەببۆوە و راڕەوی بەندیخانەکە کشومات بوو. یوهان چاوی هەڵێنا.

پێلووەکانی بە زەحمەت کرانەوە. چاوی خۆی هەڵگلۆفی. پشتە چاوی پەنەمابوون: "کەی منیان هێناوەتە سللول؟" وەڵامێکی بۆ پرسیارەکەی نەدۆزیەوە: "ڕەنگە بە کۆڵ هێنابیانمەوە سللوول." هەندێ جار کە دەیانهێنایەوە سللوول چاوی ڕەشکە و پێشکەی دەکرد. زۆربەی وەختان تا ماوەیەکی زۆر نەیدەتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. زۆر جار بیری ئەو کاتە دەکەوتەوە کە وازیان لە لێدانی دەهێنا. ئینجا وەردەیانەکەی لەسەر زەوی هەڵیدەگرتەوە و دەیبردەوە سللوولەکە، بەڵام ئەم جارە هیچی لە بیر نەبوو. یەکەم جار بوو تووشی ئەو حاڵە دەبوو: "دیارە ئەو جار پتریان لێداوم." وەک نامۆیەک باسی خۆی دەکرد. نێو قامەکەکانی هێشتا خوێنی مەییویان تێدا بوو. لێوی بە زمان تەڕ کرد. لێوی ئەستوور ببوو و زۆر دەئێشا. ددانەکانیشی ژانیان دەکرد. تا ئێستا چوار ددانیان شکاندبوون. مستێکیان لە دەمولووتی دابوو، ددانەکانی وەک ناوکی مێوە لەگەڵ خوێن تف کردبوونەوە. ئازاری ئێستای لە هی ئەو کاتە دەچوو کە ددانەکانیان شکاندن. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر ئەو جارەش چەند ددانی دیکەیان شکاندبم، ئیدی نانم پێ ناخورێ." بەڵام هەوڵی نەدا زمان لە ناو دەمیدا بگێڕێ کە بزانێ ددانی دیکەی شکاون یان نا. لەبەر ئەوەی بە چکۆلەترین بزاوتن، زمانی زۆر دێشا. چاوی لێکنایەوە. لە ڕاڕەوەکەوە زرمەی پێیەک ئاوازەی دایەوە. یوهان بە پێچەوانەی جاران گوێی قوڵاغ نەکرد بزانێ دەنگی چییە. ئازای جەستەی شین و مۆر و کوتراو بوو و توانای بیرکردنەوەشی لاواز بووبوو. کاتێ هاتن بۆ لێکۆڵینەوە بیبەن، هەستا، زۆری نەمابوو لەتاو ئێش و ئازار بزریکێنێ. بەری پێی وەک نەنگوتکی لێهاتبوو. وەردیانەکە نەقورچێکی گەیاندە کەللەکەی و یوهان بە نسکۆ دان لە سللولەکەی چووە دەرێ. بۆ چەند سانێک ئازاری جێ نەقورچی پاسەوان ژانی بەری پێی لەبیر بردەوە. پاشان بەری پێی وە ژان کەوتەوە. دەبوو سەد هەنگاو بڕۆن تا دەگەیشتنە ژووری لێکۆڵینەوە. بیرکردنەوە لەو سەد هەنگاوە وایکرد بڕستی لە ئەژنۆیان ببڕێ و بەربێتەوە زەوی. پاسەوانەکە چووە ژێر باڵی و ڕاستی کردەوە. یوهان زۆر سووک ببوو. وەزنی منداڵێکی نەمابوو. ئەویش کێشی هێسک و پێستەکەی بوو.

## (٦١)

یوهـان لـه یـەکـەم رۆژی گیرانییـەوە هـەر یـەک قسـەی دووپـات دەکردەوە. لە نووکەوە گیرابوویەوە کە چۆن هاتۆتە ناو مەجەڕستانەوە، بەڵام پۆلیس بڕوای بە گوتەکانی نەدەکرد. هەموو جارێ تێیان هەڵدەدا تا قسەی راستی پێ هەڵبدەن، بەڵام پاشی لێدانەکە هەموو جارێ هەر هەمان قسەی دووپات دەکردەوە. دیسان وەری دەگەڕانی. یوهان لە گرتووخانەی پۆلیسی نهێنی مەجەڕدا بوو. هەموو رۆژێ لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرد و پاشان دارکارییان دەکرد. لێپرسەکە هەڵیدەپێچا: "تۆیان بۆچی ناردۆتە مەجەڕستان؟""کەس منی نەناردووە.""بەڵام خۆت دانت بەوەدا ناوە کە بە یارمەتیی سەرگوردێک و بە ماشێنێکی سەربازی هاتوویە سەر سنوور.""وایە، سەرگورد ئاپۆستیل کۆنستانتین سەرۆکی ئۆردووگا بوو. لەگەڵ دکتۆر ئابرامۆڤیچی برادەر بوون. بۆ ئەوەی پاسەوانانی سنوور نەمانگرن هەتا سەر سنوور لەگەڵمان هات."

"ئێمە دەزانین ئەو سەرگوردە، تانازایۆن، ئەفسەری رێکخراوی ئاسایشی رۆمانیا بووە کە بەرپرسی ئەو ناوچەیە. هەموو مانگێک ژمارەیەک سیخوڕ دەنێرێتە ئێرە. ئەو، تۆی ناردۆتە ئێرە. ئێمە دەمانەوێ بزانین بۆچی ناردووی و چ ئەرکێکی پێ سپاردووی؟"یوهان سەری داخست و گوتی: "من راستییەکەم پێگوتن." لەدڵی خۆشیدا گوتی: "دیسان دەمبەنەوە ژێرزەمینەکە" و بەو بیرە هەموو گیانی وە ژان کەوتەوە.

لێپرسەکە پێی گوت: "باشە تۆ تێناگەی درێژەدانی ئەو کۆمیدیایە بێسوودە؟ بە کورتی: نکۆڵی کردن گەمژەییە. تۆ گوتووتە پتر لە هەژدە مانگ لە ئۆردووگای کاری زۆرەملێی جوولەکان بووی یان نا؟" "بەڵێ."

"تۆ پێت لە ئۆردووگا نەناوە. تۆ رۆمانیایی.""وایە من رۆمانیاییم."

"تۆ لە مەجەڕستان خۆت کردووەتە جوولەکە، هەتا بڕوات پێبکەین کە لە ئۆردووگای جوولەکان بووی. جگە لەوە ئیدیعا دەکەی لەگەڵ سێ جوولەکەی

دی سنوورت بەزاندووە."زۆر راستە."بەڵام ئەمەشیان راست نییە. تۆ بە تەنیا هاتووی. بۆ لە ماڵی ئیساگ ناگی نەبووی. لە شەش حەفتەی رابردوودا هیچ کەس نەچۆتە لای وان. تۆ لە لای خۆتەوە پێت وابوو هەرچی بیڵێی بە بێ لێکۆڵینەوە بڕوات پێدەکەین؟ ئەوە نووسراوی خانەوادەی ناگییە. ئەوان هەرگیز ناوی تۆیان نەبیستووە و لە جێدا خانمی ناگی هیچ برایەکی نییە دکتۆر بێ."یوهان پرسی: "باشە ئەوان گوتوویانە من ناناسن؟ نابێ خانم شتی وای گوتبێ. ئەمن خزمەتم دەکردن. لەگەڵ یۆلیسکا دەچوومە بازاڕ، قاپم دەشوردن..."

یوهان چاوی پڕ بوون لە فرمێسک. لێپرسەکە بە سەریدا گوڕاند: "درۆیە.. دیسان درۆیەکی دی. خانم ناگی هیچ خزمەتکاری نییە ناوی یۆلیسکا بێ. تۆ کە دەتهەوێ درۆیان تێکخەیەوە لانی کەم دەبێ ناوی خزمەتکارەکەیان بزانی."

لەو کاتەدا دەموچاوی لێپرسەکە حاڵەتێکی گاڵتەجاڕانەی بە خۆیەوە گرت: "ئێمە لێپرسینەوەمان لە کڵفەتەکەی ماڵی ناگی کردووە. هەشت ساڵە لای ئەو ماڵەیە. یۆلیسکا هەڵبەستراوی تۆیە بۆ فریودانی مە." یوهان چاوی لێکنا، چاوەڕوان بوو وەردیانەکە گاز بکەن تا بیباتە ژێرزەمین. ئیدی نەیدەویست بیر لە هیچ بکاتەوە. زۆری خەفەت لەوە دەخوارد خانمی ناگی خۆی لێ نەناس کردبێ. بڕوای نەدەکرد وا بێ. گوێی لە ترپەی پێی کەسێک بوو کە نزیک دەبۆوە. دەرگای ژوورەکە کرایەوە، بەڵام ئەوە دەنگی پێی وەردیان نەبوو کە هەموو جارێ دەهات دەیبردە ژێرزەمینی گرتووخانە. چاوی هەڵێنا. ئیساگ ناگی لە بەردەمی بوو. لێپرس گوتی: "ئەو پیاوە دەناسی." "یەکەم جارە دەیبینم." "ئاخۆ ئێوە سێ جوولەکەتان داڵدە داون کە لە رۆمانیا رایانکردبێ؟" "چەند ساڵ دەبێ بێجگە لە خۆم و هاوسەرەکەم و خزمەتکارەکەم کەسی دی لە ماڵمان نەماوەتەوە." لێپرس سوپاسی کرد. ئیساگ ناگی ژورەکەی جێهێشت و دوای ساتێک ژنەکەی وە ژوور کەوت. ئەویش یوهانی نەدەناسی و یەکەم جار بوو چاوی پێ دەکەوت. "ئاخۆ تۆ لە رۆمانیا برایەکت هەیە دکتۆر بێ؟" "من تاقانەی دایک و بابی خۆمم." لێپرسەکە مۆڕەیەکی لە یوهان کرد و لە خانمی ناگی پرسی: "ئایا ئەوان خزمەتکارێکیان هەبووە ناوی یۆلیسکا بووبێ؟" خانمی ناگی لە وەڵامدا گوتی:

"هەرگیز، لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا کە لە بوودابێستم خزمەتکارێکم هەبووە و هەیە کە ناوی ژۆزێفینە" ئینجا بە زەردەخەنەوە لە ژوورەکە وەدەر کەوت. ئینجا نۆرە گەیشتە پیرەژنێک کە گوتی ناوی ژۆزێفینە و هەشت ساڵە خزمەتی ماڵی ناگی دەکا. لێپرس و یوهان بەتەنێ مانەوە.

"ئێستا قەبووڵ دەکەی درۆت کردووە؟ راستییەکەمان پێ بڵێ. تۆیان بۆچی ناردۆتە مەجەرستان؟"

## (٦٢)

یوهان ملی لە گریان نا. لە ژوری لێپرسینەوە بردیانە جێگای ئەشکەنجە. وەکو رۆژان، بەڵام قەت وا نەترسابوو. رووناکییەکی سپی و توند لە چاوی دەدا. گڵۆپەکان گەورە و پڕ تیشک بوون و لێکنانی پێڵووش کەڵکی نەبوو. شەوقی گڵۆپەکان وەک ئاگر دەموچاویان داغ دەکرد. مەئمووری ئەشکەنجەدان کە یوهان هەموو رۆژێ دەیدی لەگەڵ برادەرەکەی خەریکی قوماری وەرەق بوو، بە پێکەنینێکی گاڵتەجارانەوە ئەمری پێکرد خۆی رووت بکاتەوە. یوهان دەستی بۆ دوگمەی کراسەکەی برد. دەیزانی ئەگەر پەلە نەکا بە قامچی بەردەبنە دەموچاوی. قامکی دەستانی ئەستوور ببوون و دوگمەکانی پێ نەدەبوونەوە. هیچکات هێندی ئەورۆ لە قەمچی نەترسابوو. بە ترس و شەرمەوە چاوێکی لە دوو پیاوەکە کرد. دیار بوو ئەوان سەرقاڵی قومارەکە بوون و ئاگایان لە دواکەوتنەکەی ئەو نەبوو. هەر چۆنێک بوو کراسەکەی داکەند. بۆ داکەندنی شەرواڵەکەی ئەوەندە بەس بوو قایشەکەی دەربهێنێ و بەری بدا. رەق لە جێی خۆی راوەستا. چەندین جۆرە وایەر لەبەر دەمی دانرابوو کە لە حەبلی تفەنگ خاوێن کردنەوە دەچوون. بە پێی ئەستوورایی ریزیان کردبوون. لای چەپی ئەستوورایی وایەرەکان بە قەد پەنجەیەک ئەستوور بوو و تا بەرەو سەرەکەی دیکەی دەچوو باریکتر دەبوونەوە. سەرجەم بیست جۆرە وایەر و لە هەر جۆرەی دوو دانەی لێبوو. یوهان یەکەم جار بوو دەیژماردن. ئەوی هەرە باریکیان بەقەد پەرە کایەک دەبوو کە لە لای

راست دانرابوو. یوهان ژانی ئەو سیمانەی یەک یەک دەناسییەوە. یەک لە دوو مەئموورەکان گوتی: "دەی، دەست پێبکە." ئینجا وەرەقەکانی لەسەر مێزەکە هەڵڕشتن: "ئەوی کار نەکا نابێ نان بخوا." یوهان چاوی لێبوو ئەشکەنجەگەرەکە چۆن لە جێگای خۆی هەستا و باوێشکی دا. خەواڵوو بوو. پاسەوانەکەی دی سیغارەکەی کوژاندەوە و گوتی: "لەوانەیە ئەمڕۆ پێمان بڵێی بۆچی ناردوویانیەتە مەجەڕستان؟"
ئەوەندە بە هێمنی ئەو قسەیەی کرد دەتگوت داوای شەمچە لە یوهان دەکا. ئینجا باوێشکێکی دیکەشی هاتێ. خۆی خاوکێش کرد و قورس و قایم راوەستا.

یوهان منگاندی: "کەس منی نەناردۆتە مەجەڕستان." بەبێ ئەوەی بزانن هەر دوو پیاوەکە وێکڕا دەمووچاویان لە یوهان بردە پێشێ. چاویان لە رقان دەبریقایەوە. یوهان راچەنی. یەکیان لێی هاتە پێشەوە و مستێکی لە چەناگەی دا. یەکی دیکەشی لێدا. ئەوی دی شانی گرت و لەسەر کەرەوێتەکە درێژی کرد و لەسەر پشتی دانیشت. هەموو رۆژێ کە کابرای ئەشکەنجەگەر ئاوها سواری پشتی دەبوو یوهان پێی وابوو کە ئێستا نا ئێستا رۆحی دەردەچێ. یوهان ئەمڕۆ بە راستی خۆی بۆ ئەوە دانابوو بمرێ. کەرەوێتی رەق زۆر سینگی ئازار دەدا.ئەوەی مستەکەی سرەواندبووە چەناگەی، لێی پرسی: "هیچت گوت؟"

یوهان هەستی بەوە کرد یەکەم زەبری قەمچی بەری پێی داغ کرد و هەوڵی دا لاقی کەمێک هەڵکێشێ، بەڵام "سوار"ەکەی سەر پشتی لاقی توند بە کەرەوێتەکەوە نووساند. زەبری دووەم وا دیار بوو بە سیمی ئەستوورتر لێدرا. بەری پێی تەزیبوو. لەگەڵ ئەم زەبرەدا مۆخی سەری کەوتە ژان. زەبرەکانی دی بەر سینگی کەوت و دواتر شانی. ئاخیری یوهان ئاگای لە خۆی نەما و وەک بێهۆشانی لێهات، بەڵام ئەو حاڵەتە زۆری نەخایاند. شوێنی قەمچییەکان لەبەر پێی وەک جێ برینی چەقۆ دەهێشان. دیار بوو ئەو ئێش و ئازارە جێی وایەرە باریکەکان بوو کە بە گۆشتدا چووبوونە خوارێ و گەیشتبوونە دەمارەکانی. قامچی بەبێ راوەستان دادەوەشێنرا. یوهان حاڵی تێکچوو. تیشکێکی زەرد لە بەرچاوی هەڵدەبوو و دەکوژایەوە. هێڵنجی هاتێ.

ئەو ئاو و نانەی خواردبووی ئیدی بە گەدەیەوە گیر نەدەبوو. نوقمی ئەو تیشکە زەردە بوو کە لە بەرچاوی دەبووە رەشکە و پیشکە. زاری پڕ ببوو لە ئاوێکی تاڵ و زەرد. کەف و تیژاوی هەناوی سەری کرد. هەرچی ئاوەکیی ناو لەشی بوو بە لووت و دەم و هەموو کونێکی دیکەیدا دەهاتە دەرێ.
جەللادەکە هێشتا بە وایەرە باریکەکە لە قاچی دەدا، بەڵام یوهان هەستی بە هیچ نەدەکرد. خوێن بە هەموو لەشیا دەهاتە خوارێ. بە هەموو جێگایەکدا، تەنانەت لە رەگەکانییەوە. خوێن بە هەموو لەشیەوە رەق هەڵاتبوو.

## (٦٣)

کاتێ وەهۆش خۆی هاتەوە قسەکانی ئیساگ و رۆزا ناگی بیر کەوتەوە:
"ئەگەر ئەوان راستییەکەیان گوتبا من ئەوەندەم ئازار نەدەچێشت و بەریان دەدام."
قەت ئێش و ئازاری وای نەدیبوو. جەستەی ببووە برینێکی خوێناوی. لە تەپڵی سەریەوە تا نووکی پێی: "ئیساگ ناگی خۆی لێ نەناس کردم. چاوی لێکردم و گوتی هەرگیز نەمدیوە. ژنەکەشی هەروای گوت." یوهان بیری کەوتەوە کە چۆن هەموو رۆژێ پێڵاوی ناگی خاوێن دەکردەوە، یان بە گوێی دەکرد و داری بۆ دەشکاند و عەرزی متبەخی بۆ دەشوردەوە: "باشە چۆن توانیان بڵێن نایناسین؟" ئەی چۆن حاشایان لەوە کرد کچێک بە ناوی یۆلیسکا قەرەواشیان بووە؟" یوهان بڕستی لێ برابوو. دەیزانی رۆح و جەستەی ساردوسڕ، کز و تێشکاوە، بە رادەیەک وە بیری نەدەهاتەوە دوێنێ یان پێرێ کەی و چۆن هێناویانەتەوە سللولەکەی. دەرئەنجامی زەبری ئەو قامچیانە بوو کە هیچی وەبیر نەمابوو، بەڵام گومانی لەوەدا نەبوو لای خانەوادەکەی ناگی بووە، ئەمەی بە باشی وەبیر بووە. هەروەها ئەو کچەی یۆلیسکای ناو بوو، کەچی ئیساگ ناگی لە وەڵامی پرسیاری لێپرسەکەدا گوتبوو: "نا." ژنەکەشی گوتبووی:"نا." بە گوێی خۆی بیستبووی کە "نا"یان گوت. یوهان مۆریتس چاوی لێکنا.

## (٦٤)

دوای چەند کاتژمێر سەرلەنوێ بردیان. یوهان ئەوجارەش داچڵەکا. جاری پێشوو لێبڕابوو خۆی بکوژێ. چیدی بەرگەی ئەو هەموو ئێش و ئازارەی نەدەگرت. وەردیانەکە لەناو دەرگا راوەستا. یوهان بە چاوی نیوە ئاوەڵاوە دیتی کە وەردیانەکە پێدەکەنی: "هەستە." یوهان بە خەیاڵ "وارگا"ی لێپرسی هاتە بەر چاو. دەنگی لێپرس لە گوێیدا دەزرینگایەوە. پاشان بیری جەللادەکان و قامچییە باریک و ئەستوورەکانی ژووری ئەشکەنجەدان کەوتەوە. بە لێوە لەرزەوە گوتی: "نا...ئەمڕۆ نا." وەردیانەکە دیسان تێی راخوڕی: "هەستە." یوهان گوێی لە دەنگی نەبوو. وەک مردووی لێهاتبوو. وەردیانەکە هاتە ناو سللوولەکە و بە خورتی راستی کردەوە. یوهان پاڕایەوە: "نا... ئەمڕۆ نا... دووسبەی، هەموو رۆژێ، تا هەتایە. هەموو رۆژێ بمبەنە لێپرسینەوە و ئەشکەنجە، بەڵام ئەورۆ نا." وەردیانەکە پێی گوت: "تۆ ئەمڕۆ بەردەبی." یوهان بڕوای بەو قسەیە نەکرد، بەڵام هەر ئەوێ رۆژێ بەریان دا. واتە لە زیندان بەردرا، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکی رۆمانیا بوو ناردیانە ئۆردووگا.

## (٦٥)

پێش ئەوەی لە زیندان بچێتە دەرەوە نامەیەکی یۆلیسکای پێگەیی. راست لەو کاتەدا خەریک بوو پێی بنێتە دەرێ نامەیەکیان دایە. نامەکەی کردەوە: "یانووسی خۆشەویستم. چوار رۆژە ئیدی خزمەتکاری ماڵی ناگی نیم. بۆیە ئەو نامەیەت بۆ دەنووسم تا ئاگادار بی من لەوێ نەماوم و بۆ سەردانی من نەچیتە ئەوێ. من دەچمە گوندی تیزا لای دایکم و لەوێ بە عەشقێکی زۆرەوە چاوەڕانت دەکەم. هەر کە ئازاد بووی دەتوانی بێیە وێندەرێ.

**پۆلیسکا**

لە کۆتایی نامەکەدا لای راستی کاغەزەکە بە تاڵووکە نووسیبووی:

"دوێنێ بۆ بردنی کەلوپەل و جلەکانم چوومە ماڵی ناگی، کۆنە ئاغاکەم. هەردووکیان لەبەر ئەوەی لای پۆلیس گوتبوویان تۆ ناناسن تکایان لە تۆ دەکرد لێیان دڵمەند نەبی. ئەوان لەوە ترسابوون بڵێی بێگانەیەک لە ماڵیان بووە. زۆریان سڵاو هەبوو بۆت. کاک ئیساگ زۆر پیاوی چاکە. ژنەکەشی هەروەتر. لێیان زویر مەبە. لەوە دەترسان بۆخۆیان بەند بکرێن. بۆیە خۆیان لێ نەناس کردبووی. کاک ئیساگ قاتێکی داویەی، نرد و نوێن. لای خۆم بۆت هەڵدەگرم.

# لەگەڵ ماچێکدا ـ پۆلیسکا

## (٦٦)

سێ کاتژمێر بوو ئەندامانی کابینەی مەجەڕستان کۆ ببوونەوە. کۆنفرانس کۆتایی هاتبوو، بەڵام وەزیری دەرەوە دووپاتی کردەوە: "کێشەی پەنجا هەزار کرێکارەکە هێشتا حەل نەبووە، ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگە."

سەرۆک وەزیران گوتی: "مەسەلەکە بڕاوەتەوە و بە کۆی دەنگ بڕیاری لەسەر داوە." وەزیرەکان خەریکی کۆکردنەوەی نووسراو و کاغەزەکانی خۆیان بوون و دەیانویست وەدەرکەون، بەڵام وەزیری دەرەوە گوێی نەدانێ و گوتی: "ئێمە دەبێ ڕێگەچارەیەک بدۆزینەوە تا نێوانمان لەگەڵ رایشی سێیەم تێکنەچێ. بە تایبەتی کە پەیوەندیی ئێمە و رایشی سێیەم بە شێوەیەکی بەرامبەر و دوولایەنە هاوسەنگ نییە. ئێمە دەبێ بە تەواوی ئەو مەسەلەیەمان لە بەرچاو بێ کە پەیوەندیی نێوان ئێمە و ئەڵمانیا زیاتر وەک پەیوەندیی نێوان وڵاتێکی کۆڵۆنیی ئەو وڵاتەیە نەک پەیوەندیی دوو هاوپەیمان. هەر چەند ئەم راستییە زۆر خۆش نییە، بەڵام ئێمە رەوشەکەمان پێ ناگۆڕێ، تەنیا دەتوانین درێژە بەو چەشنە پەیوەندییە بدەین و بەمجۆرە وڵاتی خۆمان لە داگیرکەریان رزگار بکەین. ئەوان سەرەتا داوای سێسەد هەزار کرێکاریان لێ کردبووین و ئێستا ئەو ژمارەیان تا پەنجا هەزار داشکاندووە."

سەرۆک وەزیران گوتی: "دەوڵەتی من تەنانەت یەک مەجەڕیش وەک کۆیلە ناداتە ئەڵمانییەکان. پاشان بە تووڕییەوە گوتی: "ئەوە هیچ قسەی لێناکرێ."

بەڵام وەزیری دەرەوە کۆڵی نەدا: "حکوومەتی رایشی سێهەم زۆر گرینگی بە جێبەجێ کردنی داواکەی دەدات. لە راستیدا ئەم داوایە جۆرە ئۆلتیماتۆمێکە. پیشەسازیی ئەڵمانیا پێویستی خێرای بە کرێکار هەیە. ئەگەر ئێمە بە لای کەمی پەنجا هەزار کرێکاریان نەدەینێ ئەو کێشەیە ئاکامی

ناخۆشی لێدەکەوێتەوە. من زانیاریی تەواوم لە بەر دەستە ئەگەر ئێمە ئەو داوایە جێبەجێ نەکەین سوپای ئەڵمانیا وڵاتەکەمان داگیر دەکا. ئینجا لەو بارەوە بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی ئێوەیە."

یەک لە وەزیرەکان پرسی: "ناکرێ رێگایەک بۆ رێککەوتن بدۆزینەوە؟" سەرەک وەزیران بە پێداگریەوە گوتی: "ئەگەر ئێمە تەنیا یەک مەجەڕیش وەک کۆیلە بنێرینە ئەڵمانیا رەوەشەکە تێکدەچێ و مێژوو هەرگیز لەم رەفتارەمان خوش نابێ. بۆیە وەلامی ئێمە لەو بارەوە تەنیا دەبێ "نا" بێ و هیچ مەجالی رێککەوتنیشی تێدا نییە." وەزیری ناوخۆ گوتی: "ئەدی ئەگەر پەنجا هەزار کرێکار بنێرین بەبێ ئەوەی تاقە کەسێکیشیان مەجەڕی بێ، چۆنە؟ ئێمە لە ئۆردووگاکانی دیل و گیراوانی بیانیدا پتر لە سێسەد هەزار بێگانەمان لەبەر دەستدان. بۆ ژمارەیەکیان بۆ کار نەنێرینە ئەڵمانیا؟"وەزیری ئابووری گوتی: "من لەگەڵ ئەو رایەدا نیم. ئەم رێگاچارەیە کارەکە ئاڵۆزتر دەکا. ئەم کارە بە پێچەوانەی پەیماننامەی نێونەتەوەیی پشتگری کردنی بەندی و دیلە سیاسییەکانە. بە تایبەت کە ئێمە کەم تا کورتێ توانیومانە دۆستایەتییەکی باش لە تەک بێگانانندا دروستبکەین. نەخێر من لەگەڵ ئەو رێگەچارەیەدا نیم. ئێمە بەو کارە کەرامەتی وڵاتەکەمان لەکەدار دەکەین."

"سەرەنجام دوای نیو کاتژمێر رێگەچارە دۆزرایەوە. ئەنجوومەنی وەزیران بڕیاریدا پەنجا هەزار بیانی بۆ کار بنێرێتە ئەڵمانیا، بەڵام هەوڵبدەن زیاتر ئەو کەسانە بنێرن کە رەچەڵەکیان زۆر روون و ئاشکرا نەبێ. وەزیری ناوخۆ بەڵێنی دا ئەم ژمارەیە بە جۆرێک هەڵبژێرێ تا دواتر هیچ کەس نەتوانێ بیسەلمێنێ کە سەر بە وڵاتێکی دیکە بوون.

وەزیری ناوخۆ گوتی: "بەم جورە ئێمە دەتوانین خوێنی مەجەڕ رزگار بکەین. مێژوو هەرگیز ناتوانێ بەوە تاوانبارمان بکا کە مەجەڕستانمان بەرەو هەڵدێری کۆیلەتی بردووە. ئێمە بۆ ئامانجێکی رەسەن و شەریفانە بە جۆرێک کار دەکەین کە مێژوو بۆ چۆنیەتی سوود وەرگرتنمان لە ئامراز و کەرستەی گەیشتن بەو ئامانجە دەمانبەخشێ."

## (٦٧)

"کۆنت بارتۆلدی" بەرپرسی دائیرەی ڕاگەیاندنی مەجەڕستان چووە ژووری کارەکەی و سکرتێرەکەی بانگکرد. دەیویست نووسراوی رەسمیی ئاکامی کۆبوونەوە نهێنییەکەی ئەنجوومەنی وەزیرانی پێ دیکتە بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "مرۆڤێک کە ڕێز لە کەرامەت و لێوەشاوەییەکەی نەگیرێ، کۆیلەیەکە و هیچی تر. ئەمڕۆ ئەگەر کەسێک بیهەوێ لەسەر بنەمای ڕێوشوێنی ئەخلاقی بمێنێتەوە جگە لە خۆکوشتن چارەی دیکەی نییە. کۆمەڵگای ئەمڕۆمان بوونی کەرامەت و شایستەیی تاک و هەروەها ژیانی مرۆڤی ئازادی یاساغ کردووە. ئەم کۆمەڵگایە تەنیا تەحەمولی کۆیلان دەکا، بەلام ئەوە تا سەر نابێ. کۆمەڵگایەک کە لەودا تاکەکانی مرۆڤ بوونەتە کۆیلە مەحکوومە بە لەناوچوون. جا ئەوە تا زوو روو بدا درەنگە."

سکرتێرەکەی لێی پرسی: "چیت فەرمووو؟" "تکایە بنووسە: ڕاگەیەنراوی رەسمی: کابینەی مەجەڕستان لە کۆبوونەوەی داخراوی دوێنێی خۆیدا بڕیاریدا بۆ ڕێساکانی دەرهێنانی پەساپۆرتی ئەو کرێکارانەی بۆ فێربوونی کار لە پیشەی جوراجۆر دەچنە ئەڵمانیا ئاسانکاریی پێویستیان بۆ دەکا. ژمارەی ئەو کەسانەی ئەو ئاسانکارییەیان بۆ دەکرێ جارێ تەنیا پەنجا هەزار کەسە. تەواو. هەر ئێستا ئەو بابەتە بدەنە ڕۆژنامەکان. دەبێ لە لاپەڕی یەکەم چاپ بکرێ."

## (٦٨)

هەر ئەو شەوە کۆنت بارتۆلدی لەگەڵ کورەکەی کە هاوکات سکرتێری نووسنیگەشی بوو لە ڕێستورانێک نانی دەخوارد. لە کاتی قاوە خواردنەوەدا لە کوڕەکەی پرسی: "ڕای تۆ لەبارەی ناردنی کرێکار بۆ ئەڵمانیا چییە؟"

(لوسیان)ی کوڕی لە وەڵامدا گوتی: "گوڵێکی بەرامبەر لە گۆڕەپانی سیاسیدا . بەڕاستی بیرێکی چاکە. ئێمە لە باتی مەجەڕان، چەند هەزار کەس لە کرێکارە بیانییەکان کە لە ناو زیندان و ئۆردووگاکانماندا کەڵەکە بوونەتە سەر یەک، دەنێرینە ئەڵمانیا، ئەوە دەرسێکی چاکە لە بەرامبەر زیرەکیی ئەڵمانەکاندا. بەڕاستی فکرێکی بلیمەتانەیە."" دەزانی ئەڵمانەکان لە بەرامبەردا هێندێک ئاسانکاریمان بۆ دەکەن؟ ڕاشکاوتر بڵێم ئێمە لە بەرامبەر ئەو پەنجا هەزار کەسەدا پارە وەردەگرین؟""باشە تۆ هەست بە شەرمەزاری و سووکایەتی ناکەی باوکیشت ئەمڕۆ دەستی لەو کڕین و فرۆشتنەی ئینساندا هەبوو؟ کردەوەی لەم جۆرە، نزمترین قۆناغی نەمانی ڕەوشتە." "پاپا، تۆ چەند ژیکەڵەی. دەی بڵێ بۆچی ئەمڕۆ ئاوا گرژ و خەمباری؟" "هەوڵمەدە خۆت لە وەڵام بدزییەوە. جوابم بدەوە، قەبووڵتە من ئەمڕۆ دەستم لە کڕین و فرۆشتنی کۆیلاندا هەبووە یان نا؟" "ئەگەر زۆر سووری لەسەر ئەوە کە مەسەلەکە بەو بارەدا بخەی دەبێ پێت بڵێم بەڵێ، تۆ هاوبەشی بازرگانی کردن بە مرۆڤان بووی."

"ئەوە ئازارت نادا؟" "مەگەر گێل بم تا بابەتێکی وا بتوانێ ئازارم بدات. جگە لەوە، پێم وایە تۆ شتێکی دیکە ئازارت دەدا. ئەو بابەتە بۆ ساتێکیش ناتوانێ ئازاربەخش بێ. ئێمە ناچارین کرێکار بنێرینە ئەڵمانیا و ئەگەر ئەو ڕێگەچارەیەمان نەدۆزیباوە، ناچار دەبووین مەجەڕان بنێرین، ئەمەش زۆر خراپتر دەبوو." "بەڵێ، لە ڕوانگەی مەجەڕستانەوە خراپتر دەبوو، بەڵام لە ڕونگەی مرۆڤەوە هیچ جیاوازی نییە، ئێمە مرۆڤمان بە ئەڵمانیا فرۆشتوون." "بەڵام بابە گیان، ئەوە زەرووڕەتێکی سیاسی بوو و ئێمە ڕێگای ترمان لەبەردەم نەبوو." "ئەورووپا چەند ساڵ لەمەوبەر نەریتی بازرگانی کردن بە

کۆیلانی هەڵوەشاندەوە. دواهەمین مرۆڤ کە دەکڕان و دەفرۆشران، قولە ڕەشەکانی ئەمریکا بوون. ئەمڕۆکانە بازرگانیی کۆیلان یاساغ و رەتکراوەیە. ئێمە چەرخی مێژوومان بۆ دواوە گێڕاوەتەوە و سەر لە نوێ بازرگانیی کۆیلانمان ژیاندووەتەوە. ئێمە لە پڕێکدا لە سەدەی بیستەمەوە گەڕاینەوە سەردەمی پێش زایینی مەسیح." "بەڵام بابە گیان، ئێمە نابێ ئەوەندە خۆمان بەو مەسەلەیەوە تەنگاو بکەین. خۆ ئەو کەسانە لە ئەڵمانیا لە کۆت و زنجیردا نابن. ئەوان دەچن کار دەکەن."

"ئەمانە لە زنجیر ناخرێن، چونکە ناتوانن هەڵبێن. کۆمەڵگای ئەمڕۆ رێگای وای بۆ پاراستن و رێگەگرتن لە راکردنی کۆیلەکانی هەیە کە یۆنانی و رۆمییەکان لێی بێئاگا بوون. مەبەستم لەو قسەیە تەنیا گرتووخانە و تێلدڕوو تەلی کارەبایی نییە، بەڵکو هەموو شێوازە تەکنیکییە بورۆکراسییەکان بۆ خستنە ژێر چاودێریی مرۆڤانە. وەکو خواردن و پێویستیی وەرگرتنی ئیجازە لە پۆلیس بۆ گۆڕینی جێگا لە هوتێل و سوار بوونی شەمەندەفەر و گەڕانی سەر شەقام یان گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوون.

ئەگەر میسری و یۆنانییەکانیش ئەو چەشنە ئامراز و رێگایانەیان هەبوونایە، هەرگیز کۆیلەکانی خۆیان لە زنجیر نەدەخستن، بەڵام ئەوەی لە بنەڕەتەوە نەگۆڕاوە نەفسی کۆیلەتییە."لوسیان بە باوکی گوت: "وا باشترە هەر بیر لەو شتانە نەکەینەوە. خۆ ئێمە وەزعەکەمان پێ ناگۆڕێ. خۆ ئێمە تاکە وڵاتێک نین کۆیلەی وا دەنێرینە ئەڵمانیا. رۆمانیا، کرۆواسیا، فەرەنسا، ئیتالیا، عەرەبستان، نۆرویژ... واتە هەموو وڵاتە ئەورووپییەکان وایان کردووە. تەنیا ئەوەمان لە دەست دێ دەست لە کاری حکوومەت بکێشینەوە و دژی ئەڵمانیا شەڕ بکەین، لەبەر ئەوەی وڵاتانی دیکەی ناچار کردوون مرۆڤ بفرۆشن. ئەوکات حکوومەتێکی دیکە دێتە سەر کار کە ئەویش کۆیلە بە ئەڵمانیا دەفرۆشێ. تەنانەت ئەگەر ئێمە بتوانین حکوومەتی ئەڵمانیاش بڕووخێنین، دیسان کێشەکە چارەسەر نابێ. دوور نییە ئەودەم رووس جێگای ئەوان بگرنەوە، رووس خۆیان گەورەترین کۆیلەفرۆشی دنیان. لە رووسیا هەموو

مرۆڤەکان دیل و کۆیلەی حکوومەتن.. "ئەو مەسەلەیە تۆ ناهەژێنێ؟" "نا". "ئەوە زۆر خراپە. مانای قسەکەت ئەوەیە کە مرۆڤ لای تۆ هیچ ڕێزی نییە." "من هەر کەس بەقەد بایەخەکەی بە شیاو دەزانم و پێشم وا نییە لەو بارەوە شیاوی سەرکۆنە بم." "واتە تۆ بایەخی مرۆڤەکان بەو ڕبەیە دەپێوی کە خۆت داتناوە، لەبەر ئەوەی کەسەکان لە ڕوانگەی تووە شتگەلێن بە بایەخی دیاریکراوەوە؟" "چی تێدایە؟" "باشە بۆ بەها تاکەکەسی و کۆمەلاتییەکانیان بایەخیان پێدەدری؟" "ڕاست وایە. من هەرگیز ناتوانم بە بێ ئەوەی تووشی ئازاری ویژدان بم یان هەست بە بەزەیی بکەم، ئینسانێک ئازار بدەم."

"هەروەک ناتوانی سەگێکیش ئازار بدەی، لەبەر ئەوەی دەزانی لە لێدانی قەمچییەکانی تۆ هەست بە ئێش و ژان دەکا. هەستی هاودەردیی تۆ لەگەڵ ئینسان هەروەک هەستێکە کە لەبەرامبەر هەموو گیانلەبەرێکی دیکەدا هەتە. من دەمەوێ بزانم ئایا تۆ تەنیا لە بەر مرۆڤ بوون ڕیزی کەسێک دەگری تەنانەت ئەگەر لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە بێبایەخترین کەس بێ و بگرە ئەگەر وەک ئاژەڵێک نەتوانێ هەستی هاودەردیت تێدا بجووڵێنێ یان نا؟" لوسیان گوتی: "ڕاستییەکەی ئەوەیە من تا ئێستا ئەو پرسیارەم لە خۆم نەکردووە، تەنیا ئەوە دەزانم کە مرۆڤ بە پێی بایەخە کۆمەلایەتییەکەی لە ڕیزی گیانلەبەران دادەنێم. ئێستا هەموو کەس وا بیر دەکاتەوە."

"لوسیان، دڵنیای خەڵکی ئەمرۆ وەکو تۆ بیر دەکەنەوە و هەست بە شت دەکەن؟"

"تەواو دڵنیا نیم، مەنتیقی بەهێز و ڕاستی ئێمە، وامان لێدەکا بەو جۆرە بیر بکەینەوەو مرۆڤەکان تەنیا لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە بایەخیان هەیە. کێشەکانی دی لاوەکین." "ئەوە زۆر ترسناکە." "چی ترسناکە؟"لوسیان فەرهەنگی ئێمە داڕماوە، ئەم فەرهەنگە سێ لایەنی بالای هەبوو. جوانیی دەپەرست و ڕێزی دەگرت. ئەوەشی لە ڕۆمی کۆنەوە بۆ بە میرات مابۆوە. ڕێزی لە دادپەروەری دەگرت و مرۆڤی خۆش-

دەویستن و حورمەتی دەگرتن و ئەوە تایبەتمەندیەک بوو کە فەرهەنگی ئێمە زۆر درەنگ و بە زەحمەت و کوێرەوەرییەکی لە رادەبەدەر لە مەسیحییەتی وەرگرتبوو.

فەرهەنگی وڵاتانی رۆژئاوا تەنیا بە رەچاوکردنی ئەو سێ بنەمایە: جوانی، دادپەروەری و مرۆڤایەتی، توانیبووی ببێتە فەرهەنگێکی وەها پڕ بایەخ. کەچی ئێستا نەریتی گرانبەهای رێز و خۆشەویستی بۆ مرۆڤ لە دەست چووە. هیچ فەرهەنگێک بێ رێز و خۆشەویستی بۆ مرۆڤ ئیدی ناتوانێ بژی. فەرهەنگی ئێمە مردووە."

لوسیان گوتی: "مرۆڤ لە رێڕەوی مێژوودا ساتەوەختی لەوە تاریکتریشی بە خۆیەوە دیوە و لێی پەڕیوەتەوە. غەدر لە بارەی کۆمەڵگای ئەوڕۆکەماندا بەو شێوە توندە بڕیار بدرێ!"

"ئەوەی تۆ دەیڵێی تەواو راستە. ئەوان سەردەمان کەس هەستی مرۆڤایەتی تێدا نەبوو. ئینسانەکان دەبوونە قوربانیی درندەیی هاوچەشنی خۆیان. ئێمە تازە گەیشتبووینە ئەو قۆناغە واز لە بەربەریەت و درندێتی بهێنین و رێز لە مرۆڤ بگرین. ئێمە لە سەرەتای رێگادا بووین و هێشتا پێویستمان بە زانین و فێربوونی گەلێ شت بوو، بەڵام سەرهەڵدانی سەدەی پیشەسازی و ئامێر هەرچی شارستانییەت و فەرهەنگەکەمان وەسەر یەکی نابوو، هەمووی بە جارێ رامالی. کۆمەڵگای سەدەی پیشەسازی دیسانەوە پشتگوێ خستنی مرۆڤی دامەزراندووەتەوە و بایەخی مرۆڤی بە بوونە کۆمەڵایەتییەکەی بەستووەتەوە. ئەرێ زۆر درەنگە، نەچینەوە ماڵێ؟" لوسیان چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد: "پاپا گیان کاتژمێرەکەم خەوتووە،دەکرێ بڵێ کاتژمێر چەندە؟""کاتژمێر بیست و پێنج." "چی؟ تێناگەم.""بۆ تێبگەی؟ هیچکەس نایەوێ تێبگا، ئێستا کاتژمێر بیست و پێنجە؟"

## (٦٩)

سەرکارگەرەکە بە یوهانی گوت: "مۆریتس گیان، ئەوان تۆیان بە ئەڵمانەکان فرۆشتووە. لە خۆم دەپرسم مەجەڕەکان بۆ ئێسک و پێستی تۆ چەندیان پارە وەرگرتووە؟ پێم وا نییە نرخت ئەوەندە زۆر بێ. بە لای زۆرەوە سندووقە فیشەکێک. بیستوومانە ئەڵمانییەکان پارەی زۆریان پێنەداون. تەنیا هەندێک چەک و تەقەمەنییان بۆ ناردوون. پێم وا نییە لە بەرامبەر تۆدا لە سندووقە فیشەکێک زیاتریان دابێ. سندووقە فیشەکێک بەرامبەر بە هەموو ئێسک و پێستی تۆ."

سەرکارگەرەکە بزەیەکی هاتێ و بە دڵۆڤانییەوە شانی یوهانی تەکاند. "نرخێکی باشە. رووسەکان قەت ئەوەندەیان پێنەدەدای. لای ئەوان نرخی خەڵک زۆر لەوە کەمترە."

یوهان بەو گاڵتەیە ناڕەحەت بوو، بەڵام هیچی نەگوت. سەرکارگەرەکە خوێندکارێکی خەڵکی بوخارست بوو. مەجەڕەکان ئەویشیان گرتبوو. هەموویان هەشت مانگ بوو لە بیناکردنی مەتەرێزاندا کاریان دەکرد. یوهان دەیزانی خوێندەوارەکە زۆری حەز لە قسەی قۆڕە."تۆ نایسەلمێنی کە فرۆشراوی؟""نا بڕوا ناکەم. دەکرێ مرۆڤ بنێرییە ئۆردووگا، لە گرتووخانەی بکەی، بێگاریی پێبکەی، کەوڵی بکەی و تەنانەت بیکوژی، بەڵام ناکرێ بیفرۆشی.""بەڵام یوهان گیان، ئەوان تۆیان فرۆشتووە. من و تۆ، هەموو ئەو رۆمانیایی و سربیایی و ئۆکراینییانەی لەو ئۆردووگایەداین بە ئەڵمانەکانیان فرۆشتووین. تەنانەت گرێبەستی فرۆشتنی ئەو پەنجا هەزار کەسەشیان مۆر کردووە."خوێندکارەکە ئەوەی گوت و یوهانی لەگەڵ فکر و خەیاڵەکانیدا بەجێ هێشت.

"دەزانم دەیویست گاڵتەم پێبکا. ئەوە قەت نابێ راست بێ."

بەڵام تا ئێواریێ قسەی خوێندکارەکە لە گوێچکەیدا زرینگایەوە. لە دڵی دەرنەدەچوو بە سندووقە فیشەکێک بە ئەڵمانیاکانیان فرۆشتبێ، بەڵام هەرچەند ئەو فکرەی لە مێشکی خۆیدا دەهێنا و دەبرد، پتر دڵنیا دەبوو کە بڕواکردن بە شتێکی وا گەوجێتییە. ئۆردووگاکەیان لە نزیک سنووری نێوان مەجەڕستان و رۆمانیا بوو. ئەوان سەنگەریان لێدەدا و کارەکەیان بە نیوەیی بووبوو. ئانتیم،

هەمان خوێندکار، دەیگوت مەجەڕەکان لانیکەم دە مانگی دیکە بەو کارەوە دەبن. بۆ زووتر تەواو بوونی کارەکە هەموو ڕۆژێ ژمارەیەک گیراوی دیکەیان دەهێنایە ئۆردووگا، ئەوی چکۆلەترین هەڵەی کردبا، دەیاننارده ئەوێ. مرۆڤ کەم بوو. بەهەرحاڵ ڕۆژێک فەرمانی ڕۆیشتن دەرچوو. هەموو ڕۆمانی و سربەکانی ئۆردووگایان سواری شەمەندەفەر کردن.

یوهان بیستی کە مەجەڕەکان دەیانگوت لەبەر ئەوی ڕۆمانی و سربەکان لە کارەکەیاندا ئازا نەبوون، لە زووتر لێدانی سەنگەرەکان، دەیانگۆڕن و کەسانی ئازاتریان دێننە جێ، بەڵام ئانتیم ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە بە ئەڵمانەکانیان فرۆشتوون و ئێستا وا دەیانێرنە ئەڵمانیا. ژمارەیەکی دیکە لە ڕۆمانیاییەکان لەسەر ئەو ڕایە بوون، بەڵام زۆربەیان بڕوایان بەو قسەیە نەدەکرد. یوهانیش یەکێ بوو لەو زۆربەیە. بەیانییەک یوهان مۆریتس بۆ دەست بە ئاو گەیاندن لە شەمەندەفەر دابەزی. لە نێو شەمەندەفەرەکەدا ئەم کارە نەدەکرا. دەبوایە بەندییەکان ڕاوەستابان تا شەمەندەفەرەکە لە ناوچە چۆڵەکانی دەرەوەی شار ڕابیگرێ. لە ژێر چاودێری پاسەوانەکان لەو مەزرایە کاری خۆیان پێکدێنا. ئێستا شەمەندەفەر لە دەرەوەی شار ڕاوەستابوو. باران دەباری. یوهان لە هەوای ئازاددا کەمێک ڕاوەستا و کاتێ دەچۆوە لای ڤارگۆنەکەی، دیتی لەسەر دیواری ڤارگۆنەکان بە گەچ شتێکیان نووسیوە. نزیکتر بۆوە و ئەو دێڕەی بە زمانی ئەڵمانی خوێندەوە: "کرێکارانی مەجەڕ لە پێناوی سەرکەوتنی دەوڵەتە بەهێزەکاندا دەجەنگن." یوهان کاتێ زانی بە ڕاستی بەرەو ئەڵمانیا دەچن، مچوڕکێکی پێدا هات. لەسەر دیواری سێهەم ڤارگۆن خوێندییەوە: "کرێکارانی مەجەڕ لە پێناوی پێکهێنانی سیستەمی نوێ لە ئەورووپادا کار دەکەن."بانگی ئانتیمی کرد و دروشمەکانی نیشاندا. خوێندکارەکە گوتی:

"ئێستا بڕوا دەکەی مەجەڕەکان بە ئەڵمانیایان فرۆشتووین؟" "نا، بڕوا ناکەم."

"ڕاوەستە بە چاوی خۆت دەیبینی."شەمەندەفەرەکان تا ئێوارێ لەو مەزرایە ڕاوەستا. کاتی زەردەپەڕ بۆ گوڵچنین، هەموو پاسەوانەکان بەو دەشتەدا بڵاو بوونەوە. یوهان قەت نەیدیبوو دەستە سەربازێکی پڕ چەک لە ژێر چاودێریی

ئەفسەرێکدا، خەریکی گوڵچنین بن. ئەفسەرکەشیان گوڵی دەچنی. ئینجا سەربازەکان هەر یەکە و بە چەپکە گوڵێکی گەورەوە هاتنەوە و تەواوی شەمەندەفەریان بە گوڵ و گیا و تەنانەت لقی داران، وەک ماشێنی بووک، رازاندەوە. وڵات تاریک داهاتبوو. شەمەندەفەرەکە وەڕێکەوتەوە. یوهان بڕیاریدا نەنوێ، تا بزانێ چی روودەدا، بەڵام خەوی لێکەوت. کە وەخەبەر هات هەوا روناک ببوو. لە دەرەوەی دەنگی هەرا و هۆریا دەهات. شەمەندەفەرەکە لە وێستگەیەک راوەستا. دەنگە دەنگی خەڵک و تەپە تەپی شەمەندەفەر تێکەڵ بووبوو. یوهان گوێی قوڵاخ کردن. بیستی یەکێک خەریکی وتاردانە. وتاردانەکە بە زمانی ئەڵمانی بوو. کەوابوو راستە بە ئەڵمانەکانیان فرۆشتوون. "کێ دەڵێ من بە سندووقە فیشەکێک بە ئەڵمانەکان نەفرۆشاوم. سندووقە فیشەکێک لە بری گۆشت و پێست و هەموو گیانم." ئانتیم گوتی: "هەموومانیان وەک کۆیلان. تا کۆتایی تەمەنمان بە ئەڵمانان فروشتووە."

پاشان هەستایە سەرپێ و وتاریدا. هەموویان گوێیان لە وتارەکەی راگرت، جگە لە یوهان کە بیری هەر لای "کۆیلەی تا کۆتایی تەمەن" بوو. خۆی دەهاتە بەرچاو کە تا کۆتایی تەمەن برسی و دژوێن و تێهەڵدراو و قوون هەڵدڕاو، بە خۆی و هەزاران ئەسپێوە لە مەتەریز و خەندەکاندا کار دەکا و زمان دەکێشێ.

دیمەنی مردنەکەی لە یەکێ لەو ئۆردووگایانە هاتە بەرچاو. چاوی پڕ بوون لە فرمێسک. چەند کەسی لە بەندییەکان لە کاتی گیانەڵڵادا دیتبوون. کاتێ یەکێک دەمرد، وەک سەگ خێرا جلوبەرگەکەیان تاڵان دەکرد. یوهان گوتی: سەگ بۆ ئەوە کەوڵ دەکەن، تا دەستێکشی لێ دروستبکەن، بەندییەکانیش کە دەمرن بەرگەکەی لەبەر دادەدڕن. ئەگەر مرۆڤ زانیبای لە پێستی مرۆڤیش دەستەوانە چێ بکا، بێشک پێش ناشتنی بەندی، کەوڵیان دەکرد. لەوانەیە تا کاتی مەرگی من ببێتە باو مردووانیش کەوڵ بکەن. "پشتی راست کردەوە. لەوانەیە هەموو تەمەنم لە گرتووخانە و ئۆردووگادا رامبگرن، بەڵام پێش مردنم دەبێ ئازادم بکەن. لانی کەم دەبێ کاتژمێرێکم ئازادی بدەنێ. هەر ئەوەندە کە لە بەندیخانە نەمرم، بەڵام ئەگەر بێ و بە ئەڵمانەکانیان فرۆشتبم، تەنانەت بەر لە مردنیش کاتژمێرێکم پێ رەوا نابینن."

## (٧٠)

ئەليو نوورا ويست كۆروگا گوتی: "بەلای زۆرەوە تا دە رۆژی دی دەبێ دەربچم. ئەگەر لە ماوەی ئەو چەند رووژەدا ئێرە جێبهێڵم فەرمانی گرتنم دەدرێ و دەگیرێم. دە رۆژ لانی زۆری دەرفەتەکەمانە و لەوانەیە کەمتریش.
پاشان چاوێکی لە شتاین کرد کە تێیەوە رامابوو. دەرفەتی یاسایی بۆ تاونووسینی جوولەکان لە نووسنیگە حکوومییەکان تەواو بووبوو و ئەو جوولەکانەی خۆیان بە وەزارەتی ناوخۆ نەناساندبوو، بە پێی یاسای نوێ دە ساڵ زیندانیان بەسەردا دەسەپا. بە پێی راپۆرتێک، فایلەکەی نوورا رادەستی "داواکار" کرابوو. داواکار هەندێ بەڵگەی لە دەستدا بوون، کە جوولەکە بوونی نوورایان دەسەلماند. هەموو هەوڵ و تەقەلای نوورا بۆ تەماح وەبەرنانی کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوە ـ وەکو جاران ـ بێئاکام مابووەوە.
نوورا گوتی: " جەنابی شتاین. ئەم جارەیان ئێمە دۆڕاین. دەبێ رابکەم. تەنیا ئەو رێگایەم لەبەر ماوە. دوو ساڵ و نیوی خشت خۆم لەبەر هەموو رووداوێک راگرت، بەڵام چارەنووس هەتا سەر یار و یاوەری بێپەنایان نییە."
لیۆ پۆلد شتاین لە وەڵامدا گوتی: "بەڵام ئێمە هێشتا نەدۆڕاوین. راستە دە رۆژ دەرفەتێکی زۆر نییە، بەڵام دەتوانین لەو ماوەیەدا چاپخانە و رۆژنامە و ڤیلایەکە بە نرخێکی گونجاو بفرۆشین. کڕیار بۆ قەنەفە و کتێب و تابلۆکانیش بدۆزینەوە و پارەکەی لە یەکێک لە بانکەکانی سویسرا دابنێین، بەڵام بە دە رۆژ جەنابی ترایان دابمەزرێنرێ و پەساپۆرتەکان وەربگرین، ئەوەیان ناکرێ.""تەنیا ئەو کەسانەی پەساپۆرتی سیاسییان هەبێ و نێردراوی رەسمیی دەوڵەت بن دەتوانن لە رۆمانیا بچنە دەرێ. پێشتریش پێم گوتبووی دەبێ مێردەکەم وەکو سەرۆکی ئەنیستیتۆی فەرهەنگیی رۆمانیا لە "راگوسا" دابمەزرێ. ئەودەم من وەک هاوسەری ئەو، دەتوانم پەساپۆرتی سیاسی وەربگرم، بەڵام دەبێ ئەو کارە زۆر بە خێرایی بکرێ."
"داواکار پێی گوتم تەنیا کارێکی لە دەستم دێ ئەوەیە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

ده رۆژ دوا بخەم. دوای ئەو ماوەیە، ئەو ناچارە فەرمانی گرتنت دەربکا."
ئەلیو نوورا لە بەندخانەدا! پارێزەرەکە بۆ چەند ساتێک ئەو دیمەنەی هاتە بەرچاو و لە ترسان تەزووی بە لەشیدا داهات. لە نوورای پرسی: "تۆ هێشتا هیچت لای مێردەکەت باس نەکردووە؟ ئەوە هەڵەیەکی گەورەی تۆ بوو. ئەو دواتر هەموو شتێک دەزانی. ئەگەر تەنانەت کاتژمێرێکیش زووتر بزانی، لەوانەیە بتوانی یارمەتیت بدا."

ئەلیو نوورا لە وەڵامدا گوتی: "من ناتوانم پێی بڵێم. خۆی هەر دەزانی جوولەکەم، بەڵام ئێستا ناتوانم پێی بڵێم. ماندوو و مردوم و هێز و بڕستم لێ براوە. دان پێدانان بە نهێنییەک کە دوو ساڵە لە دڵی خۆمدا رامگرتووە، ورەیەکی تایبەتی دەوێ، کە من ئیدی لە خۆمیدا شک نابەم. من ماندووم. بە جۆرێکی ترسناک ماندووم."سەری لە ناو دەستان گرت: لیۆ پۆلد شتاین چاوی تێبڕیبوو. بەزەیی پێدا دەهاتەوە، هیچیشی لە دەست نەدەهات. پیرە بۆ ئەوی دەموچاوی تێکشاوکی ئەم ژنە نەبینێ و بۆ ئەوەی خۆی لەوە گێل بکا کە ئاگای لە داماوی و ناهومیدییەکەیەتی، وای نواند لە جانتاکەیدا بە دوای شتێکدا دەگەڕێ. لە جانتاکەدا لە نێو بەڵگەنامەی فرۆشتنی خانوو و چاپخانە و رۆژنامە و تابلۆ نیگارەکاندا، جانتایەکی دەستیی تێدا بوو، کە بە پیتی ئاوەزێڕ وشەی "ترایان کورزگا" ی لەسەر نەخشابوو. شتاین جانتاکەی دەرهێنا. نوورا چاوی پێکەوت و دەستی بۆ درێژ کرد.

"سبەی دوووهەمین ساڵەوەختی زەماوەندی ئێوەیە. من دەزانم ئەوەندە سەرقاڵ بووی، پێت نەکراوە دیارییەکی بۆ بکڕی. بۆیە من ئەو جانتایەم کڕی"."سبەی دوو ساڵ بەسەر مێردکردنمدا تێدەپەرێ؟ بەڵێ، لەبیرم نەبوو. زۆر سوپاست دەکەم جەنابی شتاین. ترایان زۆری پێخۆش دەبێ."

بە نەرمونیانی دەستێکی بە جانتاکەدا خشاند." بۆخۆشم نازانم بۆچی هەموو شتێک لە ترایان دەشارمەوە. رەنگە لەبەر ئەوە بێ خۆشم دەوێ. ئەگەر ئەو ئاگای لە حاڵی من بوایە، بۆ یارمەتیدانی من هەموو کارێکی دەکرد. بەو حاڵەشەوە من هیچم پێنەگوتووە.دەترسم لە دەستی بدەم. هەموو جارێ کە بڕیارم داوە هەموو شتێکی لا بدرکێنم، ئەو ترسە بەرۆکی گرتووم، بەو جۆرە

دیسانەکە ئەو نهێنییە بە ئازارەم لە دڵی خۆمدا ڕاگرتووە. ترایان تاقە کەسێکە کە بە ژیانەوەی گرێ داوم. بێت و ئەو لە دەست بدەم، خۆشم لە دەست دەچم."پاشان جانتاکەی نایە لاوە و بە لەرز گوتی: "دەزانی داواکار چی پێ گوتم؟"ئیدیعای ئەوەی دەکرد من هەر مێردم نەکردووە." ئەلیو نوورا دەنگی دەلەرزی: "ڕاستیش دەکا. من دوای ئەوەی یاسای یاساغ کردنی ژنخوازی لە نێوان ڕۆمانیایی و جوولەکاندا پەیڕەو کرا، مێردم بە ترایان کرد. ئەو یاسایە لە مانگی خاکەلێوەدا دەرکرا و من و ترایان دوای چوار مانگ زەماوەندمان کرد. بە پێی ئەو یاسایە ژن و مێردایەتیی ئێمە هەڵوەشاوەیە. هەموو ئەو هاوسەرگیریانەی پاش ئەو ڕێکەوتە کراون، چ ئاگادار بووین لەو یاسایە و چ بێئاگا، بەتاڵ بوونەتەوە. ئەلیو نوورا کڕ بوو. هێشتا گوتەکانی داواکاری لە گوێدا دەزرینگانەوە: "جەنابی ترایان کۆرۆگا مێردی تۆ نییە. مارەبڕینەکەتان هەڵوەشاوەتەوە. بەڕێزیان هەر کاتێ پێی خۆش بێ، دەتوانێ ژنێکی دیکە بهێنێ، بێئەوەی بە فرەژنی تاوانبار بکرێ؛ تەنانەت ئەگەر منداڵیشتان هەبایە بە نایاسایی لە قەڵەم دەدرا و نەدەکرا ناوی کۆرۆگای بە سەرەوە بێ، بەڵکو تەنیا بە ناوی تۆوە بانگ دەکرا. تۆش کە خۆت وەکو خانمی ئەلیو نوورا کۆرۆگا دەناسێنی بە تاوانی بە ئیستلاح "ساختەکاری" تۆمەتباری.

نوورا ڕووی تێکرد و گوتی: "هەرچەند پارە دەخوازێ، بیدە. ئێمە لەو ماوە کەمەدا بە هەر نرخێک بێ دەبێ پەساپورت و ڤیزەی دەرچوون وەربگرین. دوو پەساپۆرت بە ناوی نوورا و ترایان کۆرۆگاوە."

## (٧١)

دوای پێنج ڕۆژ شتاین بە مزگێنیی دامەزرانی ترایان کۆرۆگا وەک سەرۆکی ئەنیستیتۆی فەرهەنگیی ڕۆمانیا لە "ڕاگوسا"وە پەیدا بوو. دوو پەساپۆرتی سیاسیشی لەگەڵ خۆی هێنابوون: "خاتوو نوورا، ئەو شەڕەشمان بردەوە زۆر خۆشحاڵم." لیۆپۆلد شتاین چاویلکەی سڕیەوە. ئەلیو نووورا چاوی لێکرد و بۆی دەرکەوت زۆر کز و لاواز بووە. ویستی لێی بپرسێ، کە

بۆچی لەگەڵیان نایە. شتاین خۆی گوتی: "نازانم جارێکی دی یەکتر دەبینینەوە یان نا؟ هەر ئەمشەو چوار هەزار جوولەکەیان بردنە ئۆردووگای "ترانزیسترین". تا ئەو کاتەی ئێوە دەگەڕێنەوە بوخارست، یەک جوولەکەش لێرە نامێنێ. تەنانەت من. پیاوێک لەو تەمەنەی مندا زەحمەتە بەرگەی نەهامەتییەکانی ئۆردووگا بگرێ."

## (٧٢)

ترایان لە ژووری کارەکەی خۆی بوو. نوورا قەت لە کاتی کارکردندا نەدەچووە لای، بەڵام ئەو جارە بە خۆی و پەساپۆرتەکانەوە چووە ژوورەکەی و دیتی ترایان دەستی وە بەر چەناگەی داوە و لە گژ فکران راچووە. پێی گوت: "بە بۆنەی ساڵهاتی زەماوەندمان دیارییەکم بۆ هێناوی. فەرمانی دامەزرانی تۆ لە پۆستی سەرۆکی ئەنستیتۆی فەرهەنگیی رۆمانیادا لە راگوسا." پاشان فەرمانەکەی دایە: "دالمانتین جوانترین کەناری دەریای دنیای لێن، لەوێ لەوپەڕی هێمنیدا دەتوانی رۆمانەکەت تەواو بکەی."

"چۆن توانیت ئەم کارە بکەی؟ لەوەش گرنگتر چۆت توانیت ئەو نهێنییە گرنگە تا دوا ساتەوەخت لە دڵی خۆتدا رابگری؟" نوورای لە باوەش گرت. "نوورا، کچێ تۆ بلیمەتی، بریا زانیبات چەند دڵخۆشم. بۆ تەواو کردنی رۆمانەکەم، بەڕاستی پێویستیم بە شوێن گۆڕین هەبوو. ئەگەر لێرە مابامەوە بەشی دواترم پێنەدەنووسرا. بۆخۆشم هەستم بەوە کردبوو گۆڕانکارییەک روودەدا. لەوانەیە بەشەکەی تر بەهێزترین بەشی کتێبەکە بێ." نوورا لێی چووە پێشەوە و لێوی ماچکرد تا ترایان بەشی داهاتوو کتێبەکە نەگێڕێتەوە. نوورا دەترسا.

# کتێبی سێهەم

## (٧٣)

"فەرمانیان پێداوین کارێکی سووکت بدەینێ." وەستاکار بە نەرە نەرێکەوە گوتی: "تۆ نەخۆشی، هەرچی نەخۆش و نێوزگ رزیوە بۆ ئێمەی دەنێرن."

پاشان بە رقەوە مۆرەیەکی لە یوهان مۆریتس کرد. ئینجا چاوێکی لە نامەکەی دەستی یوهان کرد و سەرلەنوێ بە دڕدۆنگییەوە تێی وەڕاما. لە ماوەی ئەو دووساڵەدا کە یوهان لە ئەڵمانیا بوو، هەمیشە و لە هەموو جێیەک بە دردۆنگییەوە سەیریان دەکرد. هەموو لێی دەترسان دەست بداتە جینایەتێکی گەورە. هەر چەندە قەت شتی وای لێ روو نەدابوو، بەڵام ئەوان وێدەچوو لەوە دڵنیا بن کە رۆژێک کەتنێک هەر دەکا. وەستاکار پرسی: "مەجەڕ؟ من زۆرم کار لەگەڵ مەجەڕان کردووە. هیچ بە دڵم نین. لەوانەیە تۆ وا نەبی." پاشان بزەیەکی هاتێ و دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کرد:

مۆریتس یانووس، مەجەڕ، ٣٢ساڵە، کرێکاری ناپسپۆڕ لە ٣٠ی پووشپەڕی ١٩٤١وە ئاکنجی ئەڵمانیا." یوهان کە دەیزانی لەو دوو ساڵەدا لەبەر ئەوەی بەڵگەنامەی مەجەڕستانی هەبووە، بە هاووڵاتیی مەجەڕستان لە قەڵەم دراوە. تەماشای جووڵەی دەموچاوی وەستاکارەکەی دەکرد کە لیستی ئەو هەموو کارگە و دامەزراوی پیشەسازی و کارخانەی ئاسن تواندنەوەی یوهان هەر یەک ماوەیەکی کەم کاری تێدا کردبوون، تووشی سەرسوڕمانی کردبوو. لیستەکە دوور و درێژ بوو، چەندین جۆرە پیشەی تێدا بوون. بۆ هەر کامێک دیمەنی تێلدڕووی دەوری کارخانە جوراوجۆرەکانی هاتنەوە پێش چاو.

چاوەڕێ بوو وەستاکار سەری لە گیانسەختی و خۆڕاگریی ئەو سوڕ بمێنێ کە توانیبووی بەرگەی ئەو هەموو نەهامەتییە بگرێ، بەڵام کابرا بە پەلە بە سەر ناوی گشت ئەو شوێنانەدا بازیدا کە یوهان دنیایەک کوێرەوەری و ئازاری تێدا چێشتبوون و گەیشتە کۆتایی نووسراوەکە: "دەرچوون لە نەخۆشخانە لە ڕێکەوتی ١٨ی ڕەشەمەی١٩٤١" یوهان سەری لەوە دەرنەدەچوو کە چۆن مرۆڤێک دەتوانێ بەبێ هەستی هاوخەمی، چاو بە پێرستی دەرد و نەهامەتییەکانی ئەودا بخشێنێ و تەقەی سەری بێ. دیار بوو وەستاکار پەکیشی پێناکەوێ. قەڵەمێکی داری هەڵگرت و لە گۆشەی کاغەزەکە ـ چ جێی بەتاڵی نەمابوون ـ نووسی: "دەستپێکی کار لە کارخانەی قۆپچەسازی کنۆپۆف و کوڕەکەی لە ڕۆژی ٢٠ی ڕەشەمەی ٤٢وە." پاشان لە ئەرشیف لە ناو هەزاران نووسراوی لەو چەشنەی هاویشت و لە کاتێکدا چاوی لە یوهان بڕیبوو گوتی: "ئامۆژگاریی ئێمە بۆ کرێکارە بیانییەکان ئەمەیە: ڕێکوپێکی، گوێڕایەڵی، کار، دیسیپلین. لێرە ژنانی ئەڵمانیش کار دەکەن. من دەبێ ئەوەت پێ ڕاگەیەنم دروستکردنی بچووکترین پەیوەندی لە تەکیان لانیکەم پێنج ساڵ زیندانی بە دواوەیە. سەرۆکی کارخانە لەو بارەوە زۆر توندوتیژە. ئەو کابرا مەجەرییەی پێش تۆ لێرە بوو ئێستا لە بەنددایە. کاتێ هات، ئەویشم لەو مەسەلەیە ئاگادار کردەوە، بەڵام گوێی نەدایێ. پێی وا بوو لەگەڵ ژنێکدا بە تاریکی و لە ژێر بەتانیدا کەس نایبینێ، بەڵام لەو ولاتە گەورەیەدا تۆ بەبێ ئاگاداریی ئێمە ناتوانی هیچ بکەی. هەرچی بیکەی ئێمە خێرا لێی ئاگادار دەبینەوە. ئێمە تەنانەت ئاگامان لەوە هەیە چیت لە مێشکدایە. بیرت دەخوێنینەوە. ئێستا خاڵی دووەم: دامودەزگاکەی ئێمە بۆ جەنگ کار دەکا، هەرچی دەیبینی و دەیبیسی نهێنیی سەربازییە. کرێکاری بیانی بۆی نییە بزانێ کارخانە چی بەرهەم دەهێنێ و چەندەی بەرهەم دەهێنێ. ئەگەر بتهەوێ ئەوانە بزانی سەری خۆت بە فەتەڕات دەدەی. مانگی ڕێبەدان

ئیتاڵییەکیان لە سێدارە دا. ئێستاش چیکییەک کە ویستبووی سەرەدەر لە نهێنییەکانی کارخانەی کنۆپۆف و کورەکەی دەربکا دادگایی دەکرێ."

## (٧٤)

وەستاکار هەستایە سەر پێ و بەرەو دەرگاکە رۆیی. یوهانیش وە دوای کەوت: "ئەو مەجەڕانەی لێرە کاریان کردووە شتاقم بە دڵ نەبوون. هەموویان کەوتنە بەند. یەکیان بیست ساڵی زیندان بە کاری سەختەوە دراوەتێ. لەسەر بەدفەڕی. هیوادارم تۆ وا نەبی. هەرچەندە باوەڕم بە ریزپەڕ نییە.

هەردووکیان چوونە هۆڵێکەوە. وەستاکار لە پەنا ئامێرێک راوەستا کە سندووقی دارینی دەردەفرتاندن. کرێکارێک بە دیار کۆتایی نەقالەیەکەوە وەستابوو، سندووقەکانی لەسەر نەقالەکە هەڵدەگرتن و لەسەر داشقەیەکی دەستی دادەنان. کاتێ ئەوان گەیشتنە وێ، داشقەکەکە پڕ بووبوو، لەسەر نەقالەیەکی دی وەڕێ کەوت. لە لایەکەی ترەوە داشقەیەکی بەتاڵ دەهاتە پێشێ. وا دەهاتە بەرچاو کە کرێکارەکە کاری بە گۆڕان و جێگۆڕکێی داشقەکان نەبێ و تەنیا وەک چۆن داشقەکەی پێشووی پڕ کردبوو لە سندووق، وەک ئامێرێک سندووقەکانی یەک یەک لەسەر باندە گەڕۆکەکە هەڵدەگرتن و لە نێو داشقەدا لەسەر یەکی هەڵدەچنین. دیار بوو سندووقەکان زۆر قورسن. "لە سبەیەوە ئەمە کاری تۆیە. هەر وەک دەیبینی زۆر ئاسانە. تۆ تەنیا سندووقە پڕ کراوەکان کە لە کارخانە دێنە دەرێ لە داشقە دەنێی و داشقەکە بۆ خۆی دەیانباتە عەمبار. قەت لە کارخانەی وا گەورە کارت کردووە؟"

یوهان زەق زەق چاوی لە کرێکارەکە بڕیبوو کە وەک ئامێرێک دادەهاتەوە. دەستی درێژ دەکرد، سندووقەکەی هەڵدەگرت و لە داشقەکەی دەنا و ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو.

وەستاکار دووپاتی کردەوە: "ئامێرەکان تەحەممولی هیچ ناڕێکییەک ناکەن. ئامێرەکان وەکو مرۆڤ تەوەزەل و سەرەڕۆ و بەدفەڕ نین."

یوهان چاوی لە ویژەری ئەو وشانە بری. "تۆ بۆت نییە لە فکران رابچی. ئامێرەکان خێرا سزات دەدەن. دەبێ هەموو هۆش و گۆشت بە سەر کارەکەتەوە بێ و بە سەر ئەو هاوڕێ ئامێرەتەوە بێ کە سندووقەکان دێنێتە پێشەوە و دەیانگەیەنێتە دەست تۆ. هەر هێندەی دەوێ دابێیەوە، سندووقەکانی لێ وەربگری و لە داشقەیان بنێی."

وەستاکار بزەییکی هاتێ. یوهان هەولیدا دەستی هاوڕێی ئامێرەکەی خۆی ببینێ، بەلام نەیدیتەوە و بە جۆرێکی پرسیارئامێز چاوی لە وەستا بڕی. وەستاکار هێشتا بزەی لەسەر لێو بوو. "ئەو مرۆڤە دەسکردە جوولانی خۆی لەگەڵ تۆ رێک ناخا. تۆ دەبێ خۆتی لەگەڵ رێک بخەی. هەقی خۆشیەتی، چونکە ئەو کرێکارێکی تەواو عەیارە. ئێمە دەبێ سەرنج بدەینە ئەوان و کارکردنیان لێ فێر بین. تێگەیشتی؟ رێکوپێکی و هاوسەنگی و ئیشکەری لە ئامێرەوە فێر بە. ئەگەر لاسایی ئەو بکەیەوە دەبیە کرێکارێکی دەرەجە یەک، بەلام تۆ مەجەڕی و مەجەڕەکان لە کارخانە هەر سەیری ژنان دەکەن نەک ئامێر."

یوهان زۆری حەز لێبوو بلێ من رۆمانیاییم نەک مەجەڕ. چەندی حەز دەکرد سەربهۆردی ئەو گرتووخانانە و ئەو تێهەڵدانانەی لە بووداپێست خواردبووی بگێڕێتەوە، بەلام وەستاکار وەها نوقمی سەیرکردنی جوولەی ئامێرەکە بووبوو کە بە بێدەنگی سندووقە سپییەکانی بە هاتوچۆی هاوسەنگ و بەبێ هەستی ماندوویەتی، دادەگێڕانە خوارێ. یوهان هەستیکرد ئەو چاولێکردنە پڕ سووکایەتییە هەموو وجودی خستە ژان. گێڕانەوەی سەربردەی خۆی لە بیر چووەوە. وەستاکار گوتی: "مرۆڤ وەکو کرێکار زۆر بێ نرخ و بەهرەیە. بە تایبەتی رۆژهەلاتییەکان. ئێوە زۆر لە ئامێر وە پاش کەوتوون. سەرباری هەمووی ئەوانە تۆ تازە لە نەخۆشخانە هاتوویە دەرێ و نەخشی."

یوهان زانی کە وەستاکار تێیڕا نابینێ. ویستی دڵنیای بکا، تەواوی هەولی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی دەرەقەتی کارەکەی بێ، بەلام ئەختوچاری کرد زمانی گۆی نەکرد.

پاشان "هەر ناکرێ تۆ لەگەڵ ئامێرێکدا بەراورد بکرێی. لەبەر ئاوێنە باش سەرنجی خۆت بدە." چاوێکی هاکەزایی بە سەرتاپای یوهاندا خشاند: "ئەوە سووکایەتییەکی گەورەیە بە ئامێر، تۆی لەگەڵ بەراورد بکرێی. ئێستا وەرە با بەرگی کارت بدەمێ. تۆ تەنیا بە جلوبەرگی کارەوە بۆت هەیە پێ بنێیە کارخانە."

## (٧٥)

یوهان کاتژمێر چواری سپێدە بەتەنێ چووە ناو هۆڵی چۆڵوهۆڵی کارخانە و تا لای ئەو داشقەیەی دوێنێ وەستاکار پێی نیشاندابوو، گیر نەبوو. هێشتا پێنج خولەکی بۆ کاتی دەستپێکردنی کار مابوو. دڵەڕاوکەی بوو. جلێکی شینی لەبەر و قاپقاپی لە پێدابوون کە لە سەر کۆنکرێتی هۆڵەکە وەک چەکوچ تەقە تەقیان بوو. کاتێ گەیشتە ناوەراستی هۆڵەکە پێی وابوو یەکێک بانگی دەکا. کەس بانگی نەکردبوو، بەڵام ئەو لە خۆوە وای هەست دەکرد لەگەڵ ئەویانە. لە دەوروپشتی خۆی نۆری. دەنگەکە دووپات بووەوە، بەڵام ئەو جارە ئاشکراتر. سلاڤە سکلاڤە.

سەرێکی رەش و لوول و دوو چاوی زەق و ددانی سپی و دەموچاوێکی رەشی بریقەدار لە یوهانەوە رامابوو. لەشی لە بەر دیوارەکە دیار نەبوو. کاتێ نیگایان تێک ترینجا لاوەکە سڵاوی کرد، دەتگوت لەمێژە یەکتر دەناسن: "سلاڤە سکلاڤە[1]." یوهان پێی وابوو ئەوی لەگەڵ کەسێک لێگۆڕاوە کە ناوی "سکلاڤە"یە، بۆیە گوتی: "من ناوم یوهان مۆریتسە." فیکەی کارخانە تێی تووڕاند. ئامێرەکان گورجێ کەوتنە کار. یوهان چووە شوێنی کاری خۆی. لاوەکە هەڵوەستەیەکی کرد و بە روویدا پێکەنی. وەڵامەکەی یوهانی گوێ لێ-

---

١- Slave Sklava بە لاتینی بە مانای "سلاو کۆیلە"یە. هەمان "سلاڤ"ی کوردیی خۆمانە. وەرگێڕ

بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێش ئەوەی لە پێش چاو ونبێ دیسان بە دەنگی بەرز گوتی: "سلاڤە سکلاڤە."

یوهان یەکەم سندووقی هەڵگرت و لە داشقەکەی نا. ئەگەر سندووقەکان ئەوەندە قورس نەبوونایە ئەو کارە بە منداڵێکی حەوت ساڵانیش دەکرا. یوهان دەیزانی ئەو سندووقانە دوگمەیان تێدان و زۆری حەز لێبوو بیان‌بینێ، بەڵام دەرکی سندووقەکان توند قایم کرابوون. خۆ ئەگەر داشنەخرابان یوهان هەر نەیدەوێرا لە پەنایەک سەری دانەیەک هەڵگرێ و چاو لە ناوی بکا." مانگی رێبەندان ئیتاڵییەک لە سێدارە دراوە و ئێستا چێکییەک دادگایی دەکرێ. یوهان لە دڵی خۆیدا گوتی بێگومان کابرای خەڵکی چێکوسلۆڤاکیا ویستوویە نهێنیی کارخانەی کنۆپیۆف و کورەکەی بزانێ. لەوانەشە هەر ئێستا لە بەرامبەر قازیدا راوەستابێ و بۆ ئەو هەڵەیەی کردوویە داوای لێبوردن بکا. تۆ بڵێی سەری کابرای ئیتاڵییان بڕیبێ؟

یوهان پێشتریش ئیتاڵیایی زۆر دیتبوون، وای هاتبووە بەرچاو هەموویان رووخۆش بن. گەنجە ئیعدام کراوەکەشی هەروا دەهاتە بەر نەزەر: رووخۆش و دەم بە پێکەنین. بە سەر بڕوای هاتە بەرچاوی کە ردێنێکی چکۆلەشی هەیە و لە کاتی لینگەفرتە لە بەر لاقی جەللاددا پێی پێدەکەنێ. یوهان بڕیاریدا قەت سەیری ناو سندووقەکان نەکا، تەنانەت ئەگەر سندووقێک هەر خۆی ئاوەڵا بێ. پاشان وای بیر کردەوە کە بێگومان ئەو قۆپچانە بۆ سوپای ئەڵمانیا دروستدەکرێن. لە کاتێکدا سندووقێکی هەڵگرتبوو تا لە داشقەی بەتاڵی بنێ. ـ داشقە پڕ بووەکە لەو ماوەیەدا بەڕێ کەوتبوو و بێ ئەوەی یوهان ئاگای لێبێ داشقەیەکی بەتاڵ جێگای گرتبووەوە ـ لە خۆی پرسی ئەوانە چ جۆرە قۆپچەیەکن؟ بێگومان بۆ چەند تاقمی جۆراوجۆر بوون. هێزی دەریای، هێزی ئاسمانی و پیادە، هەر یەکە و بە رەنگێ. یوهان کەیفی پێدەهات کە لە مێشکی خۆیدا وێنەی ئەو قۆپچە رەنگ زێڕینانەی وێنا دەکردن کە پڕی سندووقەکانی ناو دەستی بوون. زەردەکان لە هەمووان جوانتر بوون. وەکو سکەی زێڕ. ئەوە قۆپچەی هێزی دەریایی بوون. "لەوانەیە ئەو سندووقانە قۆپچەی هێزی دەریایی بن." گوشاری بۆ خۆی هێنا کە چیدی بیر لەوە نەکاتەوە ئەو

سندووقانه چییان تێدایه. ئەوە نهێنی بوو. دوای کەمێ بیری لەوە کردەوە ئەگەر سوپای ئەڵمانیا چەندەی قۆپچە پێویستە؟ هەموو ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی دیتوونی قۆپچەیان بە یونفۆرمانەوە بوو. کەواتە ئەو قۆپچانەی ئێستا چێ دەکران بۆ یونیفۆرمی نوێ بوون. یوهان سەیری ریزی سندووقەکانی کرد کە بێپسانەوە، یەک لە دوای یەک دەهاتنە پێشی و لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەبێ ئەو سندووقانە ملیۆنان قۆپچەیان تێدا بن. هەر ئەوەندە سندووقانە بەشی هەموو سوپای ئەڵمانیا دەکەن. لەوانەیە سوپا فەرمانی دابێ هەموو سەربازەکان یونیفۆرمی تازە وەربگرن، بۆیە ئەو هەموو قۆپچەیە دروستدەکەن." لە دڵی خۆیدا گوتی: "لەوانەشە ئەو قۆپچانە بۆ یونیفۆرمی کەسانێ بێ کە دوای براوەنەوەی شەڕ بە ئاڵا و مۆزیقاوە سان دەبینن. ئەو دەم قۆپچەی رەنگ زێڕینی هەر سەربازێک وەک خۆر دەدرەوشێتەوە."
یوهان بەو بیرە خۆشییەکی بە دڵیدا هات. خۆی لە ناو سەیرکەرانی سان بینینەکەدا دەدی و بە خۆی دەنازی کە قۆپچەی گشت سەرباز و ئەفسەر و بگرە ژەنەراڵەکان بە ژێر دەستی ئەودا تێپەڕیون.
"لەوانەیە ئەو قۆپچانەی هەر ئێستا لە بن دەستی مندان لە بەرگی ژەنەراڵێک بنرێن. ئەودەم قۆپچەی هەموو یونیفۆرم و بەرگی ئەو ژەنەراڵە هی ئەم سندووقە دەبن. لەوانەیە ئەو سندووقە قۆپچەیە گشتی لە جلوبەرگی ئەو بنێن.
یوهان کە خۆی دابووە دەست فکر و خەیاڵان، لە بیری چوو ئەو سندووقەی هەر ئەو ساتە گەیشتبووە بەردەمی دەست بداتێ. نەقاڵەکە کە هەروا خەریکی کاری خۆی بوو سندووقێکی دیکەی هێنا پێشەوە. سندووقەکەی پێشوو کەوتە سەر زەوی. یوهان ویستی هەڵیگرێتەوە. لەم کاتەدا سندووقێکی دیکەش گەیشتە بەر دەمی و ئەویش بە تەق و هۆڕێکی زۆر کەوتە سەر عەرزی چیمەنتۆکراوی کارگەکە. یوهان هەوڵیدا نەپەشۆکێ. یەکەم سندووقی لە ژێر هەنگڵی نا، بەڵام سێیەم سندووقیش لەسەر نەقاڵەوە بەربۆوە. ڕووداوێکی سامناک بوو، قەت وای لێ نەقەومابوو. گەڕایەوە سەر جێگای خۆی لای نەقاڵەکە. وازی لەو سندووقانە هێنا کە بەربوونەوە و هەوڵیدا سندووقی دیکە بنێتە داشقەوە. بۆ لەحزەیەک بە چاوێکی پڕ لە

پاڕانەوەوە لە ئامێرەکەی ڕوانی. دەتگوت بە زمانی حاڵ سوێندی دەدا بۆ ساتێک نەقالەکە ڕابگری، تا پیڕابگا ئەو چەند سندووقە هەڵبگرێتەوە، بەڵام بەردەوام و یەک لە دوای یەک، سندووق دەهاتن، یوهان بە ترسەوە لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. دەترسا سزای بدەن، بەڵام کەسی لێنەبوو تا سەرکۆنەی بکا. کاتی نیوەڕۆیە نەقالەکە ڕاوەستا. تا ئەودەم یوهان هەر لەوە دەترسا یەکێ بزانێ سندووقی کەواندوون. بە پەلە سندووقەکانی هەڵگرتنەوە و بە ئەسپایی لە داشقەی نان. خۆشحاڵ بوو کە هیچ کەس بەو ڕووداوە نازانێ. کەچی داشقەی ئۆتۆماتیک کە وێڕای ئامێرەکە لەکار کەوتبوو بە پێنج سندووقەوە ڕەق ڕاوەستا. یوهان هەولیدا بە پاڵنان بیباتە پێشەوە، بەڵام دەتگوت لە قوڕ چەقیوە. داشقەکە تەنیا لەگەڵ وە کار کەوتنی ئامێرەکان وەگەڕ دەکەوت. یوهان ویستی سندووقەکان لە بن باڵی بگرێ و خۆی بیانباتە عەمبار، بەڵام دیواری عەمبارەکە تەنیا دەلاقەیەکی بەقەد داشقەکەی تێکرابوو. بە دوو سندووقەوە، کۆڵەوار و داماو لەوێ ڕاوەستا. لەو کاتەدا دەنگێک لە دواوەیڕا هات. دڵی داخورپا، سندووقەکەی دانا و ئاوڕی دایەوە. لە لای پەنجەرەکەوە هەمان لاوە کز و چاوڕەشەکە ڕاوەستابوو. هەر ئەو کەسەی بەیانی دواندبووی. دۆستانە چاوی لێدەکرد. دیسان گوتی: "سلاڤە سکلاڤە." یوهان سندووقەکان و هەڵەکەی خۆی لەبیر چووەوە و دۆستانە بە ڕوویدا پێکەنی:

"نا ئەمن نێوم ئەوە نییە. نێوم یانووس مۆریتسە. تۆ منت لەگەڵ یەکێک لێگۆڕاوە." کوڕەکە پێکەنی و ددانە سپییەکانی وەدەرکەوتن. لە دڵەوە پێدەکەنی. پاشان هەر بەو ڕستەیەوە "سلاڤە سکلاڤە" لە بەرچاو ونبوو.

یوهان بۆ نان خواردن لە هۆڵەکە وەدەر کەوت، بیری لەوە دەکردەوە دەبێ زۆر لەو "سلاڤە سکلاڤە"یە بچێ کە ئەو لاوە کزە چاوڕەشە، سەرەڕای ئەوەی یوهان ناوی خۆی پێگوت، هەر بەو ناوەوە گازی دەکا. دواتر زانی کە گەنجەکە هەموو هاوڕێ کرێکارەکانی بەو ناوە بانگدەکا. خۆی فەڕەنسی بوو و دەیگوت ناوی خۆش "سلاڤە سکلاڤە"یە، بەڵام یوهان دواتر زانییەوە کە ناوی ژۆزێفە.

## (٧٦)

پێنج مانگ بوو یوهان لە کارخانەی قۆپچەسازی کاری دەکرد و لەو ماوەیەدا سندووقێکی لە دەستی بەرنەببووەوە. ئێستا بێئەوەی چاوی لێبێ سندووقەکانی دەخستنە داشقەوە. ئێستا ئیدی بیری لە قۆپچەی ناو سندووقەکان و ئەو ژەنەڕاڵانەش نەدەکردەوە کە ئەو قۆپچانەیان لە بەرگی دەدان. واتە هەر بیری نەدەکردەوە خەونیشی نەدەدی. تەنانەت خەونی ئەو ئیتالییەش کە سەری بڕاوی لەبەر پێی جەللادەکەدا بە پێکەنینەوە خۆی هەڵداویشت. تەنیا جاروبار حەزی دەکرد بزانێ ئەو چێکییەی کاتی هاتنی بۆ کارخانە درابووە دادگا چی بەسەر هاتووە؟ سزایان داوە یان لێی خۆش بوون؟ بەڵام ئەو بیرەش هەر سەرەتاکان بە خەیاڵیدا دەهات. ئێستا ئیدی بە هیچ شێوەیەک حەزی لە کەندەوکۆژی نەبوو. هەموو رۆژێ لەگەڵ پێی دەنایە هۆڵی کارخانە تەرح و دیداری لاوەکە بە خۆی و بە "سڵاڤە سکلاڤە"وە پەیدا دەبوو. یوهانیش هەر بەو رستەیە وەڵامی دەدایەوە، بێ ئەوەی بزانێ دەڵێ چی، تەنانەت بێئەوەی بە خۆی بزانێ هەموو جارێ کە لەو لاوە هەڵدەنگووت بزەیەکیشی بۆ دەکرد. جارێکی یوهان ویستی کارەکەی ئاسانتر بکا و دوو سندووق بە جارێک بگوازێتەوە، بەڵام نەقالە ئیزنی ئەو کاری پێنەدا. پەتی سندووقی دووهەم لە باندەکە نەدەبووەوە و هاڕ و هووڕێکی سەیر بە ئامێرەکە دەکەوت، دەتگوت سەیە دەقروسکێنێ. یوهان وەک مێژۆک دەلەرزی و لەوە بوو بە جارێکی ددانەکانی هەموو هەڵوەرن. لەمەوپاش ئیدی بیری ئەوەی لە سەری وەدەر نا کە دوو سندووقان پێکەوە هەڵگرێ. ئەو دەبوایە ملکەچی رەفتاری ئامێرەکە بێ. ئەگەر لە دەستی هاتبا پێنج سندووقیش بە یەکەوە هەڵبگرێ ئامێرەکە مەحاڵ بوو بواری وەی بداتێ، ئەویش لەگەڵ ریتمی کارەکە راهاتبوو. کارەکە نە زەحمەت بوو نە ئاسان. جاران کە زۆر شەکەت دەبوو، ئارەقی هەڵدەڕشت و جوێنی دەدان، بەڵام ئێستا نە ئارەقی دەکرد و نە جوێنی دەدا. وای دەهاتە بەرچاو کە لە جێدا هیچ کارێک ناکا، کەچی دەستبەتاڵیش نییە. جاران بۆ کات تێپەڕ کردن بیری لە

عــەرش و قـوڕش دەكـردەوە، بـەڵام ئێـستا بیـری لـە خـودی كـارەكـەش نەدەكردەوە. هەموو هۆش و گۆشی لای كارەكەی بوو، لەبەر ئەوەی دەیزانی ئەگەر وا نەكا و هەر بە شان و باهۆ كار بكا، دڵ و رۆحی دەچنە لایەكی دی، بەڵام ئێستا مێشک و دڵی هـەر لـەوێ لای خۆی بوون. یوهـان دەیدی چلۆن هەموو وجوودی دەمەیێ و رەق هەڵدێ.

شەوانە كە بۆ حەسـانەوە دەچۆوە ئۆردووگا وای دەهاتە بەرچاو كە بۆ سندووقێك داهاتۆتەوە و بەیانیان كە لە خەو هەڵدەستا وەكو ئەو دەمانـە بوو كە بـارەكـەی نـاوەتـە داشـقەكـەوە و دەسـتەكـانی بۆ سـاتێک ئـازاد بوونـە. كە دەخـەوت چیتـر خـەونـی نـەدەدی. چـاو و زەوقـی تاریـک داهـاتبوون. ئـەمـە تاریكانی زەوی نەبوو، بەڵكو ئەگەر بە هەڵكەوت ئەو بابەتـەی جار و بارێک وەبیر هاتباوە ـ كە ئەوە كەم رووی دەدا ـ تەنیا نیسكێک پێدەكەنی. پێكەنینێک وەک كێڵانی زەوییەكی رەق و كەس نەكێڵ. دكتۆر گوتیان نەخۆشـە و بـەم جۆرە بردیانە نەخۆشخانە.

## (٧٧)

لـە نـەخۆشـخانەی كارخانـە كـە كـەوێلێكی لـە دار دروسـتكراو بـوو یوهـان خـەوێنرا. پەنجـەرەكانی نـەخۆشـخانەیـان بـە تێلـدڕوو گرتبوون. مانگێک لـەوێ كـەوت. ریخۆڵـەی چڵكی كردبوو. وەک تـەندوور دایسا. هـەمیشە خـەونـی بـە كارخانـەی قۆپچـەسـازییەوە دەدی. هـەمـوو رۆژێ كـاری ئـەوە بـوو بـە چـاوی قووچـاو لـەسـەر تـەخـت درێـژ بێ و بیر لـە كارخانـە بكاتـەوە. ئـەوێ رۆژێ لـە هـەمـوو رۆژان قـەرەبـاڵغتر بـوو. لـە دڵی خۆیدا گوتی: "دیارە دكتـۆر خـەریكی سـووڕانەوەی خۆیـەتی." لـەپڕ بۆن و بەرامەیەكی دڵڕفێنی پێستێكی ناسک بـەر لـووتی كـەوت. بۆن و بەرامەیەک كە لە مێژبوو هەڵینەمژیبوو، بـەڵام بۆی ئاشنا بـوو. چـاوی هەڵهێنا. ژنێک بە بەرگی سەربازییەوە لە پەنـا تـەختـەكـەی راوەستابوو. لاو و قژ زەرد بوو. ئـەو بـۆن سـابوون و تـەڕ و بڕیـە لـەو دەهـات. ژنـە

چاوی لە یوهان بڕیبوو. یوهان زەردەخەنەی هاتێ. دوو پاسەوان و دکتورەکانی بەشیش لەگەڵ ژنەدا بوون. دکتۆرێکیان لە ژنەکەی پرسی: "ئەمەیە؟" ژنە کاغەزی عیلاجی کە لە ژوور سەری یوهانەوە بوو خوێندەوە و پاشان بە شک و گومانەوە سەیری کرد. لە ئەڵمانیا هەموو ئاوهایان سەیر دەکرد. ژنە پرسی: "مەجەڕ؟" و ئینجا گوتی: "مەجەڕ و ئیتاڵی لە هەموو کەس خەتەرترن."

پاشان چەرچەفی سەر یوهانی فڕێ دایە لایەک و سنگی رووتکرد:

"نا ئەمە نییە. ئەو سنگی تووکن بوو." پاشان بە پەلە چووە سەروکاری تەختێکی دی. لە دەموچاوی هەموویان ورد دەبۆوە. سنگی هەندێکیانی رووتدەکردەوە، بەڵام ئەوەی لێی دەگەڕا نەیدۆزییەوە. پاسەوانەکان دەورەیان بەرنەدەدا. وەدەریش کەوتبوو هێشتا ژوورەکە پڕ لە بۆنی ئەو بوو. یوهان بۆی دەرکەوت کە ئەو بۆن و بەرامەیە هەر بۆنی سابوون و عەتر نییە. وە بیری هاتەوە کە لەشی سۆزانا و پۆلیسکاش بۆن و بەرامەیەکی وای هەبوو.

"هاوڕێیەکتان شەوێ دی لەگەڵ ژنە ئەڵمانێک دەستی تێکەڵ کردووە. ئەو ئافرەتەی ئێستا لێرە بوو، پێکەوەی دیتوون. کچەی گرتووە و کابراش هەڵاتووە. دیارە یەکێکی قژ خورمایی سینگ تووکن بووە. کچەکە ناوی کابرای ئاشکرا نەکردووە، بەڵام کێوە دەچێ، هەر دەیگرن. قوڕبەسەرە پێنج ساڵ حەپس چاوەڕوانیەتی." پاشان دکتۆرەکە کە هۆڵەندییەک بوو لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی کرد و گوتی: "گرتیان." یوهان لە جێگاکەی راست بووەوە. بە بەر پەنجەرەکەدا سرببییەکیان دابووە پێش خۆیان و لە پشتەوەڕا دەستیان شەتەک دابوون. گەنجێکی قۆز و قژخورمایی بوو. پاسەوانەکان لە نێو خۆیان گرتبوو. یوهان دەیناسی. کوڕە لە بەشی ئاوریشمکاریدا کاریدەکرد. کوڕێکی بزۆز بوو. لە دواوەشی ژنەکە بە بەرگی سەربازییەوە دەڕۆیی.

## (٧٨)

ژۆزێف تاقە کەسێک بوو کە یوهان لێی نەدەترسا. ماوەیەک بوو لە هەموو شتێک تۆقیبوو. لە کارخانە ترسی ئەوەی هەبوو سندووقێکی لێ بکەوێ، یان پێرانەگا لە کاتی خۆیدا سندووقەکان لەسەر باندەکە هەڵبگرێ. ترسی ئەوەی هەبوو هەروا بە هەڵکەوت لە هەندێ نهێنیی کارخانە ئاگادار بێ. زەندەقی لە گشت ئەڵمانییەک چووبوو. نەک هەر لە خەڵکی ئەڵمانیا، بەڵکو لە خاکی ئەڵمانیا و لە زاراوەی تایبەتی ئەڵمانی و ئەو هەوایەی ناچار بوو هەڵیمژێ. لەبەر ئەوەی ئەویش هەوای ئەڵمانیا بوو. لە رۆمانیا گرتیان، لێیان دا و برسییان کرد، بەڵام هەرگیز ترسی لێ نەنیشت. تەنانەت لە مەجەڕانیش نەترسا. سەرباری ئەوەی بە قەمچی ئەوەندیان لێدەدا زۆر جاران وەختبوو هەموو گۆشتی لەشی لە هێسکەکانی دابماڵێ. ئەوان هەر چۆنی بێ مرۆڤ بوون. تەنانەت یۆرگ یۆردانیش مرۆڤ بوو و یوهان لێی نەدەترسا. لە ئەڵمانیا کەس لێی نەدابوو، هەموو رۆژیش نان و شلە و قاوەیان دەدایێ. کارەکەشی لە هەڵکەندنی خەندەک لە رۆمانیا و لێدانی مەتەرێز لە مەجەڕستان ئاسانتر بوو. لەگەڵ ئەمەشدا لێرە ئۆقرەی نەدەگرت. لێی سوور بوو ئەڵمانەکان سەری لە لەشی جیا دەکەنەوە. هەمیشە لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەوە بیرێکی گەوجانەیە، بەڵام ئەو رۆژەی لە بەرچاو بوو کە کۆت و زنجیریان کردووەتە مل. نهێنیی کارخانەی قۆپچەسازیشی نەزانیبا، هەر دەکەوتە بەند. خەڵکی ئێرە وەک ئامێرەکان تووڕە و مرچ و مۆن بوون. ئاڵمانەکان رەنگبێ خراپیش نەبن، بەڵام یوهان لەگەڵ ئامێران هەڵی نەدەکرد. لە ئامێر و ئەو کەسانەی لە ئامێر دەچوون دەترسا. لەنێو کۆمەڵی ئەو مرۆڤ ئامێرانەدا و لە نێو ئامێرەکاندا خۆی بە نامۆ دەزانی. هێندە نامۆ کەم مابوو بداتە پرمەی گریان، هەر بۆیە کابرا فەرەنسییەشی خۆشدەویست.

ژۆزێف هاتە لای: "سلاڤە سکلاڤە." یوهانیش وەڵامی داوە: "سلاڤە سکلاڤە." ژۆزێف گوتی: "ئێمە هەموومان کۆیلەین. جا باش وایە رۆژێ هەزار جار ئەمە وەبیر خۆمان بهێنینەوە بۆ ئەوەی لەبیرمان نەچێتەوە. ئەگەر لە بیر بکەین کۆیلەین هەموو شتمان لە دەست دەچێ."

دوانیوەڕۆی یەکشەممە بوو. یوهان و ژۆزێف باسی دڵخوازەکەی خۆی بۆ دەگێڕایەوە. یوهان دەیزانی ناوی بیئاتریس و خەڵکی پاریسە. چاوی رەش و گەورەن و هەموو شەوێ بۆ ژۆزێف دەگری. ئەو کوڕە هێندەی باسی بیئاتریس بۆ کردبوو، یوهان دڵنیا بوو لە نێو هەزار ژنیشدا ببینێ دەیناسێتەوە. جاری وا بوو وای بە بیردا دەهات کە تەنانەت گوێی لە دەنگی دەبێ. دەنگی ناسک بوو. وەک گۆرانی بڵێ وا بوو. یوهان وای هەستتدەکرد کە بیئاتریس لەگەڵیان دانیشتووە و پێی سەیر بوو بۆچی قسەیەکیان دەگەڵ ناکا، یان وەڵامیان ناداتەوە

## (٧٩)

بەرپرسی ئۆردووگا لە بڵندگۆکەوە گازی هەموویانی کرد. بچنە ناو کۆڵیتەکان. یوهان گوتی: "وا دیارە دیسان دەمانپشکنن." ژۆزێف و یوهان بەرەو کۆڵیتەکە کەوتنە رێ. ژۆزێف گوتی: "باشە چیان لێمان دەوێ؟" لەوە تووڕە بوو کە دوانیوەرۆی یەکشەممەیان لێ تێکدابوون و ناچار بوون بڕۆنەوە ناو کۆڵیتەکان.

کرێکارەکان پۆل پۆل حەوشی ئۆردووگایان بەجێ هێشت. لە دەرێ خۆر دەدرەوشایەوە و دنیا گەرم بوو. یوهان و ژۆزێف پاڵیان وە پەنجەرە دابوو و تەماشای دەرەوەیان دەکرد. لە ناکاو یوهان یەک بە خۆ گوتی: "کەواتە راستە." سێ کامیۆن لە حەوشەی ئۆردووگا راوەستان. ماوەیەک بوو دەنگۆ داکەوتبوو کە بەم زووانە چەندین ژن دێننە ئۆردووگا، بەلام بەندییەکان بڕوایان نەدەکرد وا بێ. ئێستا هەر بە راستی ژنەکان هاتوون. بە پرچی زەرد و خورمایی و کاڵەوە. یوهان مۆریتس بڕوای بە چاوی خۆی نەدەکرد. گوتی: "چاو لێکە، کەواتە راستە." یوهان سەرنجی دانێ هەموو خۆیان رەنگاندبوو، جلوبەرگی تەنکیان لەبەر و چاویان هەر لەلای پەنجەرەکان بوو کە بەندییەکان بەوێدا ملیان هێنابووە دەرێ. ئینجا خۆیان ئامادە کرد دابەزن. با تەنوورەکانی هەڵدەدانەوە. یوهان ئەتەگە رەنگاورەنگەکانی تا ژوور رانیانی

دەدین. ئەتەگەکان وەک پەڕی سیغار تەنک بوون. پیاوەکانی پشت سەری یوهان پێدەکەنین، بەڵام ئەو واقێکی بردبووەوە و پێکەنینی نەدەهات.
دیسان دەنگی بڵندگۆکە بەرز بووەوە: "ژنەکان با دانەبەزن. خۆ فەرمانی دابەزینم نەداونێ."
دەنگێکی گڕ بوو، دەنگی بەرپرسەکە بوو کە لە ژوورەکەی خۆیەوە قسەی دەکرد. ژنەکان هەر بەو خێراییەی دابەزیبوون، پاڵیان پێکەوە نا و سواری کامیۆنەکە بوونەوە. زۆر ترسابوون کە بەبێ ئیزن جووڵابوونەوە. کاتی سەرکەوتن بەندییەکان دیسان چاویان بە ئەتەگەکانیان کەوت کە لە هەموو رەنگێ بوون. ژنەکان هەروا حیلکە حیلیکیان بوو، بەڵام ئەمجارە هەڵسوکەوتیان ترس و لەرزیشی پێوە دیار بوو.
بڵندگۆکە رایگەیاند: "هەر کۆڵێتە و دە ژنی وەبەر دەکەون. ئەوان تا کاتژمێر نۆی شەو لێرە دەبن. چاودێری کۆڵێتەکان رێنومایی پێویستیان بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەکە دراوەتێ و هەر کام بەرپرسیارێتیی راگرتنی دیسیپلین و هێمنیی کۆڵێتی خۆیان لە ئەستۆیە."بڵندگۆکە بێدەنگ بوو. ژنەکان لە کامیۆنەکەدا چاوەڕێی فەرمان بوون. ژۆزێف لە حەژمەتان ددانی لە چیڕەوە بردن و گوتی: "بێشەرەفینە."
یوهان کە پێی وابوو لەگەڵ ئەویەتی ئاوڕی دایەوە و دیتی رق و تووڕەیی لە دەموچاوی دەبارێ. بڵندگۆکە فەرمانی دا: "ژنەکان دەستە دەستە و بە بێدەنگی با دابەزن. "ژنەکان کە چاوەڕێی ئەو فەرمانە بوون، خێرا دابەزین و بە سەر پێنج دەستەدا دابەش بوون. پێنج پیاو، چاوەدێری کۆڵێتەکان، پەیدا بوون و هەر یەکەو دەستەیەکیان وە دوای خۆیان دا. یوهان بۆی نەدەچووەوە سەر یەک کە بەڕێوەبردنی "بەرنامە"کە دەبێ چۆنا و چۆن بێ. هەستی زانینی تێدا وروژابوو. دەیزانی ئەم ژنانەیان بۆ رابواردن و کەیف و نەهەنگی بەندییەکان هێناون. ئەڵمانەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە بەبێ تێرکردنی غەریزەی جنسی، کرێکار کارەکەیان بەرووبووی باشی نابێ، بۆیە ئافرەتیان بۆ هێنابوون. یوهان سەری لەوە دەرنەدەچوو بۆچی پیاو بۆ تێر کردنی مەیلی سێکسی زیاتر و باشتر کار دەکەن و بە لایەوە سەیر بوو

بەندییەکان بە حەزەوە لاقەی ئەو ژنانە بکەن کە بۆ رابواردنی ئەوان تەرخان کرابوون. ژووری خەوتن گەورە بوون و قەرەویلەی زۆریان تێدا بوو. پیاو زۆر بوون و ژن کەم. مەحاڵ بوو هەر ژنێک تەنیا ببێتە هی یەک پیاو. یوهان لە دڵی خۆیدا گوتی: "لەوانەیە ژنەکان لە تەختێکەوە بچنە تەختێکی دی."

بیری کردەوە ئەودەم زۆر تەریق دەبنەوە. ئاوها لە پیاوێکەوە بۆ لای پیاوێکی دی. ژنەکان گەیشتنە بەر دەرگای کۆڵێت. چاودێری کۆڵێت لەگەڵیان دەدوا. بێگومان پێی گوتوون چۆن چۆنی "بەرنامە"کە بەرێوە ببەن. ژۆزێف پرسی: "بچینە دەرێ؟" یوهان و ژۆزێف چوونە دەرەوە. چەند کەسێکی تریش وە دوایان کەوتن. لە نێو دەرگا تووشی ژنەکان بوون. بۆنی پۆدر و عەتری هەرزان بایی بەر لووتیان کەوت. ژنەکان لەگەڵیان پێکەنین. ژۆزێف کاتێ بە پەنایاندا تێدەپەڕی گوتی: "سلاڤە سکلاڤە. سلاوتان کۆیلەکان."

ئەم قسەیەی ژۆزێف قاقای پێکەنینی بەرزتر کردنەوە، بەڵام ژۆزێف پێنەکەنی. نێوچاوانی تێکنابوو. لە حەوشەی ئۆردوگا لەسەر چیمەنەکە راکشا. ژۆزێف چاوی لە ئاسمان بڕیبوو. کەس مەتەقی نەدەکرد. یوهان بیری لە ژنەکان دەکردەوە. ژۆزێفیش هەروەتر، بەڵام یوهان نەیدەزانی ئەو بیر لە چی دەکاتەوە.

کابرای فەڕەنسی بە یوهانی گوت: "تۆ ئەگەر حەزت لێیە بڕۆوە کۆڵێت."
یوهان وەڵامی دایەوە: "نا،نا ناچم."

هەر دووکیان بێدەنگ بوون. ئەوە یەکەم جار بوو کابرای فەڕەنسی باسی بێئاتریس نەکا. ژۆزێف ئاخیری وە قسە هات. "ئەمانە لەهیستانی (پۆڵۆنی)ن. لە ئۆردووگای دیلەکانەوە هێناویانن. ئەوانە دوای ئەوەی شەش مانگ ئەو کارە دەکەن، ئازاد دەکرێن، بەڵام بەو شەش مانگە زۆریان لەناو دەچن. ئەم ژنانە، دوای شەش مانگ لە ئۆردووگا یان بەرەو نەخۆشخانە دەبرێن یا گۆڕخانە." یوهان بە پەرۆشییەکی زۆرەوە گوتی: "من پێم وا بوو پیشەیان ئەوەیە. نەمدەزانی ئەوانیش بەندیین." "نا، ژان."

ژۆزێف بە "ژان" یوهانی ناو دەبرد. "ئەمانە قەحپە نین، ئەوانە ئەو کەنیزانەن کە لەوپەڕی بێ هیواییدا بۆ رزگاریی خۆیان بەربەرکانی دەکەن. بەربەرەکانییەکی قارەمانانە. بە داخەوە ناتوانن زنجیری کۆیلەتی بپسێنن. لەبەر

ئەوەی زنجیری کۆیلەتی لە جەستەی ئەوان قایمترە. کاتژمێر نۆ ژنەکان ئۆردووگایان بەجێ هێشت. کاتی سواری بوونی کامیۆنەکە ئیدی ئاسەواری پێکەنینیان پێوە نەمابوو. هەموویان سیغاریان دەکێشا. ژۆزێف لە کاتی وەڕێ کەوتنی کامیۆنەکە، بە دەنگێکی دۆستانەی پڕ لە پەرۆشی هاواری کرد:
سلاڤتیس سکلاڤە."
کابرای فەرەنسی هەر ئەو شەوە لە ئۆردووگا هەڵات.

## (٨٠)

وەستاکار لە کاتێکدا یوهانی دەبردە نووسینگە گوتی: "ئەفسەرەکان پێویستیان بە وەرگێڕێکی زمانە بەڵکانییەکان هەیە. لەوێ زۆر بە ئەدەب بجووڵێوە."
یوهان بە لای کەمی کاتژمێرێک لە بەر دەرگا چاوەڕێ بوو. دواجار بردیانە ژووری نووسینگە. دووکەڵی جغارە و بۆنی مەشرووب پشووی لە یوهان بڕی. چەند گڵاس و بتڵی بەتاڵ لەسەر مێزەکە بوون. کە وە ژوور کەوت هیچ کەس ئاوڕی وێ نەدا. لە بەر دەرگا راوەستا. حەزی دەکرد پێیان بڵێ وەرگێڕێکی خراپە، دەشقەم بیبەنەوە لای سندووقە قوپچەکانی خۆی. ئەوێ هیچ نەبێ هێمن بوو و بۆنی جغارە ئازاری نەدەدا، بەلام ئێستا لە جیاتی کارکردن لە کارخانە لەم هۆدەیەدا راوەستابوو و چاوی لە بەرگ و رەختی ئەفسەرەکان دەکرد. ئەفسەرەکان گشتیان گەنج بوون. سەرجەم حەوت کەس بوون. یەکێکیان بەرەو لای یوهان هات و دەستی لە سەر سەری دانا، پاشان وەک تۆپ سووڕاندی. ئینجا ئەمری پێکرد: "بسووڕێ." لە دوایەرا بە وردی چاوی لێکرد. دەستی بە شانیدا هێنا. چەناگەی بەرز کردەوە و پاشان ئەمری پێکرد دەمی بکاتەوە تا ددانەکانی ببینێ. دواجاریش بە دەنگێکی بەرز، بەلام زۆر بە کورتی پێی گوت: "خۆت رووت بکەوە." یوهان جلی کاری داکەند و لە بن دیواری دانا. ئەفسەرکە بە وردی سەرنجی دابوو لە کاتی رووت بوونەوەدا چ دەکا چ ناکا. ئەفسەرەکانی دی

ملیان لە قسەکانی خۆیان نایەوە. ئەو ئەفسەرەی لای یوهان بوو ـ سەرهەنگێکی ئیس.ئیس بوو ـ گوتی: "بەڕێزان، بەڕێزان، دەمەوێ شتێکتان نیشانبدەم."

ئەفسەرکان بێدەنگ بوون و هەموویان هاتن دەورەی یوهانیان دا کە بە رووت‌وقووتی لەوێ راوەستابوو. ئەویان بە ناوی وەرگێڕەوە هێنابوو و ئێستا سەری لەو بەزمە دەرنەدەچوو و نەیدەزانی سەرهەنگ بە تەمای چییە. یوهان بیری بۆ شانۆی سێرکبازان چوو. سەردەمایەک جادووبازی سێرک کەسێکیان لە ناو تەماشاکەران هەلدەستاند و پشیلە و کەروێشک و جۆرەها باڵندەیان لە گیرفانی دەردەهێنا، ئێستا سەرهەنگیش دەیویست شتێک نیشانی ئەوانی دیکە بدا، رەنگە وەک ئەوەی لە کاتی عەسکەریدا لە سێرک دیتبووی. یوهان گەلێکی حەز دەکرد بزانێ سەرهەنگ بە تەمای چییە. بزەیەکی هاتێ. لە نمایشەکە نەدەترسا. ئێستا لەوانەبوو سەرهەنگ پشیلە و کەروێشک و کۆتر لە گیرفانی یان لە بن هەنگڵی ئەو دەربهێنێ.

یوهان بە بزەیەکەوە کە دڵنیایی پێوە دیار بوو چاوی لە سەرهەنگ کرد. سەری لەو جۆرە کارانە دەخورا و بە چاوی ئافەریم‌بارانەوە سەیری سەرهەنگی دەکرد کە جادووگەری دەزانێ. لە پڕ قسەکەی دایکی بیر هاتەوە کە دەیگوت: "جادووباز و بیجبیجەگەر شەریکی شەیتانن. "بە بیر کەوتنەوەی ئەم وتەیە دڵی گوشرا و زەردەخەنەی لە لێوان پەڕی.

سەرهەنگ دەستی بە وتاردانی خۆی کرد: "جەنابێنۆ! ئەو کوڕە تەنیا دە دەقیقە دەبێ هاتووەتە ئەم ژوورە و من پێشتر قەت نەمدیوە. ناشزانم بۆچی هاتووەتە ئێرە."

ئەو وەستاکارەی لەگەڵ یوهان هاتبوو گوتی: "ئەوە ئەو وەرگێڕەیە کە جەنابت بۆ زمانی خەڵکانی بەڵکان داوات کردبوو."

"بەڵێ بەڵێ، من هەر بە جارێ لە بیرم چوو کە وەرگێڕم دەویست. قەڵافەتی ئەو پیاوە هەر کە هاتە ژوورەوە سەرنجی راکێشام."

سەرهەنگ دەستی خستە سەر سەری یوهان: "هەر چەندە من تەنیا دە دەقیقەیە ئەو پیاوەم دیوە ـ وەک ئێوە ـ و هێشتا یەک وشە قسەم لەگەڵ

نەکردووە، بەڵام دەتوانم بیۆگرافی و تەواوی تایبەتمەندی و مێژووی ژیانی تایفە و تۆرەمەی لە سەدەکانی رابردوودا، بە پێی بنەمای زانستی، دەستنیشان بکەم."

یوهان بیری هاتەوە کە شتێکی لەو بابەتەی لە سێرکیشدا بینیوە. جادووبازی سێرک کەسێکی لەناو خەڵکەکە بانگ دەکرد، ناو و تەمەن و زۆر شتی دیکەی ـ وەک ئەوەی هاوسەری هەیە یان نا ـ هەڵدەدان و خەڵکەکە سەریان سوڕ دەما کە جادووبازی سێرک ئەو هەموو شتە لە کوێ دەزانێ؟ بەڵام یوهان ئەو نمایشەی پێخۆش نەبوو.

سەرهەنگ دووپاتی کردەوە: "زانستی رەچەڵەکناسی لای ئێمە هێندە پێشکەوتووە، کە ئێمە لەو بارەوە لانیکەم سەد ساڵ لە پێش خەڵکی ترین. بە یەک چاولێکردنی ئەو پیاوە رووتە دەتوانم پێتان بڵێم بنەچەکەی لە چ ناوچەیەک سەریان هەڵداوە، چۆنیان ژن خوازتووە، داب و نەریتیان چۆن بووە و بە چ کارگەلێکەوە خەریک بوون و... ئیدی... و ئیدی. ئێوەش دەتوانن پرسیاری لێبکەن تا بزانن وایە یا نا. بە گوێرەی شێوەی کاسەسەر و فۆرمی ئێسکی نێوچاوان و شکڵی لووت و هەروەها شێوەی هێسکبەندی، بە تایبەت کووڕیی قەفەزەی سینگ و خوارایی بەشی خوارووی ئێسکەکانی ئەم پیاوە سەر بە دەستەیەکی رەچەڵەکی جەرمەنە کە ئەمڕۆکانە تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە دۆڵی راین و لە لوکزامبورگ و زیبن بورگن و ئوستراڵیا دەژین. هەروەها هەژدە هۆزی دیکەیان لە چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان، بەڵام ئەوانە هێشتا بە رەسمی سەرژمێری نەکراون، لەبەر ئەوەی دۆزینەوەی ئەو ژمارەیە چەند مانگ بەر لە دەستپێکردنی شەڕ بوو. ئێمە تەنیا ئاماری راست و دروستی بەردەستمان لەو رەچەڵەکەیە، هی تیرەی جەرمەنە کە لە رووی زانستییەوە بە "تیرەی پاڵەوان" نێوبانگیان رۆیوە.

ئەم تیرەیە بە لای زۆرەوە هەشتسەد کەس دەبن، باب و باپیرانیان لە ساڵانی ١٥٠٠ تا ١٦٠٠ لە کۆرەوێکدا ناوچەی باشووری ئەڵمانیایان بە جێ هێشت. ئەوانە رەسەنترین کەسانی تۆرمەی جەرمەنن. ئەوان تا ئەمڕۆ سەرەڕای هەموو ئەو زەبروزەنگ و نەهامەتییەی بەسەریان هاتووە خوێنی خۆیان تێکەڵاوی خوێنی تر نەکردووە. بەڕێزان، ئەو تیرەیە خاوەنی هەندێ

تایبەتمەندیی دەگمەنە کە خۆڕاگری و بەهێزییان لەگەڵ هەموو کەس جیاوازە. "تیرەی پاڵەوان" کە ئەم پیاوەش یەکێکە لەوان بە باشترین شێوە بوونی ئەو تایبەتمەندییانەی سەلماندووە. بەڕێزان، چ هۆکارێک، وای لە باپیرانی ئەم تیرەیە کردووە سەرەڕای ئەوەی دەوروبەریان پڕ بووە لە ژنی دڵڕفێن، توانیویانە خۆیان لە ئافرەتی بێگانان بە دوور بگرن و ئەو تیرە پاڵەوانە لە فەوتان رزگار بکەن؟ ئەوە ناوبانگی خوێنە کە وای لێکردوون تێکەڵاوی هۆزی تر نەبن. لە مێژووی ئەم هۆزەدا نەبینراوە جارێک لە جاران ژنێک لە هۆزێکی تر بخوازن. بۆیەش دوای چوارسەد ساڵ ئەو لاوە بە موو لەگەڵ باپیرانی خۆی جیاوازی نییە. تکایە سەیری قژی ئاوریشمینی بکەن. ئەوە مووی "تیرەی پاڵەوان"ی پێش چوار سەد ساڵە کە ئێمە لە ئەلیکوین دۆزیومانەتەوە. ئەو جۆرە مووە قەت لەگەڵ مووی دیکە ناگۆڕێ و هەر پسپۆڕێک یەکسەر تێدەگا هی تیرەی پاڵەوانە. ئەو مووە لە مووی رەچەڵەکی رەسەنی جەرمەن ئاوریشمینترە، بەڵام بە روونی دیارە کە هەردووکیان سەر بە یەک رەچەڵەکن. لووت، نێوچاوان، چاو و چەناگەی ئەم لاوە لەگەڵ هی باپیرانی کە لە مۆزەخانە هەمانە مووی لێنادا. لەو ماوە دوور و درێژەدا بچووکترین گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

ئەفسەرەکان دەستیان بە سەری یوهاندا هێنا و دەستیان لە تووکی سەری وەردا. هەموویان بە سەرسوڕمانەوە تێی وەڕامابوون. یوهان پێی ناخۆش بوو بە بێ ئەوەی هیچی کردبێ ئاوا پێی هەڵبگوترێ. دەیزانی زیاتر کەسانێ بەم شێویە پەسن دەدرێن و پییان هەڵدەگوترێ کە بەرۆکیان بە جوانترین مەدالیا رازابێتەوە. سەرلەنوێ پەنجە خرپنەکانی سەرهەنگ موولێر بە جۆرێک بە زەوق و تامەزرۆییەوە کەوتنە سەر شانی یوهان، دەتگوت لەسەر پەیکەری پیرۆز دانراون. یوهان چاوی لێکنا. سەرهەنگ بە دەنگێکی ئاشکراترەوە گوتی: "ئەم تیرەی پاڵەوانە، بالاترین نموونەی پاڵەوانیەتیی رەچەڵەکیمان پێ نیشاندەدا. لە راستیدا ئەمڕۆ رۆژێکی گەورەیە بۆ من. لەبەر ئەوەی نموونەیەکی وا دانسقە و بە نرخم دۆزیوەتەوە. هەر بە راست خراپ نییە بزانن یەک لە باپیرانی منیش کچێکی لە تیرەی پاڵەوان

خواستووه، بەڵام بە داخەوە هیچ میراتێکی جەستەیی و ڕەچەڵەکیی لە پاش بەجێ نەماوە، با لە شتی لاوەکی بگەڕێین. دەمەوێ وێنەی ئەو لاوە لەگەڵ ناوونیشانە ئەنترۆپۆمیترییەکەی بخەمە ناو کتێبەکەم، کە ماوەی دە ساڵە لەسەر ئەمری سەرۆک خەریکی نووسینیم.'
ئەفسەرەکان چەستیان لێدا و گوتیان: 'ئیزن دەفەرمووی پیرۆزباییت لێ-بکەین؟' ئەفسەری ئێس.ئێس لە خۆشیان سوور هەڵگەڕا. دەستی بە نیشانەی سڵاو هەڵبڕی و پاشان یەک یەک دەستی لەناو دەستی ئەفسەرەکان نا.
'کوڕی باش تۆ لە ڕاین دەژی یان لە لۆگزامبۆرگ یان زیبن بۆرگن؟' یوهان وەڵامی دایەوە: 'لە زیبن بۆرگن.' یوهان وەڵامی دایەوە: 'لە زیبن بۆرگن.'
ئەفسەرکان کردیانە قریوەی خۆشحالی. سەرهەنگ موولێر لە خۆشیان خەنی بوو: 'من شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەو لاوەتان بە وردی پێدەڵێم.'
سەرهەنگ پاشان ڕووی لە یوهان کرد و گوتی: 'تۆ یان لە تەمیش بۆرگ لەدایک بووی یان لە کرۆن شتات یا نژی لە زیکلێرلاند؟'
'بەڵێ، لە زیکلێرلاند.' 'زۆر باش' سەرهەنگ دەستی لێک خشاندن: 'دەمزانی بە هەڵە نەچووم. هەر کە چاوم پێکەوت دەتگوت لە مۆزەخانەی خەڵکناسیم و چاو لە وێنەی باپیرانی تیرەی پالەوان دەکەم. ئێوە سەرتان لە وێنەی کتێبەکەم سوور دەمێنێ. هەندێکیان ڕەنگاوڕەنگ چاپدەکەم. دیسانیش دەیڵێمەوە. 'بەڕێزان، ئەو لاوە نوێنەرێکی تەواو عەیاری 'تیرەی پاڵەوان'ە و بوونی ئەو، هەموو تیۆرە ڕەچەڵەناسییەکانم دەسەلمێنێ.'
سەرهەنگ ڕووی لە وەستاکار کرد: 'فایلی ئەو پیاوەم بۆ بهێنن.'
دوای ئەوەی وەستاکار فایلەکەی هێنا، سەرهەنگ وەک فیشەکە شێتە تەقییەوە: 'گەوجانە، یەکێک لە تیرەی پاڵەوان بێ نابێ ناوی یانوس بێ. ئەو ناوە کفر و سووکایەتییە.' سەرهەنگ بە نێوچاوانی گرژ و مۆنەوە چاوی بە سەرتاپای یوهاندا گێڕا: 'باشە باوکت ئەو ناوەی لێ ناوی؟'
'نا، جەناب سەرهەنگ. من هەر ناوم یانووس نییە.' یوهان ویستی ئەوەش بڵێ کە ناوی خۆی 'ئەیون'ە، بەڵام قسەکەی پێ تەواو نەکرا.

"ئاشکرایه ئەندامێکی تیرەی پاڵەوان ناتوانێ جگە لەو ناوانەی لە گەنجینەی زمانی جەرماندا هەن ناوێکی دیکە لە کوڕی خۆی بنێ. چوارسەد ساڵە ئەو ڕێ-وشوێنە ڕەچاو دەکرێ. کەوابوو نەدەکرا ئەو گەنجە ناوی "یانووس" بێ. شتی وا مەحاڵە."

سەرهەنگ بە ڕەزامەندییەوە چاوێکی لە یوهان کرد.

"باشە کێ ئەو نێوی "یانووس"ی بەسەر تۆدا بڕیوە؟" "بۆ خۆشم نازانم. دوو ساڵ لەمەوبەر کە هاتمە ئەڵمانیا ئەو ناوەیان لە فایلەکەمدا نووسیبوو."

"هەمیشە ئەو قەشمەرییە بە ئەندامانی تیرەی پاڵەوان کراوە. ئەو نەتەوانەی ئەم تیرەیان لە ناودا دەژیان هەمیشە هەوڵیاندەدا ناویان بگۆڕن، بەڵام خوێنی تیرەی پاڵەوان پاکە."

ئینجا سەرهەنگ ڕووی لە وەستاکار کرد و گوتی: "لەوڕۆوە ئەم پیاوە لەبەردستی دائیرەی لێتۆژینەوەی ڕەچەڵەکدایە. ئەوە نموونەیەکە لە دەستماندا."

"ئیدی نابێ کار بکا؟" سەرهەنگ بە لیبراوییەوە گوتی: "نەخێر، دواتر لەو بارەوە ئەمری پێویستتان بۆ دەنێرم."

سەرهەنگ لە کاتێکدا وەختبوو بە چاوان یوهان قووت بدا گوتی: "زانست بە ڕاستی پێشڤەچوونی گرنگ و خێرای بە خۆیەوە دەیوە، بەڵام هێشتا تا گەیشتنە ئامانج ڕێگەیەکی زۆرمان لە بەرە. هەق وا بوو ئەو نموونە دەگمەن و خەیاڵییەی ڕەسەنترین ڕەچەڵەک لە باخچەی خەلکناسی بپارێزین. بەداخەوە هێشتا باخچەیەکی وا نەکراوەتەوە کە تێیدا نموونەی دەگمەن و ڕەسەنی تۆرەمە جیاوازەکانی تێدا بپارێزین. ئێمە لە ئەوروپا زۆر باخچەی وامان هەیە کە هەموو جۆرە ڕەچەڵەکە جیاوازەکانی تێدا دەپارێزین، لە باڵندەکانەوە بگرە تا شیردەران، بەڵام بە داخەوە خورافەپەرستی و دەمارگرژی تا ئێستا ڕێگەی لەوە گرتووە باخچەیەکی لەو چەشنە بۆ تۆرەمە مرۆییەکان تەرخان بکرێ. ئەوە بۆ زانست خەسارەتێکی گەورەیە. لەو ڕووەوە ئەمریکییەکان زۆر پێش ئێمە کەوتوون. ئەوان پاشماوەی چەندین جۆرە تیرەی سووورپێستیان پاشەکەوت کردوون. ئەوە کارێکە ئێمەش لە ئەورووپا دەبێ بیکەین. لە بەستنی یەکەم کۆنفرانسدا من پێشنیاری کردنەوەی وەها باخچەیەک دەهێنمە گۆڕێ.

بەم جۆرە نموونە دەگمەنەکانی تۆرەمان دەخرێنە بەر دەستی پسپۆڕانی ڕەچەڵەکناسی. ئەو ئەندامەی تیرەی پاڵەوانیش وەکو یەک لەو نموونانە لەو باخچەیە دادەنرێ. خۆم پێشکەشی باخچەکەی دەکەم." سەرهەنگ لە چاولێکردنیڕا دیار بوو لە زەینی خۆیدا یوهان بە ژن و منداڵەوە لە غورفەی ڕەچەڵەکی جەرمەندا دەبینێ. ڕۆژێک دێ ئەو خەونە بێتە دی. ئێمە تا ئەو کاتە دەبێ پیشەیەکی وا بۆ ئەو لاوە دابین بکەین کە لە ئەسڵ و فەسڵی بوەشێتەوە. ئەو دەبێ شەیدای سەربازی بێ. من خووخدەی تیرەی پاڵەوانان بە باشی دەناسم. ئەو تیرەیە جەنگاوەرترین لکی ڕەچەڵەکی جەرمەنە. بۆیە ئێمە ئەو هەلەی بۆ دەڕەخسێنین ببێتە سەرباز.

ئەفسەرەکان سەرلەنوێ پیرۆزباییان لێکرد. پێشنیاری سەرهەنگ بووە هۆی ڕەزامەندیی ئەو ئەفسەرانە. سەرهەنگ لە خۆشیان شاگەشکە بوو. داوای کاغەز و قەڵەمی کرد و بە نووسراوێک ڕایسپارد یوهان بخرێتە خزمەتی ئێس‌ئێس‌ەوە. نامەکەی دایە وەستاکاری کارخانە: "تکایە خۆتان کاروبارەکەی بۆ ڕاپەڕێنن، بەڵام بەبێ دوا کەوتن."

بە پێکەنینەوە بە یوهانی گوت: "خوا یار بێ تا مانگێکی دی وێنەیەکی خۆتم بە بەرگی سەربازییەوە بۆ بنێرە. ئەم وێنەیە بۆ پاژی تیرەی پاڵەوانی کتێبەکەم زۆر بە کەڵک و گونجاوە. نوسخەیەکیش لەو وێنەیە بۆ دکتۆر گۆبلز دەنێرم. وێنەی خۆت لە هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەبینی."

## (٨١)

پزیشکی کۆمیسیۆنی پشکنینە پزیشکییەکان دوای ئەوەی بە وردی چاوی لە یوهان کرد، گوتی: "خزمەت کردن لە سوپادا مەحاڵە. هەندێ پەڵەی لە ڕیخەڵۆکەی چەپیدا دەبینرێن. سەرباز دەبێ ڕیخەڵۆکەی ساغ بێ." سێ حەفتە لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرهەنگ موولێر تێپەڕیبوو. یوهان زۆری بیر لەوە کردبۆوە کە سەرباز جیرەی خواردن و سیغار و بەرگی گەرموگوڕیان هەن. دەیزانی سەرباز بێ چاکترە لەوەی کرێکاری بیانی بێ. بەو حاڵەشەوە کە بیستی

به سەربازی وەرناگرن پێی خۆش بوو. دکتۆر لە کاتێکدا چاوی لە بەڵگەنامەکانی دەکرد گوتی: "ئەو پیاوە لە لایەن سەرهەنگ موولێری ئەفسەری سەرفەرماندەیی و سەرۆکی دائیرەی رەچەڵەناسییەوە راسپێراوە. نابێ رەتی بکەینەوە." هەر سێ پزیشکی سوپا سەیری یوهانیان کرد. یەکیان لێی پرسی: "سەرت لە کاری سکرتێری دەردەچێ؟ ئەرێ تۆ پیشەت چ بووە؟" "جووتیار."

پزیشکەکان راوێژیان پێکەوە کرد. بە یوهانیان گوت لە دەرەوە چاوەڕوان بێ. پاش ماوەیەک گازیان کردەوە ژوورێ و پێیان راگەیاند بە سەرباز وەردەگیرێ. "تۆ وەک سەربازی یاریدەر وەردەگرین و چونکە کاری سکرتێری نازانی دەتنێرینە بەشێکی پاسەوانی."

## (٨٢)

فەرماندەی ئۆردووگا لە فیتفیتەی نان خواردنی تووڕاند. یوهان مۆریتس کە گوێی لەو فیکەیە بوو خۆی کۆکردەوە. لە بیری نەبوو لە کاتی ئێشکگریدایە، دەستی کردە گەڕان لە قاپەکەی. لە پڕ تفەنگەکەی بە خۆیەوە گوشی و لە دڵی خۆیدا گوتی: "من چەند گێلم. دیسانیش لە بیرم نەبوو من سەربازم نەک بەندی." لە ماوەی ئەو سێ رۆژەی لەو ئۆردووگایە بوو هەموو جارێ کە گوێی لە دەنگی فیتفیتە دەبوو وەکو سەردەمی بەندیخانە قوشقی دەبوو. وێدەچوو بۆی قووت نەچووبێ بووەتە سەرباز. کە دیمەنی تێلدڕوو و بەندییەکانی دەدین لە بیری دەچووەوە کێیە و لە کوێیە. بەندی بوون ــ دوای ئەو هەموو کوێرەوەرییەی بەندیخانە ـ ببووە بەشێک لە رەگ و پێستی. جگە لە بەندی بوون نەیدەتوانی بیر لە هیچی تر بکاتەوە. کاتێ کاتژمێری گۆڕینی پاسەوانییەکەی هات دڵی دادەخورپا. وەک ئەوەی ئەو سەربازەی دەهاتە لای بۆ ئەوە بێ بیباتە زیندان. بە دیتنی دیمەنی ریزی دووروودرێژی بەندییەکان لە بەردەم مەنجەڵی گەورەی چێشت لە بیری چووەوە لە کاتی ئێشکگریدایە و بە خۆی گوت باشە بۆچی ناچمە ناو ریزەکەوە تا بەشە خوراکی خۆم وەربگرم. لەو رۆژەوە هاتبووە ئێرە بە دوای ئەوەوە بوو دۆست و برادەرێک پەیدا بکا، کەسی

نەدیتەوە. ئەوەی زۆر پێ سەیر بوو. لەبەر ئەوەی لانیکەم لە دە ئۆردووگای ئەڵمانیا ببوو. زۆری پێخۆش بوو هاورێیەک بۆخۆی پەیدا بکا. دیارە دواندنی بەندییەکان قەدەغە بوو، بەڵام هیچ نەبێ دیتنی سیمایەکی ئاشنا - ئەگەر لە دوورەوەش بێ - سووکنایی پێدەبەخشی.

لەپڕ، پۆست و گرنگایەتیی پیشەکەی خۆی کە پاسەوانی بوو فەرامۆش کرد و پڕ بەدەنگ هاواری کرد: "ژۆزێف... ژۆزێف!"

بەندییەکان سەریان هەڵبڕی و تەماشای یوهانیان کرد. ژۆزێفیش سەری هەڵێنا و هەموویان دەستیان بە نان خواردن کردەوە. کابرای فەڕەنسی نەیناسیبووەوە. یوهان دیسان بە ناو بانگی کردەوە. ژۆزێف سەری لە قاپی خواردنەکە بەرز کردەوە و چاوی لە سەرەوە کرد.

"نامناسییەوە؟ من یانووس موریتسم." "سلاڤە سکلاڤە." ئێستا ژۆزێف ناسیبوویەوە و بۆی پێدەکەنی. ئینجا قاپەکەی نایە لاوە و خۆی گەیاندە شوێنی ئێشکگرتنی یوهان.

"ژان چۆن بەو حەوایە کەوتووی؟"یوهان بە کورتی بۆی باسکرد چۆن بۆتە سەرباز. ژۆزێف ئێستا باشتر لە زمانی تێدەگەیشت. یوهانیش لەوی پرسی: "تۆ چۆنە کەوتوویە ئێرە؟"

"پێنج رۆژ دوای ئەوەی هەڵاتم گرتیانمەوە. ئەرێ هەر بە راست، نامەیەکم بۆ بیئاتریس بۆ دەنێری؟ ئێمە بۆمان نییە نامە بنێرین. مانگێکە لێی بێ هەواڵ ماوم."

یوهان داوای ئەدرێسی بیئاتریسی کرد. ژۆزێف ئەدرێسەکەی لەسەر پارچە کاغەزێکی بچووک نووسی. یوهانیش لەو ماوەیەدا پاکەتە جغارەکەی دەرهێنا و بە نێو تێلدڕووەکاندا بۆ لای ژۆزێفی بەرێ کرد: "سبەی جغارەی پترت بۆ دێنم. نانیشت بۆ دێنم. ئەوشۆش نامەکە بەرێ دەکەم."

ژۆزێف جغارەکەی لێ وەرگرت و پاشان ئەدرێسەکەی کە لە خڕکە بەردێکی وەرپێچابوو بۆ یوهان هاویشت، بەڵام کاغەکە بەربۆوە نێو تێلدڕووەکان. ژۆزێف ویستی دیسان ئەدرێسەکە بنووسێتەوە. یوهان گوتی: "راوەستە، من ئەگەر بچمە لای تێلدڕووەکە کەس تەقەم لێناکا. خۆم ئەدرێسەکە هەڵدەگرمەوە."

یوهان ویستی بە پلیکانی بورجی پاسەوانیدا داگەڕێ کە دەرەجەدارێک و پاسەوانی تازەی دیتن بەرەو لای دێن. بە پەلە پێهەڵاچۆوە و بە ژۆزێفی گوت: "وا دەرەجەدار دێتە ئێرە. ئێستا ناتوانم ئەدرێسەکە هەڵگرمەوە، سبەی کاتژمێر نۆ نۆرە ئێشکمە. ئەودەم هەڵیدەگرمەوە. چاوەڕانم بە." "سلاڤە سکلاڤە." ژۆزێف جغارەیەکی لە لای لێوی گرت و لەوێ دوور کەوتەوە. هەمان جلوبەرگە شڕەکانی لە بەردا بوون، بەڵام لەو کاتیش شڕتر ببوون. بۆخۆشی کزتر ببوو.

## (٨٣)

یوهان شەوێ تای لێبوو. بۆ سبەی بە ئامبۆلانس بردیانە نەخۆشخانە. دەیزانی ژۆزێف چاوەڕوانیەتی، جگە لەوە دەبوایە ئەو پارچە کاغەزەی ئەدرێسی بیئاتریسی لێ نووسرابوو، هەڵگرێتەوە. یوهان پێی ناخۆش بوو کابرای فەڕەنسی بە خۆڕایی چاوەڕێ دەهێشتەوە و بێگومان نیگەرانیش دەبوو: "بەستەزمانە ژۆزێف، لەوانەیە شەوێ تا بەیانی چاوی لیک نەنابێ و چاوەنۆڕ بووبێ کاتژمێر نۆی بەیانی دابێ."

یوهان بەو بیرە دڵخۆشیی خۆی دایەوە کە بە زوویی چاک دەبێتەوە و دەتوانێ هەموو ڕۆژێ نان و نامەی بیئاتریس بۆ ژۆزێف ببا، بەڵام یوهان ریخۆڵەی بریندار بوو و بە ناچار دەبووایە دوو مانگ لە نەخۆشخانە بکەوێ.

ڕۆژی دوازدەی ڕێبەندان دکتۆر پێی گوت: "ئەم هەفتەیە دەتوانی نەخۆشخانە بەجێ بهێڵی، بەڵام سێ ڕۆژ مەرەخەسی چارەسەرکردنت بۆ دەنووسین." یوهان لەلای خۆیەوە بیری کردەوە بەو شێوەیە تا مانگێکی دیکەش ناتوانێ ژۆزێف ببینێ. کابرای فەرەنسی حەتمەن بە ئومێدێکی زۆرەوە چاوەڕوانی بوو. چاوەڕوانی ئەو نان و جغارانەی یوهان بەڵێنی پێدابوو. بۆیە بڕیاریدا چاوپۆشی لە مەرەخەسیەکەی بکا. دکتۆر پێی گوت: "لاوۆ، دەبێ باش وچان بدەی. دەبێ باش بخۆی و بنووی دەنا تێدا دەچی. هەر بە ڕاست ماوەی مەرەخەسیەکە لە کوێ دەبەیە سەر؟" یوهان نەیوێرا بڵێ گەرەکیەتی چاو لە مەرەخەسیەکەی بپۆشێ. زۆر تەنگەتاو و ناڕەحەت بوو.

"دەی دەی تێگەیشتم. بۆخۆت نازانی بچیە کوێ. دیارە من دەتوانم بتنێرمە وچانگەیەکی گشتی، بەڵام پێم وایە ئەو شوێنە بۆ تۆ گونجاو نییە. تۆ پێویستت بە شوێنێکی گەرموگوڕ و دۆستانە هەیە. یوهان زۆر زگی بە خۆی سووتا. دەتگوت دکتۆر لە دڵی ئەودایە. ئەو پێویستی بە خواردن و وچاونگەی باش یان پارە نەبوو. تەنیا حەزی لە شوێنێک بوو وەک ماڵی خۆی وا بێ.

"تۆ پێویستت بە ژنێکە ئاگای لێت بێ و خزمەتت بکا. تۆ دەبێ باوەڕ بەخۆ بوون پەیدا بکەیەوە دەنا چاک نابییەوە. دیارە لە وچانگە گشتییەکانیشدا ژن زۆرە، بەڵام ئەوان هەر بە کەڵکی دامرکاندنی حەزی جنسی دێن و بۆ نەخۆشێک کە هەم لە رووی جەستە و هەم لە بارەی دەروونییەوە نەخۆش بێ گونجاو نین. کوڕم تۆ پێویستیت بە سۆز و خۆشەویستی هەیە:"پزیشک لە دەوروبەری خۆی روانی. چاک دەیزانی نەخۆشەکەی چیی لازمە. ویژدانی پزیشکی وای لێدەکرد خۆشەویستی، ماڵ و حاڵ، بڕوا بە خۆبوون و هاودەمێکی ژن بۆ نەخۆشەکەی دابینبکا، بەڵام ئەو دەرمانانەی شک نەدەبردن. لەپڕ چاوی بە کچە پەرستارێک کەوت کە بە خۆی و بە کاغەزی چارەسەرەوە هاتە ژوور.

"خاتوو هیلدە، ئەرێ بەڕاست تۆ لەو دەوربەرانە لەگەڵ دایکتدا دەژی؟"

پەرستار چاوێکی پڕ لە دڵنیایی لێکرد. وەکو نیگای سەربازێکی بە ئەمر و گوێ لە فەرماندەکەی کە چاوەڕێی فەرمانی ئەو بێ. دکتۆر بزەی هاتێ. "من مۆریتس بە تۆ دەسپێرم. وا لەگەڵی بجووڵێوە وەک ئەوەی مێردت بێ. پاشان دوای مانگێک بە ساغ و سەلامەتی بیهێنەوە ئێرە. من حەز دەکەم پێش ئەوەی بچێتەوە سەر کار چاوم پێی بکەوێتەوە. ئەو پێویستی بە ژنێکە هاوکات بۆ وی هەم دڵدار و هەم خوشک و دایک بێ." "تێدەگەم جەنابی دکتۆر." هیلدە بیست ساڵە بوو. بەژنی کورت، دەموچاوێکی خڕ و هەڵگیراو، هێندێک سوورکارە و لێوی جوان بوو. دکتۆر بە رەزامەندییەوە چاوێکی پێداگێڕا. وای هاتە بەرچاو ئەو میهرەبانی و خۆشەویستییەی تێدایە کە یوهان پێویستی پێیەتی. پاشان چاوێکی لە قژی کچەکە کرد کە زەردە، بۆ نەخۆشی وەک ئەو لاوە کچی قژ خورمایی بە هیچ کلۆجێ گونجاو نییە. ئەو پرچە زەردە کاڵە هەموو رەشاییەک دەتارێنێ." "بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە مەرەخەسیەکی چاردە رۆژەت دەدەینێ. لەو

ماوەیەدا تەنیا ئاگاداری لەم نەخۆشە دەکەی، خواردنیش دیارە لە ئێمە وەردەگری، بەلام پێشنیار دەکەم لە ماڵەوە چێشتی بۆ لێبنێ. ئەو پێویستی بە دەستاوی کەسێکی میهرەبانە، نەک چێشتی چێشتخانەی گشتی."

"تێدەگەم جەنابی دکتۆر."

هیلدە شانازی بە وەها مەئمووریەتێکەوە دەکرد. دەیزانی هاوکارەکانی بەخیلی پێدەبەن.

"ئەرێ تۆ لای دایکت بێگومان ژوورێکی تایبەتی خۆت هەیە؟"

"بەڵێ."هیلدە کەمێک سوور هەڵگەڕا.

"من پێم وایە ئەو گەنجەت بە دڵ دەبێ."دکتۆر چاوەڕوانی وەلام نەبوو. فەرمانی دابین کردنی پەتەی مەرەخەسی و کوپۆنێکی پلە یەکی خۆراک بۆ ماوەی سی رۆژی بۆ دوو کەس، دایە کچەکە.

"سەر چاوان، دکتۆر."

هیلدە بۆ راپەڕاندنی کارەکان وەدەر کەوت. دکتۆ کاتێ وەدەرکەوت لە نێو دەرگا راوەستا، چاوێکی لە یوهان داگرت و گوتی: دیمانە بەخێر، کوڕم، بە ساغ-وسەلامەتی بگەڕێوە."

## (٨٤)

یوهان چاوی لە حەوشەی نەخۆشخانە کرد. بەفر دەباری. لە دوورەوە تێلدڕووەکانی ئۆردووگا دەبینران. ماوەیەکی زۆر هەروا لە لای پەنجەرە راوەستا. لەپڕ دوو دەستی سارد چاوی گرتن. ئاوری دایەوە. هیلدە بوو. یوهان بە تەواوی لە بیری کردبوو.

جلەکانت بکەوە بەر و بڕۆ سندووق. مووچەکەت وەربگرە. من کاغەزی دەرچوونم وەرگرتووە."

هیلدە زوو زوو قسەی دەکرد. یارمەتیی یوهانی دا کوتەکەی لەبەر بکا. کاتێ دوگمەی کۆتەکەی دادەخستن دەستی چووە بن کراسەکەی یوهان. یوهان دەستی وی لەسەر سنیگی خۆی هەستپێکرد. دەستی نەرم و خۆش بوو. هیلدە

بە جۆرێک یارمەتیی بەرگ پۆشینی یوهانی دا، دەتگوت لەگەڵ منداڵ یان مێردی خۆی هەڵسوکەوت دەکا. تا ئەودەم هیلدە سارد و دوورەپەرێز بوو، بەڵام ئێستا لە ناکاو گەرموگوڕ و بە موحیبەت بووبوو. تەنانەت گەرموگوڕتر لە سۆزانا و یۆلیسکا. ش. یوهان هەستیکرد خوشی دەوێ. هیلدە زۆر بە خێرایی دڵی دابوێ. بە ئەمری دکتۆر. یوهانی خۆش دەویست و ئەو بەڵێنەی بە پزیشکی دابوو، دەیگەیاندە سەر.

دکتۆر ئیزنی داوین قەرەوێڵەیەک لە نەخۆشخانەوە بۆ خۆمان ببەینەوە. قەرەوێڵەیەکی گەورەی سپی لە بەشی نەشتەرگەرییەوە لەگەڵ دوو پەتۆی خوری. قەرەوێڵەکەی من بو دوو کەس بچووکە. دکتۆر پێی گوتووم نابێ زۆرت بورووژێنم. هەڵبەت ئەوە ئاساییە، بەڵام دوای هەفتەیەک حەسانەوە و پارێز وەزعەکە بە تەواوی دەگۆڕێ." "چی... دەگۆڕێ؟"

هیلدە بە پەلە لێوی ماچکرد و گوتی: "خۆت دەیبینی". یوهان مووچەکەی وەرگرت. هەستی بە بەختەوەری نەدەکرد. تەنیا فەرمانێکی جێبەجێ دەکرد. دیارە ئەو فەرمانە بۆ کارکردن لە کارخانە یان ئێشکگرتن نەبوو، ئەو فەرمانە بۆ خۆش ویستنی هیلدە و رابواردن لەگەڵی بۆ ماوەی مانگێک بوو تا لە رووی دەروونی و هەم جەستەییەوە بێتەوە سەرخۆ. دیارە ئەمرێکی وا بوو قەبووڵبکرێ، بەڵام هیچ ئەمریک نەیدەتوانی بەختەوەری بکا.

## (٨٥)

حەفتەیەک بوو هیلدە و یوهان پێکەوە دەژیان. هیلدە بە یوهانی گوت: "دەزانی ئەگەر من و تۆ ببینە هاوسەر دوو حەفتەی دیکەشم مەرەخەسی دەدەنێ؟"

یوهان بە خۆشەویستییەوە سەیریکرد: "تۆ خۆت دوێنێ گوتت مێردت پێدەکەم، وا نییە؟

"وایە."

یوهان بیری کەوتەوە شەوێدی لەگەڵ هیلدە و دایکی چەند بتڵ شەرابی هەڵچۆڕاندبوو.

"هەر بە راست بۆ زەماوەند ناکەین؟ ئەگەر پەلە بکەین من دەتوانم چاردە ڕۆژی دیکەش ئیجازە وەربگرم. ئیجازەکەی تۆش نوێ دەکرێتەوە. جگە لەوە خانوویەکیشمان دەدەنێ، بە مۆبڵەوە. ئینجا کارەکەشت ئاسانتر دەبێ. ئەودەم تەنیا ئەو شەوانەی ئێشکت هەیە لە سەربازگە دەمێنییەوە و شەوەکانی تر لە ماڵێ دەبی. من لەگەڵ دایکیشم قسەم کردووە. پێم وایە باشترین کار ئەوەیە تا زووە شاییەکە بکەین."

یوهان کڕ بوو. هیلدە پێی وا بوو لەوانەیە یوهان حەز نەکا ماوەکەی بە تەدارەکی زەماوەند تێپەڕ بکا. "تۆ کارت بە هیچ نەبێ. هەر وەک ئێستا لە ماڵێ دانیشە. هەموو کاروباری وەک چوونە مەحزەر، دائیرەی تاپۆ، دائیرەی خۆراک، ژاندرمە و بە کورتی بۆخۆم هەموو کارەکان جێبەجێ دەکەم. تۆ نابێ خۆت ماندوو بکەی."

یوهان ڕازی بوو. گوتەکانی هیلدە قەناعەتی پێ هێنابوو. ئەگەر زەماوەندیان کردبا لە زۆر سەرەوە بە قازانجیان بوو. هەر واشیان کرد.

خانوویەکیان دانێ، سێ ژوور و مەتبەخ و حەمامی هەبوو. بێجگە لەوە دوو هەزار مارک و ئیزننامەی وەرگرتنی قەرەوێڵە، نوێن، جلی بنەوە، کەرستەی مەتبەخ، سووتەمەنی، ڕەژی و شەراب و گۆشتیان بۆ شایی دانێ. سەرەڕای هەموو ئەو شتانە ڕادیۆیەکیشان وەرگرت. یوهان بە تەما بوو بچێتە سەربازگە. هیلدە کە لە پۆشینی بەرگەکاندا یارمەتی دەدا، گوتی: "ئێمە گێل بووین ئەگەر زەماوەندمان نەکردبا و ئەو هەموو شتەمان لە کیس خۆمان دابایە، پیاو ماڵی خۆی هەبێ لە سەربازگە خۆشتر نییە؟"

"بێگومان خۆشترە." "ئەو خواردنەی من شەوانە بۆتی لێدەنێم لەگەڵ هی سەربازگە وەک یەکن؟"

هیلدە زۆر ڕازی و خۆشحاڵ بوو: "دوو مانگی دی دەڵێم دووگیانم، ئەوکات تۆ دەتوانی بۆ نانی فراوینیش بێیەوە ماڵێ. ئەودەم ئازووقەی پترمان دەدەنێ. ئەو ژنانەی دەیانەوێ ببنە دایک جیرەی سێ کەس وەردەگرن. ئەودەم خواردنی باش دەخۆی."

یوهان پێکەنی و گوتی: "تۆ زۆر کچێکی چاکی هیلدە"؟

## (٨٧)

ئاگادارییەک لە دوو نوسخەدا بۆ پۆستخانەی پازگای فانتانا هاتبوو کە دەبوو لە دیواری بدەن. سەرۆکی پازگا نیکۆلای دوبریسکۆ نووسراوەکەی خوێندەوە: "ئیڤان مۆریتس ـ ی جوولەکە ناسراو بە یوهان بە ژاکوب بە یانگ لە دەست پۆلیسی وڵات رایکردووە. ناوبراو لە یەکێ لە ئۆردووگاکانەوە هەڵاتووە. ئەو کەسانەی ئاگایان لە شوێنی خۆشاردنەوەیەتی یان داڵدەیان داوە تا زووە بە بەرپرسان رانەگەیەنن بە زیندان مەحکووم دەکرێن."
لەلای سەرەوەی کاغەزەکە دوو وێنەی رووبەڕوو و لە لاتەنیشتی یوهان بەرچاو دەکەوتن. سەرۆک پازگا دوای خوێندنەوەی نامەکە گوڕاندی: "کەواتە ئەو پیاوە جوولەکە بوو. "ئینجا بانگی سەربازێکی کرد: "تفەنگەکە هەڵگرە و دایک و باوکی ئەو جوولەکەیەم بۆ بهێنە."
لە فانتانا بەفر دەباری. سەرۆکی پازگا لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. قەشە کۆرۆگا بەویدا رادەبرد. شانی داتەپیبوون. قەشە فایلێکی لە ژێر باڵیدا بوو. زۆری پێنەچوو ژەندەرمەکە گەڕایەوە.
"قوربان تەنیا دایکیم لەگەڵ خۆم هێنا. مێردەکەی نەخۆش بوو: "سەرۆکی پازگا تووڕە بوو. دەیویست لێپرسینەوە لەگەڵ هەر دووکیان بکا. سەربازەکە گوتی: "ئەگەر ئەمر دەفەرمووی بە زەبری چەک لە جێیەی دەردێنم، بەڵام بە پێی خۆی ناتوانێ بڕوا. بۆخۆم لێفەم لەسەر هەڵدایەوە، هەموو لەشی هەڵمساوە."
سەرۆکی پازگا بۆ ساتێک دۆش داما. ئینجا چاوپۆشی لە هێنانی کابرا کرد. فەرمانی دا دایکی یوهان کە لە پشت دەرگا چاوەڕێ بوو بهێننە ژوورێ. ئاریستیزیا کە لە داخان رەنگی بە روونەوە نەمابوو وە ژوور کەوت:
"چیت لێ قەوماوە وا منت وەک پیاوکوژان بە زەبری چەک راکێش کردووەتە ئێرە؟ چما من پیاوکوژم؟"
ئاریستیزیا ئاگای لە خۆی نەمابوو. کاتێ ژەندرمەکە بە خورتی لە ماڵێ دەرهێنا لەبەر خۆیەوە گوتی شەرتە چاوی سەرۆکی پازگا دەردێنم."

ژەندەرمە دانەیەکی لە ئاگادارییەکە دایێ. ئاریستیزیا هەر کە چاوی بە وێنەی کوڕەکەی کەوت لە پڕمەی گریانی دا.

"تۆ پیاوت نەکوشتووە، بەڵام پۆلیس بە دوای کوڕەکەتدا دەگەڕێ."

"کوڕیژگەم چەند کز بووە." ئاریستیزیا کە کز و لاواز بوونی کوڕەکەی دیت، ئیدی هیچی وە بیر نەما. سەرۆکی پازگا پێی گوت: "بیخوێنەوە." "بۆ بیخوێنمەوە؟" چاوی سڕینەوە: "ئەمن هەر کە وێنەکەم دی زانیم کوڕەکەم خەریکە لە برسان دەمرێ. ئیدی چی بخوێنمەوە؟ ئۆف، ئەوە دڵم بۆی دەتۆقێ؟" دۆبریسکۆ بە دەنگی بەرز دەستی بە خوێندنەوە کرد. هێشتا لە یەکەم رستە نەبووەوە کە ئاریستیزیا لێی وە جواب هات: "دادەی جارێکی دی وەیخوێنە. من خراپ تێگەیشتم؟ گوتت ئیڤان مۆریتس، جوولەکە؟ راستت خوێندبێتەوە ئەوە باسی کوڕی من نییە. من چ کوڕی جوولەکەم نییە."

سەرۆکی پازگا نووسراوەکەی دایە دەستی خۆی. ئاریستیزیا کە چاوی بە رەنگ و رووی کوڕەکەی کەوتەوە دیسان دڵتوند بوو. جەندرمە لێی پرسی: "خۆیەتی، وا نییە؟" "کەواتە ناسیتەوە؟ ئەدی بۆ دەڵێی جوولەکە نییە. درەنگە، گوێ بگرە، من بۆت دەخوێنمەوە. من هەر چییەکی بەڵگەنامە نووسیبێتی بڕوای پێدەکەم. ئەوە نووسراوێکی رەسمییە کە کاربەدەستانی دەوڵەت ناردوویانە. لەوێدا بە راشکاوی نووسیویانە کوڕەکەی تۆ جوولەکەیە." "یەک جاری دی بە کوڕی من بڵێی جوولەکە هەردووک چاوت دەکۆڵم. کوڕیژگە بەستەزمانەکەم. هێندی کوتەرە دارێک شایی بە خۆی بوو.. ئێستاش ئێسک و پێستێکی لێ ماوەتەوە." "سووکایەتی بە کاربەدەستانی سەروو مەکە. ئەگینا بە ناوی سووکایەتی کردن بە پیاوی دەوڵەت فایلت بۆ دەکەمەوە." "ئیڤان لە من و باوکی بووە نەک لە کاربەدەستانی سەرەوە. نۆ مانگ لە زگی خۆمم گێڕاوە، بە شیری مەمکەکانم فراژووم کردووە. خۆ کاربەدەستان بە خێویان نەکردووە. من دەزانم ئەو جوولەکە نییە." "وەزارەتی ناوخۆ لەم نووسراوەدا بە راشکاوی رایگەیاندووە کە یوهان مۆریتس جوولەکەیە." "ئەگەر وەزارەتی ناوخۆ دەوێرێ با لە کن من ئەو قسەیە بکا. با ئەو بڵێ منداڵێک کە لە هەناوی من بەرۆتەوە جوولەکەیە بزانە دەمی دەشکێنم یان نا."

"ئەگەر تۆش رۆمانیایی بی، دەبێ باوکی جوولەکە بێ. بەهەرحاڵ یەکتان جوولەکەن. ئەوە بەڵگەنامەیەکی رەسمییە. لەوانەیە خۆتان ئاگادار نەبن کە جوولەکەن." "ئەوە سەرخۆشی؟ چۆن من نازانم لە بەردەم کام خاچدا چۆک دادەدەم و نزا دەکەم؟" "ئەوە پەیوەندیی بە بیر و باوەڕی ئێستاتانەوە نییە. لەوانەیە یەکێ جوولەکە بێ و بۆخۆشی نەزانێ. لێرەدا مەسەلەی خوێن لە گۆڕێدایە." "خوێنی من و مێردەکەم خوێنی مەسیحییە. کافر ئێوەن کە فرزەندی من لە زینداندا جەزرەبە دەدەن."

"باشە دڵنیای مێردەکەت مەسیحییە؟"

"تۆ ئیجازە بە خۆت دەدەی بڵێی من پیاوێک نەناسم کە سی و پێنج ساڵ لەگەڵی خەوتووم."

ئاریستیزیا دەرهەڵبوو: "خۆ قەحپەیەکیش دەزانێ ئەو پیاوەی بەسەری دەکشێ چ کەسە. تۆ دەفەرمووی من سی و پێنج ساڵە لەتەک ئەو پیاوەدا دەنووم و نەمناسیوە؟ کاربەدەستانی سەرووی تۆش دەبێ باجی ئەو هەموو ئازار و سەختییەی جگەرگۆشەکەم کێشاویەتی بدەن." ئاریستیزیا چاوی بە شووشە مەرەکەبێک کەوت کە لە سەر مێزەکە دانرابوو. مەرەکەبەکە سوور بوو. سەرۆکی پازگا بەوەی زانی و خێرا شووشە مەرەکەبەکەی لەوێ لابرد. پەردەیەکی سوور بە پێش چاوی ئاریستیزیادا کشابوو. هەموو شتێکی سوور دەدی. دار و دیوار، مێزەکەی سەرۆکی پازگاش. بە پەنجەکانی، داوێنی کراسەکەی هەڵدەگلۆفی. دەتگوت ملی کاربەدستە گەورەکانی چنگ کەوتووە.

ئاریستیزیا ددانی لە چیڕەوە بردن. پاشان لە ناکاورا تەنوورەکەی هەڵدایەوە سەر تەپڵی سەری. بن کراسەکەشی لەگەڵ هەڵدرایەوە. پێستی گەنم رەنگ و چرچ-ولۆچی وەدەر کەوت. مەمکە چرچەکانی داچۆڕان. سەرۆک پازگا بۆ ساتێک چاوی بە لەشی رووتی ئاریستیزیا کەوت و هەر دوو چاوی نووقاند. گرمە لە دەرگاکە هەستا. دار و دیوار لەرزی و کوتە گەچ لە میچەکە بەربوونەوە. ئاریستیزیا ون بوو، بەڵام هێشتا دەنگی لەرزۆک و توورەی کە دەتگوت هۆڕنی ماشێنە لە گوێی دۆبریسکۆدا دەزرینگایەوە: "ئەوەش وەڵامی من. تۆ و کاربەدەستانی سەرێ هەتا سەروو هەڵدەگرێ گووی منتان خوارد. تۆش و ئەوانیش؟"

## (٧٨)

ئاریستیزیا کە گەیشتەوە ماڵی سەرپۆشەکەی فرێدا لایەک و لە پەنا ئاگر هەڵترووشکا. هەندێکی دار لە ئاگردانەکە هاویشت و چاوی لە سەمای بڵێسەکان بڕی. فرمێسک بە چاویدا هاتبووە خوارێ. "وا باشە جارێ هیچی پێ نەڵێم. هەر بۆخۆی نەخۆش و زەلیلە، ئەوەشی پێ بڵێم بە جارێ دەتۆڵێتەوە." ئاریستیزیا رووی لە مێردەکەی کرد و یوهانی بیر کەوتەوە کە پێنج ساڵی مۆر بوو بە فەرمانی گەورە کاربەدەستان لە بەندیدا دەرزی، چونکە بە جوولەکەی تێ-گەیشتوون. لە دڵی خۆیدا گوتی: "خۆ ئەگەر جوولەکە بوایە نەیاندەگرت. یوهان زۆر گەوجە. حەتمەن لێیان داوە تا ددانی پێدا بنێ جوولەکەیە، ددانی پێدا ناوە و "گەورە کاربەدەستان" یش دایانکردۆتە ژووری." هەروا لە پەنا ئاگرەکە هەڵترووشکابوو. سەری گرتبووە نێو دەستانی و دەگریا. ئیدی لەوە زیاتر خۆی پێ رانەدەگیرا. هەستیکرد دەبێ بە مێردەکەی بڵێ کە وێنەی کورەکەیان لەسەر کاغەزێکی سەوزی وەک بڵاوکراوەی پڕوپاگەندە لە تەنیشت دەرگای پارێزگا هەڵواسیوە، بەڵام پێویست ناکا بەوە بزانێ کە یوهان وەک قامک باریک بووە. بەوە زۆر تێکدەچێ، بەڵام دەبێ پێی بڵێم سەرۆکی پازگا گوتوویە ئیڤان جوول‌ـــــــــــــەکـــــــــــــــــەیـــــــــــــــــە."

"یــانکو هـــەســـتە. رۆژەکـــەی هـــەر بنـــووی شـــەوێ خـــەوت لێناکـــەوێ."

پیرەپیاو وەڵامی نەدایەوە. "بەزمەکەیە! هەموو جارێ کە دەمەوێ لە خەوی هەستێنم خۆی لە خەو دەکا. چاوی قووچاون و گوێی لە هەموو شتە. هۆی یانکو، رەییس پازگا پێی گوتم تۆ جوولەکەی. قەتت قسەی وا قۆڕ بیستووە؟، بەڵام باوەڕ بکە دەردێکم پێکرد با بە دەواری شڕی نەکردبێ." ئاریستیزیا وای هاتە بەرچاو کە پیرەمێردەکەی پێدەکەنێ. لە ماوەی سی و پێنج ساڵ ژیانی هاوبەشدا شەڕ و دەمەچەقەی زۆریان کردبوو، بەڵام ئاریستیزیا مێردەکەی خۆی خۆش دەویست. زۆربەی شەڕ و بەگژدا چوونی ئاریستیزیا لەسەر دڵنەرمی و دڵساقی مێردەکەی بوو، بەڵام بەراستی خۆشی دەویست.

"یانکو، ئەگەر تا سبەی چاکتر نەبووی دەچمە شار و دختۆرت دێنمە سەر. خەمی پارەشت نەبێ، بەچکە بەرازێک دەفرۆشم. خوا دەکا تۆ چا دەبیەوە."
مێردەکەی هەروا بێدەنگ بوو.
"یانکو، چاوت هەڵێنە. هەها ئەوە جغارەیەکیشم لە لالێوی نای."
هەستا لەسەر ئاگردانەکە سیغارێکی هێنا کە بۆ مێردەکەی هەڵگرتبوو.
"شەمچەت پێیە؟" پاشان لە قەرەوێڵەکە چووە پێشێ تا جغارەکە بنێتە لالێوی مێردەکەی، وەک ئەو کاتەی لە هەرەتی لاویدا بوون و شەیدای یەکتر بوون. دەیزانی ئەگەر مێردەکەی چاویش هەڵنەیەنێ بەهەرحاڵ بۆ گرتنی جغارەکە لێوی لێک دەکاتەوە، بەلام لێوە چفت کراوەکانی لێک نەترازان. تەنانەت کاتێ ئاریستیزیا جغارەکەی پاڵ دا، لێوی هەروا مانەوە.
"یانکو، چ بووە؟"
ئاریستیزیا شانی مێردەکەی راتەکاند. لەسەر جلەکانییەوە هەستی بە لەشی ساردوسڕی کرد. ئینجا دەستی لە سەر نێوچاوانی دانا. وەک سەهۆڵ بوو. یانکۆ مردبوو. ئاریستیزیا دەستی بە هاوار هاوار کرد. دەیویست لە ژووری دەرپەڕێ، بەلام گەڕایەوە سەر تەرمی مێردەکەی. هەر بەو شەمچەیە کە دەیویست جغارەی بۆ دابگیرسێنێ، مۆمێکی هەڵکرد و لە ژوور سەری مردووەکەی دانا. ئینجا لە بانگ و سەلایەی دا. ئاخر دەیزانی پاشی وی لەو دنیا گەورەیەدا هیچ کەسی نامێنێ. تا شل و کوت بوو گریا. پشووی سوار بوو. پاشان لە پەنا تەختی مێردە مردووەکەی دانیشت و لەسەرخۆ هەنیسکی دان. دەتگوت لە خەیاڵی خۆیدا راز و نیازی لەگەڵ دەکا. ئینجا لە گریانیش بێزار بوو. چیتر نەدەگریا. لەو کاتەدا بە تەواوی و بە روونی هەستی بەوە کرد تاهەتایە بەتەنێ دەمێنێتەوە. هەستا و چرای پێکرد. مۆمی ژوور مردوو لەمێژ بوو تەواو بووبوو.

## (٨٨)

قابلەمە ئاوێکی بۆ چێشت وەسەر نا. وەک رۆژان پەردەکانی دادانەوە و ئەودەم هێندەی دی هەستی بە نامۆیی و تەنیایی کرد. گێژ و وڕ بوو. چاوی بە

خەوتووە تاهەتاییەکە کەوت. ئاریستیزیا لە مردوو نەدەترسا. حەزی دەکرد پێش ئەوی کفن و دفن بکرێ، ماوەیەک لە لای بێ. لە ناکاو قسەی سەرۆکی پازگای وەبیر هاتەوە "لەوانەیە مێردەکەت جوولەکە بێ." لە نێوەڕاستی هۆدەکە ڕاوەستابوو، نەیدەزانی چ بکا. ئاوەکە وە کوڵ هاتبوو، بەڵام ئەو هەستی بە برسێتی نەدەکرد. جێگاکەشی ڕاخرابوو. مێشک و جەستەی بەو هەموو ئازار و بەدبەختییە سڕ بووبوون. ئاریستیزیا پێویستی بەوە هەبوو بە هەر جۆرێک بێ خۆی بخافڵێنێ و مێشکی خۆی بە شتێکەوە مەژغوول بکا. ئۆف کە ئەو تەنیاییە کوشندە بوو. ئەمجارەش پەردەکانی بە تەواوی ڕاستەوپاستە کرد و ئینجا بەرەو لای تەرمی مێردەکەی چوو. دەتگوت جەندرمەکە لە لای ڕاوەستاوە و دەنگی کە دەیگوت: "لەوانەیە مێردەکەت جوولەکە بێ." دەکەوتە بەرگوێی.

لێفەکەی لەسەر هەڵدایەوە و سەیری مردووەکەی کرد. هەموو گیانی ئەستوور بووبوو. دەستێکی بە کراس و بیجامەکەیدا هێنا. هەر ئەو جلانەی کە سەد جار شۆردبوونی. پاشان دۆخینی کردەوە و بیجامەکەی تا سەر چۆکان داخزاند. لەشی مردووەکە مۆر بووبوو.

بە دەنگی بەرز لە خۆی پرسی: "باشە بۆ شەرم دەکەی؟ ئەو مێردی خۆت بوو."

ئەو ڕۆژانەی هاتنەوە بیر کە هەر دووکیان بە ڕووتوقووتی چەندین کاتژمێر لە پەنا یەکتر دەخەوتن. کەچی ئێستا لەشی مێردەکەی شین و مۆر بووبوو.. لەوانەیە مێردەکەت جوولەکە بێ.

دەستی وە هێنی مێردەکەی کەوت. ئەویش ساردوسڕ و مۆر بووبوو، چەشنی لووت و لێو و پێڵووی. ئاریستیزیا خێرا دەستی کێشایەوە. بە دەم هەڵلەرزینەوە و بیجامەی بەر مردووەکەی هەڵکێشایەوە، دۆخینەکەی بەستەوە و لێفەکەی پێدادایەوە. ئینجا هەستا سەر پێ و خاچی ڕەسم کرد.

"خوایە زۆر شوکر کە کاتی خۆی گێڕاتمەوە." ئەمجارەش خاچی کێشایەوە. "باش بوو چاوم لێنەکرد دەنا دەکەوتمە جەهەننەم. زۆر نەمابوو تووشی گوناهێکی گەورە بم، بەڵام باش بوو چاوم لێنەکرد. هیچم نەدی. ناشمەوێ ببینم تا بزانم جوولەکە بوو یان نا. نا... نا، نامەوێ."

ئینجا تەماشای مردووەکەی کرد و گوتی: "یانکو... بمبوورە." چاوی پڕ بوو لە فرمێسک. "سوێندت بۆ دەخۆم هیچم نەدی. هەر نەمدەویست بیبینم. تۆ خۆت من دەناسی. ئەو جەندرمە و گەورە کار بە دەستانە خەریک بوون تووشی گوناهم کەن. ئۆهـ ڕەبی بچنە سەر کڵەی جەهەندەم."

## (٨٩)

یوهان مۆریتس لە ناو شاردا پێنج زیندانی پێش خۆی دابوون. کاتژمێر ٧ی بەیانی بوو. کاتێ بە بەر ماڵەکەی خۆیاندا تێدەپەڕی، هیلدە خۆی بە پەنجەرەدا شۆڕ کردەوە و چاوی لێکرد. "فریتز"ی کورە چکۆلەکەشیانی بە باوەشەوە بوو. یوهان گوێی لێبوو هیلدە دەیگوت: "چاو لێکە ئەوە بابتە. چاو، خوودە و تفەنگیشی هەن." فریتز سێ مانگانە بوو. جارێ فامی نەدەکرد بزانێ باوکی بە خوودەی سەریەوە و تفەنگ بە دەستەوە پێنج بەندی پێش خۆی داون، بەڵام هیلدە هەموو ڕۆژێ ئەو دیمەنەی بە کورەکەی نیشاندەدا تا شانازی بە بابیکی وەهاوە بکا. هەروەک خۆی شانازیی پێوە دەکرد.

یوهان لە ڕێگاوە بیری هەر لای هیلدە و فریتز بوو. لە دەرەوەی شار ڕێگاکە بە نێو گژوگیادا تێدەپەڕی. یوهان کڕ و کپ، چەک لە ملدا، بە دوای بەندییەکانەوە هەنگاوی دەنا. کە گەیشتنە پردەکە ڕاوەستا. لەوێ کاریان دەکرد. هەر کە گەیشتنە ژێر پردەکە هەموویان لە قاقای پێکەنینیان دا. ئەو شوێنە هاتوچۆی بە سەرەوە نەبوو. کەس ئەوانی لێرا دیار نەبوو. یەکێ لە بەندییەکان دەستی یوهانی توند ڕێکگوشی و گوتی: "سالْڤە سکلاڤە، دوێشەو چاک خەوتی؟" ژۆزێف بوو. یوهانیش لە وەڵامدا هەر ئەو ڕستەیەی دووپات کردەوە. پاشان تفەنگەکەی لە لایەک فڕێدا و یەک یەک تەوقەی لەگەڵ کردن. ئینجا نانێک و گڵۆزە جگارەیەکی لە بن پاڵتۆکەی دەرهێنا و دایە ژۆزێف. "هێشتا پازدە مارکت پێ قەرزدار دەمێنمەوە، سابوونم دەست نەکەوت. سبەی ..."

بەندییەکان دانیشتن و چرە دووکەڵیان ساز کرد. یوهانیش وێڕای وان. لەو کاتەوە بۆ کار ناردبوویاننە ئەو پردە هەموو ڕۆژێ پێش دەستپێکی کار، نیو

کاتژمێر خەریکی گاڵتە و گەپ و جغارەکێشان دەبوون و ئینجا تا نیوڕۆ کاریان دەکرد. ئەودەم خۆشترین کاتی ڕۆژ دادەهات. یوهان لەو کاتەدا ئەو نامانەی لە فەرەنساوە دەهاتن و نان و سیغار و هەر شتێکی لەسەر داوای بەندییەکان کڕیبوونی دەیدانێ و دەستیان بە کار دەکردەوە. یوهانیش زۆر جار یارمەتی دەدان. دیارە بە دزیەوە، نەدەبوو کەس ببینێ. زیندانییەکان حەزیان نەدەکرد کار بکا، بەڵام ئەو خۆی چێژی لەوە وەردەگرت یارمەتییان بدا. زیندانییەکان کەسانی خوێندەوار بوون و سەریان لەو جۆرە کارانە دەرنەدەچوو. یوهان پاچەکەی دەست دەدایە و پێی دەگوتن چۆن دەبێ.

ژۆزێف بە یوهانی گوت: "ژان، ئەمڕۆ دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم." پاشان یوهانی تاق کردەوە. چوار کەسەکەی دی خەریکی کاری خۆیان بوون. دەمی کۆڵنگەکە زرینگەی لە تاشە بەردەکان هەڵدەستاند.

کاتێ ژۆزێف و یوهان گەیشتنە کونجێکی چۆڵ ژۆزێف گوتی: "ئێمە دەمانەوێ رابکەین، بەڵام ئەمڕۆ نا. پاش چەند ڕۆژی دی. هەر پێنج کەسمان." یوهان بە دڕدۆنگییەوە لە ژۆزێف وەڕاما. پێی وابوو گاڵتە دەکا، بەڵام نا.. بە گاڵتەی نەبوو. "باشە من چ خراپەیەکم دەرهەق کردوون دەتانەوێ رابکەن؟ دەتانەوێ تا مردن لە بەندا بم؟"یوهان زۆر تووڕە بوو: "تۆ خۆت دەزانی راشبکەن من دڵم نایە تەقەتان لێبکەم. ناتوانم بتانکوژم. تەقەشتان لێنەکەم ئەوکات خۆم دەکوژرێم. گاڵتە دەکەی، وەنا؟""نا، گاڵتە ناکەم، ئێمە رادەکەین. تۆش ناخرییە زیندان." یوهان ئاگای لە قسەکانی ژۆزێف نەبوو. "داوا دەکەم بمگۆڕن. من لە سبەیەوە لەگەڵتان نایەم. نە دەمەوێ تەقە لە ئێوە بکەم و نە ئازادیی خۆشم لە دەست بدەم. من چەندین ساڵ تامی زیندانم چێشتووە. لە سبەیەوە... بەبێ من. کە من لێرە نەبووم چیتان پێخۆش بوو بیکەن. کەیفی خۆتانە.""باشە تۆ راوەستە با پلانەکەت بو باس بکەم. تۆش دەبێ لەگەڵ ئێمە بێی." "من هیچ پێویستم بە راکردن نییە..." پاشان یوهان دەنگی لێ هەڵبڕی . "من ژن و منداڵم هەیە و ئازادیشم. ئەگەر زیندانی بام لەوانە بوو لەگەڵتان رابکەم.""تۆش زیندانیی، ژان گیان. جیاوازیت لەگەڵ ئێمە هەر ئەوەندەیە تۆ کۆیلەی چەکداری و ئێمە کۆیلەی بێ چەک. دەنا وەکو یەک واین. تۆش دەبێ

لەگەڵ ئێمە بێی.""لە سبەینێوە... من نایەم." یوهان دینی لە کنە خۆی نەمابوو. جغارەیەکی لە لالێوی گرت و ئاوڕی دا.

"ژان گیان، ئێمە نیازمان خراپ نییە. خۆت دەزانی شەڕ بەرەو کۆتاییە. هاوپەیمانان هەروا دێنە پێش. پێم وایە هیچ بیرت لەوە نەکردۆتەوە ئەگەر تۆ لە بەرگی ئێس.ئێس‌دا ببینن کۆڵەوار دەبی. لانی کەم دە ساڵ، بیست ساڵت دەگرن."

"قسەی قۆڕ، ئەگەر هاوپەیمانەکان بێن من بۆچی دەگرن. من زەرەری کەسم نەبووە. خۆیان هەمیشە لەسەر رادیۆ دەڵێن خەڵکانێکی هەق‌خوازن."

"بەڵام تۆ دوژمنی ئەوانی، تۆ دوژمنی فەرەنسا، نیشتمانی من و دوژمنی هەموو وڵاتانی هاوپەیمانی.""هەر بە راست؟ من دوژمنی فەرەنسام؟" یوهان دیسان پیس تووڕە بووبوو: "بۆیە هەموو رۆژێ نان و جغارەتان بۆ دەکڕم و هەر کارێکی هەتانبێ بوتان جێبەجێ دەکەم؟ چونکە دوژمنی فەرەنسام؟" سیغارەکەی تووڕ هەڵدا و ملی لێنایەوە. "نەمدەزانی ئێوە بە چاوی دوژمن سەیری من دەکەن. پێم وا بوو ئێمە دۆستین."

"تۆ دۆستی ئەڵمانەکان و لە بەرەی ئەواندای. تۆ سەربازی هیتلەری. ئەوەت نابێ لە بیر بچی.""من ئەگەر شووشە بیرەیەکم دەست کەوێ لەگەڵ کێ دەیخۆمەوە؟ لەگەڵ ئەڵمانەکان لە سەربازگە یان لەگەڵ ئێوە لە بن ئەو پردەدا؟ وەڵامم بدەوە ژۆزێف. من تووتن و جغارەی خۆم لەگەڵ کێ بەش دەکەم؟ من قسە لەگەڵ کێ دەکەم؟ دەردە دڵی خۆم لای کێ دەکەم؟ لای ئەوان یان لای ئێوە؟ من هیچ لای ئەڵمانەکانی سەربازگە باس ناکەم. تەنیا لەگەڵ ئێوە دەدوێم. لەبەر ئەوەی خۆم بە برادەری ئێوە دەزانم. تۆ چۆن زاتت کرد بە من بڵێی دوژمن؟ تۆ دەڵێی من لای ئەڵمانەکانم؟ تا ئێستا دیوتە لەبزم لە لەبزیان بگەڕێ؟ من برادەری ئێوە بووم. بەس ئێوە."

یوهان جغارەیەکی دیکەی داگیرساند. دەستەکانی دەلەرزین: "تۆ دەڵێی هاوپەیمانان بیست ساڵم دەگرن. دیارە فەرەنسییەکان ئەم کارە دەکەن، وە نا؟

"بەڵێ، ئەوان بگەنە ئێرە یەکسەر دەستگیرت دەکەن."

"زۆر باشە ئەگەر وا بێ، هەق و دادپەروەری لەگەڵ خۆر ئاوابوون، ئاوا بووە. ئەگەر وا بێ گوللەبارانیشم بکەن پێم ناخۆش نییە. باشە ئەگەر

دادپەروەری لە دنیادا نەمابێ من بۆچی بژیم؟ ئەگەر تۆ و هاورێکانیشت من بە دوژمنی خۆتان دەزانن لە سبەینێوە لەگەڵتان نایەم. رادەکەن راناکەن، کەیفی خۆتانە. من رێگەتان لێناگرم. ئەگەر خۆم نەکوژمە مەترسییەوە ئامادەم یارمەتیشتان بدەم. بەڵام لەگەڵ ئێوە رابکەم.. نا، مەحاڵە. تا هەتایە لەبەندا بم، مەحاڵە."..

"مەسەلەکە وا نییە. ئێمە دەمانەوێ تۆ رزگار بکەین. ئەوە دۆستایەتییە. دەمانەوێ تۆش لەگەڵ خۆمان ببەینە فەرەنسا."

"من لێرە ژن و منداڵم هەیە. ناتوانم لەگەڵتان بێم."

"تا چەند مانگی دی هاوپەیمانان دەگەنە ئێرە. ئەودەم ژن و منداڵەکەشت دێنینە فەرەنسا. ئێمە لە دەورەبەری پاریس کێڵگەیەکمان هەیە. تۆ خۆت وەرزێری. لەوێ بمێنەوە. کشتوکاڵ بکە و پارە پەیدا بکە. پاشان بە پارەی خۆت خانوو و زەوی بکرە. فەرەنسا زۆر خۆشە. خەڵکەکەشی زۆر باشن. تۆ دوای شەڕ، لە ئەڵمانیا چ دەکەی؟ وەرە لەگەڵ ئێمە با رابکەین." "نا من هەڵنایەم."

"ئێمە ئەوەندە پارە بۆ ژنەکەت بەجێ دێڵین، تا دەیبەینە فەرەنسا بە باشی پێی بژی. ئێمە پێنجسەد مارکمان پاشەکەوت کردووە. فەرەنساش سوپاست دەکا کە پێنج بەندیت بۆ ئازاد کردوون. چت گوت؟" یوهان وەڵامی نەدایەوە. هەر بیری لە کێڵگەکەی دەوروبەری پاریس دەکردەوە. هەوڵیدەدا خاکی ئەوێ و ئەو خانووبەرەی دواتر چاکی دەکا و ژیانی خۆی و هیلدە و منداڵەکەی بهێنێتە بەرچاو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەکرێ منداڵی دیکەشمان ببێ. بۆ وێنە کچێک. جا نێوی دەنێم ئاریستیزیا. بەنێو دایکمی دەکەم. "یوهان بە دەم خەونی داهاتووەوە بزەی دەهاتێ، بەڵام سەرلەنوێ رووی گرژ بووەوە و گوتی: "نا من ناتوانم رابکەم."

## (٩٠)

هیلدە لەسەر ئەو راوەستابوو. خۆی پۆشتە کردبوو پێکەوە بچنە دەرێ. چوونە سینەما، بەڵام یوهان ئێستاشی لەگەڵدابێ نەیزانی فیلمەکە چی بوو. هەواڵی هەفتەی رابردوو، چەند دیمەنێک لە دوای بەربەرەکانێ لە گۆڕەپانی شەڕدا، دەبابەی تێکشکاو، خانووی وێران و چەندەکی کوژراوان سەرنجی راکێشا. لەسەر نەخشەیەک باروودۆخی شەڕیان نیشاندەدا. ئەڵقەی گەمارۆی دەوری ئەڵمانیا تا دەهات تەنگتر دەبووەوە. دوای بینینی ئەو دیمەنانە یوهان کز و خەمبار ملی بە لارەوە نا. هیلدە هەستی بەو حاڵەی یوهان کرد: "هیچ کوێت دێشێ؟" بەڵام یوهان تاقەتی نەبوو وەڵام بداتەوە. کاتێ چوونە ناو پێخەف چاوێکی لە منداڵە ساواکەیان کرد. ئەو شەوە خەوی لێنەکەوت. "هیلدە ئەگەر ئەڵمانیا لە شەڕدا بشکێ ئێمە چ بکەین؟"

"ئەڵمانیا شکست ناخوا."م یوهان دیمەنی ئەو شەرانەی لە سینەما دیتبوونی بیر کەوتەوە. پاشان بیری لە نەخشەی جەنگ و منداڵەکەی کە لە لانکدا خەوتبوو و لە ژۆزێف کردەوە:

"هیلدە، من دەزانم ئەڵمانیا لە شەڕدا دەشکێ. ئەودەم ئێمە چیمان بەسەر دێ؟ دڵنیام من دەگیرێم." "ئێمە یان سەردەکەوین یان هەموومان دەکوژرێین. هیچ ئەڵمانییەکە ناتوانێ لە ئەڵمانێکی داگیر کراودا بژی؟"

"ئێمە تا دەکوژرێین شەڕ دەکەین. کاتێ هەموو شت لە دەست دەدەین ئەوانەی نەشکوژرابن دەبێ خۆیان بکوژن؟"

"ژنەکانیش هەروەتر. ئەگەر ئێمە لە شەڕدا شکست بخۆین. من خێرا بۆخۆم منداڵەکەم دەکوژم. نابێ بۆ یەک کاتژمێریش خۆمان بە تێشکاوی ببینم، بەڵام ئەڵمانیا سەردەکەوێ. ئەڵمانیا نابێ تێبشکێ. باشە تۆ خۆت بۆ ساتێکیش بێ دەتوانی بیر لە شکست بکەیەوە؟ ئێستا شەو باش."م هیلدە لێفەکەی بەسەر خۆی کێشا. یوهان بیری لە هیلدە و فریتز دەکردەوە. وای دەهاتە بەرچاو لە سەرەمەرگدا بن. لە خەویشدا هاوپەیمانەکانی دیتن هێرشیان کردبووە شارەکە و تانگەکانیان گەیشتوونە بەر ماڵان. ئەودەم هیلدە هەستایە سەر پێ و بە تفەنگ

منداڵەکەی کوشت. ئینجا گوللەیەکیشی لە خۆی دا. یوهان شەلاڵی ئارەقە، لە خەو راپەڕی. تیشکی رۆژ لە پەنجەرە هاتبووە ژووریّ. هیلدە لە خەودا بوو. یوهان بە ئەسپایی لە جێگاکەی هاتە دەریّ تا وە خەبەر نەییّ. خۆی لەبەر کردەوە و چووە سەر کارەکەی، بەڵام بە پێچەوانەی قسەی دوێنیّ داوای گۆڕینی شوێنی کارەکەی نەکرد. فەرەنسییەکان کە چاویان پێکەوت هیچیان نەگوت، بەڵام چاویان کەوتنە بزە بز.

کاتیّ گەیشتنە ژێر پردەکە ژۆزێف بە پێی عادەتی خۆی سەرەتا گوتی: "سلاڤە سکلاڤە" و پاشان "شەویّ دی چۆن خەوتی؟" یوهان خەونی شەویّ دیی هاتەوە بیر، دیمەنی کوژرانی کوڕ و ژنەکەی.

"ژۆزێف سوێند دەخۆی ئەگەر ئەڵمانیا بشکیّ ژن و منداڵەکەم بێنییە فەرەنسا؟" "هەر کە هاوپەیمانان ئەڵمانیایان گرت، دەستبەجیّ دەیانهێنمە پاریس. سوێندت بۆ دەخۆم."

یوهان تفەنگەکەی دانا و چۆنیەتی گفتوگۆی خۆی و هیلدەی بۆ فەرەنسییەکان گێڕایەوە.

"ئەدی ئەگەر ئێوە درەنگ گەیشتنیّ و ئەو خۆی و منداڵەکەی کوشت؟" فەرەنسییەکان گفتیان دایێ لەگەڵ یەکەم دەستەی سەربازانی هەوپەیمانان بگەڕێنەوە ئەڵمانیا. چاوە تەڕەکانی یوهان سوپاسگوزارانە دەدرەوشانەوە.

"ئەگەر ئەو بەڵێنەم پیّبدەن لەگەڵتان دێم. کەی دەبیّ بڕۆین؟"

"سبەی بەیانی، ئێمە وەکو رۆژان دێینە سەر کار، بەڵام ئیدی ناگەڕێینەوە ئۆردووگا. فەرەنسا ئەو چاکەیەی تۆی لە چاودا دەمێنیّ."

"من بۆ فەرەنسا ئەو کارە ناکەم. من هیلدە دەناسم. ئەگەر لە کاتی خۆیدا نەیگەمیّ خۆی و منداڵەکەی دەکوژیّ. ئەو لەسەر قەولی خۆی سوورە و دڵی وەک بەرد وایە."

"بەهەر حاڵ تۆ خزمەتێکی فەرەنساش دەکەی." "تۆ بۆ پێت وایە من لە پێناوی فەرەنسادا رادەکەم؟" تۆ زۆرت کتێب خوێندوونەوە و دەبیّ تێبگەی من دەڵێم چی. من نازانم فەرەنسا چییە. تەنیا ئەوە دەزانم ژنێک و منداڵێکم هەن گیانیان لە مەترسیدایە. لە پێناوی ئەواندا لەگەڵ ئێوە رادەکەم.

## (٩١)

نامەیەکی ترایان کورزگا بۆ باوکی:

"باوکە، من ئەو نامەیەت بە پۆستی سیاسیدا بۆ دەنێرم و تکا دەکەم دەستبەجێ وەڵامم بدەوە. من نیگەرانی ئەوەم شتێکت بەسەر هاتبێ. لەوانەیە بەو ترسەی من پێبکەنی. ئەگەر حەز دەکەی ناوی بنێ هیستریا، بەڵام تکام وایە تا زووە وەڵامم بدەوە. دەمەوێ دڵنیا بم تۆ ماوی. رۆمانەکەم چووەتە پێشێ. ئێستا گەیشتوومە بەشی چوارەم. ئێستا سێ کاتژمێر بەسەر مردنی کەرویشکەکاندا تێپەریوە.

کۆیلەی ئامێر، هەرچی بێتە سەر رێگایان لەناوی دەبەن و چراکان یەک بە دوای یەکدا دەکوژێننەوە. مرۆڤ لە نێو شەوەزەنگ و تاریکانێک کە هاوسێی مەرگە وێڵ و ئاوارەن.

تۆ و دایکە لە هەمێز دەگرین

نوورا و ترایان

راگوسا - دالمانتین - ٢٩ی گەلاوێژی ١٩٤٤

# کتێبی چوارەم

## (٩٢)

قەشە کۆرۆگا دەستبەجێ وەڵامی نامەی ترایانی دایەوە. پێی راگەیاند کە خۆی و هاوسەرەکەی لەوپەڕی ساخڵەمیدان و رەوشی فانتانا هەر وەک خۆیەتی، بەڵام یوهان مۆریتس هێشتا نەگەڕاوەتەوە و کەس بە سۆراخی نازانێ. کاتێ قەشە خەریکی خوێندنەوەی دوا دێڕەکانی ئەو نامەیە بوو کە دەیوست بۆ ترایانی بنێرێ (گیۆرگ دامیان)ی داواکار کە بۆ پشوودانی دوو رۆژە هاتبووە فانتانا، وە ژوور کەوت. زۆربەی هەفتان دەهاتە فانتانا. هەر دووکیان پێکەوە بۆ ناردنی نامەکە چوونە پۆستخانە. قەشە لە کاتێکدا نامەکەی دەدایە دەست داواکار گوتی: "ترایان زۆر نیگەرانی ئێمەیە." دامیان بە پەلە بە نامەکەدا هاتەوە. بێ ئەوەی بزەی سەرلێوی بشارێتەوە گوتی: "ترایان شاعیرە و زێدەڕۆیی دەکا. لەوانەشە کاری زۆر، ماندووی کردبێ."

بەرامبەر شارەوانی کە لە تەنیشت پۆستخانە بوو ئاپۆرەیەک لێک خڕ ببووەوە. فەیتوونی پۆست هێشتا وەڕێ نەکەوتبوو. قەشە ویستی نامەکەیان بداتێ، بەڵام سەرۆکی پۆستخانە نامەکەی لێ وەرنەگرت: "مامۆستا چیتر نامە بۆ دەرەوە بەڕێ ناکەین. ئەمڕۆ کاتژمێر شەشی بەیانی، رۆمانیا داگیر کراوە. واتە رووسەکان داگیریان کردووە. پادشا لە سەر رادیۆ قسەی کرد..."

قەشە نامەکەی خستەوە گیرفانی. ترایان ئیدی وەڵامی نامەکەی پێنەدەگەیی. هەر ئەو شەوە گوندییەکان لە کڵێسا کۆبوونەوە. هاتبوون بزانن دەبێ چی بکەن. رووسەکان زۆریان نەمابوو بگەنە فانتانا. خەڵکی شارەکان هرووژمیان دەهێنا گوندان. هەواڵی ناخۆش بڵاو دەبوونەوە. دەیانگوت رووسەکان ژنان ئەتک دەکەن ئینجا لە داریان دەدەن و پیاوان بە رەشاش دابێژ دابێژ دەکەن. قەشە پێی نایە بێڵایە. گوندییەکان خەمبار و پەشۆکاو بوون.

"ئێستا خەڵکانێکی تر بەسەر ئەم وڵاتەدا حوکم دەکەن. ئەمانە لە حاکمانی پێشوو خراپترن، چونکە بێگانەن، بەڵام مەسیحیی راستەقینە دەزانی کە حکوومەتی سەر ئەرز قابیلی هەڵوەشانەوەیە و پاشایەتی راستەقینە وا لە ئاسمانان. "پاڵەیەکی لاو پرسی: "چۆنە ئێمە بچینە دارستان و لەوێوە بەرەنگاری داگیرکەران ببینەوە؟ رای جەنابت چییە مامۆستا؟" "کڵێسە، مەسیحییان بۆ شەڕ لە پێناوی بەدەستهێنانی ئامانجی دنیایی هان نادا." "واتە کڵێسە پێمان دەڵێ دەستتان بەردەینەوە تا ئەوان بێن لە کۆت و زنجیرمان خەن؟" باشە کڵیسە دەیەوێ ئێمە دەست لە سەر دەست دابنێن و بە بەر چاومانەوە ژنانمان ئەتک بکرێن و کڵێسەکانمان ئاگر بدرێن؟ نا... کڵێسە ناشێ چاوەڕوان بێ ئاوا بین، ئەگەر وا بێ ئێمە ناتوانین پەیڕەوی کڵێسە بین. "دەنگی ئافەرین بەرز بووەوە. قەشە لە جێگای خۆی نەبزووت.

"پەروەردگار فێری کردووین ملکەچی دەسەڵاتی سەروو بین. هەڵبەت ئێوە دەڵێن ئەم حکوومەتە تازەیە زۆردار و کافر و بێگانەیە، منیش دەزانم، بەڵام دایکی مەسیحیش لە ژێر زەبروزەنگی زۆردار و کافر و بێگانانندا بوو. کەمێک بیر لە چارەنووسی ئەو منداڵانە بکەنەوە کە لە فەلەستین بە فەرمانی هیرۆدۆس کوژران.

زۆردارێکی گەورە بوو. رەنگە بە قەد زوڵم و زۆری کۆمونیستان، بەڵام مەسیح بە گژیاندا نەچووەوە. ئەو تەنیا گوتی: "هەقی قەیسەر بدەنە قەیسەر و هەقی خواش بدەنە خوا." پاڵە لاوەکەی پرسیاری کردبوو دیسان هەڵیدایێ: "مامۆستا تۆ لە کڵێسە بۆ ستالین دەپاڕێیەوە؟ ئەگەر وا بێ بۆ دژە مەسیحییەک پاڕاییەوە و ئێمە چیدی نایەینە کڵێسای وا." "ئەگەر حکوومەت پێم بڵێ بۆ ستالین دوعا بکە، ئەمرەکەی بە جێ دەگەیێنم. من دەزانم ستالین خوا نەناس و کافرە، بەڵام خۆ کافرەکانیش هەر مرۆڤن. ئەوان لەبەر ئەوەی لە رێگەی مەسیح لایانداوە، تووشی گوناه بوون. قەشە دەبێ بۆ هەموو عەبدێکی خوا بپاڕێتەوە، بە تایبەتی بۆ تاوانبار و خەتاکاران."

لاوەکە کە ناوی ئاپوستێل ڤاسیلە بوو بە رق و توورەییەوە گوتی: "زۆر باشە، تۆ بۆ ستالین وەپاڕێ. ئێمەش تازە نایەینەوە کڵێسا. هەر بە راست، ئەگەر ئێمە بۆ بەگژدا چوونەوەی بەلشەڤیکان بچینە لێڕەوار، داخوا مامۆستا

رۆژی یەکشەممە بۆ ئێمەش دەپارێتەوە؟" "قەشە بۆ هەمووان، بۆ گشت ئەوانەی لە شاخ و دارستانان خەریکی شەڕن، نەک هەر یەکشەممان بەڵکو رۆژانی دیکەش، دەپارێتەوە. ئەوانەی شەڕ دەکەن هەمیشە گیانیان لە مەترسیدایە و پێویستیان بە نزای قەشە و چاوی خێری دایکی ئاسمانییە." بۆ ساتێ بێدەنگی زاڵبوو. پاشان ئاپۆستێل ڤاسیلە گوتی: "بەڵام ئەگەر یەک جاریش دوعا بۆ ئێمە بکەی گوللەبارانت دەکەن." "ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی نزاتان بۆ نەکەم. مەرگ ناتوانێ مەسیحییەک بترسێنێ." "ئێمە دەچینە دارستان. تکا دەکەم پێش رۆیشتنمان رێورەسمی عیشای رەببانیمان بۆ پێکبهێنن. ئێمە لە پێناو کڵێسە و خاچی پیرۆزدا دەچینە شەڕ."

"ئێوە ئەگەر بڵێن لە پێناوی کڵێسە و ئاییندا دەست بۆ شیر دەبەین گوناهێکی گەورەتان دەکاتێ و نەچن باشترە. کڵێسە و ئایین بە زەبری چەک ناپارێزرێ."

"ئێمە لە پێناوی رۆمانیا، واتە وڵاتێکی مەسیحیدا دەچینە شەڕ." پاشان ئاپۆستێل خەڵکەکەی بەسەر چەند دەستەدا دابەش کرد. ژن و تەنانەت منداڵی ساواشیان لەگەڵدا بوون. هەموویان داهاتنەوە و لەسەر چیمەنی حەوشەی کڵێسا چۆکیان دادا. قەشە لەگەڵیان دەستی بە دوعا خوێندن کرد و یەک یەک بۆیان پاڕاوە.

داواکار گوتی: "بۆ منیش بپاڕێنەوە. پاشان لە هەمبەر قەشە داهاتەوە. "منیش لەگەڵیان دەچمە دارستان و لە پێناو ئازادیی مرۆڤدا دەجەنگم."

"کڵێسە هەر کەس داوا بکا بۆی دەپارێتەوە." "تەنانەت بۆ ئەوانەی نیازی خراپیان هەیە؟ یان ئەو کارانەت پێ کاری باش و خێرن؟"

"ئەگەر عەشق و هۆگری بەرەو ئەو کارە راتاندەکێشێ، بچن. ئەگەر عەشق و هۆگری هاندەرتان بێ لە گوناه مەترسن لە بەر ئەوەی لەسەر سیراتی موستەقیمن. رێورەسمی پاڕانەوەی دامیان کۆتایی پێهات. لە ژوورێکی کڵێسەدا ژنی قەشە دەگریا.

## (٩٣)

دوو کاتژمێر بەسەر ڕۆیشتنی گوندییەکاندا ڕابردبوو. قەشە هەوڵیدەدا خۆی بە خوێندنەوەوە سەرقاڵ بکا. لەپڕ دەرگای ژوورەکەی بەبێ دەرکوتان کەوتە سەر گازی پشت و دوو گوندیی نەناس هاتنە ژوورێ. هەردووکیان شریتی سێرەنگیان بە دەستەوە و دەمانچەی حەوتخۆریان بە کەلەکەوە بوو. قەشە وەسەر خۆی نەهێنا و بە ڕووی خۆش بە خێر هاتنی کردن. بە دەنگێکی بەرز، وەها کە ژنەکەی لەودیو گوێی لێبێ گوتی: "دیارە بۆ شارەوانی لە دووم هاتوون." قەشە دەیویست هەر چۆنێک بووە نەبێتە هۆی ترس و تۆقانی ژنەکەی. یەک لە گوندییەکان بە تووڕەیی و بێئەدەبییەکی ئاشکراوە گوتی: "ئێمە ڕاسپاردەین بتبەینە دادگای گەل." قەشە چاوی لەو دەرگایە کرد کە ژنەکەی لەودیوی بوو و لەبەر خۆیەوە گوتی: "پێم وانییە گوێی لێ- بووبێ." پاشان بە ئەسپایی کتێبەکەی وەلا نا و لەگەڵیان ڕۆیشت. پێش ئەوەی بڕوا، ئاوڕێکی وە ماڵێ دا، ئاوڕی ماڵاوایی. گوندییەکان ڕاپێچیان کرد. قەشە بە دڵنیاییەکی زۆرەوە و حاڵەتی تەسلیم و ڕەزاوە لە حەسارێ وەدەرکەوت. وەک بەندییەک ڕێی نەدەکرد. وەک ئەوەی تەوێڵی لە ئاسمان بسوێ. بەم جۆرە ماڵیی بەجێهێشت و بەرەو شارەوانی کەوتە ڕێ.

## (٩٤)

سەرۆکی "دادگای گەل" مارکۆ گۆڵدنبێرگ" لە هۆڵی گەورەی شارەوانیدا لەسەر کورسیی شارەوانی دانیشتبوو. سەری وەک بەندییەک پاک تاشیبوو. ڕووسەکان چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە چاڵە خوێنییەکان ـ ئەو شوێنەی دەبوایە تۆڵەی کوشتنی لانگیلی لێ بکرێتەوە ـ ڕزگاریان کردبوو. لە لای ڕاستی مێنبەری شارەوانی ئاریستیزیای دایکی یوهان دانیشتبوو. مارکۆ ئەوی وەک

کلۆلترین و چەوساوەترین کەسی فانتانا کردبووە ئەندامی دادگا. لەلای چەپیش ئەیوون کالوگار بوو کە چەند ساڵ لەمەوبەر جەندرمەیەکی بە تەور کوشتبوو. ئەو تەور لێدانە ئەمرۆ ببووە هۆی ئەوەی وەکو دادوەر هەڵبژێردرێ. قەشە کۆرۆگا سڵاوی کرد. مارکۆ گۆڵدنبێرگ چاوی لە قەشە بڕی، بەڵام سڵاوی لێ وەرنەگرتەوە. ئاریستیزیا و کالوگار سەریان شۆڕ کردەوە و سەر مێزەکە و وایان نواند کە قەشەیان نەدیوە. پێش قەشە چەند کەسێکی دیکەیان دادگایی کردبوون و ئێستا هۆڵەکە چۆڵ ببوو. جگە لە کەسی تۆمەتبار تەنیا دادوەرەکان و چەند گوندییەک بە خۆیان و شریتی سێ ڕەنگەوە لەوێ بوون. مارکۆ نێو و تەمەن و پیشەی لە قەشە پرسی و گوتی: "قەشەیی خۆ پیشە نییە. پینەچی پێڵاو دەدوورێتەوە و بەرگدروو جل دەدوورێ. هەر کرێکارێک شتێک بەرهەم دێنێ. تۆ دەتوانی پێمان بڵێی چ بەرهەم دێنی؟" ئاریستیزیا و کالوگار چاویان لە مێزەکە هەڵنەدەگرت. چەند گوندیی نەعاملاو کە لە پشت قەشە ڕاوەستابوون پێکەنین.

"ئێ، کەواتە بێپیشەی. ئەوە تاوانە فێری هیچ پیشەیەک نەبووی. تۆ وەک کرم بە بەری ڕەنجی کرێکاران ژیاوی." دەموچاوی مارکۆ گۆڵدنبێرگ وەک نارنج زەرد هەڵگەڕابوو، لێوی تەنک و مۆر بوون. قەشە وەبیری هاتەوە کە گۆڵدنبێرگی پیریش لێوی وا بوون، بەڵام لێوی پیرەپیاوەکە بزەی لەسەر بوو کەچی هی مارکۆ لە سەریەک قوفڵ درابوون.

مارکۆ پرسیارێکی دیکەی لێکرد: "دەزانی بۆچی بانگ کراویەتە دادگای گەل؟

قەشە وەڵامی دایەوە: "نەخێر."

"وەڵامی تایبەتی چینی کۆنەپەرست. هەمیشە بانگەشەی ئەوە دەکا نازانێ بۆچی دادگایی دەکرێ. تۆ دانی پێدا دەنێی کە دەستە و تاقمی فاشیستت ساز کردوون کە هەر ئێستا لە دارستاندا بڵاو بوونەتەوە." "من هیچ دەستەیەکم پێکنەهێناوە، هەڵبەت ئەوەم قەبووڵە کە لە کڵێسە بۆ تاقمێک گوندیی لاو پاڕامەتەوە. چونکە ئەوان داوایان لێکردم لە پێناوی مەسیحدا بۆیان بپاڕێمەوە." "ئاخۆ نەتدەزانی ئەوانە تاقمی فاشیستن؟ بۆچی بۆیان پاڕایەوە؟"

"من هەر ئەوەندە دەزانم ئەو گوندییانەی بۆیان پارامەوە لە نائومێدی و بێ هیواییەکی قووڵدا بوون. ئەوان پێویستیان بە یارمەتی و پشتیوانیی دایکی پیرۆز هەبوو. منیش لە خوا پارامەوە یارمەتییان بدا و رێگایان بە نووری هەق و دادپەروەری رووناک بکاتەوە."

مارکۆ گوتی: "دادگای گەل بە تاوانی پێکهێنان و بەڕێوە بردنی راپەڕینێکی چەکدارانە بە دژی ئاسایشی گشتی، حوکمی ئیعدامت بۆ دەبڕێتەوە."

ئاریستیزیا و کالوگار پەشێو و داماو سەریان هەڵبڕی و سەیری مارکۆیان کرد. پاشان تەماشای قەشەیان کرد. کۆرۆگای پیر بە میهرەبانییەوە بە روویاندا پێکەنی.

مارکۆ گوتی: "رێورەسمی ئیعدام سبەی پێش تاوهەڵاتن لە بەرچاوی کۆمەڵانی خەڵک بەڕێوە دەچێ. بەم جۆرە کۆتایی کاری دادگای شۆڕش رادەگەیێنم.

## (٩٥)

دوو گوندی بە شریتی سێ رەنگ دەستی قەشەیان شەتەک دا و بردیانە تەویلەی شارەوانی. لەوێ (گیورگ دامیان)یش کە پێش ئەوەی بگاتە دارستان گیرابوو، سەرۆکی پازگای فانتانا، ئاپوستێل ڤاسیلە و هەشت کەس لە وردە بۆرژوای گوندەکەی لێبوون. هەموویان حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچووبوو. بڕیار وابوو رێورەسمی ئیعدامەکە لەگەڵ سپێیدەدا بەڕێوە ببرێ، بەڵام نیوەشەوێ یەک یەک هێنایاننە دەرێ و لەسەر چاڵی ریخ بە گوللە کوشتیانن. مارکۆ گۆڵدنبێرگ فەرمانێکی پێگەیشتبوو کە بە پێی ئەو فەرمانە دەبوایە خۆیان لە کاتی ئیعدامدا لە هەر جورە رێورەسم و تەشریفاتێک خۆ بپارێزن تا کۆمەڵانی خەڵک لە دژی لەشکری سوور نەهاروژێن. بەم جۆرە بە دەست خۆی گوللەی لە تەپڵی سەری گیراوەکان دا و ئیعدامی کردن.

## (٩٦)

نیوەشەو لایدابوو کە ئاریستیزیا گوێی لە دەنگی دەرگا بوو. سۆزانای بووکی بوو. بە دەنگی شین و شەپۆڕی وی ئاریستیزیا پێی وا بوو رووسەکان گەیشتوونە فانتانا و بووکەکەیان ئەتک کردووە. بە تووڕەیی لە جێگاکەی هاتە دەر. دەیزانی شەمەندەفەری سەربازان بەرەو فانتانا بەڕێوەن و دەشیزانی رووسەکان هەر ژنێکی بیگەنێ ئەتکی دەکەن، بەڵام نەیدەهێشت دەستدرێژی بکەنە سەر بووکەکەی، ئەو حاکمی گەل بوو. دەرگەی کردەوە و گوتی: "چیت لێ قەوماوە؟"

"مامۆستا کۆرۆگایان کوشتووە." "نابێ. مارکۆ دەیەوێ سبەی لەبەر دەرگای کڵێسە لە داری بدا، بەڵام نایەلم. خۆ هەر ئەو حاکم نییە. منیش حاکمم. سبەی جارێکی دی دادگا پێکدەهێنمەوە و مامۆستا بەر دەدەین. من لەو بارەوە رای کالوگاریشم وەرگرتووە."

"مامۆستا مردووە. چەند کەس بە چاوی خۆیان دیویانە کوژراوە." ئاریستیزیا بڕوای نەدەکرد، بەڵام نەچووەوە ژووری. بە توێی کراسی خەو لەگەڵ سۆزانا بەرەو شارەوانی وەرێ کەوتن. مانگەشەو بوو. بێ ئەوەی قسەیەک بکەن بە پەلە رێگاکەیان دەبڕی. سۆزانا هێشتا لە سەرەخۆ دەگریا و جاروبارە بە داوێنی کراسەکەی فرمێسکی دەسڕینەوە. ئاریستیزیا تووڕە بووبوو. مشە مشی وێکەوتبوو. چەند جار ئاوڕی دایەوە و بە بووکەکەی گوت: "خەوت دێ؟ نازانم چت لە دەماراندا دەگەڕێ. تیژاوی پەنیر یان خوێن؟" سۆزانا دە لاقانی وەرێنا. پێی وا بوو ئەو پەلە پەلەی ناوێ. قەشە مردبوو و پێویستی بە یارمەتیدانی کەس نەبوو. لە هۆڵی شارەوانیدا چرا دەسووتا، بەڵام کەس دیار نەبوو.

"با بچینە تەویلە بزانین چی بووە. من بۆم هەیە بپرسم بزانم چی بووە." دەرگای تەویلە پێوەدرابوو، بەڵام کڵۆم نەدرابوو. تەویلە تاریکوتنووک بوو. ئاریستیزیا ترسی لێ نیشت: "شەمچەت پێیە؟" "نا، دایە."

ئاریستیزیا دەرهەڵبوو: "تۆ قەت هیچت پێ نییە. کە مێردیشت کرد هیچت پێنەبوو. تەنیا کوڕی من بۆت شێت ببوو، دەنا کچێکی وەک تۆ کراسیشت بە تەواوی لەبەردا."

سۆزانا دڵمەند نەبوو. دەیزانی تووڕەیی ئاریستیزیا هی شتێکی دیکەیە. ئاریستیزیا سەری بە تەویلەدا کرد و هاواری کرد: "کەس لێرە نییە؟" "دایە ئێرە کەسی لێ نەماوە. مارکو هەمووی هێناونەتە دەرێ و لەسەر چاڵە ڕێخەکە کوشتوونی." "تۆ خەون دەبینی. ئەو ناتوانێ بە بێ ئێمەی دادوەر، ئیعدامیان بکا." سۆزانا بێدەنگ بوو. هەردووکیان چوونەوە حەوشە."

ئاریستیزیا گوتی:" حەوشەش کەسی لێ نییە. من خۆ گوتم تۆ خەونت دیوە، لەوانەیە بردبیاننە شوێنێکی تر و کۆنەپەرستان دەنگۆیان بڵاو کردۆتەوە کە مارکۆ هەمووی کوشتوون."

سۆزانا بە وردی، هەموو لایەکی حەوشەکەی سەنگوسووژن دا. دەیزانی قەشە کوژراوە. ئەو گوندییانەی لە سێدارەدانەکەیان بە چاوی خۆیان دیتبوو لە هەموو جێگایەک باسیان کردبوو کە مارکۆ دەستی گیراوەکانی لە پشتەوەرا دەبەست و سەر و گوللەیەکی لە لاجانگی دەدان. ئاریستیزیا گوتی: "با بچینە کن گۆڵدنبێرگ."

لەو کاتەدا سۆزانا زریکاندی و لەخو چوو. ئاریستیزیا غاری داێ: "بۆ وا دەکەی شێت و شوور؟ لە سێبەری خۆت ترسای؟" بەڵام دوا وشە لە دەمیدا ڕەق هەڵات. لە نزیک چاڵە ڕێخەکە تەرمی چەند کەس کەوتبووە سەر گژوگیا. ئاریستیزیا هێندێکی ناسینەوە، بۆ ئەوەی غیرەت وەبەر خۆی بنێ خاچێکی کێشایەوە. پاشان لە سۆزانا ڕاخوڕێ: "هەستە، پێویستم پێتە." ئاریستیزیا لە مردووان نەدەترسا، بەڵام پێشی خۆش نەبوو لەگەڵیان بەتەنێ بێ. سۆزانا لە کاتێکدا وەک مێژۆک دەلەرزی هەستایەوە و دەستی ئاریستیزیای گرت. هەر دووکیان بەسەر مەیتەکاندا دەنوشتانەوە تا بزانن کێن. نۆ تەرم لە دەوری چاڵەکە کەوتبوون و سێش کەوتبوونە ناو چاڵەکەوە. ئاریستیزیا لە پەنا یەکێک لە تەرمەکان بە خەفەتەوە چۆکی دادا:

"ئەمە (نیکۆلای گیبوتاری)یە." ئینجا گوێی بە سینگییەوە نا: "مردووە." ئاریستیزیا چووە سەر تەرمێکی دیکە و هەمان کاری دووپات کردەوە. "هێشتا لەشی گەرمە، بەڵام دڵی راوەستاوە. ئەمە (کۆنستانتین سۆلۆموون)ە خوای لێ خۆش بێ. کاتێ گەنج بووم داخوازم بوو. پاشان بۆ ئەوەی خەم و ناڕەحەتیی خۆی بشارێتەوە بە سەر سۆزانایدا گوڕاند: "بروانە بزانە کەس ماوە؟ بۆ وەک شێت و وێتان لەوێ هەڵوەستاوی؟

"دایە ناتوانم، دەترسم."

"لەچی دەترسی" گوێیان بە سینگەوە بێ بزانە هیچ دەنگێکت گوێ لێدەبێ یان نا. ئەگەر هیچ دەنگێک نەهات دوعای بۆ بکە و خاچێک بکێشەوە، بەڵام ئەگەر دڵی لێیدا دەبێ کارێکی بۆ بکەین، تێگەیشتی؟" "بەڵێ تێگەیشتم، بەڵام من دەترسم." ئاریستیزیا قیژاندی: "شێت و وێت، نازانم ئەو کوڕەی من چۆن تۆی هێنا؟" ئاریستیزیا بە سەر تەرمێکی دیکەدا نوشتایەوە. ئەوە دەبێ ئەو کابرا گەنجە بێ کە هەموو حەوتووان دەهات سەردانی مامۆستا کۆرۆگای دەکرد. هاوڕێی ترایان بوو. پیاوی چاک بوو. "پاشان سەڵتەی گیۆرگ دامیانی کردەوە و گوێی بە سینگییەوە نا: "خوای لێ خۆش بێ. ئەویش مردووە. بەستەزمانە لەوانەیە ژن و منداڵەکەی ئێستا چاوەڕێی بن."

ئاریستیزیا لە بیری نەمابوو سۆزانا لەوێیە، ئێستا گەیشتبووە سەر تەرمی قەشە. خۆی بەسەردا نوشتاندەوە و جبەی قەشەی لادا. بە وردی گوێی هەڵخست و گوتی: "قەشە نەمردووە." سوزانا لە قوڵپی گریانی دا.

"کچێ ئەوە تۆ هێڕ بووی؟ لەباتی خۆشحاڵ بی، دەلووریێنی؟ وەرە بزانە دڵی چۆن لێدەدا."

سۆزانا لە پەنا قەشە چۆکی دادا، بەڵام گوێی بە سینگییەوە نەنا، ئاریستیزیا دەستی قەشەی لە ناو دەستی خۆی گرتن و گوتی: "کچێ، لەشی هەروا گەرمە. "بە هەموو وجوودەوە بە دوای شوێنەواری ژیان لە لەشی قەشەدا دەگەڕا، بەڵام بێجگە لە تینی لەش هیچ شوێنەواری دیکەی زیندووبوونی مرۆڤی تێدا نەبوو. "ژیان ئەوەیە. چەند ترپەی بچووکی دڵ

و برێک گەرما بۆ ئەوەی لەش بخاتە گەڕ. ئەگەر ژیان هەر بەو شتانە بێ شتێکی زۆر نییە." بێدەنگی دەوروبەری داگرتبوو.

"بۆنی چەند خۆشە. لەشی مامۆستا بۆنی کڵێسەی لێوە دێ."

قەشە نەبێ هەموویان مردبوون. هێندێکیان هێشتا لەشیان سارد نەببۆوە. وێدەچوو دوای رم کردن یەکسەر نەمردبن و زۆریان ئازار چەشتبێ. تەرمی هەندێکیشیان سارد ببووەوە ئەمانە لەگەڵ گوللە پێکەوتن رۆحیان دەرچووبوو. ئاریستیزیا دەستی بە داوێنی کراسەکەی سڕیەوە. ئەوە پێنجەم یان شەشەمین جار بوو ئەو کارەی دەکرد. ئەژنۆکانیشی تەڕ بوون: "حەتمەن بە خوێن بوونە. لەوانەیە لە تاریکیدا پێم لە مەیتەکان نابێ. پێشێل کردنی خوێنی کوژراوان تاوانێکی گەورەیە، بەڵام خوا لێمان دەبووری، خەتای ئەو تاریکییە بوو." ئاریستیزیا چووە نێو چاڵەکەوە تا چاو لە تەرمەکانی دیکەش بکا. لەو کاتەدا سۆزانا نێوچاوانی قەشەی دەشێلا. ئاریستیزیا لێی پرسی: "کوێی بریندار بووە؟ لە چاڵەکە هاتبووە دەری و دەستی بە داوێنەکەی دەسڕیەوە.

"نازانم دایە."

"تۆ قەت هیچ نازانی. دەبێ زوو برینەکانی بپێچین." دواجار ئەو جێگایەیان دۆزییەوە کە دەوروبەرەکەی خوێنی پێوە رەق هەڵاتبوو. قەشە پشتی بریندار بووبوو. حاستی شانی راستەی.

"زووبە پارچە پەڕۆیەکم بدەیە با برینەکەی بپێچم."

سۆزانا لەبەر خۆیەوە گوتی: "پەڕۆم لە کوێ بوو؟

ئاریستیزیا چیدی خۆی پێ رانەگیرا. دامێنی هەڵدایەوە تا تیتۆڵێک لە بن کراسەکەی دادڕێ، بەڵام هەرچی گەڕا بن کراسەکەی نەدۆزیەوە: "شەیتان بە نەعلەت بێ، ئەو بە زیاد نەبووە کوا؟"

ئینجا وەبیری هاتەوە لە پەلە پەلییان بنکراسی لەبەر نەکردووەتەوە. قەشەی لە باوەش گرت و شانی کە جێی برینەکەی بوو، رووت کردەوە.

"سۆزانا کوا کراسەکەت؟" بە دەست خوێنی دەسڕیەوە:

"بۆنی چەند خۆشە دەڵێی لە کڵێسەی."

ئاریستیزیا رووی لە سۆزانا کرد کە کراسەکەی داکەندبوو و رووت-وقووت لەوێ راوەستابوو. "کچێ تۆ شێت بووی؟ رمووزنی حەیا تکاو، بە رووتی لەوێ راوەستاوی، شەرم لە قەشە و لەو مردووانە ناکەی؟"

"باشە بێ رووت بوونەوە چۆنم کراسەکەم داکەندبا؟"

ئاریستیزیا گوێی نەدایە قسەکەی: "بابان وێران، لەشی رووتت چۆن پیشانی قەشە و مردووان دەدەی؟"

## (٩٧)

ئاریستیزیا و سۆزانا لە لای کێڵگەی گەنمەشامی راوەستان و قەشەیان دانا. قەشەیان لە عەباکەی نابوو و لە تەویلەوە هێنابوویان. هەر کام سەرێکی عەباکەیان گرت و وەک برانکار دەستیان داین، بەڵام قەشە زۆر قورس بوو. ئازای لەشیان شەلاڵی ئارەقە بووبوو. هەموو جارێ کە دایاندەنا ئاریستیزیا خۆی دەنوشتاندەوە و گوێی هەڵدەخست بزانێ دڵی لێدەدا یان نا.

"خوا بکا خۆی رابگرێ. زوو کە دەی، سبەی و دووسبەی و رۆژانی دی دەتوانین پشوو بدەین."

ئاریستیزیا نەیدەوێرا قەشە بباتەوە ماڵی خۆی. کۆمۆنیستەکان هەر زوو دەیانگرت. "ئەمجارە ئەگەر لە مردن قوتار بووبێ جاری دووهەم بێشک دەکوژرێ. وا باشە بیبەینە دارستان، لای کورەکان. ئەوان تیماری دەکەن. لەوێ کۆمۆنیستەکان دەستیان وێی راناگا. ئەرێ بەراست، برینپێچیش لەگەڵ خەڵکەکە چووەتە دارستان. بریا دیتبامانەوە. سندووقێکی دەرمان و کەرستەی برینپێچی پێن."

هەتا لە دارستان نزیکتر دەبوونەوە هیوایان کەمتر دەبوو.

"ئەگەر نەتوانین بیانگەینێ، دەبێ مامۆستا لە کۆمۆنیستان بشارینەوە. ئەوە باشترین کارە. دەبێ بزانین چمان بەسەر دێ. تۆ هەر لە دارستان لە لای دەمێنییەوە و من دەچمەوە گوند. کە رۆژ بووەوە نان و ئاو و ئەگەر دەستم بکەوێ پیرێژنێکیش کە سەری لە برین و شتی وا دەربچێ، لەگەڵ خۆم دێنم و دێمەوە.

سۆزانا ئەسرینی بە چاواندا هاتە خوارێ. نەیدەوێرا شەوێ بەتەنێ لەو چۆلەوارە بمێنێتەوە. جادەرێیەک بە قەراغ دارستانەکەدا دەهات. پێش ئەوەی لە جادەکە بپەڕنەوە و بڕۆنە ناو دارستان، ئاریستیزیا گوێی هەڵخست نەکا جادەکە کەسی پێدا بێ. کاروانێکی کامیۆنان بە چرای کوژاوەوە بە رێگاوە بوو. دەنگی کپی مەکینەی ئۆتۆمبێلەکان وەک هۆڕە هۆڕی گاڕان، دەبیسترا. کاروانە ئۆتۆمبێلەکە بە هەورازێکدا وەسەر کەوت. ژنەکان بارەکەی خۆیان لە سەر گیاوگۆڵ دانا و خۆیان لە پەسیوێک مەلاس دا.

"ڕووسن، با راوەستین تا هەموویان تێدەپەڕن."

ئۆتۆمبێلەکان گەیشتنێ و راست بەرامبەر ئەو جێگایەی ژنەکانی لێبوون راوەستان. دەنگی مەکینان خاموش بوو. تەنیا دەنگی سیسرکان دەهات. چەند سەرباز لە ئۆتۆمبێلان دابەزین. دەنگیان، پچڕ پچڕ دەگەیشتە بەر گوێی ژنەکان. سۆزانا بە گوێی ئاریستیزیایدا چرپاند:

"ئەڵمانن."

ئاریستیزیا گوێی هەڵخست. پاشان بە سینگە خشکە خۆیان گەیاندە بن ئۆتۆمبێلەکان و بە دەم دڵەکوتەوە گوێیان سڵ کردن. ئاریستیزیا گوتی: "وایە ئەڵمانن. دەڵێی چی داوای دەرمان و کەتانیان لێ بکەین. خۆ لەوانەیە دکتور یان هیچ نەبێ برینپێچیان لەگەڵدا بێ." لە کێلگەی گەنمەشامی هاتنە دەرێ. ئاریستیزیا گوتی: "تۆ هیچ ئەڵمانی دەزانی؟ ئەگەر هیچ نەڵێین لەوانەیە بە دوژمنمان تێبگەن."

سۆزانا هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی: "نا، یەک وشەش ئەڵمانی نازانم." کەمێ چوونە پێشتر و ئینجا پاڵیان وێک دا و رەق راوەستان.

"تۆ جحێڵتری. مێشکت هەلگوشە بزانە چ کەلیمەی ئەڵمانیت دێنەوە بیر. سەیرە تۆ بە حەیاتت کەلیمێکی ئەڵمانیت نەبیستووە؟ خۆ باوکت ئەڵمانیی دەزانی."

"بەڵام هیچم وە بیر نییە. دەڵێی چی بە رۆمانیایی شتێک بڵێین؟"

ئاریستیزیا دەرهەڵبوو: "دەتەوێ چ بڵێی؟"

سۆزانا وەڵامی دایەوە: "ئەڵمانەکانیش مەسیحین، ئەگەر بڵێین "مەسیح" دەزانن بەلشەڤیک نین."

"دە باشە دەی، نا، وا دیارە هێندەش گەوج نی."

من بەتەنێ ناوێرم. با پێکەوە هەرا بکەین. زیاتریان پاڵ وێکدا و یەکەم جار بە دەنگی سەبر و ئینجا چەند جار یەک بە خۆ هاواریان کرد: "مەسیح، مەسیح."

دەنگێک پرسی: "کێی؟"

ژنەکان تێی نەگەیشتن و دیسان پێکەوە گوتیان: "مەسیح."

دوو سەرباز بە چەکی سوارەوە لێیان هاتنە پێش. ئاریستیزیا لە ترسان دەلەرزی. ئەو لە سۆزانا پتر دەترسا. ئەڵمانەکان نەیاندەزانی چییان دەوێ. ژنەکان قەشەیان لە سەر گیاکە دەست دایێ و لە سەر چەقی ڕێگاکە، بەرامبەر بە ئۆتۆمبێلەکان، درێژیان کرد. ئەڵمانەکان تیشکهاوێژیان هەڵکردن و دەموچاوی قەشەیان دی.

ئەفسەرێک لێی پرسین: "قەشەیە؟"

ژنەکان گوتیان: "مەسیح."

ئەفسەرەکە پرسی: "بەلشەڤیکەکان گوللەیان لێداوە؟"

ئاریستیزیا تێنەدەگەیی. پێی وابوو دڵی نەو بریندارە بەلشەڤیکە یان نا. بۆیە بە لێبڕاوییەوە جوابی داوە: "مەسیح."

کاروانی ئەڵمانەکان لە حاڵی پاشەکشەدا بوو. ئەفسەرەکە فەرمانی ڕۆیشتنی دا. بە ئاماژە ئاریستیزیای تێگەیاند کە بریندارەکە بباتە قەراغ جادە. ئاریستیزیا بە دەستی ئەفسەرەکەدا نووسا و لەبەری پاڕایەوە دکتۆرێکی بهێنێتە سەر و برینەکەی بۆ بپێچن.

کاتێ مەکینەی ئۆتۆمبێلەکان هەڵبوون ئاریستیزیا ناهومێد بوو، بەلام لێبڕا تا خەمێک لە قەشە نەخۆن لێنەگەڕێ ئەڵمانەکان بڕۆن. لەبەردەم ئەفسەرەکە خۆی بە عەرز دادا و دیسان بە دەستیدا نووسا. فەرماندەی قۆشەنەکە لە لای دواوەی ئۆتۆمبێلەکانڕا دەهات پرسی: "ئەو ژنە چی دەوێ؟"

ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: "دەیەوێ ئێمە ئەو برینداره لەگەڵ خۆمان ببەینە شار، دیارە قەشەیەکی ئۆرتۆدۆکسە."

"جا بۆ داواکەی جێبەجێ نەکەین؟ ئێمە نەتەوەیەکی پێشکەوتووین، با لە حاڵی پاشەکشەشدا بین، قەیدی نییە. بریندارەکە سواری ئامبولانسێک بکەن و زوو بکەونەوە ڕێ."

ئاریستیزیا و سۆزانا چاویان لێبوو سەربازەکان قەشەیان لە سەر برانکارێک درێژ کرد و پەتۆیەکیان پێدادا. ئامبولانسەکە کەوتە ڕێ. ئاریستیزیا دەیویست سوار بێ و لەگەڵ قەشە بچێ. سەربازەکان پێکەنین و دەرگای ئامبولانسیان داخست. ژنەکان هەر دووک لەسەر ڕێگاکە مانەوە. سۆزانا تا ماشێنەکان نەدیو بوون چاوی تێبڕین و دەستی بە گریان کرد. دەتگوت هاوار دەکا هەتا یەکێک بە هانایانەوە بێ. ئاریستیزیا گوتی: "ئەوە چیتە؟ دەتهەوێ دەنگی شین و گابۆڕت بگاتە رووسان؟"

خوا بۆخۆی لێمان خۆش بێ دایە، ئێمە نەدەبوو بیدەینە دەست ئەو ئەڵمانانە. خوا بزانێ چی بەسەر بهێنن؟"

"دەیبەنە نەخۆشخانە. لەوێ لە دارستان باشتری چاودێری دەکەن."

بەڵام دوای دەمێک بۆخۆشی دەستی بە گریان کرد: "نا، نەدەبوو، بیدەینە دەست ئەڵمانان. خوا لێمان نابوورێ. خەتای تۆ بوو، ئەڵمانەکان مامۆستا کۆرۆگایان برد."

هەر دووکیان زۆریان حەز دەکرد دوای قۆشەنەکە بکەون و قەشەیان لێ وەربگرنەوە، بەڵام ڕێگاکە چۆل و هۆڵ بوو. ئیدی گەڕانەوە ئاوایی.

## (٩٨)

بۆ سبەینێ ئاریستیزیایان گرت. لە شارەوانی بە کەندرێک کە لە ئاودا خووساندبوویان لێیان دا. ددانی پێدا نا کە قەشەی بردووە و داویەتە دەست ئەڵمانان. کاتژمێر نۆ گوللەبارانیان کرد، لە پەنا چاڵە

ریخی گۆڕین. سۆزانا بە خۆی و دوو منداڵەوە لە فانتانا هەڵاتبوو. کاتێ ئەفسەرەکان و مارکۆ گۆڵدنبێرگ رژانە ماڵی یوهان مۆریتس، بەسەر ماڵێکی بەتاڵ و حەتاڵدا کەوتن.

## (۹۹)

ژۆزێف گوتی: "ئەمڕۆ خۆشترین رۆژی ژیانمە." و خۆی هاویشتە سەر قەرەوێڵەکەی. چەند کاتژمێر لەمەوبەر بە یارمەتیی یوهان رایانکردبوو و گەیشتبوونە تخووبی ئەمریکییەکان.

یوهان و ژۆزێف پێکەوە لە هۆتێلێکی خۆش خستبوویان. هەر دووکیان خواردنی خۆشیان دەخوارد، مەشروبی مومتازیان پێدا دەکرد و باشترین جۆری جگەرەیان دەکێشا. چەندین زەرفی پڕ لە دیاریی جۆراوجۆریان دابوونێ.

یوهان چاوی لە بەستەکان بڕیبوو کە لەسەر فەرشی ژوورەکە دانرابوون. هەستیدەکرد بە عومری بابی قەت ئەوەندەی رێز لێ نەگیراوە. ئەمریکییەکان چەندین کراس و جلوبەرگ و مەکینەیێکی ردێن تاشین و کەوش و سابوون و جگەرەیان بە دیاری دابوونێ. شایی زۆری بە خۆی بوو. بۆ یەکەم جار لەوە دڵنیا بوو کە یارمەتییەکی گەورەی بە هاوپەیمانان کردووە سەرکەون: "ئەگەر بەڕاستی کارێکی گرنگم نەکردبایە ئەمریکییەکان ئەو هەموو دیارییەیان نەدەدامێ." ئەمریکییەکان تا ئەو کاتە نێویشیان لێ پرسیبوو. لەبەر خۆیەوە دەیگوت بێگومان ئاگاداری رابردووم و وردەکارییەکانی راکردنەکەمن. ئەمریکییەکان هەمیشە بە دەم بزەیەکەوە سڵاویان لێدەکرد، دەتگوت دەیانەوێ تێی بگەیەنن کە ئاگایان لەو هەموو زەحمەتی و نارەحەتییە هەیە کە ئەو چێشتوویەتی.

یوهان مۆریتس شل و شەکەت بوو، بەڵام حەزی نەدەکرد خۆی تەسلیمی خەو بکا. چاوی لە دەوروبەری خۆی دەگێڕا و بڕوای نەدەکرد بە تەنێ ئەو ژوورەیان دابێتێ. هەر چیەکی لەوێ بوو، لەسەر مێزەکە، لەسەر کورسی و

فەرشەکە، هەموو هی ئەو بوون. گشتی دیاریی ئەمریکییەکان بوو. لە بەرامبەر ئازایەتیی ئەودا کە پێنج فەڕەنسیی لە ئۆردووگای ئەڵمانەکان رزگار کردبوو.

ژۆزێف گوتی: "ڕاکردنەکەمان بەڕاستی کارێکی سەرکەوتووانە بوو."

یوهان چۆنیەتیی رووداوی راکردنەکەیانی هاتەوە بەر چاو. بەیانیی رۆژی راکردنەکە لەگەڵ پێنج فەڕەنسییەکە وەدەر کەوت، بە ناو شاردا رەت بوون. هیلدە و فریتز وەکو رۆژان لەبەر پەنجەرە بوون. وەک جاران بۆیان پێکەنی و پاشان بەرەو پردەکە کەوتنە ڕێ. یوهان دوور و نزیکی دارستان چەک بە شانەوە، بەندییەکانی پێش خۆی دابوون. لە ڕێگایە ئەوی تووشی دەبوو دەیگوت: "سەربازێک پێنج بەندییان دەباتە سەر کار."

لە دارستان خێرا جلکی مەدەنی لەبەر کرد. فەڕەنسییەکان ئەو جلکەیان بۆ پەیدا کردبوو. ژۆزێف تفەنگەکەی لە قەدی دارێک راکێشا و لەت بە لەتی کرد. پاشان فەڕەنسییەکان بەرگە سەربازییەکەیان ئاگر تێبەردا. یوهان کە دیمەنی سووتانی بەرگە سەربازییەکەی خۆی دی چی وای نەمابوو لە پرمەی گریان بدا، بەڵام نەیهێشت فرمێسکی بێ، گوتی با فەڕەنسییەکان نارەحەت نەبن. فەڕەنسییەکان بەردەوام جنێویان بە هیتلەر دەدا، بەڵام یوهان وەک گوێزی بۆ بژمێرن وا بوو.

هەفتەیەکی تەواو لە لێرەواردا ڕێگایان بڕی. رۆژێکی بە تاو و ساوی خۆش لە لێرەوار وەدەر کەوتن و لەسەر جادە خۆیان گەیاندە ئۆتۆمبێلی ئەمریکییەکان. هەر کام شریتێکی سێ رەنگیان لە بەرۆکی خۆیان دا. شریتێکیشیان دابووە یوهان. دواتر بەرەو ئۆتۆمبێلەکان گوڕیان بەست. ئەمریکییەکان جگەرەیان دانێ و بردیاننە ناوەندی فەرماندەیی. کە گەیشتنە وێ مێزی نان خواردن رازابووەوە و ژوورەکان ئامادە کرابوون. وا دیار بوو لە پێشدا هەموو شتێکیان بۆ ئامادە کردبوون. لە ساتی گەیشتنانڕا تا شەوێ ئەمریکییەکان یەک لە دوای یەک بە دیاریی جۆراوجۆرەوە سەریان لێدان. یوهان پێی وابوو خەون دەبینێ، بەڵام کاتێ چاوی لە شتەکان و ژۆزێف دەکرد دەیزانی راستە. ئەوە گشتی بە هۆی کارە گەورەکەی یوهان بوو.

ژۆزێف خەوی لێکەوتبوو. یوهان هەروا خەریکی خەیاڵپلاوی خۆی بوو. لێرەوە دەچووە فەرەنسا و خانووبەرەیەکی بۆخۆی و هیلدە و منداڵەکەیان دروستدەکرد: "کاتێ شەڕ تەواو بوو دایکم و بابیشم دێنمە فەرەنسا." یوهان بە دەم ئەو بیرانەوە خەوی لێکەوت.

## (١٠٠)

یوهان چواردە رۆژ بوو میوانی UNRRA[1] بوو. بۆ ئەمریکییەکانی گێڕایەوە کە چۆن لەگەڵ پێنج فەرەنسیدا لە ئۆردووگا رایکردووە. ئەوانیش پیرۆزباییان لێکرد و داوایان لێکرد چۆنیەتیی رووداوەکەیان بۆ بنووسێ. ئەمریکییەکان دەیانویست بەسەرهاتی راکردووەکان لە رۆژنامەکانی خۆیاندا چاپبکەن. یوهان رۆژ بە رۆژ لەوە دڵنیاتر دەبوو کە لە سەرکەوتنی هاوپەیمانەکاندا دەورێکی کاریگەر و گرینگی هەبووە. خۆی بە بەختەوەر و سەرفراز دەزانی کە کارێکی بە قازانجی نەتەوە هاوپەیمانەکانی لە دەست هاتووە و ئێستا دەیدی ئەوانیش بە خزمەتەکەی دەزانن. رۆژێک سەرۆکی UNRRA یوهانی گاز کردە لای خۆی. چەند جاری دیکەش گازیان کردبوو تا بەسەرهاتی راکردنەکە بگێڕێتەوە. ئەوجارەش دڵخۆش و بە دەماخ چووە ژووری نووسینگە. سەرۆک فەرمووی کرد دابنیشێ و بە روویدا پێکەنی.

یوهان سەری لەو هەموو رێزگرتنە سوڕمابوو. هەموویان بەو شێوەیە رەفتاریان دەگەڵ دەکرد و ئەو هێشتا لەگەڵ ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە رانەهاتبوو.

سەرۆک پێی گوت: "تۆ چیدیکە نابێ لەسەر UNRRA بژی. لە سبەینێوە نابێ خواردن وەربگری و ژوورەکەش دەبێ چۆڵ بکەی."

---

1 کورتکراوەی United Nations Relief and Rehabilitaton Administration رێکخراوی خێرخوازی و هەرەوەزی بوو کە لە دوا ساڵەکانی جەنگی دووهەمی جیهانیدا و بۆ دەستگرۆیی هەڵاتووان و کۆچبەر و زەرەرمەندانی شەڕ لە لایەن هاوپەیمانانەوە دامەزرا.

یوهان ڕەنگی بە ڕووانەوە نەما. لە دڵی خۆیدا گوتی: باشە من چم کردووە ئەمریکییەکان بە جارێ وا لێم زویر بوون؟ بێگومان دەبێ شتێکی خراپم کردبێ کە ئاوا لەپڕ وەدیوی دەرێم دەنێن. تا ئەو کاتە هەر دیاریی لێ وەرگرتبوون. دیاریی زۆریش. هێشتا پێنج بەستە دیاری بۆ خۆی و هیلدەی هەر دەست لێنەدابوون. ئەمریکییەکان کاتێ زانیبوویان منداڵی هەیە، بۆ ئەویش لەیستۆک و جلوبەرگیان دابۆیێ: "کەچی ئێستا هەر ئەوا دەرمدەکەن، دەبێ کەتنێکم کردبێ."

سەرۆک گوتی: "UNRRA تەنیا یارمەتیی خەڵکی سەر بە نەتەوە هاوپەیمانەکان دەدات، بەڵام تۆ دوژمنی هاوپەیمانانیت."

یوهان ئەو دیارییانەی هاتنەوە بیر کە لەبەر کارە گرنگەکەی دابوویانێ. هەموویان پێیان گوتبوو کارێکی یەکجار گەورەت بۆ هاوپەیمانان ئەنجامداوە و ئێستا هەر خۆیان دەڵێن دوژمنیانە.

سەرۆک دووپاتی کردەوە: "تۆ دوژمنی هاوپەیمانانیت."

"بەڵام من کارێکم بە دژی هاوپەیمانان نەکردووە. جەنابی سەرۆک، سوێند دەخۆم هیچ کارێکم بە دژی هاوپەیمانان ئەنجامنەداوە."

سەرۆک بە تووڕەییەوە پرسی: "تۆ ڕۆمانیایی نیت؟ ڕۆمانیاییەکان دوژمنی هاوپەیمانانن. تۆش ڕۆمانیاییت، کەواتە بە دوژمنی هاوپەیمانان دادەنرێیت. UNRRA خەڵکانی وڵاتە دوژمنکارەکان نە وەخۆی دەگرێت و نە بەخێویان دەکات. تۆ دەبێ هەر ئێستا ژوورەکە چۆڵ بکەیت." یوهان سەری بەردایەوە و لە ژوورەکە وەدەرکەوت. هیوای دەخواست بگەڕێتەوە سەربازگە. وە بیری هاتەوە کە فەرەنسییەکان تفەنگەکەیان شکاند و بەرگەکەیان لێ سووتاند. بەوپەڕی هەناسەساردییەوە لەبەر خۆیەوە گوتی: "ڕوو لە کوێ بکەم؟"

## (١٠١)

دوای بزربوونی یوهان دەستبەجێ هیلدەیان گرت. ئەو لە بنکەی پۆلیس گوتی نازانێ یوهان چووەتە کوێ. دوو رۆژ دواتر دایکیشیان گرت. لێپرسینەوەیان لەگەڵ کردن و لێیان دان. بەڵام پۆلیس هیچی چنگ نەکەوت. کاتێ ماڵەکەیان پشکنین چەند نامەیەکی سەرهەنگ موولێر- یان دەست کەوت. هیلدە گوتی: سەرهەنگ برادەری یوهانە و هەموو مانگێ دووسەد مارکمان یارمەتی دەدا و سەری ساڵیش هەندێک دیاری بۆ ناردبووین.

دیژبانی سوپا بە پەلە بە نامەیەک مەسەلەی راکردنی یوهانی لە سەرهەنگ موولێر گەیاند. دوای دوو رۆژ لە ناوەندی فەرماندەییەوە تەلەگرافێکی هەنارد:

"لە سەرهەنگ موولێرەوە بۆ پۆلیسی نهێنیی سوپا: لە چوار ساڵ لەمەوبەرەوە نەبووە کەسێکی سەر بە "تیرەی پاڵەوانان" کە یۆهانیش یەکێکە لەوان، خۆی لە خزمەتی سەربازی بدزێتەوە . کەوابوو مەسەلەکە راکردن لە سەربازی نییە . دڵنیام یا رفاندوویانە یان کوژراوە، لەم بارەوە لێکۆڵینەوە بکەن . ونبوونی یوهان مۆریتس بۆ مێژووی "تیرەی پاڵەوانان خەسارەتێکە قەرەبوو ناکرێتەوە . بە هەر شێوەیەک بێ دەبێ بیدۆزنەوە . درۆنگی لەبارەی راکردنی ئەندامێکی ئازاترین تیرەی جەرمەن بە خۆراییە . لە لێکۆڵینەوەکاندا بەکاربردنی وشەی راکردن راگرن . تا دوزینەوەی یۆهان مۆریتس ژن و منداڵەکەی لە ژێر چاودێری و لەسەر ئەرکی ئەنیستیتۆی رەچەڵەکناسیی دەژین . داوا لە پۆلیسی ناوچەکە دەکەم ژن و منداڵی مۆریتس بپارێزن . ئاگادارم بکەنەوە . هەر زانیارییەکی تازە لە بارەی یوهان مۆریتسەوە لە رێگەی فەرماندەیی سوپاوە بۆمی بنێرن.

سەرهەنگ موولێر

سەروانی دیژبان رووی لە ستوانێک کرد و گوتی: بە گوێی سەرهەنگ موولێر بگاتەوە کە ژنەکەی مۆریتسمان گرتووە، یەکسەر رەوانەی بەرەی شەڕمان دەکا، وا باشە داوا لە خودی ئەو ژنە بکەین لەبارەی گرتنەکەیەوە هیچ بۆ سەرهەنگ نەنووسێ."

ستوان گوتی: "ئەدی لیپرسینەوە؟"

"دەبێ یەکسەر واز لە لێپرسینەوەی بهێنین، بەڵام ئەوە گەوجێتییە پێمان وابێ رایڕنەکردووە. بەڕێزانی سەروو زۆر لە کەسانی خوارەوە گەمژەترن. ئەم موولیرە زانایە. زۆر وتارم لێ خوێندوونەوە. تەنانەت چەند کتێبیشم خوێندوونەوە، بەڵام هەر لە خۆیەوە قسە دەکا. باشە بۆ پێی وایە یوهان رایڕنەکردووە؟"

هیلدەیان سواری ماشین کرد و بردیانەوە ماڵێ. لە نزیک ماڵەوە سەروان پێی گوت: "تکایە هەر کاتێ کارت هەبوو بە بێ شەرم کردن پێم بڵێ. مەمنوون دەبم ئەگەر مەسەلەی گرتنەکەت بۆ سەرهەنگ نەنووسی. ئەوە هەر رۆتینێکی سادە بوو."کەواتە مێردەکەم فیرار نییە؟"

"خانمی بەڕێز، بەداخەوە من ناتوانم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە. گومان لەوەدا نییە کە مێردەکەت رایڕنەکردووە. ئەوی دی شتێ نهێنییە."

هیلدە لە خۆشییان سوور هەڵگەڕا. لەوە دڵنیا بووبوو کە مێردەکەی لە لایەن سوپاوە بە ئەرکێکی گرنگ نێردراوەتە جێگایەک، دەنا هەرگیز ترۆمبێلێکیان بۆ من تەرخان نەدەکرد." هیلدە چەندین کاتژمێر لەلای پەنجەرەکەوە دادەنیشت و بە خەیاڵ ئەو رووداوانەی بەسەر یوهان دەهاتن دەهێنانە پێش چاوی خۆی. وەکو فیلم. "دیارە متمانەی بە من نییە و بۆی گرنگ نیم، بەڵام هەوڵدەدەم شیاوی وی بم." ئینجا منداڵەکەی ماچکرد: "لە ژیانمدا قەت ئەوەندە هەستم بە بەختەوەری نەکردبوو. تەنیا ژنی کەسێکی وەک یوهان مۆریتس شانازیی هاوسەرێتیی قارەمانێکی پێدەبڕێ.

## (١٠٢)

هیلدە گوتی: "من بڕوا ناکەم لە شەڕدا شکستمان هێنابێ. خەڵکی شار هەموو رایانکردووەتە دارستان. بۆتە قاو، دەڵێن رووسەکان تەنیا دە کیلۆمەتریان ماوە بگەنە ئیرە. دراوسێکانمان هەموو هەڵاتوون، بەڵام هێشتا من

بروا ناکەم، بە دڵنیاییەوە ئەوە چاووڕاوی دوژمنە. من لێرە نابزووم. ئەڵمانیا ناشێ بشکێ."

ئەو ئەفسەرەی ئاودەنگی هیلدە بوو بە ئەمر پێکردنەوە گوتی: "ئاوم بۆ بێنە خۆم دەشۆم."

پاشان پاڵتۆ چەرمییەکەی داکەند و بە جلکاوێزی داکرد و جانتاکەی لەسەر کورسییەک دانا. کەوایەکەشی داکەند. ئێستا تەنیا بلووزێکی لەبەردا بوو. هیلدە ورد تەماشای دەکرد بزانێ چی دەکا.

"ئاوی گەرم، ردێنم دەتاشم."

ئەفسەرەکە ئینجا پشتی لە هیلدە کرد و جانتاکەی کردەوە. هیلدە وەدەر کەوت. دەرگا هەروا ئاوەڵا بوو. هیلدە لە پەنجەرەی متبەخەوە چاوی بە ماشێنی ئەفسەرەکە کەوت و چاوی لە کاتژمێر کرد. هێشتا چارەگێک نەبوو ئەفسەرەکە هاتبووە ژوور. لەبەر خۆیەوە گوتی: "بەڵام دەڵێی زۆر لەمێژە یەکتر دەناسین."

چارەگێک پێش، ئەفسەرەکە دەرگای ماڵی هیلدەی کوتابوو و هیلدەش دەرگای لێ کردبووەوە. بە هیلدەی گوتبوو دەیەوێ خۆی بشوا و بەرگی بگۆڕێ. هێند بە تێڕادیوی، وەک بڵێی ئەمر بە سەربازێکی خۆی بکا. دوایەش بێئەوەی لەسەر وەڵام رابوەستێ خۆی بە ژووردا کردبوو. بە تەنیشت هیلدەدا کە لە ناو دەرگا راوەستابوو، تێپەڕیبوو و هیلدە بۆنی چەرم و تۆز و خۆڵ و شەڕی لێکردبوو.

کابرای تازە هاتوو چەند جار چاوی لە هیلدە هەڵەنگووتبوو، بەڵام لەسەری نەگیرسابۆوە، هەر لەو کاتەدا هیلدە سەری قسەی کردبووەوە. هیلدە زۆری حەز دەکرد کاتێ ئەفسەرکە کەوایەکەی دادەکەند بینێرێتە حەمام. حەمامێکی خۆشیان هەبوو، بەڵام ئەفسەرەکە داوای کاسە ئاوێکی لێکردبوو و هیلدە پێی خۆش نەبوو دلی بشێکێنێ. هیلدە دیسان چاوی بە ماشێنەکەی بەر دەرگا کەوت. دیار بوو بە جارێ نوقمی خەیاڵان بووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "لەوتەیە حەز بکا سەرخەوێک بشکێنێ. "دەیتوانی لە ژووری خەوێ جێیەکی بۆ رابخا، ئەو ماوەیە تاقمێکی زۆری سەربازان بەو شارەدا تێپەڕیبوون. زۆر ئەفسەر و سەرباز بۆ حەسانەوە روویان لە

ماڵەکەی کردبوو. یا بۆ ردێن تاشین و گەرم کردنەوەی خواردنی قوتوو داوای ئاوی گەرمیان دەکرد. ئەویش داوای هەموویانی جێبەجێ دەکرد. ئەو کاتانە یوهانی بیر دەکەوتەوە. حەزی دەکرد شیاوی پلەی مێردەکەی بێ و جگە لەوە خزمەتێکییش بە نیشتمانەکەی بکا.

تا ئێستا ئەو ئەفسەر و سەربازانەی بۆ خەوتن لایاندابوو، لە ژووری میوانان نواندبوون، بەلام ئەوەیان ئامادە بوو ژووری خەوتنی بداتێ و بۆخۆی لە ژووری میوانان بخەوێ. بیری کردەوە میوانەکە لە جێگای یوهاندا بنوێ و بەو بیرە داچڵەکا.

ئەو ئاوێنەیەی بو ئەفسەرەکە برد کە هەمیشە یوهان ریشی لەبەر دەتاشی. ئەفسەرەکە بە پەخەی ئاوەڵاوە ئەمسەر ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد. ئاوێنەکەی لە هیلدە وەرگرت و چاوی لە جێگایەک گێرا لەسەری دابنێ، بەلام هیچ کوێی نەدیتەوە. زۆر کەڵەگەت بوو. لەسەر مێزەکەی دانابا دەبوایە زۆری بۆ دابێتەوە. بۆیە بەبێ قسەکردن ئاوێنەکەی دایە دەستی هیلدە و دەستی بە خووساندنی ریشی کرد. جارێکیش گوتی: "دەستت بەرز کەوە.

چەرخی رۆژگار دەموچاوی وشک و چیر کردبوو. دەموچاوی وە بن تەنکە ریشێکی ئاماڵ سوور کەوتبوو.

هیلدە ئاوێنەکەی لە پشت دەمی خۆی راگرت. کابرا دەموچاوی لە ئاوێنەکە بردە پێشەوە و ئەم هەستی بە هەناسەی کرد. دەستی کەوتە لەرزین، بەلام پەنجەکانی توند لە ئاوێنەکە قوفڵ دابوون و بە زەحمەت رایگرتبوو.

"کەمێک بەرزتر.

هیلدە ئاوێنەکەی بردە ژوور سەری خۆی. باسکی شل ببوون. پێی خۆش بوو قسەیەک بکا، بەلام خشە خشی بەردەوامی تیغەکە وای لێدەکرد بێدەنگ بێ. چاوی لێکنا و گوێی دایە خشە خشی تیغەکە.

بۆنی سابوون دەچووە ناو گەرووی، بەلام هەر بە تەنیا بۆنی سابوون نەبوو، بۆنی پیاو و شەڕ و رێگایەکی دوور و درێژیش بوو. بیری کەوتەوە کە پاڵتۆ چەرمییەکەشی هەر ئەو بۆنەی لێدەهات.

کابرای زەبەلاح هیچ ئاگای لەوە نەبوو ئەم خەریکە دەبووریتەوە. بەویەڕی دیقەتەوە ردێنی خۆی دەتاشی. دواجار لێبووە و دەموچاوی خاوێن کردەوە. "قۆڵم هەڵکە."

هیلدە قۆڵی بلووزەکەی هەڵوێزنی. لەوە دەترسا دەستی بەر گۆشتی لەشی بکەوێ. هیلدە هەستی دەکرد بۆنی ئەو پیاوە دە قەنەفە و دیوارەکان دەمرێ و ئەو بۆنە لە نێو قژی خۆیدا، لە نێو دەمارەکانی و ئازای لەشیدا دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر سەد جاریش خۆی بشوا.

کابرا گوتی: "ئێستا دەمهەوێ بە تەنیا بم."

هیلدە لە وەدەرکەوتندا چاوی بە کابرا کەوت کە تا ناوقەد خۆی رووت کردبووەوە. ئەفسەرەکە خەریک بوو بلووزەکەی دادەکەند و سەری لە بلووزەکەدا ون بووبوو. تەنیا سینگی بە دەرەوە بوو. هیلدە کە بۆخۆی پەرستار بوو لەشی هەزاران پیاوی دیتبوو، بەڵام قەت سینگی وا پانی نەدیتبوو.

هیلدە چووە مەتبەخ و لەوێوە سەیری ئۆتۆمبێلەکەی کرد. منداڵەکەی خەوتبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی ئەو کابرایە بڵێی بڕوا یان بو حەسانەوە لێرە دەمێنێتەوە؟ گوێقوڵاغ بوو نەکا ئەفسەرەکە بانگی بکا و ئەم گوێی لێنەبێ.

جیرانێکیان کە بە پێش ماڵێدا رادەبرد، گوتی: "رووسەکان سێ کیلۆمەتریان ماوە بگەنە ئێرە. تۆ هەر ناڕۆی؟"

هیلدەش وەڵامی دایەوە: "نەخێر ناڕۆم."

لە باڵ خۆیدا بیری لای ئەو پیاوە زەبەلاحە بوو و دەیگوت: "باشە بۆ بانگم ناکا؟" ئیدی حەجمینی لێ هەڵگیرا و تەقەیەکی لە دەرگاکە هێنا. کابرا بە بەرگی سان دیتن و بەرۆکی پڕ میدالیاوە لە نێوەراستی ژوورەکە راوەستابوو. هیلدە واق ورماو لە جێی خۆی رەق هەڵات.

کابرا بزەیەکی هاتێ. یەکەم جار بوو پێدەکەنی. بە هیلدەی گوت: "دەمەوێ تاقیت بکەمەوە بزانم داخوا ئەڵمانییەکی ئازای یان نا؟"

"بەڵێ وام، من نەک هەر ئەڵمانییەکی ئازام بەڵکو ژنی کەسێکم کە لە لایەن فەرماندەییەوە ئەرکی پێ راسپێردراوە..."

هیلده بە تەما بوو باسی ئەرکەکەی یوهان لە نووکەوە بگێڕێتەوە، بەڵام کابرا زۆر بە وشکی قسەکەی پێ بڕی. وێنەی دوو ژنی جوان لە چوارچێوەدا دەبینرا. هیلدە لە وێنەکەی ڕوانی.

"یەکیان ژنمە و ئەوی دی کچمە. هەر دووکیان مردوون. زۆرم خۆش دەویستن. هیچیان قەدری ئەو خۆشەویستییەی منیان نەزانی. ژنەکەم لە ژێر خاکە و کچەکەشم نازانم پەڕیوەی کوێ بووە. مێردی بە خوێڕیلەیەک کرد و لەو ڕۆژەوە ئیدی بە مردووم داناوە.

هیلدە چاوێکی لە وێنەکە کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر منی خۆش ویستبا قەتم خیانەت پێ نەدەکرد."

وێنەیەکی سەرۆک لە پەنا وێنەی دوو ژنەکە بوو.

"ئەمەش ئیدی مرد. ئەڵمانیا فت. من تەنیا لە پێناوی ئەو دووەدا دەژیام. ئەڵمانیا و ڕایشی سێهەم. کە لاو بووم حەزم لە ئەسپیش بوو. ئەوەیان هەوای هەرزەکاری بوو. هەرچی حەزم لێی بووە و بۆی ژیاوم لە ناو چوون. ژن و کچ و سەرۆک و نیشتمانەکەم. ئێستاش نۆرەی خۆمە. نیو سەعاتی دی ڕووسەکان دەگەنێ. حەز دەکەم پێش ئەوەی ئەوان بێن دوامین ئەرکی تەمەنم ڕاپەڕێنم."

هیلدە چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسک. ئەو لای خۆی وای دانابوو ئەفسەرەکە شەو میوانی دەبێ. پێی وا بوو برسیەتی و خواردنی دەوێ.

"چی دەڵێی وا دەکەم. دەتەوێ بچیتە شوێنێک؟"

لەو کاتەدا تەماشای یونیفۆرمی ئەفسەرەکەی کرد.

"من ئیتر ناچمە هیچ کوێ. دوا سەفەرم لێرە کۆتایی دێ."

پێکەنی و گوتی: "لەبەر ئەوەی ڕدێنم تاشیوە و خۆم کۆک و پۆشتە کردووە پێت وابوو دەچمە ژوان؟"

بە ئەسپایی دەستێکی لە شانی هیلدە دا. هیلدە لە چاو ئەو خۆی زۆر بچووک دەهاتە بەر چاو.

"جوان گوێ بگرە، کارێکی زۆر ئاسانە، بەڵام تەنیا لە دەست ئافرەتێکی ئەڵمانی دێ. ژنەکەی خۆم ئەوەی لە دەست نەدەهات و قەت ڕووم لێنەدەنا ئەو کارە بکا، بەڵام لە تۆ ڕادەبینم."

هیلده کەیفی بە خۆی هات. ئەو کابرا زەبەلاحە بۆ کارێک لەو رادەبینێ نەک لە ژنەکەی خۆی."

"کە من مردم، تەرمەکەم بەرە حەوشە و ئاگری تێبەردە، تۆ کاتێک دێیە ئەم ژوورە من بە مردووی لە سەر ئەو جاجمە دەبینی."

جاجمێکی لە سەر عەرز راخستبوو: "کاری تۆ ئەوەیە ئەولاولای هەڵدەیەوە، گرێی دەی و بمبەیە حەوشە."

کابرا دوو دبە بەنزینی لە ژێر مێزەکە دەرهێنان: "هانێ ئەوەش بەنزین، بەنزینی فڕۆکەیە. کە منت بردە دەرێ ئەو بەنزینەکەم پێدا کە و بە چەخماخێک ئاگرم تێبەردە."

ئەفسەرەکە هەروا پێدەکەنی. چەخماخێکی لە گیرفانی دەرهێنا: "ئەوەش چەخماخ. ئەگەر هات بکوژێتەوە، دووهەم دبەشی پێدا بکە. پێم وایە ئەودەم هیچ نامێنێتەوە. تەنیا خۆڵەمێشەکەم دەکەوێتە دەست رووسان. سەربازێک ئەگەر شیاوی ناوەکەی بێ نایەڵێ تەرمی بکەوێتە دەست دوژمن. بە درێژایی مێژوو، گشت سەربازانی ئەڵمانی وایان کردووە. کاتێ هەموو شت لە دەست دەچوو، خۆیان دەکوشت و جگە لە خۆڵەمێشیان هیچی دیکەیان نەدەکەوتە دەست دژمن."

هیلده مت ببوو و چاوی لە وێنەکان دەکرد.

"ئەگەر پێت خۆش بوو وێنەکانیش بسووتێنە. هەر بیانخە ناو جاجمەکە با لەگەڵ خۆم بسووتێن. ئەگەر حەزیشت لێیە هەڵیانگرە، بەلام سوودی چییە؟ هیچ کەس لێرە من ناناسێ. من بە ئەسڵ رۆمانیاییم."

هیلده رانەچەنی. تەرمی دێوئاسای کابرای لە نێو جاجمەکەدا لە بەر چاو بوو. ئاگای لە هیچی دی نەبوو.

"دەترسی؟ ژنە ئەڵمانی ببرای ببر ناترسێم. پێم وایە لەوە دڵنیا بی کە بە بەجێ گەیاندنی دوامین داواکاریی سەربازێک، خزمەتێک بە وڵاتەکەت دەکەی."

"بەڵێ، هیچ ناترسم، بەلام ناتوانم بە خومی بسەلمێنم کە ئەوەی دەیبینم راستە. من قەت بڕوا ناکەم رووس بگەنە ئێرە. بڕوا ناکەم ئەڵمانیا شکست بخوا."

"هەموو شت تەواو بوو. لە بیرت نەچێ دەمانچەکەش بخەیە ناو جاجمەکەوە با لەگەڵ خۆم بسووتێ. سەرباز دەبێ لەگەڵ چەکەکەی بنێژرێ یان ببێتە خۆڵەمێش. چەند چرکەیەک بێدەنگی زاڵبوو. کابرا چاوی لە شوێنێکی نادیار بڕیبوو. لە دەریای قووڵ و بێ بنی بیر و ئەندێشاندا نوقم بووبوو. بە ئەسپایی دووپاتی کردەوە: "هەموو شتێک تەواو بوو."

هیلدە سەری هەڵهێنا. وای دەزانی ئەفسەرەکە لەبەر چاوی ئەو خۆی دەکوژێ و ئەم خۆی لەبەر دیتنی ئەو دیمەنە پێ ڕاناگیرا. کابرا بەرامبەر وێنەی سەرۆک ڕاوەستا و وەکو نیشانەی سڵاوی سەربازی دەستی هەڵبڕی. هیلدە لە پشت سەری ڕاوەستابوو و چاوی لە شانی پان و ناوقەدی باریکی بڕیبوو. دەستی ڕاستی ئەفسەرەکە تا ماوەیەک بە بێ بچووکترین جووڵە هەر وەک خۆی لە حەوا مایەوە. کاتێ دەستی هێنایە خوارێ لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. هەنگاوێکی چکۆلەی نا و دەستی بۆ هیلدە ڕاداشت: "هاوڕێی بەڕێز سوپاست دەکەم. من ستوان یۆرگ یۆردان - م، بەڵام ئەوە بە کەس مەڵێ. شانازی بەو کارەوە بکە کە دەیکەی. ئەوە بۆ ژنە ئەڵمانێک فەخر و شەرەفێکی گەورەیە وەسیەتی سەربازێک بە جێ بگەیەنی."

ئینجا دەستی هیلدەی ڕێکگوشی. ئیشاندی. بەم جۆرە ماڵاوایی لێکرد. ئینجا بە ئەمر پێکردنیکەوە گوتی: "ئێستا بە جێم بێڵە. کە گوێت لە دەنگی تەقە بوو یەکسەر وەرە ژووری. ماڵاوا."

## (١٠٣)

دەبابەی ڕووسان بە شەقامەکەدا تێپەڕین. هیلدە سەرەتا گوێی لە هاڕەی مەکینەکانیان بوو و پاشان لە پەنجەرەی مەتبەخەوە خودی دەبابەکانی دیتن. هێشتا ئەفسەرەکە تەقەی لە تفەنگی نەهاتبوو. لە دەرەوە ئۆتۆمبێلی ڕووسەکان دەهاتن و دار و دیواریان خستبووە لەرزین. هیلدە ئارامی لێ بڕابوو. زۆر ترسابوو. تەقەیەکی لە دەرگاکە هێنا. بێدەنگییەکی پەتی زاڵبوو. خۆی بە ژوورەکەدا کرد. ئەفسەرە زەبەلاحەکە، لەسەر پشت، لە نێوەندی جاجمەکە کەوتبوو.

"من بۆ گوێم لە دەنگی گوللە نەبوو؟"

لە چۆنیەتیی تەرمەکەڕا دیار بوو لە کاتی دانەوەی سلاو بۆ سەرۆک گیانی دەرچووە. کلاوی سەربازی بە پێی ڕێسا هەر لە سەر بوو. دەموچاوی کەمێک شین هەلگەڕابوو، دەتگوت یەکێک بە دەست خۆلەمێسی بە دەموچاوی هەلپڕژاندووە. لە لای ڕاستی نێوچاوانی، بە تەنیشت لووت و دەمیدا خوێن شۆڕاوگەی بەستبوو. هیلدە دەمانچەکەی لە دەستی دەرهێنا و هاویشتییە نێو جاجمەکە. پێی سەیر بوو چلۆن گوێی لە قرمەی دەمانچە نەبووە. جەمسەری جاجمەکەی وێ هەلدانەوە و لە لایەکەوە دوو سەری لێک گرێدان. پێش ئەوەی دەموچاوی مردووەکە داپۆشێ بۆ دوامین جار چاوێکی لێکرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: "هیچ هەست بەوە ناکەم مردوویەکم لە پەنایە. هیچ ناترسم. ڕەنگە هی ئەوە بێ کە لە نەخۆشخانەی سەربازی گەلێ مردووم بینیون."

لاچمکی جاجمەکەی بە سەر دەموچاوی مردووەکە هەلکێشا بێئەوەی دەستی بەر دەموچاوی بکەوێ. ئێستا لەگەل هەموو ئەو پیاوانەی هیلدە دەیناسین وەک یەک وا بوو. بە زیندوویی جۆرێکی تر بوو، بەلام ئێستا هیلدە وە بیری نەدەهاتەوە بە زیندوویی بیچمی چۆن بووە. کاتێک لە هیلدە هاتبووە پێش مچوڕکی بە لەشیدا هێنابوو، بەلام هەر بەڕاست ئەمە کەی بوو؟ دەتگوت بە لای کەمەوە دە سال لەمەوبەر بووە. هیلدە هیچی وای وەبیر نەمابوو.

لە دەرێ هارە هاڕی دەبابەی ڕووسان دەهات. هیلدە لەپڕ ترسی لێنیشت. حەزی دەکرد تا زووە پڕ بداتە مندالە ساواکەی و بە دەرگەی پشتەوەدا رابکاتە ناو دارستان، بەلام ئەو بەلێنێکی دابوو: "بەداخەوە کە ئەو بەلێنەم پێدا." بردنی تەرمەکە بۆ ناو باخچە کاری کردە نەبوو. لەوانە بوو سەربازانی ڕووس بیبینن. لە دلی خۆیدا گوتی: "تا تاریک دادێ دەبێ لێرە بم. ئەودەم تەرمەکە دەبەمە نێو باخچە و دەیسووتێنم و پاشان بە خۆم و مندالەوە هەلدێم."

هیلدە بۆ چەند ساتێک بێ هیچ بیرکردنەوەی دی هەروا لەوێ ڕاوەستا. لەناکاو بە بیریدا هات بێت و تەرمێک لە مالەکەی ئەودا بدوزنەوە، دەیگرن. مندالی لە جێیەکەی دەرهێنا و لە ئامێزی کرد.

"من جاریَ دەبێ ئەو بەڵێنەی داومەتە سەربازێک، بەجێ بگەیەنم."

دەرکی دەروازەی بە کێلوون و قوفڵ گاڵە دا. بەرە بەری بوولێڵی ئێوارە بوو. هیلدە کاتژمێری پێ نەبوو. بیری کەوتەوە کابرا زەبەلاحەکە کاتژمێرێکی سەفحە زلی لە مەچەکیدا بوو. چمکێکی جاجمەکەی هەڵدایەوە تا بزانێ کاتژمێر چەندە. لەو کاتەدا لە دەرگەیان دا. هیلدە منداڵەکەی بە خۆیەوە گوشی و متەقی لە خۆی بری. غەڵبە غەڵبێکی بە زمانی رووسی گەیشتە گوێ. دیسان لە دەرگەیان دایەوە، بەڵام ئەو جارەیان بە قەوتر. پەنجەرەی روو لە باخچەی کردەوە. دیسان گوتی: "بەبێ بردنە سەی بەڵێنەکەم ناتوانم بڕۆم."

سەری یەک لە دوو دبە بەنزینەکانی کردەوە و ئەوەندی تێیدا بوو بە جاجمەکەیدا کرد. دەنگی قونداغە تفەنگان کە لە دەرگایان دەدا، دەهات. سەرەڕای ئەوە هیلدە دبەکەی دیکەشی، نیوە پێدا کرد. ترسی ئەوەی رووسەکان هەر لەحزەیەک بۆی هەبوو بێنە ژوورەوە، وای لێدەکرد پەلە بکا. بە منداڵەوە بەرەو پەنجەرکە غاری دا و لەو کاتەدا بیری کردەوە: "کە وەدەر کەوتم چەخماخی هەڵکراو دەهاوێمە ژووری." بۆنی بەنزین وڵاتی داگرتبوو. منداڵەکە دەکۆخی. هیلدە ویستی لەسەر کەرەوێتەکەوە خۆی فڕێ بداتە خوارێ. سەربازانی رووسی شانیان وەبەر دەرگا هەڵدەدا و چی وای نەمابوو لە ریسمەی بەرن. هیلدە بۆ ساتەوەختێک راوەستا. لە پەنجەرەوە بە بازدانیک دەگەیشتە ناو باخچە. کارێکی زەحمەت نەبوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا سی کڵاوخوودی رووسان لەبەر پەنجەرە وەردەر کەوتن. باخچەش پر بوو لە سەرباز. لەو لایەوە راکردن مەحاڵ بوو. بە ترس و لەرزەوە چاوێکی لە دەرگا کرد. منداڵەکە کە بە بۆنی بەنزین خەریک بوو بخنکێ بە توندی دەگریا. بڕیاریداهەر لەو پەنجەرەیەوە خۆی فڕێ بداتە نێو سەربازەکان و رابکا. لە ناو چوارچێوەی پەنجەرەدا بوو کە یەکێک داهاتە لاقی. لە ترسان قیژاندی و ویستی بە گژیدا بچێتەوە، بەڵام هەر چەخماخێکی پێ بوو. هەر لە خۆوە چەخماخەکەی لێدا. وەک چۆن مرۆڤ لە کاتی مەترسیدا پەنجە بە پەلاپیتکەی دەمانچەوە دەنێ. لە ماوەی کەمتر لە چرکەیەکدا گرد مەشخەڵێکی گەورە بەرز بووەوە و پاشان...

هەمان ئەو بڵێسانەی لەشی یورگ یوردانیان سووتاند بەربوونە گیانی هیلدەی ژنی یوهان مۆریتس و منداڵەکەیان فریتز. هەر بە کڵپەی ئەو ئاگرە گشتماڵ و حاڵ و دار و نەداریان بوو بە خۆڵەمێش و قەرەبرووت. سووتمان ماڵەکەی رەش کردەوە و تەنیا پارچە زەوییەکی لەوێ بەجێ هێشت. تا چەند کاتژمێران ئاگر هەر ئاییسا و گڕ و بڵێسەی ناردنە هەوا.

## (١٠٤)

ترایان کۆرۆگا و ئەلیورا ویست لەبەردەم سەرگورد براون فەرماندەی شاری ڤایمار لەسەر کورسی دانیشتبوون. ترایان گوتی: "ئەوە بوو هەموو بەسەرهاتەکە. کاتێ رۆمانیا لە رێکەوتی یەکی خەرماناندا داوای تەقەوەستانی کرد من و هاوسەرەکەم و ئەندامانی دیکەی باڵیۆزخانەی رۆمانیا لە لایەن کرۆواتەکانەوە دەستبەسەر کراین. دیارە بە پێی یاسای نێونەتەوەیی کە لەبارەی کارمەندانی سیاسییەوە رەچاو کراوە لە هۆتێلێکدا ئێمەیان دەستبەسەر کرد. پاشان گەریلاکان کرۆواسییان گرت و ئێمەیان سەرەتا نارده ئۆتریش (نەمسا)، ئینجا چیکوسلۆڤاکیا و دواجار ئەڵمانیا. دوای داگیر کرانی ئەڵمانیاش لەبەر ئەوەی کەس نەبوو بمانگرێ یان دەسبەسەرمان بکا لێبڕاین رابکەینە رۆژئاوا. هەموو شتێکمان بەجێ هێشت تا بتوانین رابکەین."

ئەلیو نوورا وەبیری هاتەوە کە دووسەد کیلۆمەتریان رێگا بڕیوە. پێی ئەستوور ببوون و بە جارێ ببوونە پۆرگ. ئەلیو نوورا قەراغی بۆ قسەکانی ترایان تێکردەوە: "ئێمە هیچمان لەگەڵ خومان نەهێنا و هەڵاتین تا بگەینە هەرێمی بەردەستی ئەمریکا یا فەرەنسا یان ئینگلیز. نەماندەویست بە زیندوویی بکەوینە دەست رووسان. لێبڕابووین گیانی خۆمان دابنێین، بەڵام نەکەوینە دەست رووسان."

"ئێوه بۆ ئەوەنده له رووسان دەترسان؟ هەر فاشیستەکان لەوان دەترسن. رووس هاوپەیمانی ئێمەن و یارمەتیی بەرقەراربوونی ئاشتییان داوه."
"تۆش جەنابی فەرمانده فاشیست نی، بەڵام من دڵنیام هەرگیز رێگه نادەی بۆ وێنه هاوسەرەکەت بیست و چوار کاتژمێر له هەرێمێک بێ که بەلشەڤیکەکان داگیریان کردبێ. دیاره نەک له رووی سیاسییەوه، بەڵکو له ترسی دڕندەیی و دڵرەقیی ئەوان. تەنانەت پێم وا نییه بۆخۆشت به بێ پاراستنێکی تەواو بوێری پێ بنێیه هەرێمی ژێر دەسەڵاتی وان.
باشه پێت وایه ئەو پرسیارەت پرسیارێکی بەجێ بێ که دەپرسی بۆچی دوو مرۆڤی بێ چەک لەبەر قۆشەنی بەربەران هەڵاتوون که هەموویان به نوێترین چەکی ئەمریکی تەیار کراون؟"
"باشه ئێستا چیتان له من دەوێ؟ ئێوه ناتوانن له ئەڵمانیا بچنه دەرەوه. ئێوه له روانگەی ئێمەوه سەر به وڵاتێکی دوژمنکارن. ئێوه هەر ئەو بەرپرسیارییەتان هەیه که گەلی ئەڵمانیا هەیەتی، دیاره هەر ئەو مافانەش که ئەوان هەیانه. نەک زیاتر..."
ترایان وەڵامی دایەوه: "واته... هیچ مافێکمان نییه. ژنه ئەڵمانییەکانی ڤایمار ناچارن ئاودەسخانەکانی بوخێن والد[1] خاوێن بکەنەوه و به لای کەمەوه حەفتەی جارێک بەرگی زیندانییه ئازاد کراوەکان بشۆن. ئاخۆ دەتانەوێ ئەو بێگاره به ژنی منیش بکەن؟"
ئەلیو نوورا گوتی: "ئێمه دوژمنی ئەمریکا و هاوپەیمانان نین. ئەورۆکه هاتووینه لای جەنابت که له ناوچەی ژێردەسەڵاتی خۆتان ژوورێکمان بدەنێ یان کارێکی وا بکەن ئێمه بتوانین درێژه به سەفەری خۆمان بدەین."
"ئێوه خەڵکی وڵاتێکی دوژمنکارن و برایەوه. ئێوه پەساپۆرتی رۆمانیاتان هەیه، وایه؟ ده باشه، کەواته خەڵکی وڵاتێکی دوژمنکارن."
ئەلیو نوورا گوتی: "ده مانگه رۆمانیا شان به شانی ئێوه دژی ئەڵمانیا شەڕ دەکا. هەژده هەزار رۆمانیایی له پێناوی بەرژەوەندیی هاوپەیمانانداا کوژراون.

1 Buchenwald زیندانی بەناوبانگی نازییەکان له سەردەمی جەنگدا.

باشە چۆن دەشێ دوژمنی ئێوە بین لە کاتێکدا کە لە یەک بەرەدا شەڕ دەکەین؟"

سەرگورد براون دووپاتی کردەوە: "ڕۆمانیا وڵاتی دوژمنکارە."

پاشان پەڕە کاغەزێکی لە چەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا و لە رووی‌ڕا خوێندییەوە:

"وڵاتە دوژمنکارەکان بریتین لە ڕۆمانیا، ئەڵمانیا، فینلەند، ئیتالیا، ژاپۆن و مەجەڕستان (هەنگاریا)، شتەکە زۆر روونە، ئێوە دوژمنی وڵاتانی هاوپەیمانن."

ترایان لە جێگای خۆی هەستا. ئەلیو نوورا وێست بە چاوێکی پڕ لە پاڕانەوەوە سەیری سەرگوردی کرد و گوتی: "باشە ئاگادار نی کە نزیکەی ساڵێکە ڕۆمانیا لە بەرەی هاوپەیماناندا شەر دەکا؟"

"ئەگەر واش بێ پەیوەندیی بە منەوە نییە. بەڵگەنامە رەسمییەکان دەڵێن ڕۆمانیا وڵاتێکی دوژمنکارە. من کاتێکی زورم بە قسەکردن لەگەڵ ئێوە بە فیڕۆ دا. ئێوە دوژمنن. تێدەگەی یان نا؟ ئەگەر من کەوتبامە دەست ئێوە دابێژ دابێژتان دەکردم و کاتی خۆتان وەک من ئێستا بە فیڕۆم دا، بە مشتومڕ لەگەڵ مندا بە فیڕۆ نەدەدا. کارەکەی من بە دژی یاسایە و ئیدی دووپاتی ناکەمەوە."

سەرگورد براون لە رقان دەموچاوی سپی هەڵگەڕابوو. وەڵامی ماڵاوایی ترایان و ئەلیو نوورای نەدایەوە. ترایان لە ڕاڕەوەکە بە ئەلیو نوورای گوت: "ئەوەش رۆژئاوا، ئەوانە نە گوێ دەدەنە ڕاستی و نە مرۆڤ. بە لایەنی گشتی لە هەموو شتێک دەڕوانن و بە پێی فەرمانی چاپکراو شێوەی هەڵسوکەوتیان دیاریدەکەن."

نوورا گوتی: "من چیدی ناتوانم بڕۆم.

ترایان بن باڵی گرت و یارمەتی دا. نوورا پاڵی وە ترایان دا و گریا: "ئێمە دووسەد کیلۆمەتر بە نیمچە غاردان هاتین. وەک تەوافکەری مەککە."

"نوورا خەم مەخۆ. هیچ نەبێ لە تیرۆر و ترسی رووسان دەرباز بووین. ئەمە خۆی دەسکەوتێکی کەم نییە، بەڵام مرۆڤ ئیدی لە هیچ کوێ ئاسایش بە خۆیەوە نابینێ. زەوی چیدی هی مرۆڤ نییە."

## (١٠٥)

چـوار رۆژ دواتـر سـەرلـەنـوێ ترایـان و نـوورا چوونـەوە لای سـەرگـورد براون، فەرمانداری شار. دەبوایە بۆ هەفتەیەک مانەوە لە ڤایمار ئیزن وەربگرن نوورا لاقی ئاوسابوون و نەیدەتوانی ڕێ بکا.

نوورا تاکە جلوبـەرگـە جوانـەکـەی خـۆی بـە کڵاوەوە لـەبـەر کـرد و پێڵاوی پاژنە بڵندی کردە پێ. بە پاسەوانەکەیان گوت دەیانەوێ چاویـان بـە سـەرگـورد بکەوێ. کاتێ لە چاوەڕوانیدا دانیشتبوون ترایان گوتی: "نوورا، دەڵێی خۆت بـۆ سەر داوەتێ رازاندووەتەوە." نوورا پێکەنی. سێ ساڵ لەمەوبەر بـۆ یـەکـەم جار ئەو بەرگـەی بـۆ میوانداری باڵیوزی فینلـەند پۆشیبوو. سـەربازێک لێیان هاتە پێش و بە ڕێزەوە گوتی: "جەناب سەرگورد تکای کرد کەمێ چاوەڕوان بکەن. چەند خولەکێک تێپەڕی. سـەربـازێکی دیکـە هـات و گـوتی: "ئێوە ئـەو دیپلۆماتە رومانیانەن کە دەتانویست چاوتان بە جـەنـاب سـەرگـورد بکەوێ؟ تکایە چـەند خولەکێک راوەستن.

نوورا بە ترایانی گوت: "ئەم جەناب سەرگوردە پیاوێکی ڕێکوپێکە. تـا ئێستا دوو جـار لـەبـەر ئـەوەی چـەنـد دەقیقـەیـەک ئێمـەی راگرتـووە داوای لێبووردنی کردووە."

شـوێنی کـاری فـەرمـانـدە گـەورەتـر بـوو و بـە دەرگـا و ڕاڕەوێکـی گـەورەدا دەچوویە ژوورێ. ئەلیو نوورا لـە ئاوێنـەکـەدا چـاوێکی بـە خـۆیـدا گێڕا. زۆر کز بووبـوو و جلـەکـانی زۆر لـە کـاتی بانگهێشتی بـاڵیۆزی فینلـەنـدەوە بـۆ گـەورە ببوونەوە. سەربازی گۆرین هاتەوە و گوتی: "تکا دەکەم تەشریف بێنن."

نوورا بە بزەیەکەوە لە ئاوێنەکەوە ڕووی خۆی وەرگێڕا. ترایـان قۆڵی گرت و هـەر دووکیان وە دوای سـەربـازەکە کـەوتن. سـەربـازەکە لە باتی بە پلیکانـەکـان هـەڵبگـەڕێ بـەرەو دەرگـای دەرێ ڕۆیـی. لـەبـەر دەرگـا جیپێـک ڕاگیرابـوو سـەربـازەکە داوای لێکـردن سـوار بـن و پاشـان جیپـەکـە وەڕێ کـەوت. ترایان پرسی: "دەچینە کوێ؟" ئەو سەربازەی لە پشت سوکان بـوو شـانی هـەڵتەکاند. ڕەشەبای دەهات. ئۆتۆمبێلەکە بە خێراییەکی زۆرەوە بە شەقامەکاندا تێدەپەری

ترایان چووه بن گوێی سەربازەکەی تر و بە سرتە گوتی: "دەچینە کوێ؟" ئەویش جگە لە شان هەڵتەکاندن هیچی نەگوت. ترایان رووی لە نوورا کرد. ئەم هەر دووک لای کڵاوەکەی توند گرتبوو و پێدەکەنی. نوورا دایمە حەزی لە خێرایی بوو. لەو سەری شار جیپەکە لە بەردەم دیوارێکی بەردین راوەستا. دەرکەوانێک بە کڵاوی سەربازییەوە دەرگای کردەوە. کاتێ ئۆتۆمبێلەکە چووە حەوشە یەک لە سەربازەکان نامەیەکی دایە دەرکەوانەکە. ئەلیو نوورا پرسی: "ئێمە لە کوێین؟" کەس وەڵامی نەداوە. ئەمریکییەکان راوەستان تا لە ماشێنەکە دابەزین. ئەلیو نوورا هەمان پرسیاری لە دەرکەوانەکە کرد. دەرکەوان دەستی نووورای گرت و گوتی: "لە زیندانی شار." ئەلیو نوورا ویستی شتێک بە سەربازەکە بڵێ، بەڵام تازە درەنگ بووبوو. جیپەکە چون هاتبوو هەروا بە خێراییش ونبوو. ئەم رووی کردە ترایان. دەرگا ئاسنەکان لە پشت سەریانەوە داخران. ئەوان لە حەوشەی زیندان بوون.

## (١٠٦)

ترایان لە سللوولی ژمارە پێنجی نهۆمی یەک و نوورا لە سللوولی ژمارە دووی نهۆمی چوارەم کران. کاتێ ترایان بە تەنێ مایەوە، ناڵاندی و گوتی: "دەبێ هەڵەیەک رووی دابێ." هەوڵیدا تێبگا چ رووی داوە. بیری کەوتەوە لەو ساتەدا نووراش لە سللولێکی وەک ئەوەی ئەودا بەند کراوە. بە لادا هات.

کاتێ ماڵاوایی هەوڵی دابوو نوورا لە باوەش بگرێ و قسەیەکی ئەویندارانەی پێ بڵێ، بەڵام وەردیانەکە بە توورەییەوە پێلی راکێشابوو و لە نوورای پچڕیبووەوە. نوورا لە بەر وەردیانەکە پاڕابووەوە، بەڵام بە پاڵەپەستۆ بەرەو لایەکەی تری ڕاڕەوەکەی پاڵ دابوو. ساتەوەختی ماڵاوایی ئاوها بوو. "داخوا منیان لەگەڵ چ پیاوکوژێک لێ گۆڕاوە کە لەوانەیە ناوەکەی وەک ناوی من بووبێ، بەڵام ئەدی نوورایان بۆچی گرت؟"

بە مست وەرگەڕا دەرگای سللوول تا وەردیانەکە بێ. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "لێم سوور بوو رووسەکان دەمگرن. هەر دەستت خاوێن بن پەڵپی

چاکە بۆ ئەوەی رووس بتگرن، بەڵام تەنانەت ئەگەر بەبێ دیتنی دەستم یان هەر بڕوبیانوویەکی دی گرتبایانم پێم سەیر نەبوو. رووسەکان هەموو شتیان لە دەست دێ. من بۆیە دووسەد کیلۆمەترم رێگا بڕی تا لە کۆمەڵگایەک دەرباز بم کە تەنانەت نەبوونی هەر چەشنە هۆکار و بەڵگەیەک دەتوانێ گوللەباران و دوورخستنەوە و بەندکردنی بە دواوە بێ!"

ورده ورده دەستی وە ژان کەوت، سەرەڕای ئەوە هەروا لە دەرگاکەی دەدا. هەر بۆ بانگ کردنی وەردیان نەبوو کە ئاوا وەرگەڕابووە دەرگا، بەڵکو زیاتر بۆ تەمێ کردنی خۆی بوو. لەبەر ئەوەی بە هیچ و خۆڕایی دووسەد کیلۆمەتری بە غاردان بڕیبوو و نووراشی بە لاق و لەتەری خوێناوییەوە دوای خۆی دابوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەڵمانەکان لەوانەبوو نوورا بگرن. لەبەر ئەوەی نازی و دژە جوولەکەن. وەردیانەکە گەیشتێ و پرسی: "چیت دەوێ؟"

من دەبێ هەر ئێستا قسە لەگەڵ بەڕێوەبەری زیندان بکەم. من و هاوسەرەکەم بە هەڵە گیراوین."

کابرا بە گاڵتەجارییەوە گوتی: "بەڵێ دەزانم، گشت ئەوانەی لێرەن دەڵێن بە هەڵە گیراون."

من ئیجازەی گاڵتەجاڕی بە کەس نادەم، دەمەوێ هەر ئێستا قسە لەگەڵ بەڕێوەبەری زیندان بکەم."

ئێرە بەڕێوەبەری نییە. ئێوە لە لایەن ئەمریکییەکانەوە گیراون. کاروباری ئیداریی ئێرە بە دەست ئێمەوەیە. ئێمە خۆشمان زیندانین. بە شێوەیەکی تر."

"کەواتە دەمەوێ قسە لەگەڵ ئەمریکییەکان بکەم."

"گرووبان هەفتەی جارێک دێتە ئێرە، دووشەممان."

ترایان زانی ئەو رۆژە دووشەممەیە.

"واتە من دەبێ تا دووشەممەی داهاتوو بێ ئەوەی چاوم بە کەس بکەوێ، رابوەستم؟" "من چیم لە دەست نایە. ئەگەر حەزت لێبوو دەتوانی شتێک بۆ من بگێڕیەوە، ئەگەر ویستیشت دەتوانی چەندین کاتژمێر بە مست لە دەرگا بدەی. گرووبان دووشەممەی داهاتوو دێ."

"کەوابوو بە کەسێکی دیکە بڵێ. من تا چاوم بە سەرۆک نەکەوێ و هۆی گرتنی خۆم و هاوسەرەکەم نەزانم دەم لە نان و ئاو نادەم. ئەوە تەنیا ئامرازێکە لە دەستی مندا و من ئەو ئامرازە بەکار دێنم.

"واتە مان گرتن لە نان خواردن؟"

"ئەگەر پێت خۆشە تۆ ناوی بنێ مان گرتن لە ئاو خواردنەوەش."

وەردیانەکە بۆ ساتێک لە جێگای خۆی راوەستا و لە فکر راچوو. پاشان بە پەرۆشەوە چاوی لە ترایان بڕی و بە دەلاقەی چاودێریدا گوتی: "حەیفە، تۆ هێشتا زۆر گەنجی."

## (١٠٧)

نیو سەعات بوو ئەلیو نووراش بە مست لە دەرگای دەدا. دواجار وەردیانێک هات و لە کونی دەرگاکەوە چاوی لە ژوورێ کرد. "ئەگەر واز لە لێدانی دەرگا نەهێنی سزا دەدرێی. بەندی بۆی نییە بە مست لە دەرگا بدا."

نوورا خۆی هاویشتە سەر تەختەکە. ساتێک دواتر قیت بووەوە. "حەتمەن ئێرە پڕ لە ئەسپێیە." زۆر ترسابوو. دەیویست لە دەرگا بدا و داوای بەتانییەکی دی لە وەردیانەکە بکا یا هیچ نەبێ لێی بپرسێ ئێرە ئەسپێی هەیە یان نا. لە ناو سللوولەکەدا دەستی بە راوێچکە کرد.

نوورا لە قووڵایی دڵیەوە خۆی بە خەتابار دەزانی. وای بیر دەکردەوە کە گیرانەکەی لە بنەڕەتدا رەوایە. دوای ئەوەی خۆی گەیاندبووە ئەو بەڵگەنامانەی جوولەکەبوونی ئەویان دەسەلماند و دزیبوونی، هەموو رۆژێ چاوەڕوانی ئەوە بوو بگیرێن. هەموو سات و رۆژێک چاوەڕوانی ئەوە بوو پۆلیسی بگاتە سەر. لێی سوور بوو رۆژێک هەر دەگیرێ. کاتی سەفەر لە خاکی ئەڵمانیادا هەر کە چاوی بە پۆلیسێک دەکەوت هەموو گیانی دەلەرزی. پێناسەکانی هەموو ساختە بوون. ئەم ساڵانەی دوایی جگە لە چاوەڕوانییەکی کوشندە بۆ ئەو هیچی تر نەبوو، چاوەڕوانیی ئەو ساتەی قۆڵبەست دەکرێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: "وا ئەم ساتە هات. ئەوان زانیویانە من جوولەکەم. تازە رزگاربوونم مەحاڵە." پاشان

گوتی: "چەند بیرێکی منداڵانەیە کە پێم وابێ ئەمریکییەکان بە هۆی شاردنەوەی رەچەڵەکی جوولەکە بوونم و دزینی بەڵگەکان، گرتوویانم. لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا دەبێ بەو هۆیە گیرابم. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە مەنتیقی نییە، بەڵام راستییەکە وایە. من خەتابارم. پێنج ساڵی تەواو توانیم رابکەم و ئێستا باجەکەی دەدەم سزایەکی قورسە، بەڵام گۆڕی گیانم بێ."

لە سەرمان رەق هەڵاتبوو. بنکراسە تەنک و تۆڕییەکەی و کراسە لەو تەنکترەکەی بەرامبەر سەرمای شێداری بەردەکان هیچیان پێنەدەکرا. سەرما لە پێستی ئاودیو بوو و لەوێشەوە تا ناو ئێسقانەکانی گیر نەبوو. سەرمای شێداری لە هەناوی خۆیدا هەست پێدەکرد. گورچیلەکانی قەت سەرمای ئاوایان بە خۆیانەوە نەدیبوو. نوورا بە چاکی نەیدەزانی گورچیلەکانی لە کوێن و چۆنن. کەچی دەیزانی لە سەرمان تەزیون. نەک هەر گورچیلەکانی، بەڵکو هەموو جەرگ و هەناو و ریخەڵۆکەی تەزیبوون. نوورا کراسەکەی خڕ کردەوە سەر ئەژنۆیان، بەڵام سوودی نەبوو. نەیدەوێرا لەسەر تەختەکەش دابنیشێ. وەک مێژۆک دەلەرزی. ددانەچۆقەی پێکەوتبوو. لە دەرێ هەوا گەرم بوو، بەڵام ئەوە هیچ سوودی بۆ ئەو نەبوو کە لە ژووری لە سەرمان دەلەرزی. بۆ ئەوەی کەمێک خۆی گەرم دابهێنێ لە ناوەراستی سللوولەکە هەڵتروشکا. لەو کاتەدا هەستیکرد میزی دێ و تا دەهات ئەو هەستە زیاتر دەبوو و پاشان گەیشتە ئەوەی ئێشی لەگەڵ بێ. ژانێکی بە بەر میزڵدانیدا هات، دەتگوت دەرزیئاژنی دەکەن و لەوە دەترسا خۆی پێ رانەگیرێ. لەو رۆمانانەی خوێندبوونیەوە لە زۆربەی سللوولەکاندا سەتڵێکی بچووک رۆڵی ئاودەستی دەگێرا، بەڵام سللوولەکەی ئەو تەنیا تەختێک و مێزێکی چکۆلە و پەنجەرەیەکی شیشبەند کراوی تێدا بوو و بەس. نوورا رۆیی تا لە دەرگا بدا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "خۆ ئیزنم دەدەن بچمە ئاودەست." لە پڕ قسە توند و تیژەکانی وەردیانەکەی بیر کەوتەوە: "ئەگەر یەک جاری دی بە مست لە دەرگا بدەی سزا دەدرێی."

نەیوێرا لە دەرگا بدا.

لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. "خەتای خۆم بوو، بە خێرایی جارێک لە دەرگام دا." دیسان چووەوە لای دەرگا، بەڵام زاتی نەکرد لێی بدا: "لە دەرگا بدەی سزا دەدرێی."

لە کاتێکدا ئەو رستەیەی وەردیانەکە لە مێشکیدا دەزرینگایەوە شتێکی وەک کارەبا بە هەموو لەشیدا هات. ئەوە راگەیاندنی مەترسی بوو. ماسوولکەکانی چیدی بە قسەیان نەدەکرد و کۆنترۆڵی بەسەریانەوە نەمابوو. هەستیکرد دەرپێ تەنکەکەی تەڕ بووە. پاشان تەڕاییەکە گەیشتە ملی گۆرەوی و ئینجا گۆرەوییەکانی هەموو. گەرمایەکی تەر بە لاقیدا هاتە خوار و رژایە ناو پێڵاوەکانی. ئەلیو نوورا ویست جارێکی دی تەقەڵلای دا خۆی رابگرێ، بەڵام گەوی لەشی شل ببوونەوە. دیسان هەڵتروشکا. لە کاتێکدا دەرپێکەی لە قورساییەکی تەڕدا گەرم و گەرمتر دەبوو هەستی بە ئۆخژنێکی وا کرد کە هەرگیز نەیدیبوو. گشت ماسولکە و دەمار و هەموو گەردیلەی لەشی حەسانەوە. ئەو پەتانەی بە زەوییان دەبەستەوە، هەموو پچڕابوون. لە حاڵەتێکی نێوان مەرگ و ژیان، خەو و بێداریدا موعەلەق بوو. هەموو گیانی رزگار ببوو و خۆی لە ماوەرای شوێن و کاتدا دەبینی. وای هاتە بەر چاو کە ئەو ئاوە چەندین کاتژمێرە هەروا خورەی دێ، بەڵام کاتێ چاوی بە عەرزی سللوولەکە کەوت، ترس سەرتاپای گیانی داگرت. لە جێی خۆی دەرپەڕی و لە قولینچکێک هەڵکورما. دەتگوت دەیەوێ خۆی بشارێتەوە. ترسناکترین کاتی ژیانی ئەم کاتە بوو. عەرزی چیمەنتۆی سللوولەکە لە تەڕییان بریقەی دەدا. مێزەکەی بە بن تەخت و مێزەکەدا خوشی و گەیشتە بەر لاقی. نوورا زانی کەتنێکی کردووە. دەنگی وەردیانەکەی دیسان لە گوێدا زرینگایەوە: "سزا دەدرێی." حەزی دەکرد جلەکانی داکەنێ و عەرزەکەی پێ وشک بکاتەوە، بەڵام ئەو کارەش سوودی نەبوو. تەڕاییەکە زۆر لەوە زیاتر بوو بتوانێ بەو شتانە وشکی بکاتەوە. لە خاڵێکی نادیارەوە بەردەوام گوێی لێدەبوو: "سزا دەدرێی."

بە لای نووراوە ئاشکرا بوو کە هەر هەوڵێک بۆ شاردنەوەی کەتنەکەی یان خۆ قوتارکردن لە سزا بێ سوودە. دەستە بچووکەکانی کە هێشتا لە دەستکێشدا بوون بە دەموچاوییەوە گرتن و ملی نا لە گریان.

## (١٠٨)

گرووبان گۆڵد سمیت گوتی: "من لەوەی بەسەر ئێوە هاتووە یەکجار بەداخم و بە ئەرکی خۆمی دەزانم داوای لێبووردنتان لێبکەم. بەراستی پێم ناخۆشە لەوە زووتر ئاگاداری کاری ئێوە نەبووم."

حەفتەیەک بوو ترایان کورۆگا و ئەلیو نوورا وێست گیرابوون. ترایان بە بێحاڵی لەسەر تەختەکە کەوتبوو و بڕستی لێ بڕابو. حەوت رۆژ بوو زەوادی نەبڕیبوو.

گرووبان کە کەلوپەلی نوورا و ترایانی بە جێیەکەی خۆی هێنابوون لە کردنەوەی کەلوپەلەکاندا یارمەتی نوورای دا. تەواو دیار بوو لەوی رووی داوە زۆر ناڕەحەتە. ترایان ونوورا شتاقیان چ قسەیان بۆ کردن نەدیتەوە.

گرۆوبان رووی لە سەرۆکی وەردیانەکان کرد و گوتی: "جەنابی کورۆگا و خانمەکەی بەندی نین. بە هەڵە هێناویاننە ئێرە، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ جێگایەک نییە بچنێ تا سبەینێ لێرە دەمێننەوە. نوێنی خاوێنیان بۆ راخەن. ئەوانە میوانی ئێمەن.

گرووبان رۆیی و پاش نیو سەعات بە بەستەیەکەوە هاتەوە. خواردەمەنیی هێنابوو. تەنانەت پرتەقاڵ و تریش بۆ ترایان. لە رۆیشتندا دووبارە داوای لێبوردنی کرد و دەستی ترایانی گوشی. سەرۆکی پاسەوانەکان زەق لەو دیمەنەوە راما.

نوورا گوتی: "دەمزانی ئەمریکییەکان دواجار لەو بارەوە داوای لێبوردن دەکەن. ئەمریکا وڵاتی خەڵکانی پێشکەوتووە."

ترایان تای لێبوو و هەر زوو خەوی لێکەوت. شەو لە خەودا لە ژێردەریاییەکدا بوو و هەموو کەروێشکە سپییەکان مردبوون. شەلاڵی ئارەقە، لە خەو راپەڕی. فانیلەکەی تەڕ ببوو. "کە کەروێشکە سپییەکان بمرن ئیدی هیچ هیوایەک نامێنێ." ئەوە دوا وتەی ترایان بوو کە لە خەونەکەیدا گوتبووی، بەڵام دەریاوانەکان بڕوایان پێنەدەکرد.

## (١٠٩)

ڕۆژی دوایی گرووبان گۆڵد سمیت نەهات. ئەلیو نوورا ئێواری هەر چاوەڕوانی بوو. شەوێ لەبەر خۆیەوە گوتی: "لەوانەیە ڕووداوێک نەیهێشتبێ بێت." وەردیانەکەش هەر ڕای وابوو.

سبەی و دووسبەی گۆڵدسمیت سەر و سۆراغی نەبوو دوای هەفتەیەک گرووبانێکی تازە هاتە جێگای ئەو. گوتی: "من ئاگاداری مەسەلەی ئێوە نیم. بەڕێز گۆڵد سمیت گەڕاوەتەوە ئەمریکا و لەمەڕ کاری ئێوەوە هیچی پێ نەگوتووم، بەڵام تەنیا چەند خولەک لە نووسینگە گیر بوو و کاتێ ترایان و نوورا ویستیان چاویان پێی بکەوێ. بۆی دەرچووبوو. ناچار دەبوایە حەفتەیەکی دیکەش چاوەڕێ بن. ئەم جارەیان گرووبان بە جارێ تووڕە بوو.

"من لەبارەی کارەکەی ئێوەوە زانیاریی پێویستم دەست خست. ئێوەش بەندین، وەک بەندییەکانی دیکە و لە بارەی ئەوەوە کە چاومان بە سەرتانەوە بێ و لەگەڵ بەندییەکانی دی جیاوازیتان هەبێ هیچ فەرمانێکمان پێ نەدراوە."

ئەوەی گوت و پشتی تێکردن. پاشان ئەمری بە سەرۆکی وەردیانەکان کرد: "لێکیان هەڵاوێرن. وەک خەڵکەکەی تر. هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ."

سەرۆکی وەردیانان چاوی لە وێژەری ئەو قسانە بڕیبوو. دەیویست دڵنیا بێ کە هەڵەیەک ڕووی نەداوە، دواجار گوتی: "تێگەیشتم. زیندانی تاکەکەسی، جیرەی ئاسایی، زیندان بە بێ هیچ جیاوازییەک."

## (١١٠)

نوورا کاتێ لە ڕاڕەوەکەوە گوێی لە زرمەی پێی پاسەوانەکە بوو قیژاندی: "دەیانەوێ لێکمان هەڵبڕن." و خۆی بە ترایانەوە نووساند.

سەرۆکی وەردیانان لە ژوورەکە ڕاوەستابوو و گەمەی بە دەستە کلیلەکە دەکرد. نوورا ئاوڕی نەدایەوە. ئەویش و ترایانیش دەیانزانی هاتنی وەردیان بە

مانای چییە. ترایان چاوێکی لە وەردیانەکە کرد و بیری کردەوە داوای پێنج خولەک دەرفەتی لێ بکا، بەلام هیچی نەگوت. دەیزانی بێ سوودە.

سەرۆکی وەردیانان رووی تێکردن و گوتی: "من هاوینی ئەمساڵ خزمەتم تەواو دەبێ. بەو تەمەنەوە تازە فێری ئەو جرت و فرتە نابم. ناشمەوێ فێر بم."

کەمێک راوەستا و هێزی خۆی کۆ کردەوە: "ئێوە هەر وەک جاران لە لای یەکتر دەبن. پێکەوە دەرگای سلولیش ئاوەلا دەبێ."

## (١١١)

نوورا بە ناهومێدییەوە پرسی: "باشە ئەمریکییەکان چ دوژمنایەتییەکیان لەگەڵ ئێمە هەیە؟ بوی شەش حەفتەیە لە بەندیان کردووین؟"

"ئەمریکییەکان هیچ دوژمنایەتییان لەگەڵ ئێمە نییە و هەر ناشزانن ئێمە لێرەین."

"ئەدی چەندی پێدەچێ تا بزانن ئێمە لێرەین؟ من لەوە زیاتر لێرە دەرنابەم."

"ئەوان هەرگیز ئاگادری ئەوە نابن کە من و تۆ لێرەین. شارستانیەتی رۆژئاوا لە دوا قۆناغی گەشەکردنی خۆیدا ئیدی گوێی لە مرۆڤان ئاخنیوە. هیچ شتێکیش ئەو ئومێدەمان پێنابەخشێ کە رۆژێک لە رۆژان وەزعەکە بگۆرێ. ئەم کۆمەڵگایە تەنیا تایبەتمەندی و شوناسە گشتییەکانی مرۆڤ دەناسێ. بوونی مرۆڤ وەکو تاک بە لای ئەو کۆمەڵگایەوە گرینگ نییە. تۆ ئەلیورا و کۆرۆگا و من و زۆر کەسی تر بە بێ تاوان لە زینداندایین. بۆ نموونە تۆ خەڵکی ولاتێکی دوژمنکاری کە لە خاکی ئەڵمانیادا گیراوی. ئەوە زۆرترین پێناسە و تایبەتمەندییە کە دنیای ئامێری بە تۆی رەوا دەبینێ. ئەم کۆمەڵگایە بوونی تۆ بەو پێناسەوە بە رەسمی دەناسێ.

تۆ کە بەشێک لە گرووپێکی دیاریکراوی بە پێی رێوشوێن و رێساکانی ئەو گرووپە و بە پێی یاسای "لێکدان" و "کۆ" و "دابەش" رەفتارت لەگەڵ دەکرێ. تۆ دڕکێک گەردیلەیەکی بچووک لە رۆمانیای و ئەم دڕکە بچووکە ئێستا لە

زینداندایە. خەتا یان تاوانێکی کە تۆ لەسەری گیراوی و بەندکراوی هی تاقم و خشتەیەکی دیاریکراوە نەک هی شەخسی تۆ."

"لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەمریکییەکان لەسەر شتێکی تایبەت ئێمەیان بەند کردووە. ئەوان لە شتێکی ئێمە درِدۆنگن دەنا بەریان دەدایین. من لەبەر ئەوەی لەو هۆکارە ناگەم زۆر نارەحەتم، بەڵام دڵنیام هۆکارێکی هەیە."

"تەنیا هۆکارێک هەیە، کە دیارە لە روانگەی مرۆڤانەوە هۆکارێکی گەوجانەیە و تەنیا روانگەیەکی ئامێری بە رەوای دەزانێ. مرۆڤی بریتی لە گۆشت و خوێن، مرۆڤێک کە هەست بە خۆشی و ناخۆشی دەکا، نەماوە. هەر بەو هۆیەوە ناتوانین ئەو گرتن و کوشتن و برینەیان ناو بنێین تاوان. ئەو کارەی ئەوان کاتێک بە تاوان دادەنرا کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مرۆڤی بریتی لە گۆشت و خوێن و سۆز کردبایە. بەداخەوە کۆمەڵی رۆژئاوا توانای ناسینی وجوودی ئینسانی زیندووی نییە. ئەو کۆمەڵگایە ئەگەر مرۆڤ بکوژێ بوونەوەرێکی زیندووی نەکوشتووە، بەڵکو شتێکی بێگیانی لە ناو بردووە. وەک چۆن ناکرێ ئامێر بە تاوانبار بزانین یان چاوەروانی ئەوەی لێبکەین بە پێی تایبەتمەندی و خووخدە تاکییەکان لەگەڵ مرۆڤ بجووڵێتەوە."

"باشە، سەرەنجام هۆکاری گرتنی ئێمە کە لە روانگەی ئامێری و نامرۆییەوە ئاقڵانە و رەوایە، چییە؟"

"نازانم، تەنیا ئەوە دەزانم کە ئەم هۆکارە هەر مرۆڤێک بیەوێ یاسا ئامێرییەکان ـ کە تا ئەو دەمەی لایەنی ئامێری و نامرۆییان هەیە یاسای چاکن ـ ژێر پێ بنێ، لە ناوی دەبا. مرۆڤێک کە ناچار بێ لە بارودۆخی ژیانی ماسییەکاندا بژی لە ماوەی چەند خولەکدا دەمرێ. پێچەوانەکەشی راستە. رۆژئاوا کۆمەڵگایەکی بنیات ناوە کە یەکجار لە ئامێر دەچێ و خەڵکی ناچار دەکا رێوشوێنی ئامێر بگرنە بەر. هەندێ جار وا بیر دەکرێتەوە کە رۆژئاوا لەم رێگایەوە پێشکەوتنیشی بە دەست هێناوە، بەڵام مرۆڤ کاتێ ناچار بێ رێوشوێنێ رەچاو کا کە بۆ ئۆتۆمبێلی بارهەڵگریان داناوە، جگە لە مەرگ و لەناوچوون هیچ چارەنووسی دیکەی نییە. نەهرۆ دەڵێ: "تاکەکانی مرۆڤ لەیەک ناچن...

نەتەوەکانیش لەیەک ناچن... کەس وەکو کەسێکی تر نییە و لە رووی زیرەکی یان تواناشەوە لە کەسی تر ناچێ."

تەنیا ئامێرەکان دەتوانن تەواو وەک یەک بن. تەنیا ئامێرەکان دەکرێ لەبەر یەک هەڵوەشێن و شتیان لێ بگۆڕی و دە بەر یەکیان بنێیەوە. ئەگەر مرۆڤیش وەک ئامێری لێبێ ئیدی مرۆڤایەتی لەم دنیایەدا نامێنێ."

نوورا هەناسەیەکی هەڵکێشا. ترایان درێژەی دایێ: "تۆ وەک بوونێکی مرۆیی بوونت نییە. یان - رەنگە ئاوات پێ خۆشتر بێ - تۆ هەی، بەڵام وەک بوونەوەرێک کە بە هۆی ئامێرەوە گۆڕاوە و هەموو لەحزەیەک لە ژێر چاوەدێریدایە. لە سیستەمی ئامێریدا تەواو وەک کۆمەڵی بەربەران مرۆڤ هیچ نرخێکی نییە و ئەگەر بایەخێکیشی هەبێ ئەوەندە بچووکە بۆ ئەوە دەبێ پێی پێبکەنی. لە راستیدا تۆ هەر بەندی نی."

"واتە ئێمە لە زیندان راناگرن؟"

"ئێمە گیراوین، بەڵام لە راستیدا بەندی نین. واتە ئێمە وەکو مرۆڤی سەربەخۆ و جیا لە روانگەی دنیای ئامێریی رۆژئاواوە بوونمان نییە."

"ئەوە جێگای دڵخۆشی نییە. ئێمە بەندی نین، بەڵام لە بەندداین."

"با، ئەوە خۆی جێی دڵخۆشییە. تەنانەت تاقە دڵخۆشی دانەوەیە لە دوا کاتژمێرەکانی مێژووی ئێستادا."

## (١١٢)

سەرۆکی وەردیانان هاتە ژوورەکەیان و گوتی: "هەموو شتمان لە دەست چوو. ئەوە بخوێنەوە. شاری تورینگن و ڤایمار کەوتووەتە دەست رووسان. سەربازانی رووس گەیشتوونە ئێرە. نیوەشەوێ بە ئێڤایان هاتوون. ئەمریکییەکان شار بەجێ دێڵن. ئێستا تەنیا بینایەکی حکوومی و زیندانمان بە دەستەوە ماوە. نایەڵن هیچ کەس لە شار وەدەر کەوێ و سەربازەکان شاریان گەمارۆ داوە."

نوورا هەواڵی ڕۆژنامەکەی خوێندەوە. سەرەتا چاوێکی لە ترایان و پاشان لە سەرۆکی وەردیانان کرد کە پاڵی وە دەرگاکەوە دابوو:

"کەواتە هەر کە زیندانیان تەسلیمی رووسەکان کرد ئێمەش دەکەوینە دەستی وان؟"

"دەترسم وا بێ، رووسەکان ئەمڕۆ بە لای زۆرەوە تا بەیانی زیندان تەحویل وەردەگرن. دیار نییە چ کاتژمێرێک."

ترایان سەری لە ناو دەستان گرت. لە گژ فکران ڕاچووبوو و ئەو رستانەی دووپات دەکردنەوە:

"ڕاکردن، دووسەد کیلۆمەتر ڕێگا، رووسیا ـ ترس و تیرۆر ـ ئەتک کردن ـ کۆمیسێری سیاسی. وەکو کۆیلە بە دەست بەستراوی دەماندەنە ئەوان. دەرفەت کەمە. دەبێ واقیعبین بین. جەنابی سەرۆک وەردیان، دەبێ ئەوەت لە بەر چاو بێ، من دڵنیام ئەمریکییەکان هەر وا بە باڵ بەستراوی دەماندەنە دەست رووسان. ئەوە تاوانە، بەڵام کاتێ خۆم لە جێگای ئەوان دادەنێم بە خەتاباریان نازانم. مرۆڤدۆستی وان وەکو شەمەندەفەر وایە کاتێ کە مرۆڤ لەسەر هێڵی ئاسن دەپلیشێنێتەوە لە تۆ وایە پێدەکەنێ.

ڕۆژئاواییەکان رادەی گوناهیان گەیاندووەتە سفر. تەنانەت دەکرێ بڵێین وەک پەپوولە وان، بەڵام ئەوە کۆمەڵگایە تاوانبار و خەتاکارە، بەڵام لەم ساتەی ئێستادا ئەو قسانە هەمووی بە پووڵێ، من بۆیە باسی ئەو شتانەم کرد تا لەوەی وێوە دڵم بە هیچ شتێ خۆش نەکەم. تا چەند ساتی تر ئێمە دەدەنە دەست رووسان کە خوێنمژترین تیرۆریستن و تا ئێستا لە ژێر دەمامکی حکوومەت و دەوڵەتدا دەکوژن و دەبڕن. من لەوانەیە بتوانم لەگەڵ مرۆئامێرەکاندا هەڵبکەم، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز بەرگەی دڕندە ئامێرەییەکان ناگرم. زۆر روون و ئاشکرایە: بەرگە ناگرم. من پێش ئەوەی بکەومە دەست رووسان بە هەر شێوەیەک بێ هەوڵی راکردن دەدەم و ئەگەر ئەوەشم بۆ نەکرا هیچ ڕێگایەکم لەبەر دەمدا نامێنێ جگە لە خۆ کوشتن."

پاشان ترایان رووی کردە سەرۆکی وەردیانان: "تۆ یارمەتیمان دەدەی رابکەین؟"

"من ئەوی لە دەستم بێ دەیکەم. بۆخۆشم دەمەوێ رابکەم. من ئۆتریشیم (نەمساوی)، بەڵام دوای ئێوە رادەکەم."

نوورا پرسی: "ئەدی من؟ من ناتوانم رابکەم. زۆر دەترسم. ترایان وا چاکە دە پێشدا من بکوژی."

"ئێمە پێکەوە دەمرین."

سەرۆکی وەردیانان گوتی: "وا چاکە هەوڵی راکردن بدەی، ئەوە کارێکی مەحاڵ نییە. هەر هێندە بەسە بگەیە حەوشەی زیندان. ئەوەش لە گەمەی منداڵان ئاسانترە."

## (١١٣)

نوورا گوتی: "من ناوێرم بە پەت لە نهۆمی سێیەمەوە خۆم شۆڕ کەمەوە خوارێ. تۆ پیاوی، دەتوانی، بەڵام من ناوێرم."

ترایان بە پەتو و چەرچەفەکان پەتێکی دروستکرد.

"مەترسێ. تۆ هیچ مەکە. توند پەتەکەت لێ دەبەستم و بە ئەسپایی رۆیەڵت دەکەمە خوارێ. کە گەیشتییە عەرز دەچییە پەنا دیوارەکە و لە ژێر ئەو دارەی نیشانم دای رادەوەستی تا منیش دێم."

نوورا، سەرێکی پەتەکەی گرت. ترایان سەرەکەی دیکەی گرێدەدا. نوورا پەتەکەی بەردا و بە ناهومێدییەوە گوتی: "من ناتوانم رابکەم. کاتێ شۆڕم دەکەیەوە خوارێ لەوە دەترسم بە گوللە بمپێکن. هەر کە بیریشی لێدەکەمەوە وەختە ببوورێمەوە. باشە پێت وا نییە لە هەوا تەقەم لێ بکەن؟"

"لەوانەیە، بەڵام چارەی ترمان نییە. لەوانەش تەقەت لێ نەکەن. بەهەرحاڵ تەنیا لەو رێگایەوە دەتوانین دەرباز بین، نەک خۆمان بکوژین."

"ئەدی پێت چۆنە خۆ تەسلیمی رووسەکان بکەین. دەشقەم وەک دەڵێین ئاواش ئینسانخۆر نەبن. لە نێو کۆمۆنیستانیشدا بێگومان مرۆڤ هەن. ئێمەش لەوانەیە وەکو ئەوان بتوانین گیانی خۆمان قوتار بکەین."

"ڕاست دەکەی. سۆڤیەتیش مرۆڤی لێ هەن. لەوانەیە ژیان بۆ ئەوان وەک هی ڕۆژئاواییەکانیش سەخت نەبێ. هیچ بەڵگەیەک بۆ بەراورد لە ئارادا نییە. هیچ ڕاستییەک لە ئارادا نییە. من بۆخۆم دژی ژیانی ناو بەهەشتی سۆڤیەتم. لەوانەیە کەللەڕەقی و خێلەسەریی من گەوجانە بێتە بەر چاو، بەڵام لە ڕوانگەی خۆمەوە ڕاست و مەنتیقییە. هەر کەس بیر و بەرژەوەندی خۆی پێ مەنتیقییە. سانتایانا دەڵێ: "ڕۆحی شەرەفمەند لەسەر ئەوە پێداگرە کە بە دڵ و شێوەی خۆی بژی و ڕۆحێکی ئاقڵ هیچ تامەزرۆی ژیان نییە." من ئۆگر و تامەزرۆی ژیان نیم و هەموو ساتێک دەتوانم دەستبەرداری بم، بەڵام تا ئەو کاتەی دەژیم پێم خۆشە وەها بژیم کە خۆم پێم باش و دروستە. لەوانەیە ڕەخنەم لێ بگیرێ کە جۆری تێگەیشتنی من لە ژیان هەڵەیە. من هەر ڕەخنەیەکی لەو بارەوە لێم بگیرێ قەبووڵدەکەم، بەڵام بەوە ڕازی نابم کەسانێکی تر ڕێگای ژیانی من دیاریبکەن و ناچارم بکەن بە ڕەچاوکردنی بیر و باوەڕی وا واز لە بیر و باوەڕی خۆم بهێنم. ژیانی من تەنیا هی خۆمە. نە هی کۆڵخۆزە نە هی کۆمەڵگا و نە هی کۆمیسێری سیاسی. من مافی خۆمە وەها بژیم کە خۆم حەزم لێیە. تەنانەت ئەگەر ویستم وەک کۆمیسێرێک بژیم. هەر چەند قەتم حەز لێ نییە. من تەمەنی خۆم بە پێی شێوەی خۆم ڕادەبوێرم و ژیان بە شێوەی سۆڤیەتانم قەبووڵ نییە. ئەگەر نەتوانم وا بژیم خۆم دەکوژم."

نوورا دەستی بە گریان کرد. ترایان هێشتا خەریکی تون کردنی گرێیەکان بوو: "بڕوانە هێشتا ئەمریکییەکان لە حەوشەن؟"

نوورا چووە ئەوسەری ڕاڕەوەکە و لەێوە چاوی لە بورجی پاسەوانی کرد تا بزانێ سەربازانی رووس لەوێن یان نا. ترایان گوتی: "هەر پێنج خولەک جارێک دەبێ چاو لەوێ بکەین. کاتی گۆڕینی پاسەوانەکان لە لایەن رووسەکانەوە گونجاوترین دەرفەتە بۆ ڕاکردن. دەنا درەنگ دەبێ."

دانی بەیانییەکەی هەر بە تێک کردنەوەی پەتەکەوە بوون. بۆ دڵنیا بوون لە درێژی و قایمیەکەی تاقییانکردەوە. هەر پێنج خولەک جارێک یەکیان دەچوو چاوێکی لە بورجی پاسەوانی دەکرد. دەگەڕایەوە و دەیگوت: "هێشتا ئەمریکییەکان لەوێن."

هەر دووکیان خۆشحاڵ بوون. ئومێدی ئەوەیان هەبوو هەتا کاتی ئەمریکییەکان لە بورجی پاسەوانی بان دیار بوو هەموو شت لە دەست نەچووە.

## (١١٤)

نزیک کاتژمێر شەش ترایان و ئەلیو نوورایان گاز کرد. لەگەڵ بەندییەکانی تر سواری کامیۆنی ئەمریکییان کردن. ترایان رەنگی بە روانەوە نەمابوو، ئەلیو نووراش دەگریا. ترایان گوتی: "دیارە دەیانەوێ لە شوێنێکی تر تەسلیمی رووسەکانمان بکەن. ماشێنەکە رووەو رۆژهەڵات دەڕوێ."

شەقامەکانی ڤایمار پڕ بوون لە سەرباز و ئۆتۆمبێلی رووسان. ترایان پرسی: "دەڵێی چی خۆمان فڕێ دەینە خوارێ؟ دەمانبەنە زیندانی رووسەکان.

شاریان بەجێ هێشت. نوورا چاوی لە کێڵگە سەرسەوزەکان کەوت. چاوێکی لە رۆژ کرد و زانی هێشتا بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆن. ترایان گوتی: "زۆری نەماوە بگەینە دارستان. تۆ لە پێشدا خۆت فڕێدە و لە ژێر دەوەنێکدا مات بە تا منیش دێم. منیش دوای تۆ خۆم فڕێدەدەم.

نوورا هەر هەنیسکی دەدان.

"خۆت حازر کە.

"باشە راوەستە. ئێستا ناوێرم.

تازە دەرفەتی ئاوامان دەست ناکەوێتەوە. چاو لێکە ئەو دار و دەوەنەی قەراغ جادە چەند چڕو تێکچڕژاوە. هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نییە خۆتیان لە ناودا بشارییەوە. چاو لێکە، ماشێنەکە شلی کردۆتەوە."

نوورا وەلامی دایەوە: "نا، تۆ ئەگەر حەز دەکەی بڕۆ. سوێندت بۆ دەخۆم پێم ناخۆش نییە بە تەنێ رابکەی.

ترایان لە پەنای دانیشتەوە. چاوی قووچاند تا دیمەنی دار و دەوەنە چڕ و چوغوورەکەی دەیتوانی نوورا حەشار بدا، لە بەر چاوی نەمێنێ. تازە وا هەڵنەدەکەوتەوە. دوای کەمێک چاوی هەڵێنا. هەستیکرد خۆر لە دەموچاوی

دەدا. خۆرەتاو ئیدی لە دواوەیان نەبوو. ئێستا بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشتن. دەستی نوورای گرت و گوتی: "ئەمریکییەکانیش مرۆڤی چاکن."

"دەمانبەنە کوێ؟"

"پەردەیەکی تاریک پێش چاوی ترایانی گرت: "زیندانێکی ئەمریکییان." بە خۆیدا شکایەوە کە خۆشحاڵیی خۆی دەربڕیبوو.

"نوورا بمبوورە کە خۆشحاڵیی خۆم دەربڕی. هەڵەیە مرۆڤ بەوە خۆشحاڵ بێ کە لەزیندانێکەوە ببیەنە زیندانێکی تر. ئەوە ئەوپەڕی پێشکەوتنە کە مرۆڤی ئەورووپی بە دەستی هێناوە. مافی ئەوەی لە ناو چەند زینداندا یەکێکیان هەڵبژێری."

## (١١٥)

ئەفسەرە ئەمریکییەکە پرسی: "تۆ یوهان مۆریتسی؟" ئینجا دۆستانە بە روویدا پێکەنی و گوتی: "فەرماندەی سەربازیی شار حەز دەکا لە زمانی خۆتەوە ببیستێ کە چۆن راتکردووە؟ تۆ هەر ئەو کەسەی کە پێنج فەرەنسیت لە ئۆردووگای تازییەکان رزگار کرد، وایە؟"

یوهان لە خۆشییان سوور هەڵگەڕا. چاوەڕوانی ئەوە نەبوو ئەفسەرە ئەمریکییەکان سواری ئۆتۆمبێلیشی بکەن. لە دڵی خۆیدا گوتی: "دیارە فەرماندەی شاریش بەسەرهاتی من دەزانێ."

بە فیزێکی بێ وێنەوە گوتی: "بەڵێ من یوهان مۆریتسم."

"فەرمووو با بڕۆین. ماشێن لە دەرێ راگیراوە."

یوهان ویستی چاکەتەکەی هەڵبگرێ. هەر کراس و پانتۆڵێکی لەبەردا بوو. تەنانەت ویستی گۆرەویش بکاتە پێ، بەڵام ئەفسەرەکە زۆر بە پەلە بوو: "فەرماندە چاوەڕوانە. هەر ئاوا وەرە. پاش نیو سەعات دێیەوە. خۆم بە ماشێن دەتهێنمەوە."

هەردووکیان سواری جیپەکە بوون و وەڕێ کەوتن. یۆهان لێتا لە نووکەوە بەسەرهاتەکەی بۆ بگێڕێتەوە. لەبەر خۆیەوە قسەکانی راستە و پاستە دەکردن دەموچاو لە خۆشیان دەدرەوشایەوە. روخساری فەرماندەی دەهێنا بەر چاوی خۆی.

جیپەکە لە پێش دەرگایەکی گەورە رایگرت. ئەفسەرەکە رووی تێکرد و گوتی: "تۆ دەچیە ژوورێ."

یوهان لە جیپەکە دابەزێ. پێی ناخۆش بوو ئەفسەرەکە لەگەڵی نەهات ئەگەر هاتبا بۆ گێرانەوەی سەربردەکەی باشتر وە غیرەت دەکەوت، بەڵام دوو پۆلیسی ئەڵمانی هاتنە بەرەوە و لەگەڵ خۆیان برد. یوهان بە لای راست و چەپی خۆیدا روانی. بڕوای نەدەکرد فەرماندەی سەربازیی شار لە کەلاوەیەکی وا ترسناکدا دابنیشێ. نەشیدەوێرا بپرسێ. کاتێ گەیشتنە حەوشەی ژوورەوەی بیناکە چاوی بە شیشی سەر پەنجەرەکان کەوت. لە زیندان دەچوو.

ئینجا پرسی: "فەرماندە لێرە دەژی؟"

لە باتی وەڵام پێکەنینی گوێ کەرکەری دوو پاسەوانەکەی بەسەردا رووخا کە پێکەنینیان کەم مابوو لەو گۆڕەی بکەون. پاسەوانەکان یوهان مۆریتس یان لە سللوولێکی تاریک لە نهۆمی یەکەم پەستاوت و کاتێ کلیلەکەیان دوو جار لە ناو کێلوونەکەدا سووڕاند هێشتا بە قسەکەی یوهان پێدەکەنین.

## (١١٦)

کۆرینا کۆرۆگا ژنە قەشەیان بردە شارەوانی. شەو راشکابوو کە دوو گوندی بە بازووبەندی سێ رەنگەوە وەرگەڕانە پەنجەرەی ژوورەکەی و ئەمریان پێکرد لەگەڵیان بچێ. مانگی چاردە تریەی داویشت. قەشەژن بە دیقەتی زۆرەوە دەرگای ماڵی گاڵە دا و کلیلەکەی دە دەستی گرت. ئینجا لەگەڵ ئەو دوو پیاوەدا رۆیی. لە حەساری شارەوانی نزیکەی دە عەسکەری رووس لەگەڵ کۆمەڵە گوندییەک جەژنیان بەرپا کردوو. قەشەژنیان بردە لای وان. سەربازەکان گلاسە شەرابێکیان بۆ راگرت و بە هەموو بارێکدا سەرنجیان دایێ. ژنە قەشە چاوی لە زەوی بڕی و لە ژێر لێوانەوە دەستی بە

وێرد و نزایان کرد. سەربازانی لەشکری سوور دەیانویست بە زۆر شەرابی دەرخوارد بدەن، بەڵام ئەو بێ ئەوەی گلاسەکە وەربگرێ یان چاویان لێبکا خەریکی دوعا خوێندنی خۆی بوو. لەو کاتەدا عەسکەرێک گلاسە شەرابەکەی وە بەرۆکی گێڕا. عەسکەرێکی دی داوێنەکەی هەڵدایەوە و گلاسە شەرابێکی دیکەی پێدا کرد. قەشەژن گوێی نەدانێ. هیچی نەدەدی. چاوی لێکنابوون و لە بارەگای نیکۆلای پیرۆز -کە زۆر لە مێردەکەی، قەشە کۆرۆگا دەچوو- دەپاڕایەوە. سەرباز و گوندییەکان چەند گلاسێکی دیکەشیان بە سەر و سەکوت و ژێر جلەکانیدا کرد. هەموو گیانی تەڕ ببوو. پاشان دڕندانە لە عەرزیان دا. قەشەژن هەستیکرد سەرتاپا تەڕ بووە، وەک لە ئاوت هەڵکێشابێ. وای دەهاتە بەر چاو کە دەچێتە ژێر ئاو و خەریکە نوقم دەبێ، نیکۆلای پیرۆزیش لە لێوارێ راوەستاوە و دوعای بۆ دەکا.

بۆ سبەینێکەی کۆرینای قەشەژن لە ژووری مریشکان خۆی هەڵواسی.

## (١١٧)

یەکەم شەو بوو کە ئەلیو نوورا وێست لە ئۆردووگای "ئۆهردۆرف" بوو. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "شتی وا نابێ، هەر وا لە خۆڕا بەندمان بکەن."

ئەلیو نوورا نە دۆشەگی هەبوو نە لێفە. لەسەر تەختەداری رەق و تەقی کەوێڵەکە راکشابوو. سمت و ئانیشکی، نا، هەموو هێسکی لەشی دەیچریکاند. سەری شەو بوو کە هێنایانە ئەم ئۆردووگایە. هێشتا لەو ئێڤایەی لە ڤایمارەوە هێنابوونیە ئەوێ بە تەواوی دانەبەزیبوون کە لەگەڵ ترایان لێکیان دابڕین و ئەویان ناردە لایەکی دی. دواجار ئەمیشیان هێنایە ئێرە. بەشی ژنان چەند کەوێڵێک لە دار دروستکرابوون. ئەو شوێنەی نوورای لێبوو، سێ ژنی دیکەشی تێدابوون. کاتێ چووبووە ناو کەوێڵەکەوە ئەوەندە تاریک و تنووک بوو تا دەمێ شتاقی نەدیتبوون. نوورا لەسەر تەختە دارینەکەی خەوت و لە خەودا دەستی بە گریان کرد. پاشان بە دەنگێک لە خەو راپەڕی. لەبەر خۆیەوە گوتی: "دەبێ نیوەشەو بێ."

لە سووچێکی کەوێڵەکەوە فرقەی بە ئاستەمی پێکەنینێک هات. وا تێگەیی دەنگی پێکەنینی پیاوێک بێ، بەڵام پیاو لە ناو ئۆردووگای ژناندا چ دەکا؟ گوێی سڵ کردن. بێگومان دەنگی پیاوێک بوو.

بەڵام ئیتر دەنگی پێکەنین نەهاتەوە. بە باشی دیار بوو مەسەلەیەکی دیکە لە گۆڕێدایە. بە ئاشکرا دەنگی هانکەهانکی پڕ لە چێژ وەرگرتنی جووتێک دەهات کە لە باوەشی یەکتردابن.

دیسانەوە دەنگی پێکەنینی پیاوەکە هات، بەڵام ئەوجارەیان دەنگەکە لە سووچێکی تری ژوورەکەوە دەهات. ئەلیو نوورا ترسی لێ نیشت. "من بۆ دەبێ بە عەشقێنیی خەڵک بترسم؟"، بەڵام نەیدەتوانی بەسەر شڵەژانی خۆیدا زاڵبێ.

گوێی هەڵخستەوە. ئێستا هیچ دەنگێک نەدەهات، بەڵام نوورا تەنانەت بە چاوی نووقاویشەوە دەیتوانی بیانبینێ. تەختەکەی کەوتە جیڕە جیڕ. ئەلیو نوورا چاوی هەڵهێنا، دەرگای کەوێڵەکە لەسەر پشت بوو. چەند پیاوی دی هاتبوونە ژوورێ. لە ناوەڕاستی کەوێلکەکە راوەستابوون و پێکەوە دەدوان، ژنێک بە جلی خەوینوە لە پەنایان راوەستابوو. ئەلیو نوورا چیدی خۆی رانەگیرا. تا هێزی تێدا بوو زیڕاندی. سەرەتا نەیزانی بۆچی زیڕاندووە، بەڵام جارێکی دیکەش زیراندی، لەبەر ئەوەی لەو ژن و پیاوانەی لەوێ بوون دەترسا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "من شێت بوومە. نەدەبوو بزیڕێنم. ئێستا دادەوەرووکێنە سەرم و هێندەم لێدەدەن دەمکوژن. هەقیانە لێم دەن. باشە من بۆ زیڕاندم؟"

لەپڕ پیاوەکان هرووژمیان بردە دەرگا و هەڵاتن. ژمارەیان یەکجار زۆر بوو. تەنانەت هێندێکیان لە عەرزی نووستبوون. نوورا پێشێ گوێی لە دەنگیان نەببو. تەختەکەی تەنیشتیشی ژن و پیاوێکی لەسەر نووستبوون. نوورا ئەوانیشی نەدیبوون.

ئێستا پیاوەکان هەموو وەدەر کەوتن. وەک تارمایی دەهاتنە بەر چاو. وای دەهاتە بەر چاو هێندێکیان چوارشانە و رەش بن. رەشتر لە شەو. چەند ژنێکیش لەگەڵ وان وەدەر کەوتن. دوای کەمێک لەسەر نووکی پەنجەی پێ گەڕانەوە و لەسەر تەختەکانیان درێژ بوونەوە. وڵات بێدەنگ بۆوە. ژنەکان هەر کام چوونەوە سەر جێگای خۆیان. دوو کەسیان نەبێ کە بە دیار دەرگاکەوە

راوەستابوون. لەو تاریکانەدا راوەستابوون و کراسی کورتیان لەبەردا بوو. هێڵی ئەندامی شەهوانییان ئەگەر ژوورەکەش روناک با وا بە چاکی دیار نەدەبوو. ژنەکان هیچیان نەدەگوت. پاڵیان بە یەکەوە دابوو. نوورا زانی شتێک دەخۆن. شەگەلات بوو.

نوورا چاوەنوارِ بوو ئەوانیش بچنەوە سەر جێگاکانیان. دەترسا خەوی لێبکەوێ و بیکوژن یا لانی کەم لێی بدەن، بەلام ژنەکان هەروا بە هێمنی لەوێ راوەستابوون و بە بێدەنگی شەگەلاتەکانیان دەجاوی.

پاشان یەکیان بە سرتە لەوی دیکەی پرسی: "کێ بوو زریکاندی؟ ئەو قژ سوورەی تازە هاتووە؟"

"نازانم، بە هەرحاڵ پێم ناخۆش نەبوو زریکاندی. من لێ ببوومەوە. حەزیشم لێنەبوو چیدی خەریک بم."

هەروا شەگەلاتیان دەخواردن و چی تریان نەگوت. ئەلیو نوورا چاوی بز کردبوون و بە وردی ئاگای لە هەست و خوستیان بوو. دواجار هەر یەکەو چوونە سیلەیەکی ژوورەکەوە و خۆیان هاویشتە سەر تەختەکانیان. تەختەکان جیرەیەکیان کرد و پاشان بێدەنگی ولاتی داگرت.

نوورا وەخت بوو بخنکێ. خەوی لێنەدەکەوت. ئێستا ژوورەکە تاقە پیاوێکیشی لێنەبوو و ژنەکان هەموویان خەوتبوون، بەلام ژوورەکە لە بۆنی شەراب و ئارەقەی لەش و بۆنی پیاو ئاخنرابوو. پەنجەرەکان ئاوەلا بوون، بەلام ئەو بۆنە کەم نەدەبۆوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "بۆ زیندانی کردنی من دەبێ هۆیەکیان هەبێ، دەنا نەیاندەگرتم." کۆخەی هاتێ، دەستی بە دەمیەوە گرت و زەختی لە خۆی کرد نەکۆخێ. لەوانە بوو ئەگەر بکۆخێ ژنەکان وەری بگەڕێنێ.

## (١١٨)

بەیانیی یەکەم رۆژ لە ئۆردووگای "ئۆهردۆرف" ترایان هەر کە چاوی هەڵهێنا یوهان مۆریتسی دی. یوهان گوتی:

"شەوێ تا بەیانی لە کن یەک نووستببووین."

ترایان دەستی یوهانی گوشی و گوتی: "تۆ لێرە چی دەکەی؟"
یوهان بەسەرهاتی خۆی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە، بەڵام لە پێشدا باسی ئەو ئەفسەرەی بۆ کرد کە چۆن بە بیانووی گێڕانەوەی بەسەرهاتی رزگارکردنی پێنج فەرەنسییەکە بۆ فەرمانداری شار، هێنابوویە زیندان: "لەباتی ئەوەی بمبەنە لای فەرمانداری شار، لە زیندانیان کردم. دوو مانگ لەوێ بووم. لە سللوولێکی بێ پەنجەرە هەر چاوەڕوان بووم کەس لێی نەپرسیم. پاشانیش هێنایانمە ئێرە. تەواو."
یوهان لە قسەکانی بووە و لە ترایانی پرسی: "ئەدی تۆ؟ تۆ بۆ لێرەی؟"
ترایان شانی هەڵتەکاند.
بەندییەکان کە لەسەر عەرزی ژوورەکە خەوتبوون وە ئاگا هاتن. ئۆردووگای ئۆهردۆرف کێڵگەیەک بوو بە تێلدڕوو دەورە درابوو. پازدە هەزار پیاو لەو ئۆردووگایە بوون. جگە لە ئاسمان و زەوی و پیاو، هیچی دیکەی لێ دەست نەدەکەوت. لە هەر چوار لای ئۆردووگاوە تانکیان دابەستوون و سەربازەکان بە رەشاش گۆڕەپانی ئۆردووگاکەیان خستبووە ژێر چاوەدێریی خۆیان. یوهان مۆریتس پرسی: "هیچ هەواڵی فانتانات نییە."
سەیرێکی ترایانی کرد و دووپاتی کردەوە: "ئێستاش بڕوا ناکەم تۆ لێرە بی. چۆن بوو ئێمە یەکترمان دیتەوە؟ تێناگەم، چۆن...؟"

## (١١٩)

فەرماندەی ئۆردووگا جوولەکە بوو. ئەلیو نوورا کە ئەوەی زانی دڵی خۆش بوو: "جوولەکەیەک باشتر لە دەردی من دەگا. بە دڵنیاییەوە بەرمدەدا."
نوورابڕیاریدا هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە. وەک خوشکێک کە لەگەڵ براکەی دەردە دڵ دەکا. دیواری نووسینگەی سەرۆکی ئۆردووگا بە چەند وێنەی ئۆردووگای نازییەکان رازابۆوە. نوورا چاوێکی لە وێنەکان کرد. وێنەکانیان زۆر گەورە کردبوونەوە. دیمەنی جۆراوجۆری تەرمی لە دار دراوان و خەڵکێک کە لە برسان مردبوون، فەرماندەی ئۆردووگایەکی

نازییەکان بە بەرگی ڕێک و دەق گرتوو، لاشەی لە سەر یەک کەڵەکە بوو، سێدارە و ئیڤایەکی پڕ لە تەرمی ژنان دەبیرا. نوورا لە بیری نەمابوو لە کوێیە. چاوی لەو ئەفسەرە کرد کە زۆر ڕەسمیانە لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو. ئەویش سەری سوور بوو. ئەلیو نوورا لە دڵی خۆیدا گوتی: "من خوشکی تۆم، تکا دەکەم یارمەتیم بدە."

تا ئەو ساتە قەت ئەوەندەی هەست بە جوولەکە بوونی خۆی نەکردبوو: "جەناب ستوان..."

قورگی گیرابوو. ئەوە کوڵەگرووو بوو ئەوکی ڕێکدەگوشی. ئەفسەرەکە بە شێوەیەکی وشک گوتی: "هەتا پرسیاریان لێنەکردووی قسە مەکە." نوورا لێوی خۆی گەست و بێدەنگ بوو. چاوەڕێ بوو. چاوەڕێ بوو پرسیاری لێ بکرێ. ئەفسەرەکە بەبێ ئەوەی گوێی بداتێ خەریک بوو شتێکی دەخوێندەوە. هەندێکی کاغەز لە پێش بوو. بە توندی پرسی: "ناوت ئەلیو نوورا کۆرزۆگایە؟ ئەمە تۆی؟ مێردەکەشت بەندییە، وایە؟"

نوورا وەخۆ هاتەوە کە لەگەڵ ئەویەتی، بەڵام وەک برایەک لەگەڵی نەدەدوا.

"مێردەکەت پیاوی دیکتاتۆر ئانتۆنسکۆ بوو؟"

"مێردەکەم کارمەندی وڵاتی پادشایەتیی ڕۆمانی بوو."

ئەفسەرە، خۆی سوور هەڵگەڕا. دەموچاوی شڵەی وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو و لێوی دەلەرزی:

"لە ڕۆمانی تاقمێک دڕندەی جوولەکەکوژ دەسەڵاتدار بوون. وایە یان نا؟"

پاشان بەبێ ئەوەی دەرفەتی وەڵام بداتە ئەلیو نوورا گوتی: "ڕۆمانیاش ئۆردووگای جوولەکانی لێبوو؟ لە ئۆردووگاکانی ئەوێش جوولەکەیان دەسووتاندن، بە گاز قانگیان دەدان و دەیانخنکاندن، لە سێدارەیان دەدان، سەریان لێ دەکردن و گوللەبارانیان دەکردن؟"

دوای ئەو قسانە هەستایە سەر پێ. ئەلیو نوورا دەیویست بڵێ، ئەو بۆخۆشی جوولەکەیە و بۆ ڕاکردن لە ڕۆمانیا ناچار بووە ناسنامەی ساختە دروست بکا. دەیویست بڵێ ناچار بووە لە ڕۆمانیا هەڵێ و لەو ماوەیەدا هەموو شەوێ لە ترسان هەڵلەرزیوە. ئەفسەرەکە گوڕاندی: "تەنیا وەڵامی پرسیارەکەم

بدەوە." و پاشان دەستی کردە مست و لێی چووە پێشەوە. نوورا پێی وا بوو بە مستەکۆڵە بەردەبێتە دەمولووتی. چاوی قووچاند. گڕ گڕ دەلەرزی. نەیوێرا یەک وشەش بدرکێنێ.

"وەڵام بدەوە کێوی. تۆ خۆت چەند جوولەکەت کوشتوون؟" دەنگی ئەفسەرەکە ببووە هاوار.

"دەی بڵێ. ئەگەر هەروا بێدەنگ بی مشوورت دەخۆم. چەند کەست بە دەستی خۆت خنکاندوون؟"

ئەلیو نوورا نوتقی بەسرابوو.

"وەڵام نادەیەوە؟ ترساوی ها؟ ئێستا لە ترسان دەلەرزی، بەڵام ئەودەم کە مرۆڤت دەکوشتن نەدەترسای؟"

"من بۆخۆشم..." ئەلیو نوورا قسەکەی پێ تەواو نەکرا.

"بۆ دەرەوە قەحپەی نازی، ون بە لە بەر چاوم."

ئەفسەرەکە لێی راسا. ئەلیو نوورا بە دەم ساتمە بردنەوە وەدەر کەوت.

# بەشی پێنجەم

## (١٢٠)

رایان کۆرۆگا خەریکی یوهان لە پەنایەتی و بە سەرسامییەوە ئاگای لێیە کە ترایان چۆن بەوپەڕی دیقەتەوە پیتەکان بە پەنا یەکەوە دەکێشێتەوە. دەڵێی کۆمەڵە مرواریییەک بە دەزوووەوە دەکا. یوهان بۆخۆی حەوسەلەی نووسینی نییە. هەر حەزیشی لێناکا، بەڵام دەتوانێ چەند کاتژمێر بەبێ ئەوەی ماندوو و وەڕەز بێ چاو لە نووسینی ترایان ببڕێ. یوهان لە دڵی خۆیدا گوتی: "ترایان کە دەنووسێ دەڵێی بەندبوونی خۆی لە بیر دەچێتەوە و ئیدی ئاگای لەوە نامێنێ پێڵاوی لە پێدا نییە و ردێنی هاتووە یان پانتۆڵی شڕی لەبەردایە. کاتێ جەنابی ترایان شت دەنووسێ دەبێتە یەک پارچە مەزنایەتی و مرۆڤ ناچارە بەرامبەری کڵاو داگرێ و سەبر بدوێ."

ترایان پرسی: رەنگە بیستبێتت کەسانێک هەن مار دەستەمۆ دەکەن؟"

"بەڵێ بیستوومە."

"دانیاڵ پێغەمبەر رۆژێک کەوتە ناو چاڵێک کە پڕ بوو لە شێر. شێرەکان دانیال پێغەمبەریان قووت نەدا، لەبەر ئەوەی دەستەمۆی کردن. مرۆڤ لە دەستێ دێ مار و شێر کەوی بکا. ژووری کاری مۆسۆلینی هەمیشە دوو پڵینگی لێبوو. مۆسۆلینی کەویی کردبوون. مرۆڤ دەتوانێ هەموو گیانلەبەرێک کەوی بکا، بەڵام ئەورۆکە رەگەزێکی دیکەی گیانلەبەران سەری هەڵداوە کە پێیان دەگوترێ "غوڵام، ئەمانە نە لە لێراندا دەژین نە لە مێشەڵاندا، بەڵکو لە نووسینگە و پشت مێزانن. ئەو غوڵامانە کە کێوییش دڕندەترن. ئەمانە تێکەڵەیەکی مرۆڤ و ئامێرن. ئەوانە کە بەهێزترین رەگەزی سەر زەوین، زۆڵن. بیچم و رواڵەتیان لە مرۆڤ دەچێ. لەوانەیە لەگەڵ مرۆڤ لێت بگۆڕێن، بەڵام، هەر زوو بۆت دەردەکەوێ لە وەک مرۆڤ هەڵسوکەوت ناکەن، من پێموایە ئەوانە لە جیاتی دل ئامێرێکی وەک کاتژمێریان لە ناو

سینگدایه و شتێکیان لێ دەرچووە نە مرۆڤە و نە ئامێر. حەز و هەوەسیان هی ئاژەلانە، بەلام ئاژەڵی درندەش نین، بەڵکو غولامن. واتە بەری موتوربەیەکی سەقەتن کە ئێستا سەرانسەری دنیایان تەنیوە.

یوهان هەوڵدەدا غولامێک وا بهێنێتە بەر چاوی خۆی، بەلام بۆی جێبەجێ نابێ. بۆ لەحزەیەک مارکو گۆڵدنبێرگی وە بیر دێتەوە، بەلام لەو کاتەدا ترایان درێژەی فکرەکانی هەڵدەبڕێ: "من نووسەرم. نووسەر خۆی دەستەمۆکەرە. یان لانیکەم بە ئاقڵی کورتی من وایە. ئەگەر نووسەر جوانی - واتە هەقیقەت - بخاتە بەر چاوی خەڵک، هەموویان دڵنەرم و دلۆڤان دەبن. من هەوڵدەدەم ئەم "غولام"انە کەوی بکەم، بۆیە دەستم بە نووسینی کتێبێک کردووە. گەیشتبوومە بەشی پێنجەم کە ئازادییان لێ زەوتکردم و نەمتوانی تەواویکەم. ئێستا بە ناچاری لە باتی تەواو کردنی ئەو کتێبە، شتێکی وا دەنووسم ئەو غولامانەی پێ بێدەنگ بکەم. ئەگەر ئەو کارەم بۆ بکرێ لە حاڵی ئاشتبوونەوە لەگەڵ چارەنووسدا دەمرم. ئەوەی دەینووسم بۆ تۆشی دەخوێنمەوە. ئەو نووسراوە نە رۆمانە و نە شانۆنامە. غولام حەزیان لە ئەدەب نییە. بۆ دەستەمۆکردنیان ناچارم فۆرمێک بەکار بهێنم کە لەگەڵیاندا بگونجێ. بۆیە عەرزوحاڵیان بۆ دەنووسم. غولام کاتی ئەوەیان نییە رۆمان و دراما و شیعر بخوێننەوە. ئەوان تەنیا کەیفیان بە پرسیارنامە و عەرزوحاڵ نووسین دێ.

## (١٢١)

عەرزوحاڵی ژمارە ١، لە بارەی ئابوورییەوە: بەز

ئێوە لە منەوە زنجیرەیەک نامە و پێشنیارتان پێدەگا. وا ئەم بابەتە ئابوورییە دەکەمە دەستپێکی کارەکەم. من ئاگادارم کە شارستانیەتی رۆژئاوا لەسەر بنەمای ئابووری هەڵدەسووڕێ و ئابووری "ئینجیل"ی ئەم کۆمەڵگایەیە. من نووسەرم و هەموو نووسەرێک حوکمی "شایەد"ێکی هەیە. گرنگترین و بەراییترین تایبەتمەندی "شایەد" بێلایەنییەکەیەتی.

عەرزوحاڵەکانی من تەنیا دەربڕی راستییەکان دەبن. ئەو بابەتەی دەمەوێ لێی بدوێم، واتە "بەز"، بە لامەوە بە شێوەیەکی سەیر گرفت و مەتەڵئامێزە.
وەک دەزانن مرۆڤ تووشی زێدە بەزی بووە. من کاتێ هاتمە ئۆردووگا بەندییەکان وەک کوچک و کەڵەک بەسەر یەکدا کەوتبوون و لەسەر عەرزی رەق و رووت خەوتبوون. من لە زیندانەوە هاتبووم و زۆر کز ببووم. ئۆردووگا لەبەر چاوم زۆر بەرفەرە بوو، بەڵام لەوە تێنەگەیشتم بۆچی شوێنی تایبەتی بەندییەکان هێندە بەرتەسکە. پازدە هەزار مرۆڤ لە پاڵ یەکدا و تەنیا کاتێ کە بە پێوە بن بە باشی جێگایان دەبێتەوە و ئەگەر هەموویان راکشێن جێگای هەموویان نابێتەوە و لەسەر یەک کەڵەکە دەبن. من بۆخۆم شەو تا بەیانی نەمتوانیی رابکێشم. قاچی کەسانی دیکەش کەوتبوونە سەر سەر و سینگم و لەبەر ئەوەی تا بەیانی قاچیان لەسەر لەشم بوون هەستم بە سەرما نەکرد. من پێم وایە ئێوە لە ترسی ئەوەی گیراوەکان گیانی کێڵگەکە برووتێننەوە، شوێنی حەوانەوەیانتان گەورە نەکردووە. ئێوە ئەو گیایەتان پێدەوێ. تفاق گرانە و حەیفە بەندییەکان کاوێژی بکەن. بێگومان مانگایەکی گیایەکە بخوا چاکترە لەبەر ئەوەی شیر دەدا، بەڵام بەندی هیچ نادا. جگە لەوە بەرین کردنی شوێنی حەوانەوەیان تێلدڕووی زیاتری دەوێ. کانزاش خۆ بە لاش نییە. من بۆخۆم پێم وایە بەرین کردنەوەی شوێنی حەوانەوەی بەندییان و بەو پێیەش کڕینی تێلدڕووی زیاتر، کارێکی بێجێیە. بە تایبەت لەبەر ئەوەی وای بۆ دەچم لەگەڵ بارینی یەکەم باران و هاتنی بەند و شکستدا بتەهەوێ و نەتهەوێ ژمارەیەکی زۆر لە بەندییەکان دەمرن و ژمارەکیان ناگەنە ئەو کاتیش و دنیای فانی بەجێدەهێڵن. بەم جۆرە ئەوانەی دەمێنن دەتوانن پێی لێ رابکێشن. من دەبێ پێی لێ بنێم، بەو هەموو وردبینییەتان لەمەڕ پێشبینیی دروستی رووداوەکان سەرسامم. من پێش خەوتن گوێم لە نوتقێک راگرت. دیارە نوتقەکە بەبێ بانگهێشت کردن بوو. وتاربێژەکە دەیگوت مامۆستای زانینگەی بەرلین بووە، لە بارەی مادەی چەوری و بەزەوە دەدوا. زۆر حەز دەکەم لە بارەی بابەتی قسەکانی ئەوەوە راپۆرتێکی تێر و تەسەلتر بخەمە روو. جەنابی پرۆفیسۆر ژمارەی ئەو نۆکانەی نیوەڕۆ و شەوێ وەک جیرەی خۆراک وەری گرتوون، لەسەر یەک حیساب کردوون. توانیبووی دیاریبکا کە هەر بەندییەک لە دوو ژەمی

نیوەڕۆ و شەویدا دە دەنک نۆکان دەبینێتەوە. جێگرەکانیشی کە هەمان جیرەیان وەرگرتبوو، راستی و دیقەتی تاقیکردنەوەکەی پرۆفیسۆریان دەسەلماند. پرۆفیسۆر جگە لەوە ژمارەی پەتاتە و بڕی ئەو ئاردەشی لێکدابۆوە کە لە سووپی بەندییەکاندا بەکار دەهێنرێ. دیارە ئەو لێکدانەوە و پێوانەیە هەر مەزندە بوو، لەبەر ئەوەی چوونە ناو چێشتخانە قەدەغەیە. هەر وەک دەزانن ئەڵمانەکان وەستای بێ ئەملاوئەولای حیساب و لێکدانەوەن، کەوابوو دەتوانین بڵێین ژمارەی نۆکەکان بە راست و دروستی دیاریکراوە. ئەڵمانەکان خۆڕاگر و بە ویژدانن. پرۆفیسۆر دوای سی رۆژ تاقیکاری و توێژینەوە ئاکامی کارەکەی ـ کە پێشوازی لێکرا ـ خستە روو. ئەڵمانەکان زۆریان حەز لە گوێ گرتن لە وتاربێژی لە بارەی بابەتی جۆراوجۆرە. لە کۆنەوە هەر وا بوون. پرۆفیسۆر دوای روون کردنەوەی چۆنیەتیی ژماردنی رۆژانە رادەی کالۆریی نۆکەکانی بە ئاگاداریی گوێگرانی گەیاند کە بە داخەوە ئێستا لە بیرم نییە چەند بوو. پرۆفیسۆر پاشان رادەی کالۆریی دە نۆکەکەی لەگەڵ هی پەتاتە و ئاردەکەدا ـ کە بەندیی قەت بە چاوی خۆی نەیدیبوون، بەڵام پرۆفیسۆر لەسەر هەبوونیان لە ناو خواردنەکەدا پێداگر بوو ـ لێکی دایەوە و سەرەنجام بەو ئاکامە گەیی کە هەر بەندییەک رۆژێ پێنجسەد کالۆری گەرما وەردەگرێ. هەڵبەت زۆر جار لەوەش کەمتر. بۆ نموونە پرۆفیسۆر هەندێک رۆژ نەیتوانیوە یەک قل نۆکیش لە سووپەکەیدا ببینێتەوە، کە پازدە و تەنانەت جارێکیان هەژدە دەنک نۆکی لە سووپەکەیدا دۆزیبۆوە. بەم جۆرە رادەی ژمارەی دەنکە نۆکەکان مووی لێنادا. مرۆڤێک ئەگەر شەو و رۆژ بنوێ رۆژێ هەزار کالۆری گەرما سەرف دەکا. بەندییەکان خۆ هەمیشە نانوون، کەوابوو کالۆریی پتریان دەوێ.

پرۆفیسۆر هەمان ژمارەی "هەزار"ی کردە بنەمای لێتوژینەوەکەی خۆی. بەندی، پێنجسەد کالۆریی لە رێگای نۆکەکانەوە بە دەست دەهێنن و پێنجسەد کالۆرییەکی دی لە پاشەکەوتی بەزی لەشی خۆیان وەردەگرن. هەر کەس ـ بە شێوەیەکی مامناوەندی ـ مانگێ شەش پۆند[1] کێشی کەم دەبێتەوە. بە پێی

---

١- هەر پۆندێک دەکاتە نزیکەی نیو کیلۆ ـ وەرگێر.

لێکدانەوەی ئەو پرۆفیسۆرە مانگانە لە ئۆردووگای تۆدۆرۆڤ کە جەنابتان شەرەفی بەڕێوەبردنیتان پێبڕاوە ٤٥٠٠٠ کیلۆ بەز و چەوری خەسار دەبێ. واتە هەموو مانگێک بە قەد باری پێنج کامیۆن ئازووخە بە فیڕۆ دەچێ. برایان کەمێ لێی ورد ببنەوە، چ خەسارەتێکی گەورەیە. من زانا نیم و ناتوانم ڕێگەچارەیەکتان لەبەردەم دانێم. بەهەرحاڵ دەزانم ئێوە بە یارمەتیی ئەو ئامرازە زلانەی پیشەسازی و ئامێری خۆتان بە چاکی دەتوانن سوود لەو هەموو بەز و چەورییە وەربگرن. دەی بۆ بە خۆڕایی لە ناو بچێ؟ بەڕێزان، ئێوە سەر بە یەکێ لە پێشکەوتووترین نوێنەرانی شارستانیەتی رۆژئاوان. رەنگە خراپ نەبێ راپۆرتێک لەم بارەیەوە رەوانەی ئاکادیمیای زانستی وڵاتەکەتان بکەن. ئەوە ئەوپەڕی پاشکەوتووییە لێگەڕێن هەموو مانگێک ئەو هەموو چەورییە بەبێ هیچ کەڵک و قازانجێ لەناو بچێ. ئێوەی بەڕێز سەدان ئۆردووگای لە چەشنی ئەم ئۆردووگایەتان لە سەرانسەری ئەڵمانیادا هەن و لەوانەیە لە سەدانیش زیاتر. بەم جۆرە تێکڕای سووتەمەنیی بێ سوودی مادەی چەوری ژمارەیەکی یەکجار زۆری لێدەردەچێ. من لەو کاتەوە گوێم لە وتاربێژە راگرتووە، بە باشی لە هەوادا هەست بە بۆنی بەزی مرۆڤ دەکەم. دەماخی من هەموو رۆژێ ئەو بۆنە هەڵدەمژێ. باشە ئێوە ئێواران کاتێ لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەتان رادەوەستن لەگەڵ شنەی بادا بۆنی چەوریی مرۆڤان ناکەن؟ پێم وایە تەنانەت جلوبەرگیشتان چەور بووبێ. لە هاوسەر یان دڵدارتان کە شەو لە باخەڵیاندا دەنوون بپرسن ئاخۆ کاتێ ئاوێزانیان دەبن بۆنی بەز و چەورایی مرۆڤی زیندووتان لە پێست و قژ نایە؟ لەوبارەوە ژن چاکتر بۆن دەکەن. بۆخۆشم هەمیشە بەو بۆنە دڵم لە ژێڵڵا دێ. دڵنیاتان دەکەمەوە من یەک لەو کەسانەم کە بە شارستانیەتی ئێوە سەرسامم و بڕوام وایە سەرەنجام کارێکی وا دەکەن بەز و چەوریی ئێمە بکەنە شتێکی بە کەڵک. (لە بیرتان نەچێ بەندەش مانگێ سێ کیلۆم هەیە بیدەمە خزمەتتان.)

ئیمزا:

شایەد

## (١٢٢)

عەرزوحاڵی ژمارە ٢

بابەت: جوانیناسی (ئایدیالی جوانیی مرۆڤ لە کۆمەڵگای تەکنەلۆژیی ڕۆژئاوادا)

من دوێنێ دەرفەتی ئەوەم بۆ رەخسا لەگەڵ ئەڵمانییەکی خوێندەوار و شارەزا لەبارەی جوانیناسییەوە بدوێم. دواجار قسەمان لێک هەڵبەزییەوە. ئەوانیش وەک ئەوروپییەک بە زۆری لە کلاسیزمدا چەقیون. هۆی نوشوستی هێنانیشیان هەر ئەوەیە. کۆمەڵگایەکی ساخڵەم و پێشکەوتوو تەنیا هونەرێکی پێ هونەرە ئەویش ئەو هونەرە مۆدێرنەی لە سیستەمی ئامێریی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوادا دەبینرێ.

پرۆفیسۆر ئاماژەی بە دیمەنی ئەو بەندییانەی ناو ئۆردووگا کرد کە خۆتان دەزانن هەر ئێسک و پێستن و بە بڕوای وی دزێو و قێزەونن. ئەو خۆی پابەندی ئایدیالی جوانیی یۆنانییەکانە، بەڵام من بۆم دەرکەوتووە: ئەو مرۆڤانەی تەنیا ئێسک و پێستیان ماوەتەوە یەکجار جوانترن. بەرهەمی هونەریی پەتی. لە دنیای تەکنەلۆژیی ڕۆژئاوادا تەنیا ئەوانەن نموونەی جوانیی مرۆڤن. من زۆرم هەوڵدا قەناعەت بە پرۆفیسۆری ئەڵمانی بێنم کە سیستەمی کۆمەڵایەتیی ئێوە بە جۆرێکە ڕێزی هیچ نەزمێکی بەقەد جوانی لەبەر نییە و ئێوە تەنیا لە ڕوانگەی زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەزی مرۆڤان دەتوێننەوە تا دنیا لێک و لەبارتر بکەن، بەڵام پرۆفیسۆر تێم نەگەیشت. ئەڵمانەکان زۆر ناحاڵین. من سبەی لەبارەی ئایدیالی جوانی بە لای کۆمەڵگای مۆدێرنی ڕۆژئاواوە وتارێک پێشکەش دەکەم. پەیکەرسازێکی سویسرایی هەیە بە ناوی ئەلێرتۆ جاکۆمێتی (A. Giacometti) کە لە بواری پیشاندانی ئایدیالی جوانیی ژنانە و پیاوانە هەر ئەو کارە دەکا کە ئێوە بە کردەوە دەیکەن: نەهێشتنی گۆشت و بەز لە لەشی مرۆڤدا. هەمیشە هەوڵداوە گۆشت و پێشت لە بەرهەمە هونەرییەکانیدا لابیا. لە کارەکانیدا لەشی مرۆڤ ڕەهەندێکی لێ ماوەتەوە و شکڵی تەلێکی درێژ و باریکی وەرگرتووە و ئەوە

هەمان کارە کە ئێوە لە ئۆردووگاکان دەیکەن. من لە مێژە دەزانم گشت شارستانیەتی ئێوە لەسە بنەمای زانستی جوانیناسی رۆنراوە. جا لەبەر ئەوەی بەو زووانە دنیا پڕ دەبێ لەو جۆرە مرۆڤانەی کە شکڵی لەشیان تەواو لەگەڵ هونەری مۆدێرنی جاکۆمێتی ـ و ئێوە ـ دا دەیخوێنێتەوە، کەوابوو سەرانسەری دنیا لە پڕشنگی جوانیدا دەدرەوشێتەوە.

ئیمزا:

شایەد

## (١٢٣)

ترایان کۆرۆگا بە یوهانی گوت: "یوهان گیان، تا ئێستا چل لاپەڕەم بۆ نووسیون. لە هەموو نووسینەکانمدا هەوڵمداوە لە راستییەکانیان ئاگادار بکەمەوە و کارێکی وا بکەم واز لە ئازاردانی مۆڤان بێنن. خۆم دەزانم هەر چییەکی نووسیومە راستە. هەر بەشێکم بە دیقەت و مومارەسەیەکی زۆرەوە نووسیوە، بەڵام بێسوودە. من بە شێوازی جۆراوجۆرم نووسی. بە شێوازی دیپلۆمات ودادوەران. بە شێوازی تەلەگراف، بە شێوازی کتێبی چێشت لێنان و بە شێوازی رۆژنامە، بە جۆرێکی پڕ هەست و سۆز، لادێییانە، زەلیلانە و بە دەم کڕووزانەوەوە بۆم نووسین. هەوڵمدا بە هەر شێوەیەک بێ راستییەکانیان تێبگەیەنم.

من تاڵترین راستییەکانم وە روو هێنانەوە، کەچی هیچ پەکیان پێنەکەوت. مزرترین جنێوم پێدان، بەڵام هەر تەقەشیان لەسەری نەهات. من هەوڵمدا وە پێکەنینیان بخەم یان هەستی کونجکۆڵییان بور ووژێنم، بەڵام بێسوود بوو. نەمتوانی نە هەستی پاک و نە غەریزەی ئاژەڵانەیان تێدا وە ئاگا بهێنم. نەمتوانی هیچ هەستێکیان بێدا پێکبهێنم. دەتگوت لەگەڵ گاشەبەرد دەدوێم. ئەوانە هەموو هەستێکیان لە دەست داوە. نە دەزانن نەفرەت چییە و نە هەق و دادپەروەری و نە سۆز و بەزەیی.

ئەوان ئۆتۆماتیکییانە دەجووڵێنەوە و هەر چییەکی لە بەرنامەیاندا نەبێ دەیخەنە لاوە. تەنانەت ئەگەر پارچەیەک گۆشتی لەشی خۆم بڕیبا و بە

خـوێنی گـەرم لـە سـەرم نووسـیبا هێـشتا نـەیانـدەخوێنـدەوە و وەک نووسراوەکانم فڕێیان دەدا ناو تەنەکی زبڵەوە. ئەوانە هەرگیز بە خەیاڵیشاندا نەدەهات ئەو پارچە گۆشتە گەرموگوڕە هی مرۆڤێکە. ئەوەیە نیشانەی بێ هەڵوێستیی "غولام"ان بەرامبەر بە مرۆڤ. جۆرێک بێ هەڵوێستی کە ئامێریش تۆزی ناشکێنێ."

یوهان بە دەنگێکی پڕ لە پەرۆشەوە گوتی: "بەستەزمانە هەی، کاک ترایان ئەدی بە تەمای چی بکەی؟ بە من دەکەی چیدیکەیان بۆ مەنووسە."

"دیسانیش بۆیان دەنووسم. هەتا ماوم دەست هەڵناگرم. مرۆڤ توانیویە ئاژەڵ و دڕندان کەوی بکا.

ئێمە بۆ نابێ ئەو غولامانەمان پێ کەوی بن؟"

"لەوانەیە ڕێگایەکی تر هەبێ. پێم وا نییە بە نووسین ئەو کارەت پێبکرێ."

"هەموو سەرکەوتنەکانی مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە گشتی مەعنەوی بوونە. ئێمە بە بیر و ڕۆح دەتوانین ئەو غولامانەش دەستەمۆ بکەین. دەبێ فێریان بکەین مرۆڤ بو ئەوە نابێ پارچە پارچە بکەی. هەتا ئەو وانەیان فێر نەکەین ناتوانین لەگەڵیان لە یەک جیهان و یەک شار و یەک ماڵدابژین. ئەم گەشبینییە بێگومان گەشبینیی مرۆڤە لە دوا ساتەکانی پێش مردنیدا.

دوا پەلەقاژە و بەرەنگاریم لەگەڵ مەرگدا لە بەشی عەرزوحاڵەکانی کتێبی کاتژمێر بیست و پێنج دەردەکەون، بەڵام من ئەو کتێبە هەر دەنووسم.

## (١٢٤)

عەرزوحاڵی ژمارە ٣

بابەت: ئابووری (ئەو بەندییانەی خاوەنی نیوە یان یەک لەسەر سێی لەشی خۆیانن)

من و هاوڕێ ژمێریارەکەم چوار ڕۆژ پێوە بووین تا توانیمان ژمارەی ئەو بەندییانە دەستنیشان بکەین کە نیوە، یان دوو لەسەر سێ یاخود چوار لەسەر پێنجی لەشی خۆیان بە دەستەوە ماوە. هاوڕێکەم هێشتا لە سەرژمێرییەکەی

نەبۆتەوە. ئەو لە سەرژمێری زۆر شارەزایە، بەڵام من بە پەلەم تا هەرچی زووە راپۆرتەکەتان بخەمە بەر دەست لەبەر ئەوەی ئەوە مەسەلەیەکی ئابووریی گرنگ و بە پەلەیە. بەم جۆرە هەموو رۆژێ چەند ملیۆن مارکتان بۆ دەگەڕێتەوە.

مەسەلەکە بەو شێوەیە: لەو پازدە هەزار کەسەی لەتەک مندا بەندن نزیکەی سێ هەزار کەسیان سەقەت و کەمئەندامن. نزیکەی دووسەد کەسیان لاقیان پەڕیوە و وەک خزۆکان بە سەر زەویدا دەخوشن. هەزار و دووسەد کەس قاچێکیان نەماوە. ئەو ژمارانە تەنیا پەیوەندی بەو کەسانەوە هەیە کە ئەندامێکی دەرەوەیان کەمە، دەنا زۆری وا لە نێو بەندییەکاندا هەن کە ئەندامێکی ناوەوەی جەستەیان نوقستانە، وەکو ریخۆڵە، گورچیلەیەک، پارچە ئێسقان و شتی لەو بابەتە. چل زیندانیش چاویان نییە. تەواوی ئەو کەسانە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەگەڵ من لە شوێنێکدا گیراون. سەرەتا کە دەمدیتن زگم پێ دەسووتان. هاوڕێکەم یوهان مۆریتس ئێستاش کە تووشی یەک لەو شەل و گۆجانە دەبێ لە حەژمەتان چاوی دەنووقێنێ. ئاخر ئەو مرۆڤێکی ئاساییە و تێناگا کە کردەی گرتنی ئەو خەڵکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەنجامدەدرێ و تاکەکان نەک لەسەر تاوان و خەتایەکی دیاریکراو، بەڵکو بە هۆی ئەوە کە دەکەونە ناو دەستە و خشتەیەکی تایبەتی کۆمەڵگا کە بە گرتن مەحکووم کراوە،خراونەتە بەند. لەم حاڵەتەدا ئاشکرایە بۆ نموونە نەبوونی ریخۆڵ یان قاچ نابێتە هۆی لێخۆش بوون یان کەم کردنەوەی زەخت و زۆر. ئەم رەشبگیرە ئۆتۆماتیکییە هیچ ریزپەڕێک قەبووڵناکا و هەر واش چاکە. هەق دەبێ بۆ هەمووان و بێ ریزپەڕ رەچاو بکرێ. ئێمە لە ئۆردووگا پرۆفیسۆرێکمان لەگەڵدایە لە شەڕدا دەستی پەڕیون. ئێوە دوای ئەوەی فەرمانی گرتنی پرۆفیسۆرتان پێگەیی ئەگەر چاوپۆشیتان لە گرتنی کردبا کارێکی هەڵە و ناهەقتان دەکرد. باشە رەشبگیریی ئۆتۆماتیکی چ پەیوەندییەکی بە دەست و شتی واوە هەیە؟ هیچ! ئەو پرۆفیسۆرە و ئێستا کە گرتنی توێژی پرۆفیسۆران بە پێویست دەزانرێ دەبێ بگیرێ. ئێوەی بەڕێز هەرگیز بە هەڵە ناچن. ئیزن بدەن دەستخۆشیتان لێ بکەم.

من هەموو ساتێ ئامادەم گیانی بێبایەخی خۆم لە ڕێگەی شارستانیەتی بەرز و مومتازی ئێوەدا بکەمە قۆچی قوربانی. لەبەر ئەوەی ئێوەی بەڕێزم، هەر خۆتان هاوکات خودی داپەروەری و وردبینین. با بێمەوە سەر جەغز، ئەو کەمئەندامانە تەنیا بەشێک لە جەستەی تەواوی خۆیان هەیە کەچی بەشە خۆراکی کەسێکی ساغ وەردەگرن. ئەوە ناهەقییەکی گەورەیە. بۆیە پێشنیار دەکەم جیرەی بەندییەکان بە گوێرەی ڕێژەی ئەو ئەندامانەی ماویانن، دیاریبکرێ.

حکومەتەکەتان بۆ دابینکردنی ژیان و رزگاریی بەندییەکان فیداکارییەکی گەورە دەکا. کاتێ دەگوترێ مرۆڤ، وجوودی مرۆڤێکی بێ کەمایەسی و تەواو دێتە ناو زەینمانەوە، بەلام ئەگەر دەست و قاچ و ریخۆڵە و ئەندامە لە دەست چووەکانی دیکەی ئەو سێ هەزار کەسەی لێ دەربکەین دەردەکەوێ کە ئەمانە ژمارەیان دوو هەزار کەسە و ئێوە هەموو رۆژێ هەزار جیرەی خۆراکتان بۆ دەگەڕێتەوە.

باشە بۆ بەخێوکردنی ئەندامێکی بەند کە هەر لە بنەڕەتدا نییەتی، پارە سەرف بکرێ؟ پیاوەتی و لوتفێکی وا بە راستی بە کەڵک و زیادە. من دڵنیام گەورە کاربەدەستان ئەو پێشنیارەیان بە دڵ دەبێ. لەوانەیە بە بۆنەی هێنانە گۆڕێ ئەو پێشنیارە میدالیاش بدەنە جەنابتان. ئێوە بەو کارە دەست پێوە گرتنێکی باش بە قازانجی دەوڵەتی خۆتان دەکەن. هەموو کەس دەزانێ پارە تەنیا شتێکە کە لە هەموو روویەکەوە گرینگە. لەبەر ئەوەی دڵنیام داوای جێبەجێ کردنی ئەم پێشنیارە دەکەن، لێرەدا نامەکە کۆتایی پێ دێنم.

ئیمزا:
شایەد

## (١٢٥)

عەریزەی ژمارە ٤

بابەت: سوپا ـ گۆڕینی ڕەگەز

هەندێ زیندانی بە هۆی برسیەتی گۆرانیان بەسەردا هاتووە، کە لەوانەیە لە روانگەی ئێوەی بەڕێزەوە لە رووی سەربازییەوە زۆر گرنگ بێ. ئێستا بە کورتی مەسەلەکە روونەدەکەمەوە. ئەو بەندییانەی ماوەیەکی زۆرە لە ئۆردووگان رۆژێ بە پێنجسەد کالۆری دەژین ئیدی پێویستیان بە ریش تاشین نەماوە. لەوەتی لەو هەفتەی جارێک و پاشان بە دوو هەفتە جارێک ردێنیان دەتاشی و دواجا هەر وازیان لە ردێن تاشین هێنا، لەبەر ئەوەی رۆژ بە رۆژ ردێنیان تەنکتر بوو، بە جۆرێ کە پاش ماوەیەک کۆلکەیەکی کەمیان بە ردێنیەوە ما و دوای ماوەیەک ئەوەندە کولکەشیان پێ نەما. ئێستا دەموچاویان وەک هی ژنان لووس و پووسە، بەلام مەسەلەکە بەوەش نەبڕایەوە. بەندییەکان ئێستا دەنگیشیان باریک بۆتەوە و مەمکیشیان هاتوون. بە شێوەیەک کە هەندێک مەمکیان وەک کچی عازەبی لێهاتووە. جەستەشیان نەرمونۆڵ بووە و تەنانەت خوو و رەوشتی ژنانیان پەیدا کردووە. من لە بارەی بابەتی پەیوەندیدار بە رەگەزێتی ناتوانم رایەکی ورد و راشکاوانە دەربڕم، بەلام دڵنیام ئەگەر سیستەمی جیرەبەندی هەروا درێژەی هەبێ و ئەگەر جیرەکە کەمتریش بکرێتەوە دواجار ئەندامی نێرینەیان هەڵدەکشێتەوە و دەبن بە ژن. پزیشک لەسەر ئەو باوەڕەن کە هۆکاری هەموو ئەو گۆڕانانە برسیەتییە. کەم خۆراکی وا دەکا هۆرمۆنی رەگەزێتی چ لە ژن و چ لە پیاواندا کز بێ و تەنانەت بتوێتەوە و لەناو بچێ. بەم جۆرە جەرگ کە ئەرکی رێکوپێک کردنی ناوەندی لەشی لە ئەستۆیە پەکی دەکەوێ و لە جیاتی سەرکوت کردنی چالاکیی هۆرمۆنی ستروژینی، لێدەگەڕێ گەشە بکەن، کەچی نایەڵێ هۆرمۆنی ئەندرۆژینی کاری خۆیان بکەن و لەناویان دەبا. بەم جۆرە هاوسەنگیی نێوان هۆرمۆنەکان تێکدەچێ و نیشانەی ژنێتی لە پیاواندا دەردەکەوێ. ئەو مەسەلەیە لە رووی سەربازییەوە دەشێ بۆ

شارستانیەتەکەتان بایەخی زۆری هەبێ. دیمەنی دنیایەکی ئارام و بێ کێشە بێننە بەر چاوی خۆتان کە ئێوە بە گرتنی هەموو دوژمنە بەربەر و درندەکانتان، وەک دەستتان پێکردووە و وردە وردە کەم کردنەوەی رادەی کالۆریی خواردەمەنییان و دواجار بە ژن کردنیان، وەدی دێنن. بەم جۆرە نەتەوە دوژمنکارەکان بێ نێرەوەز دەمێننەوە و بتهەوێ و نەتهەوێ توانای بەرپاکردنی شەڕ و دەستوەکەری لە دەست دەدەن. من دڵنیام فەرماندەیی سوپا پێشوازی لەو دۆزینەوە مەزنە دەکا و بە پێی ئەوە کە من بڕوام بە توانای دۆزینەوە و توژینەوەی کۆمەڵگاکان هەیە لەوە دڵنیام ئێوە پێچەوانەی ئەو مەسەلەیە لە سەر کۆمەڵگای خۆتان پیادە دەکەن و بە کردنە پیاوی ژنە خۆبەخشەکان، پیاوی کارەکەری زۆرتان دەستدەکەون. لەبەر ئەوە پێشنیاز دەکەم جیرەی خۆراک دیسانەوە کەم بکرێتەوە. بەشکو بەم جۆرە زووتر بتانن رەگەزی بەندییەکان بگۆڕن و بیانکەنە ژن.

ئیمزا:

شایەد

## (١٢٦)

بەندییەکان لەسەر رۆیشتنن. پازدە هەزار بەندی رادەگوازنە ئۆردووگایەکی تر. کاتژمێر دووی بەربەیانە. ژمارەیەکی زۆر ئیڤا و چەند دەبابەیەک لە گۆڕەپانەکە وەستان. مەشخەڵەکانیان هەڵکردوون. شەوقی چرای ئیڤا و ئۆتۆمبێلی پاسەوانان و دەبابەکان وڵاتی وەک رۆژ رووناک کردووە.

ژمارەی پاسەوانەکانیان دووقات زیاد کردوون. لوولەی چەکە رێژنە هاوێژەکانیان دە بەندییەکان کردووە کە لە ناو ئۆردووگا تێکەوە داوێن. ترایان کۆرۆگا و یوهان مۆریتس شان بە شانی یەکتر دەڕۆن. تۆف و بەندە. لە باڵ یەک خزاون و کەڵک لە تینی لەشی یەکتر وەردەگرن، بەڵام یوهان هەر سەرمایەتی و

دانەچۆقەی پێکەوتووە. لە بەر دەرگای گەورە دوو دەست سەرباز وەستاون. ئەمانە بەندییەکان بە ژمارەی وەک یەک و چەند دەستە دابەش دەکەن.

ترایان گوتی هەر حەفتا کەسمان دەپەستنە ناو ئیڤایەکەوە. ئیڤایەک کە خۆی جێگای دە دوازدە کەسی تێدا دەبێتەوە. باشە چۆن ئەوەیان پێدەکرێ؟ هەر بە راست یوهان تۆ هیچ لە بارەی یاسای لەشی مرۆڤەوە دەزانی کە هیچ شتێک زەفەری پێنابا؟" یوهان وەڵام ناداتەوە. ترایان بە وردی سەرنجی داوەتە پڕ بوونی ئیڤاکان. سەربازەکان سەرەتا بیست کەس دەنێرنە سەر ئیڤاکە. وا پێدەچێ جێگا نەمابێ. جا بە کوتەکان دادەگژێنە بیست کەسەکە و زیندانییەکان پاڵ ویکدەدەن. ئەودەم دە کەسی دیکەش سوار دەکەن. سەر لە نوێ گۆپاڵ دەکەونەوە کار. ئەوانەی تازە سەرکەوتوون پاڵ بە وانی پێشووەوە ددنین و جێگای بەتاڵ پەیدا دەبێ و دە کەسی دیکەش دەچنە سەرێ. ئێستا سوێند بخۆی بلێی جێی منداڵێکیش نەماوە سوێندت لێناکەوێ. لەو کاتەدا سەربازەکان بە قونداغی تفەنگ وەریاندەگەڕێتێ و دیسانەکە دە کەسی دی خۆیان دەهاوێنە سەر. دواجار هەر حەفتا سوار بوونە. کوتان و لێدان تەواو دەبێ. ئیڤاکە ئامادەی رۆیشتنە.

ترایان و یوهان دەستی یەکتریان گرتووە و سوار دەبن تا لێک هەڵنەبڕێن.

ترایان دەڵێ:

"یوهان، هیچ یاسایەکی نەگۆڕ و لە سەداسەد، لە ئارادا نییە. تەنانەت یاسا فیزیکییەکانیش هەر وان. زانستی فیزیا دەڵێ: دوو شت ناتوانن لە جێگای یەک شتدا جێ بگرن، بەڵام ئێستا حەوت کەس لە جێی یەک کەسدا جێیان بۆتەوە. ئاخۆ دەکرێ دیسانیش متمانە بەو زانستە بکەین؟ ئەدی هیچت لە بارەی "پیکاسۆ"وە بیستووە؟"

یۆهان بە منگەیەکەوە دەڵێ: "نا کاک ترایان."

ترایان کەڵەگەتە، دەتوانێ برێک هەوای نوێ هەڵمژێ، بەڵام یوهان هەندێ کورتەباڵایە و سەری لە ناو سینگی ئەوانی دیکەدا حاسێ بووە. سینگی وەها رێک-گوشراوە وەختە تۆزقاڵێک هەوای نەگاتە سیپەلکان. بلمەیەکی لێوە دێ. "خەریکە دەخنکێم."

یوهان فزەی لێ براوە. کەپۆی بە دوای کەمێک هەوادا دەلەرزێ. تەنیا قیچێک هەوا، بەلام نییە.

"کاک ترایان وەختە بخنکێم، پێم وایە دەمرم."

"جوابم دەوە. هیچت لە بارەی پیکاسۆوە بیستووە؟"

"نا هیچی لێ نازانم. هیچ نازانم. من ئەوە دەخنکێم. ئەمن کارم کراوە."

ترایان دەیەوێ سەری یوهان کەمێک هەڵبکێشێ، بەلام دەستی گیران. ماسولکەکانی ناتوانێ ببزێوێ. لەشی گرمۆڵە بووە و تێکبەزیوە، بەلام هەر چاکە سەری بە دەرەوەیە.

"پیکاسۆ گەورەترین نیگارکێشی دنیای رۆژئاوایە."

"هیچم گوێ لێنابێ. ئاخ بریا تۆزقاڵێکم هەناسە دەست کەوتبا. کاک ترایان فریام نەکەوی دەخنێکم."

ترایان هەوڵدەدا کەمێک جێگای بۆ بکاتەوە. دواجار سەری یوهان دەکەوێتە سەر سینگی ئەم.

"یوهان ئەم پیکاسویە دەموچاوی تۆی کێشاوەتەوە. راست لەو کاتەدا کە سواری ئیڤا کراوی."

"دموچاوی من؟ باش تێناگەم. گوێم تەپ بووە."

"بەلێ دەموچاوی تو. وەک وێنەیەک ، تەنانەت شکلی ئیڤایەکەشی کێشاوەتەوە. حەفتا کەس کە بە جارێ لەوێ ئاخنراون. یەکیان پێنج لاقی هەیە و ئەوی دی سێ کەللەسەر، بەلام قورگی نییە. تۆ دەنگت هەیە، بەلام دەمت نییە من سەرێکم بێ لەش. سەرێک کە هەواوە لە ئیڤایەکەدا هەڵواسراوە. کاتێ یەکەم جار لە پاریس ئەو تابلۆیەم دی زۆرم پێ جوان بوو، بەلام تێنەگەیشتم مەبەستی نیگارکێشەکە نەخش کردنی ئەو دیمەنە چییە. ئێستا تێدەگەم. تابلۆکە وێنەیەکی ئەم ئیڤایانە بوو. بەبێ بچووکترین جیاوازی و بێئەوەی خاڵێک لە بیر بکا. پیکاسۆ وێنەی ئۆردووگاکەشی کێشاوەتەوە. دەڵێی وێنەی فۆتۆگرافی لێ گرتووە. وێنە ئەو شتانەی هەن. هونەرمەندێکی بلیمەتە."

ئۆتۆمبێلەکە بە دەرپەڕینێکەوە دەکەوێتە ڕێ. ترایان چاوێک لە کەسانی دەوروبەری خۆی دەکا. هیچ کامیان ئیدی لە روخساری خوا ناچن.[1]

ئەوانە ئیدی مرۆڤ نین. لەم کامیۆنەدا کە بە ناو تاریکیدا دەڕوا ئیتر دەست لە مرۆڤایەتی بشۆ. بە پیاوانی ناو ئەم ئیڤایە تەنانەت ناکرێ بڵێین مردووش، لەبەر ئەوەی لە نێوان مردن و ژیندا هەڵواسراون. ساتێک زیندوون و ساتێکی تر مردوو. هەندێ جاریش لە یەک کاتدا هەم مردوون و هەم زیندوو. لێرە ئیدی کێشەی جێگا چارەسەر کراوە. ئەوی ماوە تەنیا شلەژانە. چاو و گۆشت و خوێن و هەوا و زەمان و بیر، هەمووی شلەژاون. مرۆڤ نە جەستەیان هەن نە رۆح.

ترایان دەپرسێ: "ئێستا پشووت دێ؟"

"بۆخۆشم نازانم، پێموایە بەڵێ، ئەویش بە کونێکی لووتمدا کە لە پەراسووی تۆ گیر بووە..."

"هەر ئەو یەک کونەلووتە زۆرە. گوێ بگرە، دەمەوێ بابەتێکی گرنگت پێ بڵێم."

"تکام وایە لێم زویر نەبی. گوێم لێنابی."

"خۆت راگرە، زۆر گرنگە."

Every horror had itz definion
Every sorrow had a kind of nend:"
In life There is not time to grive long.
This is out of life this is out of time, but this
An instant eternity of evel and wrong.
We are soile by filth that we connint clean
United to super natural vermin.
It is not the city, it is the hous, et is not we alone ,that is defiled
But the world that is wholly foul!"

یوهان دەڵێ: "تکایە دەنگت هەڵبڕە. ئاوا تێناگەم."

---

١- ئاماژەیە بە ئایەتێکی قورئان.

ترایان بە دەنگێکی بەرز دەڵێ:

"Clear ihe air! Clear the sky! Wash thc wind!

Takc the skin from thc, Takc thc stonc from thc stonc arm.

And wash thcm, Tak the muscle from the bonc,

Wash the brein, wash thc bonc, Wash thc stonc,

Wash soul

Wash them! -, Wash thcm

"ئەوە شیعری ئیلیوتە.

"هیچ تێنەگەیشتم. خۆزگەم بە خۆت کە دەتوانی هەناسە بدەی. خۆزگەم بە خۆت کە ناخنکێی."

لە ئۆردووگا کەسانی وردیلە و چکۆڵووکە لە کەسانی بالابەرز و بە هەیکەل کەمتر ئازاری برسێتییان دەچەشت، بەلام لەو ئیڤایانەدا کە بە حەفتا کەسەوە بە ناو ئاوایی "هێردۆرف"دا تێدەپەڕی، ئەوانی کز و پووتە بوون وەخت بوو جیق و پیقیان دەرێ. ئەوانی نابووتە، ڕێی هەناسەدانیان نەبوو. هاکا قڕ بوون.

یوهان دەڵێ: "کاک ترایان بەسە چیدی مەڵێ، گوێم لە هیچ نابێ."

"ئەگەر گوێم لێنەگری لەوانەیە باجی ئەو گوێ نەگرتنە، گیانی خۆت دابنێی."

"گوێ لە چی بگرم؟"

"پرۆفیسۆرە ئەڵمانەکە، بە هەڵە چووە، گوناهبار بووە، گوناهێکی گەورەی کردووە، ئەو مرۆڤی بە زیندیی سەری وەزن کردوون تا ڕادەی دەرد و ئازاریان بزانێ، بەلام دەرد و ئازارەکانی مرۆڤ بە سێ و تەرازوو ناکێشرێن. ژیان لە قەپان نادرێ. هەر کەس وا بکا تووشی گوناهێکی گەورە دەبێ."

یوهان: "من کە هیچ تێناگەم."

"گرینگ نییە. مرۆڤ ئەگەر تێشنەگا هەر لە ناو دەچێ. شۆفێری کامیۆن و پاسەوانە تێلا بەدەستەکان و ئەوانەی ڕەشاشیان لێ سوار کردبووین، هیچکامیان هیچ تێناگەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان هاوکات و بە یەک شێوە لەگەڵ ئێمەدا لەناو دەچن. تۆ لە ناو چوونیان دەبینی؟"

"چاوم گیراون. هیچ نابینم."
"هەست بە هیچیش ناکەی؟"
"نا، هەر ئەوەندە هەستدەکەم خەریکە بخنکێم."
"نەمگوت، تۆ گرنگترین بابەت دەرک پێدەکەی. ئەدی بۆ دەڵێی هەست بە هیچ ناکەم؟ هەموویان هەست بەو حاڵەتە دەکەن، بەڵام گوێی نادەنێ."

## (١٢٧)

بەندییەکان لە ناو ڤارگۆنی بارکردنی ئاژەڵاندا لە پاڵ یەک ترینجابوون. هەموو ڤارگۆنەکان لەسەریان نووسرابوو "بۆ ٢٤ ئەسپ. "ئێستا لە باتی ئەسپ ١٤٠ مرۆڤیان لێ بار کردبوون. لە ڤارگۆنەکانی دواوەشدا ٣٠٠٠ ژنیان سوار کردبوون. "کۆچ کردنەکەی ئێمە لە سەرکەوتن بۆ تەپۆڵەکانی "جۆلجۆتا"[1] دەچێ. جیاوازییەکە لەوەدایە ئێستا هەموو شتێ مۆتۆریزە کراوە و ئێمە وەک مەسیح و دوو پیاوخراپەکەی تەکی بە پێ ڕێگا نابڕین. هەر بەڕاست تۆ دەزانی بۆچی مەسیحیان لە نێو دوو پیاوخراپدا دانابوو؟"

یوهان لەسەر خۆ وەڵامی دایەوە: "نا."

"بۆئەوەی بێتاوانێک مەحکووم بکرێ، لە نێوان دوو تاوانباری دادنێن. ئەوە فێڵێکی کۆنە. جوولەکەکان نەیاندەوێرا مەسیح بە تەنێ شەهید بکەن، بۆیە لە نێوان دوو تاوانباردا لە خاچیان دا تا سەرنجی خەڵک لە مەسیحەوە بۆ دوو کەسە تاوانبارەکە هەتڵە بکەن. من، تو، ژنەکەم و زۆر کەسی تر لە لای ڕاست و چەپی خۆمان تاوانباری بە ڕاستیمان لەگەڵدان. هەمان فێڵی سەردەمی مەسیح دووپات دەبێتەوە، بەڵام ئێستا بە شێوەیەکی دی، بەڵام ئەو فێڵە وەک لە سەردەمی مەسیحیشدا دەرکەوت، فێڵێکی منداڵانەیە، دوای شەهیدبوونی مەسیح کەس باسی دوو کەسە تاوانبارەکەی نەدەکرد و هەموو کەس بیری لە مەسیح دەکردەوە. هەمیشە هەر وا بووە و هەر واش دەبێ.

---

١- Gogatha شوێنی ئەشکەنجەدانی مەسیح.

هەر چەندە ئەمجارەیان لە سێدارەدان ئۆتۆماتیکی بێ یان ئێمە لە جیاتی بە پێیان بڕۆین، بە شەمەندەفەر وە سەر تەپۆلکەکانی جۆلجۆتا دەکەوین."
شەمەندەفەر راوەستا.
یوهان کە داهاتبووە و پشتی راست نەدەبۆوە لە ترایانی پرسی: "تۆ هیچ دەبینی؟"
"شەمەندەفەرەکەمان گەیشتۆتە وێستگەیەک. بەرامبەریشمان شەمەندەفەرێکی دی وەستاوە."
مۆریتس پرسی: "ئەوانیش بەندین؟"
"نا، ئەوان زیندانیی پێشوون. کۆیلە بیانییەکانی ئەڵمانیای پێشوون کە ئێستا ئازاد بوونە."
ترایان چاوی بە ژن و پیاوێکی زۆر کەوت کە لە شەمەندەفەری بەرامبەریاندا دەبینران.
"هەموویان جگەرە دەکێشن... ئێستا ژنێک کە ناسکەنان و کاڵباس دەخوا لە شەمەندەفەرەکە دابەزی."
یوهان زاری پڕ بوو لە ئاو: "زۆرم پێخۆش بوو بیانبینم. دەشقەم یەکیان بناسم. خەلکی چ وڵاتێکن؟"
"هی زۆر وڵاتان.
ترایان سەرنجی دایە ئاڵای ڤارگۆنەکان و ئەو شریتانەی سەرنشینەکان بە بەرۆکیانەوە بوون و گوتی: "ئەو ژنەی ناسکەنان و کاڵبس دەخوا دانیمارکییە. بەلەکی وەک ناسکەنانەکە سپیوسوڵە. ژنێکی فەڕەنسی لە دواوەی راوەستاوە. زۆر جوانە، چاوی رەشن."
"فەڕەنسیشیان لەگەڵدان؟"
"هەر لە پەنا ئێمە دەستەیەک فەڕەنسی و چەند کەسێکیش بەلژیکی و ئیتاڵین."
"من دەمەوێ فەرەنسییان ببینم."
یوهان حەجمینی لەبەر برابوو.
خۆشەویستی فەرەنسییانی لە دڵدا ژیابووە. ترایان یارمەتی دا هەستی.

"وایە، هەموویان فەڕەنسین. ئەو فەرەنسییەی لە تەنیشت ئیتالّییەکان ڕاوەستاوە هەر دەڵێی ژۆزێفە. دەیبینی؟"

"کام ژۆزێف؟"

"ژۆزێف، هاوڕێکەی من، بۆم باس نەکردی؟ ئەو کەسەی ڕزگارم کرد. ئەگەر دڵنیا نەبام کە ژۆزێف ئێستا لە فەڕەنسایە دەمگوت خۆیەتی. سەیر وەک یەک دەچن. ئەری دەکری شتێکی پی بڵێی. چی دەڵێی بیڵێ. من بۆخۆم فەرەنسی نازانم. زۆر لە ژۆزێف دەچێ. زۆرم پێخۆش بوو قسەی لەگەڵ بکەم. ئۆغر بە خێرێکی پی بڵێم."

یوهان قەت نەیدەتوانی بە بێ قسەیەکی میهرەبانانە یان هیچ نەبی بزەیەکی دۆستانە بە پەنا فەڕەنسییەکاندا ڕەتبێ.

"ئێستا زۆر لێمانەوە نزیکە. تکایە شتێکی پی بڵێ. "ترایان متەقی نەکرد. یوهان چیدی بە خۆی نەوەستا و بە زمانی ئەڵمانی گوتی: "بەخێر چن." بە میهرەبانییەکی تایبەتەوە ئەو ڕستەیەی دەربڕی. لە خۆشیان دەموچاوی گەشابووە. چونکە، ئەو قسەیەی بە کەسێک گوتبوو کە فەرەنسی بوو و خۆشی دەویست.

لە پڕێکدا زەنا زەنای ئاپۆراکە بە تووڕەییەکی تایبەتەوە برایەوە. بەندییە ئازادکراوەکان لە جێگای خۆیان ڕاوەستان و سەیری ئەو پەنجەرەیان کرد کە یوهان لە پەنای بوو. ترایان گوێی لێبوو ئەو پیاوەی لە ژۆزێف دەچوو بە فەرەنسی دەڵێ: "ئەو بەرازە نازییە چی لێمان دەوێ؟" ئەو ژن و پیاوانەی لەسەر سەکۆکان بوون لە یوهانەوە ڕامان کە لە پشت پەنجەرە ئاسنینەکەوە بە ڕوویاندا پێدەکەنی. یەکیان گوتی: "لەوانەیە بەرازی نازی سیغاری بوێ."

ئەو گەنجەی لە ژۆزێف دەچوو دەستی بۆ گیرفانی برد، بەڵام هەر وا ڕاوەستا. یەکێکی پەنای داهاتەوە زەوی. خرکە بەردێکی دەست دایە و لە پەنجەرەکەی یوهانی هاڵاند. بەردەکە لە شیشی پەنجەرەکە تێپەری و لە ناو شەمەندەفەرەکە بە سەری بەندییەک کەوت.

"ئەوەش جگەرە! لە سەر تۆ سێ ساڵ تەمەنم لە ئاڵمانیا بە فیڕۆ چوو."

بەردێکی دی وە دیواری ڤارگۆنەکە کەوت. بەردێکی دیکە و دواجار بەرد وەک بارێزە بە ڤارگونەکەدا باری. پیاو و ئافرەت و گەورە و بچووک، بە

هەموو زمانان تف و لەعنەتیان لێدەکرد. جنێو و تووک بە هەموو زمانانی دنیا دەدران و دەکران. بەندییە بەربووەکان گشتی لە ڤارگۆن دابەزیبوون و زیندانییەکانیان وەبەر بەردان دابوون. پۆلیس و پاسەوانەکان هەوڵیاندەدا وەزعەکە هێور بکەنەوە، بەلام تەقینەوەی رق و نەفرەت لەوەدا نەبوو بەری بگیرێ. شەپۆلی توورەیی تا دەهات زیاتری پەرە دەگرت. مەترسی زیاتر دەبوو. پۆلیسەکان ناچار بوون گوللەیان بە سەردا هەڵتۆقێنن. هەرا و هۆریایەکی پڕ لە توورەیی وەلامی تەقەکەی دایەوە. ئەو هەراو هۆریایە لە قورگی کەسانێکەوە دەرپەڕی کە چەندین ساڵ لە زیندانی نازییەکاندا ئازاریان چێشتبوو و ئێستا چاوی دیتنی ئەوەیان نەبوو پۆلیس نەهێڵن نایبەکان لینچ[1] بکەن.

یوهان کاتێ یەکەم قیژەی ژنانی بە پەنا گوێدا تێپەڕی لە جێی خۆی راوەستا. تەنانەت بزەکەی سەر لێویشی نەپەری. ئەگەر لە زمانی فەرەنسییەکانیش گەیشتبا بڕوای نەدەکرد ئەو کورۆکە فەرەنسییەی لە ژۆزێف دەچوو بەردی باوێتێ.

هەر لەو کاتەدا کە یوهان بە چاوی ئەبڵەقەوە سەیری خڕکەبەردەکەی دەکرد بەندییەکان لاقیان راکێشا و لە نێو شەمەندەفەرەکە لە عەرزیان دا. دەیانویست لەبەر یەکی هەڵپچڕن. هەموویان چنگیان بۆ هەڵدڕینێ لێ قرژ کردبوو. لەو حاڵەدا کە بەردبارانەکە هەر وا بەردەوام بوو هەزار شەق کە لە رووی رق و دەستەوەستانییەوە هەڵدەهێنرایەوە، بەر لەشی دەکەوت. بەندییەکان نەیاندەتوانی لێی ببوورن. یوهان ببووە هۆی هەوسار پسانی رق و هەڵمەتی دیلە بەربووەکان. ئەوانەی لێیان دەدا چیتر مرۆڤ نەبوو، بەڵکوو ببوونە دەعبایەکی دڕندە کە بە هەزار قاچ لەشی یوهانی دەکوتا و گۆشتی گەرم و زیندووی دەئەنجنی. لە دەرەوەش ئاپۆراکە ببووە هەمان جانەوەر و بە خوێنی سەری تینوو بوو. ئەو جانەوەرە بە هەزار دەست بەردی لە یوهان دەگرت و دەیویست سەنگساری بکا.

---

١- لینچ: نەریتێکی ئەمریکییە کە لە ڕێورەسمێکدا قوله ڕەشەکانیان دەسووتاندن.

دەم و لووتی یوهان پڕ بوو لە خوێن. هەستی بەوە دەکرد لە حاڵی ئاویلکەدانە. بیری مردن حاڵەتێکی تەسلیم و ڕەزای تێدا پێکهێنابوو و ئەوە وای دەکرد ئیدی هەست بەو شەپ و مستانە نەکا کە وێی دەکەوتن. هیچ کوێی نەدەئێشا. کۆتایی ژیانی نزیک ببۆوە. بیری لە قەشە کۆرۆگا و کڵێسەی فانتانا و وێنەی مریەمی پیرۆز دەکردەوە. ڕۆح و جەستەی کەوتبووە ناو ئارامییەوە. گوێی لە تەقەی بەردان دەبوو کە وە دیواری ڤارگۆنەکە دەکەوتن و دەیزانی هەمووی بۆ ئەو دێن. تەنیا ئەو. بە هەموویان دەیانویست پف لە چرای عومری ئەو بکەن. هەموو تەمەننایان دەکرد یوهان مۆریتس بمرێ. ئێستا ئەوەی دەزانی. ئێستا هەستی بەوە دەکرد هەتا ئەو مابێ جیهان لە سووڕی خۆی دەوەستێ و هیچ پێشڤەچوونێک بە دەست نایە. بەڵێ ئەودەم کە زیندوو بوو لە خۆڕا نەبوو هەموو لا دەیانویست بمرێ. ئەو، تەنیا ئەو هۆی هەموو دزێوی و خراپەیەک بوو. تەنیا ئەو، یوهان مۆریتس خەتابار بوو. بۆیە گشتیان بە خوێنی سەری تینوو بوون و لەبەر ئەوەش بوو کۆیلەی پەت پساو بەردیان تێدەگرت. هەر بۆیەش سەربازەکانی بەندیان کردبوو. تا ئەو لەناو نەبرابا خەڵک نەدەحەسانەوە. پۆلیس تا ئەوی نەکوشتبا ئەو هەموو بەربووەی زیندانی نازییەکانی پێ دەستەمۆ نەدەکرایەوە و سەربازەکان هەتا ئەو، یۆهان مۆریتسی ـ یان لەتوپەت نەکردبا نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان کە لەوبەری دەریاکانەوەیە. ئەو دەبوایە بمرێ. ئەو مرۆڤ بوو و بەزەیی هاتنەوە بە مرۆڤ گۆڕێ نەبوو. نوقمی ناو خەیالان لە خوای دەپرسی: "خوایە من چ خەتایەکم کردووە؟ من شەیدای فەرەنسییەکانم و دەمویست قسەیەکی خۆشیان دەگەڵ بکەم، کەچی ئەوان دەمکوژن. مەسیحیان لەسەر مرۆڤدۆستی لەخاچدا."

وتەی ترایان کۆرۆگای هاتەوە یاد: "ئێمە بە شەمەندەفەر وە سەر تەپۆڵکەکانی جۆلجۆتا دەکەوین. ئێمە بە شێوەی ئامێری و مۆتۆریزە ئەو ڕێگایە دەبڕین."

یوهـان تووشـی حاڵـەتێکی وا ببـوو پێی وا بـوو بـە خاچدا شـۆڕ بۆتـەوە. دەیدی کە شەو دادێ و دنیا تاریک دەبێ. تاریکتر... تاریکتر..

## (١٢٨)

زۆری خایاند تا یوهـان مۆریتس بە سـەر و شـای پێچراوەوە هە ـی هاتەوە بەر. سەری لـە سـەر شـانی ترایان بوو. ترایان شانی رووت بوو. کراسـی لەبەردا نەبوو. یوهان زۆری پێخۆش بوو لە ترایان بپرسێ بۆ کراسی لەبەردا نییە، بەڵام هێزی نەبوو.

"تینوومـە." ترایـان گـوێی لـە دەنگـی نـەبـوو. یوهـان دیـسان بـەوپـەڕی هیلاکییـەوە دووپـاتی کـردەوە: "تینوومـە." یوهـان چـەنیـدن کـاتژمێر بـوو بوورابۆوە و لـە باوەشـی ترایاندا بوو. لەو ماوەیەدا یوهان بە کراسەکەی خـۆی سـەر و شـانی بـو بـەسـتبوو، ئینجـا دوای هـەوڵێکـی زۆر لـە نـاو شـەمـەنـدەفـەرەکەدا جێگایـەکـی بـۆ کردبـۆوە. یوهـان یـەک وشـەی بـە زمـانـدا نەهاتبوو. ترایان لەو ماوەیەدا دەستی هەر لە سەر سینگی بوو و ئاگای لە ترپەی بە ئاستەمی دڵی بوو. چەند جاریش گوێی بە سینگییەوە نابوو. ئەو کاتەی دڵی زۆر بە سستی لێی دەدا دەستی ئاگای نەدەکرد، گوێی پێوەدەنا، بەڵام بە زەحمەت گوێی لە ترپەی دڵی دەبوو. یوهـان داوای ئـاوی دەکرد. وەک مەسیح لە پەنا خاچ تینووی بوو و ڤارگۆنەکە دڵۆپێکی ئاو تێدا نەبوو. بیست کاتژمێر بوو بەندییەکان بێ نان وئاو و تەنانەت بێ راوەستان بۆ دەست بەئاو، لە شەمەندەفەرەکەدا حاسێ ببوون. ناو ڤارگۆنەکە بۆگەنیوی لێدەهات. عـەزی شـەمـەنـدەفـەرەکـەش میـزی تێدا راوەستابوو. تـەڕایـی گەیشتبووە بن یوهانیش، بێ ئەوەی خۆی بزانێ لە خۆی میزتبوو. هەستی پێنەدەکرد. تا ئەودەم چاویشی هەڵنەهێنابوون.

دیسان گوتی: "تینوومە."

"بە داخەوە یەک دڵۆپ ئاویشی لێ نییە."

ترایان بیری لەوە دەکردەوە بە چی لێوی یوهان تەر بکا. لەپڕ وە بیری هاتەوە لە شوێنێکدا خوێندبوویەوە سوارەکانی چەنگیز کاتێ نان و ئاویان دەست نەدەکەوت لە سەر زینەوە خۆیان فڕێ دەدا خوارێ، بە چەقۆ دەماری ئەسپەکانیان دەبڕی و خوێنیان دەخواردەوە. چەند رۆژ و حەفتەیەک سوارەکانی چەنگیز بێجگە لە چەند دڵۆپە خوێنی ئەسپان هیچی دیکەیان نەدەخوارد. دیمەنی سوارەکانی چەنگیز بە بەر چاوی ترایاندا تێپەڕی. بە دڵ پێی خۆش بوو چەند دڵۆپە خوێنی خۆی بداتە یوهان تا تینوێتیی پێ بشکێ. دەشقەم خوێنەکە هێز و گوڕێکی بخاتەوە بەر. یوهان پاڕایەوە: "تینوومە."

"یوهان گیان، هیچ شتێک بۆ خواردنەوە دەست ناکەوێ، تەنیا ئاوەکی کە پێم پەیدا دەبێ و بە دڵ پێم خۆشە بتدەمێ خوێنی خۆمە، بەڵام تۆ نابێ خوێن بخۆیەوە. مرۆڤ کە خوێن بخواتەوە دەبێتە خوێنمژ. کەسی خوێنمژ بە شکڵ و بیچم مرۆڤە، بەڵام ئیدی مرۆڤ نییە. ئەو ئامێرە، شەیتانە، تۆپەڵێ گۆشتە، هەموو شتێکی مرۆڤی هەیە جگە لە رۆحی."

"من تینوومە."

دەزانم. تێدەگەم تینووتە و لەوانەشە لە تینووان بمری، بەڵام مردنم پێ لەوە باشترە وەکو ئەوان بژی. تۆ نابێ خوێنی مرۆڤێک بخۆیەوە. تێدەگەی دەڵێم چی؟"

یوهان دیسان نالاندی: "تینوومە."

## (١٢٩)

عەرزوحاڵی یوهان مۆریتس:

من یوهان مۆریتس دانیشتووی پێشووی گوندی فانتانای رۆمانیا ئەو عەرزوحاڵە دەنێرمە خزمەت فەرمانڕەوای ئەو وڵاتەی ئێستا تێیدام و بەوپەڕی ڕێزەوە داواکارم وەڵامم بدرێتەوە کە لەسەر چی گیراوم و وەک حەزرەتی مەسیح بە سەر خاچەوە ئازار دەدرێم.

ئەگەر پێشتر ئەو پرسیارەم نەهێناوەتە گۆڕ ـ چۆنم هێنابا گۆڕێ؟ ـ لەبەر ئەوەیە کە مرۆی خۆڕاگر و بە سەبرم. من جووتیارم و جووتیاریش فێرە

سەبر و ددان بە خۆدا گرتنن. من سەرلەبەری بەهار و هاوینەکەی سەبرم گرت و دوایەش زستانێکی دوور و درێژ، ئێستا بەهار ژیاوەتەوە.

جەستەم هەر ئێسک و پێستی ماونەوە و دەروونیشم بە هۆی دەرد و ئازاری زۆر رەش هەڵگەڕاوە. رەش وەک مەرەکەب و زووخاڵ. ئێستاش چیدی بەرگە ناگرم. بۆیە لێتان دەپرسم لەسەر چی گیراوم؟

دزیم نەکردووە، کەسم نەکوشتووە، فێڵم لە کەس نەکردووە، کارێکی دژی یاسا و کڵێسەم نەکردووە... جا لەبەر ئەوەی نە دزم نە پیاوکوژ و نە ساختەچی، دەپرسم ئەدی بۆ چیتان گرتووم؟ من لە چل گرتووخانە و زیندانی جۆراوجۆردا بووم.

پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە لێتان بپرسم چیم لە سەرە؟ زۆری پێچوو تا بڕیار بدەم و ئێستا بڕیاری خۆم داوە. من ئەو عەرزوحاڵە بە پۆست بۆ هەموو گەورە گەورەکانی وڵات دەنێرم. ئەو نامەیە ئەگەز دەوری دنیاش لێبدا هەر دەبێ بگاتە دەست دەسەڵاتداران. فەرمانڕەوا و حوکمڕانان دەبێ گوێیان لە پرسیارەکەی من بێ، تەنانەت ئەگەر کەڕیش بن. من ئەو عەرزوحاڵە لە هەموو دەرگاکانی زیندان دەدەم و چەند دانەیەکیشی لە بەردێک وەردەپێچم و دەیهاوێمە سەر جادە. تەنانەت ئەو باڵندانەش کەوی دەکەم کە بەسەر زینداندا دەفڕن و ئەو عەرزوحاڵەیان لە قاچی دەئێخم تا بیبەنە هەموو دنیا. من لەمڕۆوە تا هەقم نەکەن واز لە هاوارکردن ناهێنم. لەوانەیە لە کونجی ژوورێک بپەستێون تا دەنگم بە گوێی کەس رانەگا، بەلام لە هەر جێگایەک بم دەست لە هاوارکردن هەڵناگرم. ئەگەر قەڵەم و کاغەزم دەست نەکەون بە نینۆک سەر دیوار هەڵدەکۆڵم. ئەگەر تیرەبارانم بکەن نە دەچمە ئاسمان و نە دۆزەخ، رۆحی من لەسەر خاک دەمێنێتەوە و وەک سێبەر شوێنتان هەڵدەگرێ. هەموو شەوێ سەد جار لە خەودا راتاندەپەڕێنم. خۆتان و دڵدارەکانتان لە خەو دەکەم و دەڵێم من بێتاوانم. ئێوە ئەوەدەم زات ناکەن چاو لێک بنێن و هەتا مردن ناتوانن گوێ لە نەغمەی مۆسیقا یان دەنگی دڵدارەکانتان

بگرن. نا... ئێوە ناتوانن گوێ لە هیچ شتێک بگرن. دەنگی من، دەنگی یوهان مۆریتس، تا هەتایە لە گوێتاندا دەزرینگێتەوە.

من مرۆڤێکم و هیچ کەس بۆی نییە بەبێ ئەوەی تاوانێک بکەم بمخاتە بەند و جەزرەبەم بدا. ئێوە هەر کەس بن، هەر چەند دەبابە و فڕۆکە و زیندان و پارەتان هەبێ، دیسان وجوودی خۆم و سێبەرەکەم هی خۆمن. ئێوە بە هیچ کلۆجێ مافی دەستدرێژیتان بۆ سەر خوم و سێبەرەکەم نییە. من لە ماوەی تەمەنمدا کەمم ئاوات هەڵخواستوون. هەر ئەوەندە کە دەمتوانی کار بکەم، سێبەری خانووی خۆمم بەسەر بکشێ و لە ژێر ئەو میچەدا لەگەڵ ژن و منداڵی خۆم بژیم و پارووە نانێکم هەبێ، شوکرانەبژێر بووم. نەکا بەو تاوانە منتان خستۆتە بەند؟ کاتێ شەڕ برایەوە پێم وابوو منیش پشکێکم لە ئاشتی پێدەبڕێ. ئەمریکیم لێ پەیدا بوون و وەک مەردان! نۆغڵ و شیرینییان لێ بار کردم. دوایەش بەبێ ئەوەی هیچم پێ بڵێن لە بەندیان توند کردم. ئێستا دەمەوێ بزانم بۆ؟ ناوەکەمیان پێخۆش نەبوو. یانووس، ژاکوب، یوهان یان یانکەل؟ ئاخۆ دیسان دەتانەوێ ناوی دیکەم لێ بار کردم. دوایش بەبێ ئەوەی هیچم پێ بڵێن لە بەندیان توند کردم. ئێستا دەمەوێ بزانم بۆ؟ ناوەکەمیان پێخۆش نەبوو. یانووس، ژاکوب، یوهان یان یانکەڵ؟ ئاخۆ دیسان دەتانەوێ ناوی دیکەم لێ بنێن؟ فەرموون. ئێستا تێدەگەم مرۆڤ مافی ئەوەشی نییە بەو ناوەوە بژی کە لە منداڵییەوە لەگەڵی بووە، بەڵام دەمەوێ ئێوەش بزانن من چیدی ڕاناوەستم. دەمەوێ بزانم بۆچی گیراوم و ئازار دەچێژم؟ چاوەڕوانی وەڵامی ئێوەم.

لەگەڵ ڕێزمدا ـ ئیڤان، یوهان، ژاکوب، یانکەل، جووتیار و گەورەی خانەوەدەیەک."

ترایان دوای خوێندنەوەی نامەکە سەرنجی یوهانی دا و گوتی: "بۆ دەگری یوهان؟"

"ناگریم."

"من فرمێسکت بە چاوانەوە دەبینم. باشە بۆچی دەگری؟"

"بۆخۆشم نازانم بۆ؟"

"لە ناردنی نامەکە دەترسی؟ باشە هەرچی نووسیومە راست نییە؟"
"من ناترسم، ئەوی نووسیوتە هەمووی راستە.
"ئەدی بۆ دەگری؟
"ڕاست لەبەر ئەوە دەگریم. لەبەر ئەوەی هەمووی راستە.

## (١٣٠)

سێ رۆژ دوای ناردنی عەرزوحاڵەکە یوهانیان بانگ کردە نووسینگە. ترایان کراسی خۆی وێدا.

"ئێمە سەرکەوتین. عەرزوحاڵەکە کاری خۆی کرد."

یوهان هەر بزەی چاوانی دەهات. وای دەزانی رزگار بووە. بە ترایانی گوت: "ئێمە بردمانەوە. بۆ ئەوەش قەرزداری تۆم. هەر چییەکی لە عەرزوحاڵەکەدا نووسرابوو هەمووی راست بوو."

"نەکا بترسی. ئەوان دەبێ بترسن. لەبەر ئەوەی، ئەوان خەتابارن." یوهان بە رووی گەشەوە چووە نووسینگە و نیوەڕۆیە هاتەوە. ترایان لە بەر دەرگا چاوەڕێی بوو.

"چی بوو؟ بەڵێنیان دا ئازادت بکەن؟"

یوهان چاوی لە زەوی بڕیبوو. هەمیشە وا بوو، کە پرسیاریان لێ دەکرد خۆی گران دەکرد.

"دوایە هەموو شتێکت پێ دەڵێم. ئێستا ناتوانم."

"شێت بووی؟ سێ سەعاتە لەبەر تۆ لێرە راوەستاوم و ئێستا هاتوویەوە دەڵێی دوایە پێت دەڵێم؟"

یوهان هێندێکی وردکە تووتن لە عەرزی نووسینگە هەڵگرتبۆوە. لە گیرفانی دەرهێنا، لە نێوەڕاستەرا بەشی کرد. نیوە بۆخۆی، نیوەش بۆ ترایان. ئینجا بە پارچە کاغەزێک خەریکی هەڵپێچانی بوو.

"کاک ترایان وا چاکە کاتێکی دی بۆت باسبکەم."

"پێیان گوتی ئازاد نابی؟"

"نا وایان نەگوت."

"ئەدی سووکایەتییان پێ کردی؟"

یوهان دەستی بە هەڵبەستنی سیغارێکی دیکە کرد: "نا، سووکایەتییان پێ نەکردم."

"لێیاندای؟"

"نا."

"ئەدی بۆ قسە ناکەی؟ وەک دیارە کارێکی خراپیان نەکردووە."

"هیچ."

یوهان جغارەکەی داگیرساند.

"ڕەنگبێ نۆرەت نەهاتبێ. قەیدی نییە. سبەی بانگت دەکەنەوە."

"با، نۆرەشم هات."

"باشە هیچیان لێ پرسی؟"

"بەڵێ."

یوهان دەتگوت زاری قوفڵ دراوە و دەبوو هەر وشەیەکی لەدەم دەربکێشی. ترایان چیدی بە خۆی نەوەستا:

"هەموویم بۆ بگێڕەوە، لە نووکەوە."

یوهان گوتی: "من یەکەم کەس بووم. کە چوومە ژووری، فەرموویان کرد دابنیشم، کورسییەک لە لای مێزەکەوە بوو."

"دەی زۆر باشی دەست پێکردووە. لەوەڕا کە فەرموویان کردووی دابنیشی دیارە ئاکامی باشی بووە. لەوانەیە فایلەکەی تۆیان خوێندبێتەوە و دەرکەوتبێ بێتاوانی. دەی؟"

"گرووبانێک لێی پرسیم."

"بە ئەدەب بوو؟"

"بەڵێ."

"یەکەم پرسیاری چ بوو؟"

"سەرەتا سەیری کاغەزەکانی پێش خوی کرد و پاشان پرسی تۆ یوهان مۆریتسی؟ منیش گوتم بەڵێ. چاوێکی لێ کردم و تەماشایەکی کاغەزکانی

کردەوە و پرسی مۆریتس چۆن دەنووسرێ؟ بە "تز" یان "تس". گوتم لە زمانی ڕۆمانیدا بە "تز" و بە ئەڵمانیش بە "تس" دەینووسرێ.
یوهان هەڵوەستەی کرد و بە داماوییەوە چاوی لە ترایان بڕی.
ترایان سەبری لە بەر بڕابوو: "دەی؟ دوایی؟ بۆ قسە ناکەی؟"
"دوایە گرووبانەکە گوتی تۆ دەتوانی بڕۆی. هەر ئەوەندە."
"تۆش هیچت نەگوت؟ باشە بۆ ئەوەی فێرم کردبووی پێت نەگوت؟"
"من زۆرم حەز دەکرد قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام گرووبانەکە نەیدەویست گوێم لێ بگرێ. بێئەوەی چاوم لێبکا، گوتی: "کەسی دواتر."
"تو چیت گوت؟"
"هیچ."
"ئەوە گەوجێتییە."
ترایان سەری لە ناو دەستان گرت: "گەوجێتیی پەتی. تۆش هەروا هاتییە دەرێ؟"
"بەڵێ."
"ئەوە هە ئەو لێپرسینەوە بوو کە ئێمە ساڵێکی ڕەبەق بوو لە زینداند! چاوەڕوانی بووین؟"
"هیچی دی ڕووی نەدا؟ لەوانەیە لەبیرت نەمابێ؟"
"نا هیچی دی نەبوو. منیش وەدەر کەوتم. کە دەرگام پێوەدا دەستە دەلەرزی. ئینجا گازی کەسێکی دیکەیان کرد کە ناوی "تۆماس مان" بوو."
"نەتزانی چییان لێ پرسی؟"
"با، لێیان پرسی مان بە ئەلف دەنووسی یان بە ئەلف؟"
"هەر ئەوەندە؟"
مۆریتس دڵۆپێ ئەسرینی بەسەر ڕوومەتاندا خزینە خوارێ. دڵۆپی وەک مرواریی درشت.
"خەفەت مەخو، یوهان گیان. دوای مردنی کەروێشکە سپییەکان مرۆڤ تەنیا ڕێگایەکی لەبەر دەمدا دەمێنێ: ملکەچی."

## (١٣١)

عەرزوحاڵی ژمارە ٥

بابەت: دادوەری (میکانیزە کردنی لێپرسینەوەکان.)

بە پێی ئەو زانیارییانەی دەستم کەوتوون ئێوە لەبارەی لێپرسینەوە لە یەک یەکی بەندییەکان فەرمانێکتان بە دەست گەیشتووە. ئەو فەرمانە لە راستیدا ئاقڵانە نییە. لە سەردەمێکدا کە مرۆڤان بە کۆمەڵ دەگرن ئەنجامی لێپرسینەوەی تاکەکەسی گەوجێتییە، بەڵام، من تێدەگەم هۆی چی بووە ئەو فەرمانە دەرکراوە.

شارستانییەتی ئێوە لە بەرامبە دابونەریتی هەر ناوچەیەک ژێستی بە ئەدەبانە دەگرێ و ئەمە تەنیا ئەدەب و رەوشتێکی رووکەشانەیە و بەس. یەکێ لە ئەفسەرەکانتان بۆ ئەوە دانراوە رۆژی بەیانیان لێپرسینەوە لەگەڵ پێنجسەد بەندیدا بکا و پاشنیوەڕۆیان لەگەڵ کەسی دیکەدا. بۆم دەرکەوتووە کە هەموو پرسیارەکان یەک شتن و گوێش نەدراوەتە وەڵامان. گوێ گرتن لە قسەیەک رێکوپێکی هەیە تا بیکا؟ هیچ!

کەچی، من بیر لەو هەموو وزەیە دەکەمەوە کە بۆ پرسیار کردن بە فیڕۆ دەچێ. بەڕاستی کارەساتێکی جەرگبڕە رۆژێ هەزار جار پرسیارێک دووپات بکەیەوە. من دەتوانم بیهێنمە بەر چاوی خۆم کە چۆن ئەفسەری بەرپرسی لێپرسینەوە شەوانە گەرووی دەکەوێتە ژان. بۆیە پێشنیار دەکەم بەرنامەی لێپرسینەوە و پرسیارکردن بە هۆی گرامافۆنەوە ئەنجام بدرێ. چۆنیەتیی کەڵک وەرگرتن لە قەوان بۆ ئەو کارە بەو شێوەی خوارەوە دەبێ: ئەفسەری بەرپرس دەبێ لە نووسینگە ئامادە بێ. بوونی ئەم پێویستە بۆ ئەوەی حاڵەتێکی تاکەکەسی بە لێپرسینەوەکە بدرێ. ئەو قەوانەکە دەخاتە سەر. کاتێ بەندییەکە دێتە ژوور سەفحەکە دەڵێ. فەرموو دانیشە. بەندی لەسەر کورسی دادەنیشێ. قەوانە هەروا دەسووڕێ و سێ پرسیار دەکا و پاشان دەڵێ سوپاس دەتوانی بڕۆی. دواجار وشەی کۆتاییش دەبیسرێ. "کەسێکی دی با بێ." بەمجۆرە لێپرسینەوە لەگەڵ بەندییەک تەواو دەبێ. ئەوسا کەسێکی دی دێت و ئەو کارە و دووپات دەبێتەوە. بەم جۆرە بە یەک قەوانی گرامافۆن دەتوانی لێپرسینەوە

لەگەڵ چوارسەد تا پێنجسەد کەس بکەی، لە ماوەی لێپرسینەوەکەدا ئەفسەری بەرپرس لە پشت میزەکەی دادەنیشێ و دەتوانێ خەریکی خوێندنەوەی رۆمانی پۆلیسی بێ! نیوەرۆیەش کاتی بۆ نان خواردن دەچێتە پشت میز قورگی ناهێشێ. دەبێ سەرنج بدرێتە ئەو خاڵە کە ئەم شێوەیە تەنیا بە کەڵکی پرسیار کردن دێ نەک گوێ گرتن. ئامێرەکە بە ئاسانی ئەو کارە رادەپەڕێنێ. مەنتیقی ئەم شێوەیەش زۆر روون و ئاشکرایە. مرۆڤ رێزی رێوشوێنەکانی گرتووە. بەبێ ئەوەی ئەفسەرێکت ماندوو و جارِس کردبێ. بەم جۆرە "دادوەری" سوودێکی زۆر لەم شێوەیە دەبینێ. دادوەری لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوودا دەبێ میکانیکی بێ. مرۆڤ پێویست ناکا وەکو سەردەمی پێش دۆزینەوەی کارەبا، لێپرسینەوە لەگەڵ بەندییاندا بکا. ئەگەر ئەو هەموو دۆزینەوە و داهێنانە لە خزمەتی دەزگای دادوەریدا نەبێ بە کەڵکی چی دێ؟

ئیمزا:

شایەد

ترایان نزا دەکا: "مەسیحی پیرۆز، من قەت ئاوا کوڵەوارم بە خاچەوە نەدیبووی. من هاتبووم لەبەر برینەکانی خۆم نزا بکەم، بەڵام تازە ناتوانم. بمبوورە کە ئێستا بۆ برینەکانی تۆ کە سەرتاپای لەشیان داگرتووی و lucky یان لە ناودا پشکووتووە، نزا دەکەم. ئەمانە زۆر لە برینی گۆشت و پێستی من بە ژانترن. با سەرەتا بۆ تاجەکەت کە لە قوتوی خۆراک چێ کراوە نزا بکەم."

ترایان چاوی بە سینگی مەسیح دەکەوێ و دەبینێ پیتی Mی پێوەیە. ئەوە پیتی یەکەمی قوتووە کارتۆنییەکانی تایبەتی جیرەی خۆراکی بەندییان بوو. بە هەندێ لەو قوتووانە لەشی مەسیحیان دوستکردبوو. ترایان هەڵدەستێ و پای مەسیح ماچدەکا.

"ئێستا دەزانم من هەمیشە رزقی لەشی تۆم هەبووە، ئەی خۆراکی تاهەتای ئومێدی مە.

تۆ، تۆ کە تەنیا خۆراکی ئێمە بووی، من تا ئێستا هەرگیز ئاوا بە روونی نەمدەزانی کە لەشی پیرۆزی تۆ خەمی بەخێو کردنی ئێمەی لەبەرە! وەستای وێنەکەی تۆ چۆن بیری بۆ ئەوە چووە سینگی تۆ لە

جیرەی خۆراک ساز بکا. تۆ ئێستا هەموو برسێتییەکانی من، تەواوی برسێتی و تامەزرۆیی من بۆ خوای نان و ئازادیت هێناوەتە بەر چاوم."

ترایان حاڵ گرتوویە و ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەماوە. یوهان بە سەرسوڕمانەوە لە وێنەی ئەو پەرییانە راماوە کە لە پاکەتی بەتاڵی جگەرە دروستکراون. وێنەی مریەمی پیرۆز بە قەپاغی رەنگ زێڕینی پاکەتی "پۆدینگ" رازاوەتەوە، یوهان لە بەردەم وێنەی نیکۆلای پیرۆز کە زۆر لە قەشە کۆرۆگا دەکا، دوعا دەکا. پاشان لە پەنا ترایان چۆک دادەدا و لە برینە سوورەکانی مەسیحەوە رادەمێنێ.

ترایان هێشتا نزا دەکا: "خوایە، من داوات لێناکەم پیاڵەی ژیانم لە دەم بکەیەوە. نا، دەزانم ئەوە ناکرێ، بەڵام لە بارەگای تۆ دەپاڕێمەوە لە هەڵچۆڕاندنیدا یارمەتیم بدەی. ساڵێکە من ئەو پیاڵەم بە دەمەوەیە. ساڵێکە لە نێوان مەرگ و ژیاندام. ساڵێکە لە مەودای نێوان خەون و واقیعدا سەرگەردانم. من لە داوی زەمان راپسەکاوم کەچی هێشتا ژیانم ماوە و هەناسە دەدەم. نیوە عەمر خۆم بە کێش دەکەم و نان و ئاوێکی کە ئیدی پێویست من دەکەمە ناو لەشمەوە. ئەوە هەمووی لەبەر ئەوەیە نازانم دیلم یان ئازادم. دەبینم دیلم، بەڵام ئاوەزم پێم دەڵێ هۆیەک بۆ ئازاد نەبوونم لە ئارادا نییە. ئەشکەنجەی تێنەگەیشتن و نەفامی لە کڵێلەتی ترسناکترە. ئەوانەی ئازادییان لێ زەوت کردووم رقیان لە من نییە و تەمەنناى مردنم ناکەن. ئەوان دەخوازن جیهان رزگار بێ و بەو حاڵەشەوە شەهیدم دەکەن. ئەوان نەک تەنیا من، بەڵکو بەرە بەرە هەموو دنیا شەهید دەکەن و لە ناوی دەبەن. دەسەڵاتداران باسی ئازادی دەکەن. من دەزانم ئەوان کە دەڵێن خوازیاری ئازادیی مرۆڤن درۆ ناکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا کە باسی ئازادی دەکەن و لە پێناویدا شەر دەکەن، لە لاوە زیندان دروستدەکەن. دنیا پڕ بووە لە زیندان. وشەکان شیرینن، بەڵام کاتێ وەک تیری ژاراوی لە گۆشتی مرۆڤان هەڵچەقێ جگە لە خراپە مانایەکی دیکەی نییە. ئاغاکانی دنیا بە خەیاڵی خۆیان بەردەوام خەریکی هەڵخستن و دانانی نەخۆشخانانن تا برینی خەڵک سارێژ بکەن، کەچی بیناکانیان بەندیخانەی لێ دەردەچێ. خوایە، لێم گەڕێ با بمرم. یارمەتیم دە بمرم. ئەو کاتژمێرە هێ ژیان

نییە. لەشی من گۆشت و خوێنە و بەرگەی ئەو ساتەوەختە ناگرێ. ئێستا کاتژمێر بیست و پێنجە. کاتژمێرێک کە نە رێگای رزگار بوونی بۆ ماوەتەوە و نە هیوای ژیان. کات بۆ هەموو شتێک بەسەر چووە. با ببمە بەرد، بەلاّم رازی مەبە لێرە بم. تۆ ئیمکانی مردنیشت نەهێشتوومەوە. بڕوانە، رۆح و جەستەم هەر دووک مردوون، کەچی هێشتا ماوم. دنیاش مردووە و ماویشە. مُن نە تارماییەکی سەرگەردانم و نە مرۆڤ."

ترایان سەری لە نێو دەستەکانیدا شاردەوە. یوهان خوشەویستانە شان و پیلی دادەماڵی، بەلاّم ئەو ئاگای لێنەبوو. قەشەیەک هاتە ناو کڵێسە. یۆنیفۆرمی ئەمریکی لەبەردا بوو. یۆنیفۆرمەکەی پیتی PW[1]ی لەسەر نووسرابوو. یوهان بەرەو پیری چوو و دەستی ماچکرد. ترایان لە جێی خۆی نەبزووت.

قەشە لە یوهانی پرسی ئێوە چ نەتەوەن؟ کاتێ زانی ژنی ترایانیش زیندانییە خاچی کێشایەوە و دوعای بۆ کرد. ترایان ئاگای لە هاتنە ژوورەوەی قەشە نەبوو.

"ئێمە هەموو رۆژێ کاتژمێر شەش رێورەسمی نزاکردن بەڕێوە دەبەین. من "پالادی"، ئۆسقۆفی شاری "وەرشۆ"م، قەشەکانی دیکەی کڵێساکەشم لێرەن. هەمووما‌ن گیراوین. بەرنامەی نزاکەمان زۆر خۆشن. ئێوەش وەرن. قەشەیەکی رۆمانیشمان لەگەڵدایە. هەڵبەت ئێستا لە نەخۆشخانەی ئۆردووگایە.

یوهان بە واق ورمانەوە چاوی لە ئۆسقۆف بڕی. ئۆسقۆف گوتی: "حەزم دەکرد یەکێک هەبێ سلاّوی منی پێ بگەیەنێ. ئەگەر بزانێ دوو رۆمانی لێرەن، خۆی دێ و داوای بەرەکەتتان بۆ دەکا.

## (١٣٢)

کاتژمێر شەش دەستەی قەشان رێورەسمی ئایینیان دەست پێکرد. لەسەر یۆنیفۆرمی بەندیانەوە جبەیان کردبووە بەر. ترایان و یوهان لە پەنا یەکدی راوەستابوون. ئۆسقۆف بەرگی تایبەتی لەبەر و تاجی هەتاوی

---

١- Prisoner of war دیلی شەر

لەسەر نابوو. دیارە لەعل و بەردی گرانبەهای پێوە نەبوون. دەنگی ئۆسقۆف وەک هی کۆنترباس نەرم بوو. ترایان لە میحراب نزیک بۆوە، بەڵام کاتێ گەیشتە بەردەم خاچ لە خۆ چوو. یوهان پێی وا بوو ترایان هەڵەنگووتووە و غاریدا هەڵیگرێتەوە. ترایان لەشی وا شل ببوو دەتگوت ئێسکی لە جەستەیدا نەماون. دەم و چاوی وەک مێو زەرد هەڵگەڕابوو. خێوەتی کڵێسە بێجگە لە قەشەکان کەسی دیکەی لێنەبوو. یوهان سەری هەڵبڕی تا بە هانایەوە بێ. ئەودەم تێگەیی ترایان بۆچی دڵی لە خۆ بۆتەوە.

"مامۆستا کۆرۆگا!"

هەر توانی بە دژواری ئەو وشەیە دەربڕێ. پاشان بەرامبەر قەشە چۆکی دادا، وەک بیەوێ بە لاقیدا بنووسێ، بەڵام قەشە کۆرۆگا لاقی نەمابوو. قەشە بە دراشەقە هاتە پێشێ. سەری چاک سپی ببوو، بەڵام بزەی سەر لێوی - نوقمی چاکە و بەختەوەریی بێبن - هەر وەک خۆی بوو. لە ڕێگەی بزە و چاوەکانییەوە دەکرا لە ئاسمان بڕوانی.

"ترایان کوڕە ئازیزەکەم."

قەشە کاتێ دەیویست بگاتە ترایان دار شەقەکەی لە دەست کەوت.

قەشە نەکەوت. خۆی بە دار شەقەکەی تر گرتەوە و ڕاوەستا. ئینجا ئەویشی فڕێدا و وەک درەختێ قورس و قایم لە پەنا ترایان ڕاوەستا. دار شەقەکانی فڕێدابوون تا دەستی بۆ لە باوەش گرتنی کورەکەی ئاوەڵا بن. یوهان دار شەقەکانی هەڵگرتنەوە و بە دیار قەشە و کوڕەکەیەوە ڕاوەستا.

## (١٣٤)

قەشە کۆرۆگا و ترایان مۆریتس لەو ڕۆژەوە لە ناو خێوەتێکی گرتووخانەی دارموشتاد - دا پێکەوە بوون. دوای ساڵێک لێگەڕاون نامە بۆ بەندییەکان بێ. یەکەم کەس کە نامەی پێدەگا یوهان مۆریتسە. دایکی هیلە بۆی دەنووسێ: "هانسی خۆشەویست. ڕێکەوتی ١٩ی جۆزەردانی ١٩٤٥ ماڵەکەت ئاگری گرت. دەزانم هێشتا بەو ڕووداوەت نەزانیوە. سووتانەکە ئەو ڕۆژە

رووی دا کە سەربازانی رووس هاتنە ناو شارەکەمانەوە. هیلدە و فریتزی کوڕت لە ماڵێ بوون. سەرەتا بۆخۆشم نەمدەزانی بە زیندیی سەری سووتان، بەڵام دوای چەند حەفتەیەک کە چووم بزانم ئاخۆ شتێک لە هۆلمانی ئاگرەکە قوتار بووە یان نا، تەرمی هەر دووکیانم دیتنەوە کە ببوونە کۆلوو. منداڵەکە بە باوەشی هیلدەوە، هەردووکیان مردبوون. نازانم کاتێ ماڵەکە ئاگری تێبەربووە بۆچی هەڵنەهاتوون. رەنگە لە خەودا بووبن. بەو حاڵەشەوە بڕوا ناکەم هیلدە بەو حاڵ و رۆژە خەوتبێ. هەموو خەڵک ـ بە تایبەتی ژن ـ هەڵاتبوون. تۆ خۆت دەزانی هیلدە فێری چێشتەخەوی پاشنیوەڕۆیان نەبوو. هەر کە لە نەخۆشخانە دەهاتەوە خۆی لە کاران هەڵدەکرد. ئێسک و پروسکی هیلدە و فریتزم کۆکردنەوە، لە تابووتێکم هاویشتن و لە گۆڕستان ناشتمن. بە داخەوە دوو تابووتم بۆ پەیدا نەبوو. تابووت دە کڕین نایە و کەس تابووتان دروستناکا. خەڵک مردووەکانیان بەبێ تابووت دەنێژن. تەختەدار قاتە و بزماریش هێند گرانە ناکڕدرێ. ئەمن ناچار بووم بزمار لە دیواران هەڵکێشمەوە و بۆ دارتاشیان ببەم. کەچی دارتاش واش تابووتەکەی بۆ دروست نەدەکردم. دەیگوت بزمارەکان باریک و قوڵەن. هەر بۆ ئەوەی زووتر تابووتەکەی پێ چاک بکەم کڵاوێکی تۆم دایە. لێم دڵمەند مەبە کە لە پێشدا ئیزنم لێ وەرنەگرتووی. کڵاوەکەم نەدابایە تابووتەکەی ساز نەدەکرد. دەشبوایە زوو تەرمەکان بە خاک بسپێرم. تەرمەکان حەفتەیەک لە ماڵی من بوون. خاچی دارینیشم بۆ دروستکردن. کە گەڕایەوە بۆخۆت خاچی بەردینیان بۆ دروستکە، تایفەی مە هەموویان خاچی بەردینی جوانیان بۆ چەقێنراون.

تەرمی سووتاوی ئەفسەرێکیشیان لە ماڵەکەیدا دیتەوە. ببووە خەڵووز. وێدەچێ ئەفسەرەکە ویستبێتی چەند سەعاتێ لەوێ وچان بدا و بتوانی بەرگی مەدەنی لەبەر بکا. کاتێ رووسەکان هاتن سەربازان هەموو وایان کرد. ئەفسەرەکەش لەسەر ئەرکی ئەنجوومەنی ئایینی لە گۆڕستان نێژرا. جانتا چەرمییەکەی بە تەواوی نەسووتابوو و چەند کاغەزم تێدا دیتنەوە. ناوی یۆرگ یۆردان و خەڵکی رۆمانیا بوو. لەوانەیە ناسیاو یان هاوڕێیەکی تۆ بووبێ هاتبێتە ماڵێ چاوی بە تۆ بکەوێ.

## (١٣٥)

قەشە کۆرۆگا گوتی: "ڕەنگە ئاوا باشتر بێ."
دەستەکانی بە نیشانەی ڕەزامەندی لەسەر شانی یوهان دانا.
"ئەگەر هیلدە مابا و تۆ ڕۆژێک ئازاد ببای دەچوویەوە لای کام ژنت؟ کەس ئەو بڕیارەی پێنەدەدرا؟"
"ئەرێ گوتت سۆزانا تەلاقی لێ وەرنەگرتووم؟"
یوهان بەو دواییە زانیبووی سۆزانا ئەمەگدار بووە: "باشە چاوەڕوانی من دەکا؟"
"سۆزانا چاوەڕوانی تۆ دەکا و هەتا مابێ چاوەڕوانت دەبێ. ئەو هەر ژنی تۆیە. بۆیە تەلاقنامەی ئیمزا کرد تا خانووەکە لە کیس نەدا و منداڵەکانت لە قوون دەرکان نەبن. ئەو بە ناچاری و لە ڕووی بێدەرەتانییەوە ئەو کارەی کرد، بەڵام قەت دڵی بەرامبەر تۆ نەگۆڕا."
"کەواتە ئەو تەلاقە درۆ بوو."
یوهان سەرە زللەیەکی لە نێوچاوانی خۆی راکێشا: "منی دەبەنگیش پێم وابوو سۆزانا دڵی داوەتە کەسێکی دی . بۆیەش هیلدەم هێنا. باشە بە چیم زانیبا، لە کاتێکدا تەلاقنامەکەم دی ئیمزای خۆی پێوە بوو! بەڵام من تاوانبارم و خوا لە گوناهم نابووری."
قەشە کۆرۆگا وەڵامی دایەوە: "خوا دەتبەخشێ. گوناهەکەت گەورەیە، بەڵام نە تۆ و نە سۆزاناش هیچ لایەکتان خەتابار نین. ئەو تاوانە لە ملی دەوڵەت و یاسایە. خوا حکوومەت وەکو "سۆدۆم"[(1)] و "عۆمۆرە" سزا

---

١. Sodom and Gomorrha 1، بە پێی گێڕانەوەی ئینجیل ناوی دوو شار بوون کە لە لێواری دەریای "مەییت" کە بە هۆی گوناهی بێنەژمار و کفر و خراپەکاریی پیاوانی کەوتە بەر غەزەبی پەروەردگار و بوو بە خۆڵەمێش.

دەدا. هەورە تریشقە نەک هەر بۆ حکوومەتی ئێمە نازڵ دەبێ بەڵکو کۆمەڵگای ئێستاش تەفر و تونا دەکا.'

## (١٣٦)

ترایان کۆرۆگا یەکەم جار بوو بۆ لێپرسینەوە بانگ دەکرا.

'دەی تۆ دەتهەوێ ئیدیعا بکەی نازانی ساڵێکە لەسەر چی گیراوی؟ لەو ٢٥ هەزار بەندییە تاقە کەسێک نییە بڵێ هۆی گیرانی خۆی دەزانێ. ئێوە هەمووتان ئیدیعا دەکەن ئێمە بە زۆر و زۆرداری هاتووینە ناو ئەوروپا و کۆمەڵێک خەڵکمان هەر وا بە گۆترە گرتوون. ئێوە هەڵەن. هەموو حوکمێکی گرتن و بەندکردن بە پێی یاسایەکی تایبەت بووە. ئێوە دەتانهەوێ ئیدیعا بکەن یاساکانی ئێمە لەگەڵ بنەما یاساییەکان ناکۆکن. هەموو رۆژێ گوێم لەو رەخنەیە دەبێ. هەر هەمووتان گازندەتان لەوەیە کە ئەو یاسایانەی ئێوەی پێ بەند کراون لەگەڵ بنەما یاساییەکان یەک ناگرنەوە، بەڕاستی خەڵکانێکی گاڵتەجاڕن. جارێ بەڕێوەبردنی کاروباری هەموو وڵاتان لە دەست مرۆڤدایە و هیچ شتێکی مرۆڤ تا سەر نییە. مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە ئەو یاسایانەی پێی خۆشە دایانبڕێژێ و خۆیان لەگەڵ بگونجێنێ. ئەو یاسایانەی لە وڵاتی ئێمە رەچاو دەکرێن شتێکە پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە. لە لایەکی دیکەوە هیچ ئەسڵێکی یاسایی ئەبەدی نییە. مافی دروستکراو بایەخی هەر یاسایەکی ترە و هەموویان هاوکات هەم بڕ دەکەن و هەم بڕ ناکەن. هەر کەس بە جۆرێکی دیکە بیر بکاتەوە خۆی فریو دەدا. بە گوێرەی یاسای ئێستای ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکا، ئێوە هەمووتان وەکو بەکرێگیراوی وڵاتە دوژمنکارەکان گیراون. یاس ئەوهای دەوێ. هاوسەرەکەی تۆش هەر بە پێی ئەو یاسایە گیراوە کە دەڵێ هاوسەری بەکرێگیراوە پایەبەرزەکانی وڵاتانی دوژمنکار دەگیرێن. تەنانەت باوکیشت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وەکو بەکرێگیراوی وڵاتێکی دوژمنکار دەبێ دەسبەسەر بێ. دیارە من هەقت دەدەمێ کە ئەوە بۆ تو زۆر سەختە، بەڵام یاسا وا دەڵێ. بە درێژایی مێژوو

یاسا هەمیشە بارگرانایی هەبووە. ئێوەش پێم وا نییە چاوەڕوانی ئەوەتان هەبێ لە پێشدا پرسمان بە ئێوە کردبا ئینجا یاساکانمان دارشتبان!"

ترایان هەستایە سەر پێ. دەیویست وەدەر کەوێ. هەر لەو کاتەوە دەستی بە نووسینی "کاتژمێر بیست و پێنج" کرد بڕوای وا بوو ساتەوەختێک دێ کە یاساکان مافی ژیان لە خەڵک زەوتدەکەن. هەر لە سەرەتای گیرانییەوە هەستیکردبوو کە ئەم جۆرە یاسایە دەست بە جێبەجێ کردنی کراوە، بەڵام هەمیشە بەوە دڵی خۆی دەدایەوە کە رەنگە ئەو بە هەڵە چووبێ. ئێستا وا بە رەسمی پێیان راگەیاند کە ئەو یاسایە بەبێ بچووکترین خاتر و خۆتر گرتن پێڕەو دەکرێ. ئیدی ئیمکانی هەڵە کردن لە گۆڕێدا نەمابوو. کەسانێ کە هیچ تاوانێکیان نەبوو بە پێی یاسا بەند دەکران، ئەشکەنجە دەدران، برسێتییان دەکێشا و دواجار سەریان دەنایەوە.

ئەفسەری زیندان گوتی: "من دەزانم تۆ بۆ خۆت بێتاوانی. من چوار جارم داوا کردووە تۆ و خێزانەکەت و باوکت بەردرێن. هەر چەند ئێمە لێمان مەنع کراوە داوای بەردانی کەسانێک بکەین کە بە کۆمەڵ و ئۆتۆماتیکی گیراون، بەڵام هیچ وەڵامیان نەدامەوە. بە هیچ شێوەیەک بەندی بە تاک بەرنادەن. فەرمانی ئازاد بوون ئەگەر دەربچێ تێکڕا بۆ ئەفرادی چین و خشتەبەندییەک دێ."

"کەواتە گرینگ نییە کێ تاوانبارە و کێ بێ گوناهە؟ هیچ نەبێ بۆ چێژوەرگرتنی خۆتان زیاتر لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە."

"ئەوە پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە. خۆ ئەگەر بە هۆی پەروەردەکەتەوە و گشت بۆچوون و روانگەت لە بارەی زانستە ئایینییەکان و مرۆڤایەتی و ئیستاتیکاوە، ئەوانە دڵت بریندار بکەن، ئەوی هەیە هەر هەیە و ناگۆڕێ. رەنگە شێوەی دەرک و تێگەیشتنی ئێمە خاو و ئامێری و بە پێی بنەما بیرکارییەکان بێتە بەرچاو... ئەوە راستە جیهان و بوون بە یەک شێوازی بیرکاری لە جووڵەدایە و هیچ کەس بیر لەوە ناکاتەوە بچووکترین گۆڕانی تێدا بکا."

"کەوابوو ئەو لێپرسینەوەیەی لەتەک مندا کردتان، بە لای ئێوەوە هیچ بایەخی نییە و بە سانایی دەکرێ چاوپۆشی لێ بکرێ؟ هەرچی پەیوەندی بە تاکەوە هەبێ بە لای ئێوەوە بۆ ئەوە نابێ گرنگی پێ بدەی؟"

"وایە، تەنیا شتێکی لە کەسەکانمان دەوێ ناونیشانیانە. نێو و شۆرەت و شوێن و مێژووی لە دایک بوون. ئەو لێپرسینەوەیە تەنیا بۆ کۆنترۆل کردنی تاقمێک و پۆلێن کردنی بەندییەکان بەسەر دەستە و خشتەی جۆراوجۆرە. فەرمانی مانەوە لە زیندان یان بەردانی بەندییان بە پێی تاقم و خشتە دەردەکرێ نەک بۆ تاکەکەسان." "بە رای تۆ ئەوە کارێکی نامرۆڤانە نییە کە وەک لەت و کەرستەی خشتە و دەستەبەندییەک سەیری مرۆڤ بکرێ؟"

"نا، پێم وا نییە کارێکی دوور لە ئینسانییەت بێ. ئەم شێوازە عەمەلی و خێرایە، بۆیە شێوازێکی باشە. دادپەروەری بەم جۆرە بە پێی مێتۆدە بیرکاری و فیزیکییەکان، واتە دەقیقترین مێتۆد، بەڕێوە دەچێ. تەنیا شاعیر و کەسانی خەیاڵاوی و سۆفی میزاج باوەڕیان بەو مێتۆدە نییە، بەڵام کۆمەڵگای مۆدێرنی ئەمڕۆ لە مێژە قۆناغی شیعر و خەیاڵپڵاوی تێپەڕاندووە. ئێمە ناتوانین لە رووی سۆز و هەستەوە میلی زەمان بۆ دواوە بگێڕینەوە. بێجگە لەوە هەر لە جێدا ئەو جۆرە هەست و سۆزە زادەی بیری شاعیر و خواپەرستانە." ئەفسەرەکە بە ژێستێکەوە کۆتایی بە لێپرسینەوەکە هێنا:

Take it easy

ترایان کۆرۆگا دەرگای کردەوە. لە پشت سەریەوە گوێی لە دەنگی سارد و سڕی ئەفسەرەکە بوو کە گوتی "کەسێکی تر با بێ."

## (١٣٧)

یوهان ماوەیەکە کەلکەڵەی هەڵاتنی کەوتۆتە مێشکی. لەو دەمەوە زانیویە سۆزانا تەڵاقی وەرنەگرتووە و بە خۆی و منداڵانەوە چاوەڕێیەتی، کێچی کەوتۆتە کەوڵ. ترایان پێی دەڵێ: "شەڕی خۆتڕێنە. دوور و نێزیکی تەلبەند بێ پاسەوانە لەهستانییەکان دەتدەنە بەر گوللە."

یوهان پاسەوانەکانی بە خۆیان و بەرگی شینەوە دیون. پاسەوانەکانیش بە دیقەتەوە چاویان لەو بڕیوە. دەڵێی بیریان خوێندۆتەوە.

"گریمان توانیشت رابکەی، مەفرەزەی ئەڵمانی و ئەمریکییەکان قوتارت نادەن. بۆ ئەوەی لە ئەڵمانیا تێپەڕی و بگەیەوە رۆمانیا تووشی مەفرەزەی چیک و ئۆتریش و فەرەنسا و مەجەرستان هەر دەبی. تۆ مەحاڵە بگەیەوەماڵەکەی خۆت. ئەگەر لە گوللەی ولاتێکیش دەرباز بی گوللەی ولاتێکی دی دەتپێکێ. تەواوی میللەتانی دنیا بە چەکی لەسەر پێوە کەوتوونەتە نێوان تۆ و ماڵباتەکەتەوە و چاوەڕێی کوشتنی تۆن.

سوپای نێودەوڵەتی کەوتۆتە نێوان مرۆڤ و ژیانە تایبەتییەکەیەوە. ئیدی مرۆڤ مافی ژیانی تایبەتیی لەدەستداوە وچکۆلەترین مل بادان لەو فەرمانە دەبێتە هۆی ئەوەی سەری تێدا بچێ. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە هەمیشە رەشاش و تیشکهاوێژ و تەلبەند ئامادەن."

"بەو حاڵەشەوە دەمەوێ رابکەم."

پاسەوانە لەهستانییەکە چاوی لە یوهان هەڵنەدەگرت. لەو ساتەدا دوو ئەفسەری ئەمریکی هاتنە نێو گۆڕەپانەکە و بەرەو نەخۆشخانە رۆیشتن. یوهان دیتنی. لە ناکاو بێ ئەوەی هیچ بە ترایان بڵێ بەرەو دوو ئەفسەرە ئەمریکییەکە گوڕی بەست. ئەفسەرەکان لاقیان گرتنەوە. هەر ئەوان تەماشای یوهانیان کرد و یوهان تەماشای ئەوان. ئینجا یەکیان کە کەمێ قەڵەوتر و بە تەمەنتر دیار بوو باوەشی کردەوە و یوهانی لە ئامێز گرت. زیندانییەکان بە سەر سوڕمانەوە لێیان نزیک بوونەوە. قەت نەیاندیبوو ئەفسەرێکی ئەمریکی بەندییەک لە باوەش بگرێ. یوهان لەگەڵ ئەفسەرە ئەمریکییەکە هێشتا بە میهرەبانییەوە دەستی هاویشتبووە سەر پشتی بەرەو نەخۆشخانە رۆیشتن و لەو دیوی دەرگای نەخۆشخانەدا بزر بوون.

ترایان کۆرۆگا بە لۆژە لۆژ بەرەو نەخۆشخانە رۆیی و لەوێ بە دیار دەرگاکەیەوە راوەستا. دەیویست بزانێ چی رووی داوە. یوهان بە دڵنیاییەوە ئێستا دەهاتەوە و هەموو شتێکی بۆ باسدەکرد. یوهان سەرو سۆراغی دیار

نەبوو، بەڵام دواجار دەنگی هات. لە پەنجەرەی نەخۆشخانەوە ملی دەرهێنابوو. چاوی هەر ورشەی دەهات:

"ئەو ئەفسەرە ئەمریکییە برادەرێکی خۆمە، دکتۆر ئابرامۆڤیچی ـ یە. یەکسەر ناسیمەوە. پێکەوە لە ڕۆمانیا هەڵاتبووین. بێگومان هەر زوو رزگار دەبم. بە دڵنیاییەوە."

یوهان پەنجەرەکەی داخستەوە. دیار بوو هاوڕێکەی بانگی کردبوو و دەیویست قسەی لەگەڵ بکا.

"یانکەلی خۆشەویست، شتی مەحاڵ داوا مەکە، شتێکم داوا لێ بکە کە لە دەستم بێ. فەرمانی بەربوونی بەندییان تەنیا بە شێوەی ئۆتۆماتیکی و بە کۆمەڵ دەدرێ. بیر لەو مەسەلەیە نەکەیەوە چاکە. دان بە خۆتدا بگرە."

"من بێ تاوانم، باشە بۆچی دەبێ لێرە بم؟"

"مەسەلەی بێ تاوانی و بەربوون فریان بەسەر یەکەوە نییە."

دکتۆر وردە وردە تووڕە دەبوو: "باشە تا ئێستا هیچکەس پێی گوتووی تۆ تاوانباری؟ پێم وا نییە کەس وای پێ گوتبێ. من دەتناسم و دەزانم لە ئاوی شەو پاکتری، بەڵام پاکی و بەربوون لە زیندان، دوو شتی لێک جیان. رزگار بوون لە بەند تەنیا سەبری دەوێ."

"من زۆرم سەبر گرتووە."

"ئەوە رای خودی خۆتە. تۆ هێشتا هەر جووتیارەکەی جارانی. پێت وایە بەندییەک تەنیا لەبەر بێ تاوانی بەردەبێ؟ ئەگەر وا بوایە هەموو گرتووخانەکان دەبوو بە رۆژێک چۆڵبکرێن. هەر نازییەکیش دەتوانێ پاساوێک بۆ بێ تاوانیی خۆی بدۆزێتەوە.

فەرمانی ئازادبوونی بەندبوونی بەندییان تەنیا لە ناوەندی فەرماندەیی لە پاریس دەردەچێ. بەڵگەنامە و فایلەکان دەنێرنە واشنتۆن. بڕیاری یەکجارەکی بە "ویسبادەن" رادەگەیەنرێ. لیژنەیەکی تایبەت لە "ئەسلینگن" بە راگەیەنراوەکاندا دەچێتەوە. پاشان ئاکامی کارەکە وەک راپۆرتێک دەنێردرێتە "بەرلین." لە بەرلین فەرمانی ئازادبوون دەدرێ و رەوانەی "هایدلبێرگ" دەکرێ و کاتێ ئەمری ئازادیی بگاتە هایدلبێرگ دەبێ نووسراو و ناونیشانی تۆ لە

سەدا فایلی جیادا هەڵبگیرێ. مەتەڵێکی ئاڵۆزە. ئەو کارانە گشتی وەک کاری ئامێرێک بە شێوەی ئۆتۆماتیکی ئەنجامدەدرێن. هەر بەندییەک پەڕەی ناونیشانی خۆی هەیە. ئەمریکییەکان ئەرشیڤێکی هێندە گەورەی ئەو ناوانەیان هەیە، بە قەد پادگانێک دەبێ. کاتێ حوکمی بەربوونی تۆ دەگاتە هایدلبێرگ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پەڕەی ناونیشانت لە ئەرشیڤخانەی واشنتۆن و پاریس و بەرلین و فرانکفۆرت هەڵدەگیرێ. ناوی تۆ لە سەرانسەری دنیا تۆمار کراوە. لە دائیرەی پۆلیسی نهێنیی ئەمریکا، لە ناوەندی فەرماندەیی هاوپەیمانەکان لە پاریس، لە لیژنەی چاودێری لە بەرلین لە هەموو ئۆردووگا و زیندانەکان و هەموو نووسینگەکانی SOS,SP,MP,CID,CIC. بە کورتی لە هەموو جێگایەک. دوای هەر گۆڕانێکی بچووک لە وەزعی تودا دەبێ هەموو کارت پێناسەکانی تۆ لە سەرانسەری دنیا بگۆڕێن. ئاگاداری ئەو شتانە نەبووی؟"

یوهان مۆریتس ناوی خۆی وا دەهاتە بەر چاو کە لە هەموو شارێکی دنیا نووسراوە و بە هۆی کارەباوە هەڵدەبێ و دەکوژێتەوە. ڕاست وەک تەلبەندەکانی ئۆردووگا کە لەبەر تیشکی جار نا جارێکی تیشکهاوێژەکان هەڵدەبن و دەکوژێنەوە. ئێستا دەیزانی چکۆلەترین جووڵەشی تۆمار دەکرێ!

"نا نەمدەزانی."

"ئەگەر زانیبات داوای ئازادبوونت لە من نەدەکرد، بەڵام من پێم ناخۆش نەبوو تۆ ئەو داوایەت لێ کردم. هەر بەڕاست پێت وا بوو من، بەتەنێ ئەو ئامێرە زەبەلاحەم پێ رادەگیرێ؟"

دکتۆر ئابرامۆڤیچی قاقا پێکەنی: "من هیچ، سەرۆک کۆماری ئەمریکاش ئەو کارەی لە دەست نایە، تۆ دەبێ سەبر بگری تا نۆرەت دەگاتێ."

"باشە من کە بێتاوان بم بۆ دەبێ بگیرێم؟ کە لە هیچدا نەبم ئەو ئامێرە بۆ دەبێ سەرم لە دوو بنێ؟ مەگەر ئەو ئامێرەی باست کرد بە دز و زەلامکوژ و کڵاوچییان دروست نەکراوە؟"

"یانکەل گیان، فێر بە وەک گوندییەکی دەبەنگ بۆ مەسەلەکان نەچی. تۆ هەموو شتەکان دەبەیەوە سەر ژیانی شەخسی، بەڵام وڵاتە زل و پێشکەوتووەکان خۆیان بە مەسەلەی شەخسی و تاکەکەسیەکانەوە سەرقاڵ

ناکەن. ئەوەیان کە تۆ تاوانباری یا بێتاوان مەسەلەیەکی شەخسییە. ڕەنگە بە ژنەکەت و دەرو دراوسێ و گوندییەکانی دیکەوە گرنگ بێ. هەر ئەوانیش خۆ بەو مەسەلە شەخسیانەوە خەریکدەکەن. حکوومەتەکان لایەنی گشتیی لەبەر چاو دەگرن و گوێ نادەنە کێشە شەخسییەکان."

"باشە بۆ چییان گرتووم"

"ئێمە هەموو تاقم و دەستەیەکی گومان لێکراومان دەستبەسەر کردوون و ئێستا ئەگەر بمانهەوێ تاوانبارێک ببینینەوە - بۆ نموونە تاوانبارێکی شەڕ - ئیدی پێویست ناکا گوند بە گوند و شار بە شاری دنیای لێ بگەڕێین. ئەوە بە فیڕۆدانی کاتە. هەر هێندە بەسە بە پێی پیتی ئەبجەد دوگمەیەک دابگرین و داوای فایلەکەی بکەین. فایلێک کە هەموو زانیارییەکی تێدایە. بەژن، کێش، ڕەنگی قژ، مێژوو و شوێنی لە دایک بوون، ژمارەی ددانەکان و هەر شتێکی دیکەی پێویست. هەر ئەوەندە زەحمەتە تەلەفۆنێک هەڵبگری و تەلەفۆن بۆ ئەو بەندیخانەیە بکەی کە گرتووەکەی تێدایە تا دوای چەند کاتژمێر بەندییەکە لەبەر دەم دادگای نێودەوڵەتیی تاوانبارانی شەڕ لە "نۆرمبێرگ" ئامادە بێ. ئەوە هی دەستکەوتەکانی پیشەسازییە! هەموو شتێک ئۆتۆماتیکییە. هەموو شت کارەباییە. باشە چۆن پێت وایە دەتوانن بەرت بدەن؟ ئەوە بیرێکی گەوجانەیە. تۆ وەک داوە دەزوویەک وای کە لە ئامێری چنیندا بە کار دەهێنرێ. هەر کە چووە ناو ئامێرەکەوە دەرهێنانەوەی مەحاڵە. دەبێ سەبر بگری تا خوی لە ئامێرەکە دێتە دەرێ. جگە لە چنران لەگەڵ دەزووەکانی دی هیچ ڕێگایەکی تری نییە. ئامێرەکان وردەکارن و مرۆڤ جگە لە سەبر گرتن لێیان چی تری لە دەست نایە. تۆ ئێستا چوویەتە ناو ئامێرەکەوە، هەر چەند خۆت لێرە و لەوێ بدەی، نایەوە دەرێ. ئامێر کەڕو لاڵە. نە دەبیسی و نە دەبینێ. تەنیا کار دەکا. کارێک کە بە هیچ مرۆڤێک ناکرێ. یانکەل، سەبر بگرە و دڵنیا بە سەرەی تۆش دێ. ئامێر وەک مرۆڤ نییە شتێ لە بیر بچێتەوە. زۆر دەقیقە، تێگەیشتی؟"

یوهان کڵۆڵانە شانی هەڵتەکاند: "کەواتە تۆش ناتوانی بەرم بدەی؟"

"هەر وەک پێم گوتی تۆ چوویەتە ناو ئامێرەکەوە و جگە لە سەبر گرتن چارەی دیکەت نییە."

"ئەگەر تۆ قسەیەکی لێبکەی دەشقەم شتێک بۆ بکەن. خۆ فەرماندەکانیش وەک ئێمە بەشەرن. ئەگەر پێیان بڵێی ژن و منداڵی هەیە و چەندین ساڵە بە هیچ و خۆڕایی گیراوە لەوانەیە دڵیان نەرم بێ و بەرم بدەن."

دکتۆر بە تووڕەییەوە گوتی: "قسەکردن لەگەڵ تۆ کەڵکی نییە. تۆ هەموو شتێک لەگەڵ کێشەی شەخسیی خۆت تێکەڵدەکەی. بە کورتی تۆ ناتوانی وجوودی تاکەکەسیی خۆت پشتگوێ بخەی. ئەوە خووی مرۆڤە بەراییەکانە. دەی چیت پێویستە پێم بڵێ چونکە دەبێ بڕۆم. جگەرە، خواردەمەنی، جلوبەرگ، چیت دەوێ؟"

"من دەمویست مافی خۆم وەربگرم، بەڵام دیارە کە مافی مرۆڤ لەم دنیایەدا لە ناو چووە. هیچی تریشم ناوێ.

"بەهەرحاڵ، خۆ دەتوانی جگەرەیەک بکێشی."

دکتۆر پاکەتە جگەرەی "لاتی سترایک"ی بۆ راگرت.

"ئێمە هاوڕێی سەردەمی نەهامەتی بووین، یانکەل گیان."

یوهان دەستی درێژ کرد تا جگەرەیەک هەڵگرێ کەچی پاکەتەکە بەتاڵ بوو. دکتۆر هەموو گیرفانی پشکنی، بەڵام جگەرەی دیکەی پێ نەبوو. بە یوهانی گوت: "ئەمجارە بێم جگەرەت بۆ دێنم، یانکەل گیان."

ئینجا لێی دا رۆیی.

## (١٣٩)

قەشە کۆرۆگا لە کاتێکدا دار شەقەکانی لەسەر ئەژنۆی دادەنا، بەرامبەر ئەفسەری لێپرسینەوە دانیشت.

"تۆ ئەگەر نازی نی یان سیخوڕیان نەبووی لە ئەڵمانیا چیت دەکرد؟ منداڵێکیش بڕوا بەو ئەفسانەیە ناکا کە گوایە: "کاتی وە هۆش هاتوویەوە لە نەخۆشخانەیەکی ئەڵمانیا بووی. ئەو جۆرە رووداوانە هەر لە

ئەفسانەکانی باڵکاندا هەن، نەک لە دنیای واقیعدا. بە لای ئەفسەرێکی ئەمریکییەوە چیرۆکەکەی تۆ زۆر بەرایی و ئەفسانە ئامێزە. باشە تۆ کە دۆست و هاوکاری نازییەکان نەبووی، لە بەر چی عەمەلیاتی دژواری بڕینەوەی هەر دوو قاچی تۆیان ئەنجامداوە؟ لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ کە دوژمنیانی! لەوانەشە لە رووی مرۆییەوە! ئەوە لە کەیەوە ئەڵمانەکان ئاوا بوونە مرۆڤدۆست. هەر ئەو ئەڵمانانەی دوژمنی خۆیان هەموو دەناردنە ئۆردووگاکان و ژووری پڕ لە گاز؟ تۆ هاوکاریت کردوون و ئێستا رەنگە لە دڵەوە پەرۆشی هیتلەرت بێ کە شەڕەکەی دۆڕاندووە."

قەشە بێدەنگ بوو. رەنگی هەڵبزرکابوو. نێوچاوانی ئارەقەی دەردابوو. بە زەحمەت خۆی لەسەر کورسییەکە راگرتبوو. لەوەتی قاچەکانیان بڕیبوونەوە نەیدەتوانی لەسەر کورسی دابنیشێ. سەربازی ئەوە تاشی لێبوو. تەمەننای دەکرد زووتر لێپرسینەوەکە ببڕێتەوە تا بتوانێ لەسەر کورسییەکە هەستێ. ئەفسەرەکە دووپاتی کردەوە:

"بە دڵنیاییەوە ئەگەر هیتلەر شەڕەکەی بردبایەوە، خەنی دەبووی. وایە؟ ئەودەم هیتلەر تۆ دەکردە کاردینالی مەزنی رۆمانیا. دانی پێدا بنێ کە بە سەرکەوتنی نازییەکان شادمان دەبووی."

"نا، من خۆشحاڵ نابم."

"کەواتە بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان دڵشادی؟"

"بەویش خۆشحاڵ نیم."

ئەوە وەڵامی قەشە بوو.

ئەفسەر نێوچاوانی تێکنا. ئەلیکساندر کۆرۆگا بزەیەکی هاتێ و گوتی: "هیچ سەرکەوتنێک بە زەبری چەک من خۆشحاڵ ناکا. "لائۆتسە" گوتەنی: سەرکەوتنیش هیچ جۆرە جوانییەی تێدا نییە و هەر کەس پێی جوان بێ بزانە حەزی لە کوشتارە. ئەوی حەزیشی لە کوشت و بڕ بێ لە گەیشتن بە زێدەخوازی و گۆڕینی رێچکەی سووڕانی جیهاندا، سەرکەوتوو نابێ. کوشتاری بە کۆمەڵی خەڵکان بۆ ئەوە دەبێ شینی بۆ بگێڕی و سەرکەوتنێکی وا بۆ قورپێوان دەبێ." قەشە بە دەم قسەکردنەوە چاوی بە وێنەی چەند

دیمەنێکی ئۆردووگاکانی ئەڵمانیا کەوت کە دیوارەکەی هەموو داپۆشیبوو، تەرمی گیۆرگ دامیانی داواکار و ڤاسیلی ئاپوستێل و گوندییەکانی دیکەی فانتانا کە بە دەستی مارکۆ گۆڵدنبێرگ گوللەباران کرابوون و هاویژرابوونە ناو چاڵی ریخەوە. بیرەوەریی لەشی لەتوپەت کراوی منداڵانی دەرسدن، فرانکفۆرت و بەرلین ـ ی لێ ژیایەوە. ئینجا کوژراوی شەڕی ستالینگراد و دۆنکرک ـ ی بیر کەوتنەوە. لە کاتێکدا ئەو هەموو قوربانییەی هاتبوونەوە یاد نەیدەتوانی بە سەرکەوتنێک دڵخۆش بێ کە بەرهەمەکەی نەهامەتی بوو.

"شیعرێکی جوانە، بۆخۆت داتناوە؟"

"چینییەک گوتوویەتی کە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ژیاوە."

"ئەو شیعرەم بۆ بنووسەوە. دەمەوێ بۆ کەسوکارەکەمی بنێرمە ئەمریکا."

ئەفسەر زەردەخەنەیەک گرتی. لەوانەیە لەو کاتەدا خزم و کەسی خۆی هاتبنەوە بیر، بەڵام هەر زوو رووی گرژ بۆوە.

"دڵنیای ئەو شیعرەی خوێندتەوە هی شاعیرێکی چینییە؟"

"بەڵێ، بەڵام ئەگەر بە لاتەوە جوانە گرینگ نییە هی کێ بێ. شیعرێکی یەکجار جوانە و ئەوی دی هەموو بێبایەخە."

"بە پێچەوانەوە زۆر گرینگە. بەوە باشە شیعرەکە هی چینییەکە و چینیش هاوپەیمانی ئەمریکایە. کەسوکارم بە دیتنی ئەو شیعرە زۆر خۆشحاڵ دەبن. ئەگەر شاعیرەکەی سەر بە وڵاتێکی دوژمنکار با نەدەتوانی بینێری. تکایە تا سبەی بۆمی بنووسەوە. قەڵەم وکاغەزت بۆ دەنێرم. ئەرێ جگە لە زانستی ئایینی هیچی ترت خوێندووە؟"

"من ئەوەندی کوێرەوەریی یان لێم گەرابێ هەر شتێکی نیازم بووە فێری بووم."

"زمانی چینیش دەزانی؟" "نەخێر."

"حەیف، دەنا پێم خۆش بوو بە خەتی چینی بۆم بنووسی. بێگومان کاتێ کەسوکارم نامەیەکی منیان بە زمانی چینی پێ دەگەیی سەریان سوڕ دەما. قەی ناکا هەر بە ئینگلیزی بینووسەوە.

قەشە ماندوو مردوو گەڕایەوە. یوهان یارمەتیی دا رابکشێ و دوایی چەند پارچە کاغەزی تەڕی لە سەر سەری دانا.

"بابە، لە بارەی ئازاد بوونی تووە هیچی گوت؟"

قەشە وەڵامی دایەوە: "نەخێر."

"ئەدی چیی لێ پرسی؟"

"داوای لێکردم شیعرێکی لائۆتسەی بۆ بنووسمەوە. زۆری پێخۆش بوو شیعرەکەی بە خەت و زمانی سەرەکی هەبێ و پێی ناخۆش بوو من خەتی چینی نازانم.

"لێپرسینەوەکە هەر ئەوەندە بوو؟"

قەشە تەنیا سەرێکی لەقاند.

## (١٤٠)

ترایان نامەیەکی نووورای پێگەیی. ترایان لە کاتێکدا نامەکەی لە نێو پەنجەکانیدا رێکدەگوشی کە بە پیتی گەورە رستەی Prisond of warی لەسەر زەرفەکەی نووسرابوو، گوتی: "دەمزانی نووراش بەند کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوادار بووم تا ئێستا ئازاد کرابێ. ئێستا ئەو هیوایەش نەما. ئەویش وەکو ئێمە بەندییە. لە ئۆردووگایەکی وەک ئەوەی ئێمەدا. ئەویش هەر رۆژەی لە ئۆردووگایەکەوە دەنێردرێتە ئۆردووگایەکی دی. ئەویش لە ناو تێلدڕکدا دەستبەسەرە، وەک ئێمە."

نوورا ناونیشانی ترایانی نەدەزانی. بۆیە ناوی ترایان و ئینجا هەموو زیندانەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکای لەسەر زەرفەکە نووسیبوو. نامەکەش تا گەیشتبووە دەستی ترایان چەندین زیندان گەڕابوو.

"کەواتە وەک چۆن ناوی ئەو ئۆردووگایەی نووورای لێیە باس نەکراوە، ناونیشانی منیشیان نەداوەتە ئەو."

قەشە هەوڵیدا دڵی ترایان بداتەوە. ئەو لەسەر تەخت راکشابوو و پەڕۆی تەڕی لە سەر نێوچاوان دانابوو. یوهان مۆریتس ـ یش لە پەنای دانیشتبوو.

دڵدانەوەی ترایان بە خۆڕایی بوو. هەستایە سەر پێ و گوتی: "هەموو ئازارێک سنووری خۆی هەیە و پێم وایە من گەیشتوومە ئەو سنوورە. مرۆڤ ناتوانێ لەو سنوورە تێپەڕێ و هەر بشمێنێ."

ئینجا لە خێوەتەکە وەدەر کەوت.

یوهان بە ترسەوە گوتی: "کاک ترایان دەیەوێ خۆی بکوژێ."

قەشە گوێی لێنەبوو. بە روخسارێکی رووەو ئاسمانەوە لە جێی خۆی نەدەبزووت و لە دڵی خۆیدا دوعای دەکرد.

نەک هەر بۆ ترایان و ئەلیو نوورا، بەڵکو بۆ یوهان و هەموو ئەو کەسانەش کە بە دەستی شارستانیەتی تەکنەلۆژی گەیشتبوونە لێواری سنوورێک کە لەودیوی بێجگە لە مەرگ شتێکی دیکەی لێنەبوو.

"کاک ترایان بە تەنیا جێ بهێڵم خۆی دەکوژێ."

قەشە چاوی هەڵهێنا. دەستی بە سەری یوهاندا هێنا و ئینجا لێی گەڕا بڕوا.

## (١٤١)

قەشە کۆرۆگا گوتی: "تکایە دەستت بدە من. چاوی نیوە ئاوەڵا بوون، تەوێڵی زەرد هەڵگەڕابوو و کوڵمەکانی ئاسەواری خوێنیان تێدا بەدی نەدەکرا. دەستی ترایانی لە دەستی خۆی گرت. تینی دەستیان چووە ناو یەکدی. دەتگوت خوێنی جەستەیان بە ناو دەستی یەکتردا دەگەڕێ. ئەوەندەیان هەست بە نزیکی دەکرد تەنیا هەستی نێوان باوک و ئەولاد وایە و بەس.

ترپەی دڵی باوک تا دەهات کەم دەبووە. یوهان پرسی ئاخۆ پەڕۆیەکە بگۆڕێ یان نا، بەڵام قەشە بە ئاماژەی دەست تێی گەیاند کە ئیدی پێویست ناکا. یوهان لە پەنا تەختەکە دانیشت. قەشە بە کوڕەکەی گوت: "لەم ساتەدا وا هەستدەکەم دەستم نەک بە دستی تۆ بەڵکو بە ئاگری ژیان گەرم دەکەمەوە. تۆ گەرمی و تەنیا کەسانی زیندوو گەرمن."

ترایان دەستی باوکی زیاتر لە ناو دەستەکانیدا گوشی. دەستی ساردو سڕە و بوون، بەڵام قەشە هەر پێدەکەنی.

"من لە دنیایە دوو ئاواتی گەورەم هەبوو. لە ئەمریکا قەشە بم و کە مردیشم لە گۆڕستانی فانتانا بنێژرێم. تۆ شارەزای ئەوێی ترایان. گۆڕستانێکی بێ دیوار و شوورەیە، پڕە لە گوڵ و گیای خۆڕسک، دەڵی گوڵزارە. هەمیشە دەمهێنا بەر چاوی خۆم کە هەتا هەتایە لەوێ دەنووم. من هەر دوو ئاواتم هاتوونە دی، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر. من نەچوومەتە ئەمریکا، ئەمریکا خۆی هاتە لای من. من لێرە لەو ئۆردووگایە دەمرم، شوێنێک کە ئاڵای پڕ ئەستێرەی ئەمریکای لە سەر دەشەکێتەوە. تەرمی من لە گۆڕستانی فانتانا نانێژرێ، بەڵام گۆڕستانی فانتانا هێندە لەبەر یەک ڕەویوەتەوە سەرانسەری خاکی ئەورووپای داگرتووە. ئەمڕۆ فانتانا و ڕۆمانیا و هەموو ئەورووپا لە سەر نەخشەی جیهان پەڵەیەکی ڕەشن، وەکو پەڵەی مەرەکەب. سەرانسەری ئەو قارەیە خامۆش و دڵ مروو بووە. شادومانی ئەو قارەیەی جێ هێشتووە. بەو زووانەش گوڵ و گیا هەمووی دادەپۆشی. ڕاست وەک گۆڕستانی زێدەکەمان. ئیدی، بە لامەوە گرینگ نییە لە چ کونجێکی ئەو قارەیە دەمنێژن. لە هەر جێیەک بم وا هەستدەکەم لە زێدەکەی خۆمم، لە حەوشی کڵێسەی گونید فانتانا کە هیچ دیوار و شوورەی نییە."

ترایان بە باوکی گوتی: "ئەو وتانە لە پای چی؟ چاکتر نییە ئیسراحەت بکەی؟"

"تۆ ڕاستدەکەی. لەگەڵ ئەوەشدا حەزم دەکرد شتێکت پێ بڵێم. ترایان تۆ دەبێ بزانی ژیان بەبێ لەبەر چاو گرتنی مردن هیچ ئامانجێکی عەینی (ئۆبژێکتیڤ) نییە و هەر ئامانجێکی ڕاستەقینە لە ژیاندا زیهنی (سۆبژێکتیڤ)ە. سیستمی شارستانییەتی تەکنەلۆژی دەیەوێ مانای عەینی ببەخشێتە ژیان. هەر بۆیە شیرازەی ژیانی تێکداوە.

کۆمەڵگایکی وا ژیان تا ئاستی ئامارگیری دادەبەزێنێ. کۆمەڵگای ئێستا بە لاڕێدا دەڕوا، بەم جۆرە کە گشتێتی دەداتە هەموو شتێک. هەر بەم هۆیە

دەتوانم لەوە دڵنیا بم کە ئەو کۆمەڵگایە تێکدەڕووخێ. تۆ بۆخۆت شەوێکیان لە فانتانا باسی ئەو بابەتەت بۆ کردم. مرۆڤ چیدی سیستەمی کۆمەڵگای تەکنەلۆژی پێ تەحەمول ناکرێ. ئەم سیستەمە مرۆڤ دەخنێکێ و مرۆڤ وەکو کەروێشکی ناو رۆمانەکەی تۆ لە گیانەڵڵادان. ئێمە هەموومان لە کەشوهەوای کوشندەی ئەم کۆمەڵگایەدا بەرەو لە ناو چوون بەڕێ کەوتووین. لەم کۆمەڵگایەدا تەنیا کۆیلە ئامێرییەکان، خودی ئامێرەکان و غوڵامەکانن بەرگە دەگرن. هەر وەک خۆت دەتویست لە کتێبەکەتدا باسی بکەی. مرۆڤ بەم شێوەیە تووشی گوناهی گەورە دەبن و بەرامبەر زاتی خواوەند بەرپرسیارن. ئێمە بە هەموو هێزمانەوە بە گژ ئاسوودەیی تاکەکەسیی خۆمان و بە تایبەت بە گژ خوادا چووینەتەوە. ئەوە دوا قۆناغی زەلیلی و بوودەڵەییە کە کۆمەڵگای ئەورۆ کەوتۆتە ناوی و بەم جۆرە کۆمەڵگای ئێمەش ـ وەکو هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی بە درێژایی مێژوو یەک لە دوای یەک رێگەی لەناوچوونیان گرتە بەر ـ تێکدەڕمێ.

هەندێ کەس دەیانەوێ لە رێگەی سیستەمێکی نوێوە کۆمەڵگا رزگار بکەن، بەڵام هەر بەو سیستەمە نوێیە دەستی لە تێنتینۆکەی دەنێن. جینایەت و بەربەریەتی سیستەمی تەکنەلۆژیی رۆژئاوا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم کۆمەڵگایە مرۆڤ دەکوژێ و دەیکاتە قوربانیی پلانێک یان تیۆرێک، واتە بوونێکی ئەبستراکت.

ئەوە مۆدێرنترین شێوەی تێداچوونی مرۆڤە. ئەورۆکە قەسابخانە و شوێنی سووتاندنی قوربانییەکان بۆتە نووسینگەی ئامارگیری و پلان و بتە کۆمەڵایەتییەکان. ئاگری ئەمانەیە مرۆڤی خستۆتە ناو گڕ و بڵێسەی خۆی.

بۆ نموونە دیموکراسی فۆرمێکی بەرزی سیستەمی کۆمەڵایەتییە و زۆر لە توتالیتاریزم باشترە، بەڵام ئەگەر لە دیموکراسیشدا تەنیا لایەنێکی مرۆڤ، واتە لایەنە مادییەکانی لەبەر چاو بگیرێ، ئەوە بە مانای کوژاندنەوەی چرای ژیانە. کۆمۆنیست و ناسیۆنال سۆسیالیستەکانیش تووشی ئەو هەڵەیە بوون. ژیانی مرۆڤ لە گشتیەتی خۆیدا خاوەنی چەمک و مانایەکە کە تەنیا بەو ئامراز و کەرستانە دەرک دەکرێ کە بۆ ناسینی هونەر و ئایین بەکار دێن. بیرکاری و ئامار و لۆژیکیش بۆ تێگەیشتن لە

ژیان هەر ئەوەندە بە کەڵکن کە لە سوز و هەستی ناو پارچە مۆسیقایەکی مۆزارت دەگەن، بەڵام کۆمەڵگای ئەمڕۆی رۆژئاوا لەسەر ئەوە مکوڕە کە بەرهەمی بتهۆڤن یان رافائێل لە رێگەی لێکدانەوەی بیرکارییەوە تێبگا و بە هۆی داتاوە ژیانی مرۆڤ بناسێ و بەرەو پێشەوەی ببا. ئەو چاوقایمیە ئەوەندی جێگای داخە، هێندەش گەوجانەیە. مرۆڤ بە یارمەتیی ئەو شێوازە، لەوانەیە بگاتە چڵەپۆپەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، بەڵام هەر لەو کاتەدا شێرازەی ژیان کە ناچارە ملکەچی کۆمەڵگا و ئۆتۆماتیزم و رێسا تەکنەلۆژییەکان بێ، لێک هەڵدەوەشێ. ئەو جۆرە یاسا و رێسایە هەرگیز ناتوانێ بۆ ژیانی مرۆڤ مانایەی پێ بێ. کۆمەڵگای ئێمە لەمێژە لە راستەرێی چاکەکاری و خێر لایداوە و ئێستا نائومێدانە پەنای بردۆتە بەر رێگای تر. بۆیە ئەمرۆکە روندکی چاوی کۆیلان لە شەپۆلی راین و دانووب و ڤۆلگا بە خورترە. ئەو فرمێسکانە رووباری هەموو ئەورووپا و دنیا پڕ دەکەنەوە و وای لێدێ زەریاکان لێوانلێو بن لە دەرد و ئازاری ئەو مرۆڤانەی کە کویلەی پیشەسازی و حکوومەت و بۆرۆکراسی و سەرمایەن.

ئینجا خوا بەزەیی بە مرۆڤدا دێتەوە و هەر وەک چەندین و گەلێ جاری دیکەش رزگاری کردووە ئەوجارەش نەجاتی دەدا. ئەودەم ژمارەیەکی کەم لەو کەسانەی بە ئینسانیەتی ماونەوە، وەکو نووح و هاوڕێیانی چاروگی پاپۆر هەڵدەدەن و لە زەلکاوی عەدەم دەپەڕنەوە. لە سەر دەستی ئائەمانەیە بەرەی مرۆڤ سەر لە نوێ سەرهەڵدەداتەوە. لە سەرانسەری مێژووی مرۆڤدا چەندین جار ئەو رووداوە دووپات بۆتەوە، بەڵام ترایان، ئەمجارە خشتەبەندی و چینێکی تایبەت رزگار نابێ.

هیچ کلێسە و هیچ حکوومەت و هیچ نەتەوە و هیچ قارەیەک ناتوانێ ئەندامان و کەسانی سەر بە خۆی، بە شێوەیەک خشتەبەندی، قوتار بکا. تەنیا تاک تاکی مرۆڤی هەڵبژاردە، بە بێ لەبەر چاو گرتنی ئایین و نەتەوە یان ئینتیمای سیاسی و کۆمەڵایەتییان رووی رزگاری و سەرفرازی بە خۆیانەوە دەبینن. دەستەبەندی درندانەترین و شەیتانیترین تاوانە کە بە مێشکی مرۆڤدا هاتووە. قەت نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە دوژمنەکەشمان مرۆڤە نەک ئەندامی دەستە و خشتەیەک.[1]

ترایان بڕە هەڵوەستەیەکی باوکی بە دەرفەت زانی و بە ترسەوە گوتی: "بابە، ئێستا بۆچی باسی ئەو شتانە دەکەی؟ وا باشتر نییە کەمێک وچان بدەی؟"

"وچان دەدەم، بەڵام لە پێشدا دەبێ هەموو شتێکت پێ بڵێم. تۆ خۆت ئەمانە هەموو دەزانی و هەستی پێدەکەی. هەموو مرۆڤێک ئەمانە دەزانێ و هەستیان پێدەکا، بە یوهانیشەوە! زۆر باش بوو ئەو قسانەم کردن. ئەوانەم نەگوتبان دڵم نەدەحەسایەوە."

"بابە دەستت سڕ بووە."

"دەزانم ترایان. لەوانەیە بە خۆی خرۆشانێک بێ کە پێشتر نەدیوە. ئەو خرۆشانەی لە گۆشت و خوێن بەهێزترە."

"بابە، باش تێنەگەیشتم چیت گوت؟"

"هیچ."

قەشە ئیدی لێوی کرۆژتن. وەک بڵێی برووسکێکی دەرد و ئازار لێی دابێ. ترایان بەسەر باوکیدا نوشتایەوە. روخساری قەشە بە جارێ بە بزەیەکی گەرم و پڕ خۆشەویستی داگیرسا. وەک چرایەکیان لە پشت تەوێڵی هەڵکردبێ. ترایان تێگەیی ئەوە کۆتاییەتی. لە پەنا باوکی چۆکی دادا. کوڵەگڕووی لە ئەوکێ ما. یوهان قیت بۆوە و پرسی: "دکتۆر بانگ کەم؟"

ترایان وەڵامی نەدایەوە. هێشتا دەستی باوکی لە ناو دەستدا بوون و بە نائۆمێدییەکی تایبەتەوە کە لەمەوبەر نەیدیبوو، دەگریان. یوهانیش بە مەسەلەکەی زانی. کڵاوەکەی داگرت و لە تەنیشت ترایان چۆکی دادا و بە دەست خاچێکی کێشایەوە.

دوای دەمێک یوهان هەستایە سەر پێ. بەندییەکان دەورەیان دان. لە خێوەتەکانی دیکەشڕا هاتبوون. یوهان درێ بە ئاپۆرەی بەندییەکان دا کە بە سەری تاشراو و رووی خەمبارەوە راوەستابوون و هەر زوو مۆمێکی هێنا و هاتەوە و لە ژوور سەری مردووەکەی دانا. مۆمەکەیان لە مێوی کاغەزی چوکلێتان دروستکردبوو، لە جیاتی مۆمدان قوتوویەکی بەتاڵی خۆراکسان سەراوبن دانا.

## (١٤٢)

زۆری پێنەچوو دکتۆری ئۆردووگا و بە دواشیدا دوو پەرستار بە برانکارێکەوە پەیدا بوون. ترایان پرسی: "چیتان دەوێ؟"

"دەمانەوێ باوکم ببەین، خۆ ناکرێ جەنازەکە لە خێوەت بمێنێتەوە."

"دەتانەوێ باوکم بۆ کوێ ببەم؟"

"دەبێ لێرەی بەرینە دەرێ، بەڵام نازانم دەیبێرنە کوێ. ئێمە تەنیا راپۆرتەکەی دەدەینە فەرماندەیی، ئەودەم سبەی ئەمریکییەکان جەنازەکە وەردەگرن و دەیبەن."

"خۆ مافی ئەوەم هەیە بپرسم تەرمی باوکم دەبەنە کوێ؟"

"ئێمەش دەمانەوێ زۆر شت بزانین، بەڵام ناتوانین."

پەرستارەکان هاتنە پێشەوە. خەریک بوون تەرمەکە باوێنە سەر برانکار. دکتۆر پێی گوتن کەمێک راوەستن: "من سەرەتا دەبێ رووداوی مردنەکەی پشتڕاست بکەمەوە، لەوانەیە هێشتا نەگەیشتبێتە ئەو قۆناغە."

دکتۆر دەستی قەشەی گرت و لە نەبزی گەرا. ئینجا گوێی لە سەر دڵی دانا. دوای کەمێ بە پەرستارەکانی گوت: "جەنازەکە ببەن."

ترایان هاواری کرد: "نا."

ئەوە چ خێلەسەرییەکە تۆ دەیکەی؟ ئێمەش زیندانی ئاساییین، وەک ئێوە. جگە لە مل راکێشان چارەی ترمان نییە."

"من دەبێ بزانم تەرمی باوکم دەبەنە کوێ. ئەگەر ئیزنیشم نادەن لە رێ-ورەسمی ناشتنیدا بەشدار بم، لانیکەم دەبێ شوێنی بە خاک سپاردنی پێ بزانم. دەمەوێ لەوە دڵنیا بم بە داب‌ودەستووری ئایینی مەسیحی دەینێژن. ئەگە بەندیش بم ئەو مافەم هەیە. باوکم لە ساتەوەختی مردنییەوە ئیدی بەندی نییە و مافی خویەتی وەک هەموو مردوویەک رێزی لێ بنرێ."

"کێ دەڵێ مردوو رێزی لێ ناگیرێ؟"

"من وام نەگوت، بەڵام لەبەر ئەوەی باوکم قەشەیەکی ئۆرتۆدۆکس بوو دەمەوێ بە پێی رێ‌وشوێنی کڵێسا بە خاک بسپێردرێ."

"سبەی داواکارییەک لەو بارەوە بۆ فەرماندەیی ئۆردووگا بنووسە."

"دەتوانی زەمانەتی ئەوە بکەی تا سبەی کار لە کار ناترازێ؟"

"من ناتوانم زەمانەتی هیچ بکەم. منیش وەک تۆ زیندانییەکم و هیچی دی."

"ئەگەر وا بێ تەرمی باوکم هەر لێرە دەبێ. هەتا دڵنیا نەبم بە پێی ڕێ-وشوێنی کڵێسەی ئۆرتۆدۆکس بە خاک دەسپێردرێ، بە جێی ناهێڵم."

پزیشکەکە لە وەڵامدا گوتی: "بە خۆڕایی کەڵەوەکێشی دەکەی."

"ڕەنگبێ، بەڵام من واز ناهێنم."

"ئێمە فەرمانمان پێ دراوە جەنازەکە لێرە ببەینە دەرێ."

ترایان گوتی: "ئێوە دەتوانن پەنا ببەنە بەر زۆر، بەڵام باش بزانن پەشیمان دەبنەوە."

دوو پەرستارەکە قۆڵی ترایانیان گرت و بە مرخێش مرخێش لە تەرمەکەیان دوور کردەوە. تەرمی قەشە نرایە سەر برانکار. ترایان لە ناو دەستی دوو کەسەکەدا کە گرتبوویان، خۆی رادەپسکاند و کاتێ تەرمی باوکیان بە پەنایدا دەبرد، ئەوەندەی پێکرا چاوێک لە روخساری بکا کە پاک و خاوێن، وەک مانگ دەدرەوشایەوە.

یوهان مۆریتس بە سەری رووتەوە وە دوای پەرستارەکان کەوت. ئەو مۆمەی لە قوتووی تەنەکەی چەقاندبوو و بە دەستیەوە بوو، هێشتا داییسا.

"ئێوە سزای ئەو تاوانەی خۆتان دەبیننەوە. هەندێک تاوان لێخۆشبوونی بۆ نییە. لە بیرت بێ دکتۆر، نەتهێشت تەرمی باوکم بەڕێ بکەم."

"من نەبووم کە نەمهێشت، بەڵکو یاسا بوو."

سەردەستەی بەندییەکان هاتە لای ترایان و گوتی: "لەسەرەخۆ بە، گوێیان لە دەنگی هاوارت بێ لە ژووری تاکەکەسیت دەکەن."

"لەو ساتەوە هیچ شتێک کارم تێناکا. هیچ سللوول و زیندانێک ناتوانێ هاوارم لە گەروودا بخنکێنێ. من هیچ ناخۆم تا دەمرم. من لە ناو ئەو بیست هەزار بەندییەدا لە برسان دەمرم. بە نیشانەی نارەزایەتی کڵپەی وجوودم تۆسقاڵ تۆسقاڵ و کاتژمێر بە کاتژمێر دادەمرکێتەوە. مەرگی من دەبێتە هاواری بەرخۆدان. ئەم هاوارە دەچێتە ناو گوێ و چاو و گۆشتی لەشیی کەسانێکەوە کە لەگەڵ من لە بەنددان و ئەوانەش کە منیان لە بەند کردووە.

ئەو هاوارە لە هەموو لایەکی گۆی زەوی دەگاتە گوێ و کەس لە بەر دەستی قوتار نابێ. هیچ کات، هەرگیزاو هەرگیز، تەنانەت دوای مردنم...‌"

## (١٤٣)

یوهان مۆریتس گوتی: "بەڕاستی دەتەوێ خۆت بکوژی؟ ئەویش لە برسان و لە تینوان؟"

چوار رۆژ بوو ترایان مانی لە خواردن گرتبوو. گەرما شالاوی هێنابوو. ترایان لە سێبەری خێوەتدا لەسەر پشت کەوتبوو. جووڵە و تەنانەت ئاخاوتنیش ماندووی دەکرد. راوەستان، گوێ گرتن لە قسەی خەڵک و سەیرکردنی ئاسمانیشی لەبەر زەحمەت بوو. تەنانەت وجوودی خۆی لێ بەلا بوو.

کاتی نان خواردنی نیوەرۆ بوو. یوهان ئەو جارەش هەوڵیدا قەناعەتی پێ بهێنێ: "خواردنت بو وەربگرم؟"

هیربارەکەی ترایانی بە دەستەوە بوو: "ئەوان لە خوایان دەوێ تۆ بمری. باش نییە مرۆڤ تەمەننای مەرگی خۆی بکا."

"ئەگەر پێت خوشە، بەشە خۆراکی منیش بۆخۆت وەرگرە، من نامەوێ."

یوهان رۆیی. زۆری پێنەچوو بە قاپە سووپێکەوە هاتەوە. قاپە شێوەکەی لە پەنا خوی دانا. کەوچکەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بە دەست سرییەوە. قاپە سووپەکەی لە نێو قاچەکانی گرت. یوهان بە کونەتفنگی فشەوە هەڵمی سووپەکەی هەڵمژی. قاپی بەتاڵی ترایان لەوێ بوو.

"ئەدی بۆ بەشە خۆراکی منت بۆخۆت وەرنەگرت؟ خۆ بە بەشەکەی خۆت تێر نابی. کەس پێی تێر نابی."

"ناتوانم بەشی تو بخۆم، ئەوە تاوانێکی گەورەیە."

یوهان لە کاتێکدا قاپە چێشتەکەی لە نێو لاقی بوو سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی. بۆ ماوەیەکی کورت هەروا بە دەمی بەش و سەری رووەو حەوا مایەوە. پاشان خاچێکی کێشایەوە. ترایان جوان سێرەی دابۆیە. یوهان بە

حاڵەتێکی جەزبە و لە فکر راچوونەوە وەک لە حاڵی بەجێ گەیاندنی عیبادەتێکی کڵێسا بێ، کەوچکەکەی لە سووپەکە نا. پاشان بە هێمنی کەوچکی نیوە پڕی بۆ زاری برد و... خواردنەکەی قووتدا. هەڵوەستەیەکی کرد. کەوچکەکەی وەک ئەوەی هێشتا پڕ بێ، هەر وا راگرتبوو. چاوە رەشەکانی لە ئاسۆی دوورەدەست لە خاڵێک بڕیبوون کە لەودیو دنیای خاکی بوو و تەنیا ئەو چاوانە دەیاندی. یوهان کەوچکەکەی دیسان لە سووپەکە نا. قەت کەوچکەکەی پڕ نەدەکرد. بە کاوەخۆ و ویقارێکی رۆحانییەوە کەوچکەکەی بردە ناو دەمی. یوهان مۆریتس بە حەزێکی لەسەر خۆوە خواردنی دەخوارد. وەک ئەوەی سروودێکی ئایینی بخوێنێتەوە بە لایەوە کارێکی پیرۆز بوو. بویە بەوپەڕی دیقەت و بە حەوسەلەوە و بێ ئەوەی هیچ پەلە بکا نانەکەی دەخوارد. بەو جۆرە هیچکات نە دڵۆپە سووپێکی بە لێوییەوە دەما، نە دەیڕشت و نە بە کەوچکەکەیەوە دەهێشت.

هەڵسوکەوت و شێوەی نان خواردنی یوهان جۆرە ئارامی و هێمنییەکی بە مرۆڤ دەبەخشی. لەو حاڵەدا وەکو درەختێکی لێدەهات کە لە بنەوەی دۆڵێکی قووڵەوە ئاوی ژیان بە رەگەکانیدا هەڵدەمژێ. یوهان بە هەموو وجوودییەوە نوقمی نان خواردنەکەی بوو. لەو حاڵەدا بەبێ ئەوەی ئاگای لە دەوروبەری خۆی مابێ گەڕابۆوە کەسایەتیی سەرەکی و راستەقینەی خۆی و لەگەڵ سروشتی وجوودیدا گەیشتبوونەوە یەک. کاتێکیش بە کەوچکەکەی دوا دڵۆپی سووپەکەی لە قاپەکەی کردەوە، وەک کەسێ کە سەرسامی شانۆیەک بووبێ ئاگای لە خۆی نەمابوو. ئینجا سێ قامکی دەستی راستی پێکەوە نووساندن و خاچێکی کێشایەوە.

وەک ئەوەی لە خەو راپەڕیبێ رووی کردە ترایان و گوتی: "خواردنی نانی خەڵک تاوانێکی گەورەیە."

ئەمجا راست بۆوە هەتا هیربارەکەی خاوێن بکاتەوە. چاوی ترایان لە ئاسۆی دووردا نیگاکانی لێ بزر بوون. ئیدی دنیای دەوروبەری خۆی نەدەبینی. دیمەنی نان خواردنی یوهانی هەر لەبەر چاو بوو. هەر ئەو خواردنەی یوهان وەها بە پیرۆزی و رۆحانیەتەوە خواردبووی و ئەم، ترایان، دەستی لێ هەڵگرتبوو. ترایان بە ئەسپایی گوتی: "ناهێڵم هیچ یارمەتییەکی پزیشکیم بدەن."

## (١٤٤)

چوار شەو بەسەر مانگرتن لە خوارنیدا تێدەپەڕی. بە ستوان یاکۆبسن ـ ی فەرماندەی ئۆردووگایان ڕاگەیاند کە دەستە ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی بۆ سەردانی زیندانەکانی ئەمریکا هاتوونە "شتۆتگار"ی ئەڵمانیا. ستوان یاکوبسن هەر خێرا ئەمری بە "شمیت"ی کۆنە شارەوان و پزیشکی ئۆردووگا کرد ترایان تا ماوەیەک لە ئۆردووگا دوور بخەنەوە. مەسەلەی وی نەدەبوو لە ڕۆژنامەندا بڵاو ببێتەوە، چونکە زۆر هەژێنەر بوو. ترایان نازی نەبوو. کوڕی قەشەیەک بوو کە هەمووی چەند ڕۆژێک بوو مردبوو و دوو قاچیشی لە دەست دابوون. جگە لەوانە خێزانەکەی جوولەکە بوو. بەڕاستی بابەتێکی چاک بوو بۆ ئەوەی پەیامنێران هەڵلای پێ بنێنەوە. یاکوبسن حەزی نەدەکرد هەڵلا ساز بێ. ئەگەر ڕیپۆرتاژێک لەو بارەوە لە ڕۆژنامەندا بڵاو ببایەوە، هەر زوو بانگیان دەکردە واشنتن. ئەویش لەو کاتەدا کە خەریک بوو کەلەکسیۆنی فەخفووری ئەڵمانی کامڵ دەکرد. چەندین سندووقی پڕ لە فەخفووری لە هەمبەر چەند پاکەتە جگەرەیەک دەست کەوتبوون. ئەگەر توانیبای کەلەکسیۆنەکەی کامڵ بکا، دەیتوانی تا کۆتایی ژیانی بەبێ کێشە و دەردەسەر بە تێر و تەسەلی بژی. بۆئەوەی ئەو کارەشی پێک بێ دەبوایە لە مەنسەبەکەیدا بمێنێتەوە.

ئەگەر ڕۆژنامەنووس نەهاتبان ستوان یاکوبسن پەکی بە مەسەلەی کورڕۆگا نەدەکەوت و مەسەلەکە بێدەنگی لێ دەکرا. ڕۆژ نەبوو لە ئۆردووگا ژمارەیەک بەندی لە برسان نەمرن و مردنی کورڕۆگاش سایلی مردنی ئەوان.

بەڵام ئێستا جەنجاڵێک بەس بوو بۆ ئەوەی ڕیسەکەی لە یاکوبسن بکاتەوە خوری و دەبوو بە هەر شێوەیەک بێ نەهێڵێ مەسەلەکە ئاشکرا بێ. "شمیت" فەرماندەی پێشووی یەک لە تاقمەکانی "ئێس.ئێس" و کۆنە شارەداری شاری ڤایمار، گفتی دایە ستوان یاکوبسن لە کەمترین ماوەدا و بە بێ قڕە و هەرا ئەو مەسەلەیە کۆتای پێ بهێنێ. شمیت بە ترایانی

گوت: "هەموو پزیشکێک بە ئەرکی خۆی دەزانێ چاودێریی نەخۆشی خۆی بکا، تەنانەت ئەگەر نەخۆشەکە بۆخۆشی حەزی لێنەبێ. تۆ تات لێیە و ئێمە ناچارین بتبەینە نەخۆشخانەی ئۆردووگا."

کاتژمێر دەی شەو بوو. یوهان لە پەنا قەرەوێڵەی ترایان دانیشتبوو. هەموو جارێ کە گوێی لە دەنگی شمیت دەبوو مچوڕکی بە قالبیدا دەهات. بە دەنگی شمیت، یۆرگ یۆردانی بیر دەکەوتەوە.

"نایەڵم لێرەم ببەنە دەرێ. ئێوە لەبەر نەخۆشیی من نییە کە دەتانەوێ لێرەم راگوێزن. بەڵکو لە هەرا نانەوە تۆقیون، بەڵام ناتوانن ئەو دەنگ و هەرایەش پووش بەسەر بکەن. ئاخۆ پێتان ناخۆشە زوو دەمرم؟ بیست هەزار تەرم لەو ئۆردووگایەدا تێکەوەداوێن، بەلام ئەوەتان پێ ناخۆش نییە، چونکە لە درێژخایەندا دەمرن. ئەوانەی بە شێنەیی و لە درێژخایەندا دەمرن مەرگیان هیچ بەزم و هەرایەکی لێ ناکەوێتەوە. ئەدی بۆ ئەوان نابەنە نەخۆشخانە؟"

"من وەک پزیشکێک بە ئەرکی خومی دەزانم بتبەمە نەخۆشخانەی ئۆردووگا."

دکتۆر (دۆرف)ی پزیشکی ئۆردووگا هەروەها گوتی: "تۆ حاڵت شڕە و ئێمە ناتوانین هەروا لە خێوەتێکدا فڕێت بدەین."

دوو پەرستار بە خورتی ترایانیان لەسەر برانکار دانا، دەتگوت کەلوپەلێکی دەهاوێنە سەر. یوهان دەستی کردنە مست. زۆری حەز دەکرد لە سەری بکاتەوە، بەڵام ئەوە شەڕی خۆترێن بوو.

ترایان گوتی: "گەورەترین تاوان ئەوەیە رەنگی چاکە لە خراپەکاری هەڵسووی."

پزیشک وە سەر خۆی نەهێنا: "بیبەن."

پەرستارەکان ترایانیان لە خێوەتەکە وەدەر خست. بەندییەکان سەر رێگایان بۆ چۆڵ دەکردن. کەسیان نەخەوتبوون کڕ و کپ بوون. کپییەک کە لە کاتی مردنی کەسێکدا زاڵدەبێ. هەموویان هەستیان بەوە دەکرد رووداوێکی جیددی قەوماوە. مانگەشەو بوو. یوهان ملی بە لارەوە نا و وە دوای برانکارەکە کەوت. وەک بە دوای دارەمەیتدا رێ بکا وا بوو. بەرگ و

پێڵاو و چاویلکە و پایپی ترایانی بە دەستەوە بوون. چاوی پڕ لە فرمێسک بوون. دواجار دڵی خۆی بەوە دایەوە کە مرۆڤ لەسەر برانکار بێ واتە هاوەڵەکەی هێشتا زیندووە. لەبەر دەرکی نەخۆشخانە پێشیان بە یوهان گرت. شمیت گوتی: "تۆ بۆت نییە بێیە ژووریٚ. یاسا وا دەڵێ. کەس مافی ئەوەی نییە لەگەڵ ترایان بدویٚ. سەردان قەدەغەیە. خۆم بەرگ و پێڵاوەکانی بۆ دەبەم."

یوهان تا بەیانی لە دەوروبەری تەلبەندەکان هات و چوو. دڵی بەرەدایی نەدەدا ترایان بە جێ بهێڵێ.

## (١٤٥)

ترایانیان بردە نەخۆشخانە و دەرگایان لەسەر داخست. ژوورەکە چوار قەرەوێڵەی لێبوو کە هەموویان چۆڵ بوون. دیار بوو ژوورەکەیان بە دانسقە بۆ ئەو چۆڵ کردووە. دوو چاودێری لاویشیان دانابوو چاویان بە سەریەوە بێ. ترایان لەسەر کەلەکە درێژ ببوو. لێوی وەک دەشتی قاقڕ وشک هەڵگەڕابوو. لە مێشکیدا خەون و خەیاڵی تێکەڵ و پێکەڵ وەک فیلمی ڕەنگاوڕەنگ ڕمبازێنیان بوو. چاوی لێکنابوو، بەو حاڵەشەوە شەوقی توندی چرایەک ئازاری دەدا. ئەو شەوقە لە ناخیرا دەهات. تیشکێکی گەرم بوو و خەریک بوو پێڵووەکانی بسووتێنێ. سەرلەبەری بیر و خەیاڵی کەوتبووە بەر ڕووناکی. لەشی وەک ئەوەی بووبێتە سەرچاوەی تیشک، تیشکێکی سووکەڵە، بەڵام گەرم وەک خەونەکانی. هەستیدەکرد لە حەوا کەوتووە: "ئێستا دەزانم مورتاز و دەروێش بۆچی بە ڕۆژوو چلە دەکێشن. بە زگی برسییەوە پساندنی پەیوەندی لەگەڵ دنیای خاکی گەلێ ئاسانترە. لەو کاتەدا خوا زۆر نێزیکترە. مرۆڤ تووشی ئەو هەستە دەبێ کە بە سەر بەرەو ئاسمان دەخشێ."

ترایان تا ماوەیەکی زور لەو حاڵە حاڵ لێهاتنەدا بوو. لە پڕ بەوەی زانی خۆراکیان بۆ هێناوە. یەک لە چاودێرەکان سینییەکی پڕ خواردەمەنی لەسەر کورسیەکی پەنا قەرەوێڵەکەی دانابوو. ترایان پشتی تێکرد. قاپی چێشتەکەی

نەدی، بەڵام باش دەیزانی چی تێدایە. بۆن و بەرامەی پەتاتەی سوورکراوە لە ناو رۆنی کەرەی کەوتە بەر لووتی. ئینجا بۆنی قاوە. وەهای هەست بە بوونی خواردەمەنییەکانی سەر کەشەفەکە دەکرد، دەتگوت دانە دانە چێژتوونی. هەستی بۆن کردنی بەهێز ببوو. بە عومری خۆی وەک ئێستا نەیتوانیبوو ئاوا بە وردی بۆنی خۆراکان لێک بکاتەوە. کەشەفەکە جامە شیرێکی گەرمیشی لەسەر بوو. بۆنی شیرە گەرمەکە وەک بونی پاوە کەبابی گەرم دەهات ترایان بۆنی کەباب وەک رەنگێکی تۆخ لە تابلۆیەکدا بە سانایی هەستی پێدەکرد. رۆنی کەرە و کەبابەکە بۆنی خۆراکەکانی دیکەشی خۆشتر کردبوو. بۆنی ئەو خواردنانە لە پەتۆکەی تێپەڕی، رۆچووە ناو کراس و قژی و دیوارەکان.

ترایان هەستیکرد کە بۆنی کەبابی برژاو و رۆنی کەرە و شیر و قاوەکە وەک شلەمەنییەکی لیچق بە لەشیەوە دەنووسێ. وای هەستدەکرد لەگەڵ هەر هەناسە هەڵکێشانێکدا ئەو بۆن و بەرامەیە بە قورگیدا و لەوێشەوە بۆ ناو گەدەی دەچێ. تووشی هەستێکی وا ببوو کە رۆژووەکەی شکاندووە و خەریکی خواردنە.

هەوڵیدا بۆنی خواردنەکان لەو هەوایەی هەڵیدەمژی جیا بکاتەوە، بەڵام ئەوە مەحاڵ بوو. تا دەهات بۆنی خواردنەکان کاریگەرتر دەبوو.

ترایان لێبڕا بە دیقەتی زیاترەوە بەرامەی جۆری خۆراکەکان لێک هەڵاوێرێ. لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوەش هۆکارێکە لە هۆکارەکان، بۆ تاقیکردنەوەی هەستی بۆن کردنم. "زۆر زوو سەرقاڵی کارە تازەکەی بوو. هەستیدەکرد ئێستا دەتوانێ بەسەر نەوسی خۆیدا زاڵبێ و تەنیا بە چاوی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەوە سەیرێکی قاپی چێشتەکە بکا. لەگەڵ یەکەم دۆزینەوەیدا بۆی دەرکەوت کەبابەکە نە گۆشتی گایە و نە ئی بەراز. ئەگەرچی گۆشتەکە، گۆشتی لە قوتوو کراوی بەهارات لێدراو بوو، بەڵام ترایان سوور دەیزانی دەبێ گۆشتی باڵندەیەک، بۆوێنە هێ قەل بێ. زۆر حەزی دەکرد لە بۆچوونەکەی دڵنیا بێ، بەڵام هەروا پشت لە خواردنەکە و رووەو دیوار مایەوە. شیرەکە کەمێ بۆنی بنکرِی لێدەهات. لەوانەیە شیری وشک بێ. کۆمپیوتی مێوەشی لێبوو. دیارە بۆنی زۆر ئاشکرا نەبوو و ترایان بە زەحمەت توانی بیناسێتەوە. شای بە خۆی بوو کە توانیبووی بۆنی کۆمپیوتیش

بناسیتەوە. دەتگوت لە تاقیگە، دۆزینەوەیەکی گەورەی کردووە یان ریکۆردێکی مەزنی شکاندووە. تەنیا شتێکی بۆ نەدەچۆوە سەر یەک کە ئاخۆ کەشەفەکە نانیشی لەسەرە یان نا؟ ئەگەر نانیشی لەسەر بێ دەبێ هی ئاردی سپی ئەمریکی و تۆزێکیش بەیات بێ. پەرستارەکە هاتە پەنا قەرەوێڵکەی و گوتی: "ئێستا بخۆی زۆر باشترە. چێشت کە سارد بۆوە تامی نامێنێ."

ترایان وەڵامی نەدایەوە. زۆری حەز لێبو درێژە بە کەندەوەکۆڕیی خۆی لە بارەی خۆراکانەوە بدا، بەڵام ئیدی نەیدەتوانی. لە ناسکترین کاتی وردبوونەوەدا هۆشی پەرت کرابوو. ئێستا بۆنەکان هەموو تێکەڵ ببوون و ببوونە یەک شت. وەک حەوت رەنگەکەی پەلکەزێڕینە کە ببنە رەنگی سپی. وتەی پەستارەکە بۆنەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردبوون. ترایان لەبەر ئەوە کە نەیدەتوانی بۆی خواردنەکان لێک هەڵاوێرێ و بیانناسێتەوە، نارەحەت بوو. ئیتر خەوی بەسەر چاواندا هات، تا سبەی بەیانی خواردنەکە هەروا لەوێ بوو. ترایان هەر چاویشی لێنەکرد. هیچ بۆنی لێنەدەهات. لەناو چووبوون. خواردنەکان ئیدی زیندوو نەبوون. ترایان زۆر هیلاک بوو. نە ئەمدیو ئەودیوی پێدەکرا نە دەیتوانی چاو هەڵێنێ. چەند جار بە زمان لێوی تەر کردن و هەموو جارێ هەستیدەکرد تاڵ و وشکن.

پەرستارەکە قاپێک چێشتی تازەی هێنا و خواردنە کۆنەکانی بردنەوە. ئەم جارە چێشتەکە هێلکە و رۆن بوو. بەرامەی هێلکە و رۆنەکە وەکو رەنگی تابلۆیەکی ریکلام زۆر زەق و کاریگەر بوو. تەنانەت بۆنی مرەبای پرتەقاڵ لەگەڵ بەرامەی قاوە و شیر و رۆنی کەرەشی بەر لووتی کەوت. ئەو بۆنانە ترایایان ئازار دەدا. وەک گوللە لەشیان دەسمی. بە ورتە خەریکی دوعاکردن بوو: "خوایە یارمەتیم بدە. ئاخ چەندە سەختە مرۆڤ تا دیلی قالبی خۆیەتی، لە بەر وەسوەسەی نەفسی خۆ رابگرێ." ئەو فکرە کە تا دوو سێ رۆژی دی لەشی دادەڕزا، ئوخژنی پێ دەبەخشی. لە دڵی خۆیدا گوتی: "دوو سێ رۆژی دی دەمرم." ئینجا خەوی لێکەوتەوە.

## (١٤٦)

ترایان کۆرۆگا لەسەر جێگاکەی دانیشتبوو و لە پەنجەرەوە چاوی لە دەرێ دەکرد. نیوەڕۆ بوو. لە حەوشەی زیندانەدا بەندییەکان سێ ریزی دوورودرێژیان پێکهێنابوو. هەموویان رووت بوون. لە سەرانسەری گۆرەپانەکەدا تا چاوی هەتەری دەکرد لەشی رووتی مرۆڤان دیار بوو. لە ژێر پەنجەرەی نەخۆشخانە جێیێک راگیرا. دەستە سەربازێکیش بە خوتورمەوە لەوێ راوەستابوون و چەقەیان دەجوو. بەندییەکان یەک یەک دەهاتنە بەر دەمیان.لاقیان تێکدەئالان. مرۆڤ کە رووت بێ نازانێ بڕوا. ترایان شارەزای ئەو هەستە بوو. ئەویش بە رووتی تووشی هەستێکی ئەوتۆ دەبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "دیسان لەشیان دەپشکنن. ئەوجارە لە چی دەگەڕێن؟"

ئەو جۆرە پشکنینانە مانگێ چەند جار دووپات دەبۆوە. ئێستا پیرەپیاوێک لەبەر دەم سەربازەکان راوەستابوو. ترایان ناسییەوە: "پالادی، ئۆسقۆفی وارشۆ." ئۆسقۆف پیاوێکی کەڵەگەت بوو. کەمێ کووڕ ببۆوە و یەکجار کز و لاواز بوو، پەراسووت لە دوورەوە ژماردبان. ئێسکبەندێک بوو پێستی بەسەر کشابێ. ئۆسقۆف ریشی پاک سپی ببوو. تاقە سپاییەک کە لەو ناوە دەبینرا. مرۆڤ کە ئەو ردێنەی دەدی پێی وابوو تۆپەڵێ رووناکیی دیوە. رەنگێکی سپیی مومتاز و شکۆمەندانە. سەربازەکان کە چاویان پێکەوت لە فرقەی پێکەنینیان دا، بەڵام پێنەدەچوو ئۆسقۆف ئاگای لەوان بێ، چاوی لە ژوور سەری خۆی، لە تەشقی ئاسمان بڕیبوو. ئەو رۆژە ئاسمان شین بوو، لە رەنگی گومبەزی کڵێسەکانی بیزانس دەچوو.

وەرگێڕەکە پێی گوت: " پەنجەکانت لێک بکەوە."

پیرەپیاو پەنجەکانی ئاوەڵا کردن.

سەربازەکانی بە وردی نێو قامکەکانیان پشکنی. پیرە بەندییەکە ئەنگوستیلەی لە پەنجەدا نەبوو.

وەرگێڕەکە تێی راخوڕی: "دەستت هەڵبڕە."

پیره سەرەتا دەستی تا ئاستی شانی بەرز کردنەوە، دەتگوت خەریکی پاڕانەوەیە. پاشان تا ئاستی سەری هەڵیبڕین و لەو کاتانەدا نە هۆشی بەسەر وەرگێڕەوە مابوو نە بە سەر سەربازەکانەوە، بەڵام وەرگێڕ و سەربازەکان بە وردی هەموو گیانیان پشکنی،نەکا لە شوێنێکدا پەنجەوانەی حەشار دابێ. پاشان ناو تووکی سەری گەڕان. ئۆسقۆف قژی درێژ و سپی بوو. بە ئاسانی شتی بچووکی گرانبەهای تێدا حەشار دەدرا. سەربازەکان قژیان بە چەند جێ بەش کرد و سەرەتا بە سەری خوتورمە و پاشان بە نووکی پەنجە لە تەوێڵی تا پشتی گەڕان. دواجا دەستێکیان بە ریشیدا هێنا تا دڵنیا بن هیچی تێدا نەشاردۆتەوە.

وەرگێڕ دیسان دەنگی هەڵبڕی: "بسووڕێ."

پیرە پشتی تێکردن. "داوەرەوە." داهاتەوە. مۆرەغەی پشتی تا توانی کووڕ کردەوە، بەڵام وا دیار بوو هێشتا بەس نییە.

وەرگێڕ ئەمجا فەرمانی دا: "قاچەکانت لێک بکەوە."

ئۆسقۆف لینگی لەبەر یەک بردن. لینگی باریک و سپی بوون. وەرگێڕ و سەربازەکان نوشتانەوە تا دڵنیا بن هیچی لە نێو لینگیدا نەشاردۆتەوە. سەربازێک ئاماژەیەکی بە هاوەڵەکەی کرد.

پیرەمێردەکە هەروا پشتی لە سەربازەکان و بە قاچی لێک ئاوەڵاوە راوەستابوو.

وەرگێڕەکە گوتی: "دوور بەوە."

سەربازەکان لەگەڵ کەسێکی تر خەریک بوون. ئۆسوف هەر بە هەنگاوی تێک ئاڵاوەوە رۆیی. بای دەهات. قژ و ریشە درێژەکەی وەک ئاڵایەکی سپی و درەوشاوە دەشەکایەوە. ترایان هەستی بەوە کرد ئۆسقۆف وەک ئەوانی دی رووت نییە. ترایان چاوی لێ هەڵنەدەگرت تا چۆوە نێو ریزی بەندییەکان و لە ریزی پیاوانی رووت و قووت راوەستا. ئێستا لە ناو تاقمێکدا بوو، بەو حاڵەشەوە شتێک هەبوو کە لەوانی دیکەی جیا دەکردەوە.

شتێکی لە دەوری سەری بوو کە سەرنجی وی رادەکێشا. لەوانەیە بەفری سپیی ریش و سەری بووبێ. لەوانەشە هی شێوەی روخساری. شتێک مرۆڤی ناچار دەکرد تەماشای بکا. هەر وەک مرۆڤ چاو لە وێنەی پیرۆز دەبڕێ.

ترایان لە پڕێکا و بە ترسەوە بە ورتە گوتی: "ئێستا دەزانم چ دەبینم."

پەرستارەکان هەر دووکیان کە گوێیان لەو وتەیەی بوو هاتنە لای. ترایان هەروا لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەی دەڕوانی و هیچ ئاگای لەوان نەبوو.

خەرمانەیەک تیشک دەوری سەری ئۆسقۆفی داوە. لەودیو نێوچاوانییەوە سەرچاوەیەک تیشک هەڵدەقوڵێ کە زۆر لە کارەبا بەهێزتر و رووناکترە و هەر لەو سەرچاوەیەیە کە تیشک دەڕژێتە دەوری سەری. تیشکێکی زێڕین."

پیرەپیاوەکە کە ئێستا تەواو چووبووە ناو ریزەکەوە چاوێکی لە لای پەنجەرەکانی نەخۆشخانە کرد. لەو کاتەدا تاجە درەوشاوەکەی، تیرۆژی لێ دەبوونەوە.

ترایان لە دڵی خۆیدا گوتی: "خەرمانەی پیرۆز، داهێنانی نیگارکێشە ئایینییەکان نییە." ترایان چاوی لە ریزی مرۆڤەکان بڕیەوە و لە ناویاندا چەند کەسی دیکەش خەرمانەیەکی لە تیشکی پیرۆزیان بە دەوری سەرەوە بوو. هەموویانی نەدەناسین، بەڵام چەند کەسێکی ئاشنای ناسینەوە.

سەرۆکی ئاکادیمیای ڤیەننا، رۆژنامەنووسێکی بەرلینی، تەنانەت وەزیرێکی یۆنانی و باڵیۆزی رۆمانی لە بەرلین، ئەمانە گشتیان خەرمانەیەکی لەو شێوەیان لە دەوری سەری بوو. نێوچاوانی هەموویان پرشنگی دەهاویشت، بەڵام ئەو تیشکانە زۆر لە شەوقی ئاگر و کارەبا رووناکتر و بە باق‌وبریقتر بوون. ئەو تیشکانە هەموو دنیایان پێ رووناک دەبۆوە. ئەودەم هەرگیزاو هەرگیز شەوەزەنگ و تاریکان بە سەر جیهاندا زاڵ نەدەبوو.

## (١٤٧)

ستوان یاکوبسن پرسیاری کرد: "باشە بۆ نان ناخۆی؟" ستوان بۆ ئەوەی بە تەنیا قسەی لەگەڵ بکا پزیشک نەخۆشخانە و شمیتی کۆنە شارەداری لە ژوورەکە وەدەر نابوون:

"باشە مەبەستت لەو کارە چییە؟ زیندان خۆ منداڵ بازاڕی نییە."

"من برسیم نییە بۆیە نان ناخۆم. لە پڕ ئیشتیام کوێر بۆتەوە. من تەنیا هێلنجم دێ، گەدە و ریخۆڵەم سواری سەری یەک دەبن. ت، جەنابی ستوان، هێڵنجت نایە؟"

یاکوبسن متەقی لە خۆی بڕی. لەوەی لەگەڵ ترایان بە تەنیا مابۆوە هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد. ترایان لە شێتێک دەچوو و چاوی بز کردبوون. یاکوبسن لە دڵی خۆیدا گوتی: "نەکا پڕم داتێ، دەستم لە ئەوک بنێ و بمخنکێنێ." چاوێکی لە لای دەرگا کرد و ئینجا بزەیەکی هێنا خۆی.

"هێمن بە جەنابی کۆرزۆگا، هەڵچوونت پێوە دیارە، شتێکی زۆر ئاساییە. شەش رۆژە نە هیچت خواردووە، نە هیچت خواردۆتەوە."

جەنابی ستوان پێویست ناکا ژوورەکە جێ بهێڵی. تەواو ئاگام لە خۆمە. مەترسە. پرسیارەکەی من لە بارەی حاڵەتی رشانەوەوە لە جێی خۆیدا نەبوو. تۆ قەت نابێ هەست بەو حاڵەتە بکەی. هەر کەس لە سەرەتاوە چاوی خۆی بقووچێنێ و لووتیشی بگرێ، هەرگیز تووشی مەترسی نابێ. مرۆڤ بە هەموو شتێ رادێ، تەنانەت بە بەدبەختیش. ئەوە ئیدی بە شەخس دەگۆڕێ، بەڵام من توانای ئەوەم نییە خوو بە بەدبەختییەوە بگرم. کرێکاری وا هەن بەرچایی و فراوین و شێفی خۆیان لە پەنا ئاودەستخانە یان بیری ئاودەست دەخون و هەر تەقەشیان لەسەری نایە. بە چاوی خۆم دیومە دوو هەنگاو وێوەی کونی مەبال قەپاڵتەیان لە کاڵباس داوە و نانیان پچڕیوە. ناسکترین و هەستیارترین کەسیش ئاخیری لێڕادێن. ئەو ئەڵمانانەی بەندییەکانیان لە زیندانەکاندا دەسووتاندن هێشتا دەرگای کوورەی مرۆڤ سووتانیان دانەدەخست، بە گاڵتە و فشق و هۆڕ ملیان لە خواردنی قاوەڵتی دەنا، بێئەوەی هێڵنجیان بێتێ. ئێرە مرۆڤی وای لێن دۆشەگ و لێفەیان بە بسک و کەزیی ژنانی لە زیندان کوژراو ئاخنیون و لە ناو ئەو نوێنانەدا خەریکی زاوزێکردن بوون. ئەو کەسانە قەت بۆ جارێکیش حاڵیان تێک نەچوو! هەرگیز دڵیان تێکەڵ نەهات، بەڵکو لەوپەڕی چێژ و خۆشیدا بوون. من لە زیندان تووشی ژنێک بووم کە سەردەمێک گڵۆپی خەوی ژوورەکەی لە پێستی گرواوی مرۆڤان چێ کرابوو. دەیگوت تیشکێکی زەردی لێ دێتە

دەر. ئەم ژنە لە ژێر ئەم تیشکە زەردەدا کە لە پێستی مرۆڤ تێپەڕیوە، خواردوویە و خواردوویەتەوە، خۆی خستۆتە باخەڵی پیاوێک، ماچی داوەتێ و خۆی بە بەختەوەر زانیوە. بەڵێ مرۆڤ بە بەدبەختی رادێ. هەر وەک گوتم هەمووی لێڕاهاتنە. رووس ڤۆدکایان دەخواردەوە و دەستدرێژییان دەکردە سەر پیرەژنێکی هەشتا ساڵە، بێئەوەی هێڵنجیان بێ، داخوا چەند ژنی حەفتا ساڵەیان وا لێ کردبن. تەنانەت هەندێ جار نۆرەیان بۆ دادەنان. هەر بە دە کەس ژنێک! ئیدی هیچکامیان بە خۆایڵیاندا نەدەهات هەست بە نەگبەتی یان لانیکەم نارەحەتی بکەن، بەڵام

دەزانم ئێوە ئەو کارانە ناکەن. ئێوە بە زۆر دەستدرێژی ناکەنە سەر ژنان. ئێوە چوکلێتیان دەدەنێ و کاتێکیش ویستتان دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکەن "پرزروانیو" بەکار دێنن. ئێوە وەک ئەڵمانەکانیش هەڵسوکەوت ناکەن. هەر نەتەوەیەو بۆخۆی هەندێ خووخدەی هەن، بەڵام ئێوەش هەر کارێکی دەیکەن لەوە ناترسن هێڵنجتان بێ. دڵنیام ئێوە لەو مەترسییە خەلستوون. لەبەر ئەوەی بڕوا بکە هەست بە نەگبەتی کردن زۆر بە ئازارە.

ڕیخۆڵەکانم بەردەوام سواری سەری یەک دەبن وهەندێ جار وا هەست دەکەم هاتوونە نێو زارمەوە. زوو هەڵدەچم و سەرەڕای هەستی هاوسۆزییەکی سەیرم بۆ مرۆڤان هەیە و ئێستا پێت وایە بەو حاڵەوە من دەتوانم شت بخۆم؟ ئاخر چۆن دەتوانی داوام لێبکەی نان بخۆم؟ هێشتا لەوە نەگەیشتووی من ئیدی هیچم پێ ناخورێ."

ستوان یاکوبسن هێندێکی دیکەش لە دەرگا نزیک بووە. لە هاتنەکە پەشیمان بوو. نە پزیشک و نە شمیت پێیان نەگوتبوو ترایان کۆرۆگا شێتە. ئەوان دەیانگوت خاوەن عەقڵ و هۆشی تەواوە. هەردووکیان درۆیان دەگەڵ کردبوو. ترایان شێت بووە.

"تۆ راست دەکەی جەنابی کۆرۆگا. زۆر ئاساییە لەم دۆخەدا نەتوانی هیچ بخۆی."

"کەمێک راوەستە، من بە حاڵ دەتوانم دانیشم. تکا دەکەم لە پەنجەرەوە سەیرێکی دەرەوە بکە بزانە پشکنینی لەش تەواو بووە؟"

"نا، هێشتا نا."

ترایان له لای خۆیەوە سەری لەوە سووڕ مابوو کەچۆن کەسێک دیمەنی لێپرسینەوە لە حەوشەی زیندانی دیتبێ،دەتوانێ بە ئارامی لە سەر مێزی نان خواردن دابنیشێ، هەر وەک یاکوبسن تا چەند خولەکی دی وە بەر خواردن دەنیشت.

"گوتت پشکنینی لەش تەواو نەبووە؟ وا زوو تەواو نابێ، تازە دەستی پێکردووە. ئێوە ناو دەم و بن هەنگڵ و قوونی مرۆڤان دەپشکنن بەڵکو زێڕی تێدا ببیننەوە. ئەو خەڵکە دەبێ لەبەر چاوی ئێوە رووت بنەوە. جارێ ئەوە لێ‌لێ‌یە. سبەی کەوڵیشیان دەکەن، تا بن پێستیانْ بۆ زێڕ بگەڕێن و پاشان گۆشتیان لە بەشی دەکەنەوە و ئێسکەکانیشیان دەپشکنن نەکا زێڕیان تێدا حەشار دابن. ئێوە ناو مێشکی مرۆڤانیش دەپشکنن و دەست لە خوێن و خوڕیان وەردەدەن. تەنیا لە پێناوی زێڕ. ئەنگوستیلەی زێڕ، ئەلقەی زێڕ... ئێوە دڵان پارچە پارچە دەکەن. لە پێناوی زێڕ... زێڕ، زێڕ، زێڕ. ئەوەی ئەوڕۆ دەیبینی پێش‌پەردەیە. ئێوە هێشتا لە قۆناغی پێستدان، بەڵام بەو زووانە پێستیان دەگروون. ئەم پشکنینەی لەش درێژەی دەبێ."

ستوان یاکوبسن لە ژوورەکە نەمابوو. ترایان رووی کردە دیوار.

## (١٤٨)

عەرزوحاڵی ژمارە ٦

بابەت: ئابووری (ئەو شتانەی زیندانی پێیانن)

لە ماوەی پشکنینی لەشدا کە بەم دواییە لە زیندانەکان کراوە هەندێک ئەنگوستیلە، بازنە، کاتژمێر، قەڵەم پەندان، پووڵ و بە گشتی هەموو جۆرە شتێکی گرانبەها دەستیان بەسەردا گیراوە.

هەر چەند پشکنینەکەی ئەم دوای زۆر بە وردی و تا سەر پێستی بەندییەکان ئەنجامدراوە بەم حاڵەشەوە هێشتا بەس نییە.

بۆم دەرکەوتووە هەندێک لە بەندییەکان تاجێکیان لەسەرە کە وەکو خەرمانەی تیشکی وێنە پیرۆزەکان وایە. ئەوەشم لێ روونە کە خەرمانەی پەیکەرە پیرۆزەکان لە زێڕی خالیسن. دیارە نیوە تاجی سەری بەندییەکان نە لە زێڕە و نە لە کانزایەکی گرانبەهای دی، ئەگینا تا ئێستا ئەو تاجانە یان باشتر وایە بڵێم خەرمانانەتان سەد جار دەست به سەردا گرتبوون. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم خەرمانانە لە کانزایەکی بە نرخ نین، بەڵام ناکرێ نکۆڵی لە بایەخیان بکەین. من بۆخۆم زانا و ژمێریار نیم، بەڵام پێم وایە ئەو تاجانە دەبێ زۆر بە نرخ بن. دیارە ئەو تاجانە بەرەمی تیشک دانەوەی دەروون و مێشکی هەندێ لە بەندییەکانە. سەیر لەوەدایە ئەو کەسانەی پابەندی کۆمەڵگای تەکنەلۆژیی رۆژئاوان دیاردەیەکی وایان لە لا نابینرێ. ئاکام: دیاردەیەکی وا لە نیشانە بەرچاوەکانی کەسانی پاشکەوتووە، بەو حاڵەشەوە ئەگەر ئەم تاجانە بە نرخ بن نابێ لای بەندی بمێننەوە. لەبەر ئەوەی زیندانی بە هیچ شێوەیەک بۆی نییە شتی گرانبەهای هەبێ. وا بزانم بە درێژایی مێژوو ئەو تاجانە ـ یان باشترە بڵێم خەرمانانە ـ دەستیان بەسەردا گیراوە. تەنانەت داگیرکەری بەربەر و درندەی وەک چەنگیز خانیش ئاگاداری ئەوە بووە کە هەندێ لە دیلەکانیان خەرمانەی لەو شێوەیان لە دەوری سەری بووە و وەک دەسکەوت لەگەڵ خۆیان بردوون، بەڵام چونکە ئەو سەردەمە ئیمکانی گواستنەوە وەکو ئێستا نەبووە، چەنگیز خان فەرمانی دا ئەو خەرمانانە بە سەرەوە دەست بە سەردا بگرن هەتا لە درەوشانەوە نەکەون. بەم جۆرە گەلێ خەرمانەی لە چین و عەربستانەوە بە کەللەسەری خاوەنیانەوە بە بەنێکەوە دەکردن، بە پاشتەرکی ئەسپەکانیانەوە هەڵدەواسین و دەیانناردنە دەرباری چەنگیز لە مەغۆلستان، بەڵام بە داخەوە لە رێگایە ئەو خەرمانانە، زۆر رێی تێدەچێ بە هۆی گۆرانی کەشوهەوا، لەناو دەچوون و بەم جۆرە سەری بێ خەرمانەیان توور هەڵدەدان. ئیدی هەم سەر دەفەوتا و هەم خەرمانەکەی. چەند باش دەبوو بۆ ئەوەی ئەو خەسارەتە نەیەتە پێش، ئێوەی بەرێز لە جیاتی ئەوەی وەک چەنگیز خان سەری بەندییان لێ بکەنەوە، بەندییەکان بە ساغی لەناو بەرمیلدا بنێرنە وڵاتی خۆتان، بەڵام دەبێ

بەمیلەکان کەش‌وهەوای ناویان گونجاو بێ. کۆمەڵگای ئێمە لەوەدا زۆر بەختەوەرە کە کەرستە و ئامرازی زانستیی وەهای هەیە کە نایەڵێ تووشی زیان و خەسارەتی وەک هی سەردەمی چەنگیز خان بێ. مێژوو دەڵێ چەنگیز خان نیو ملیۆن خەرمانەی لە کیس چوو. وەک هەمیشە ڕێز و سەرسوڕمانم قەبووڵ بفەرموون. Keep smiling(بزەتان بێ.)

ئیمزا

شاپەد

## (١٤٩)

شمیتی کەونە شارەدار گوتی: "تا پێنج خولەکی دی دەتبەینە نەخۆشخانە." دەستی دە پشت قوونی نابوون و لە ژوورەکەی ترایان دەهات و دەچوو: "ئەوان بە زۆر، خواردنت دەرخوارد دەدەن، تۆ دیارە تێناگەی. ئێمە هەمیشە چاکەی تۆمان ویستووە، بەڵام تۆ لووتت لێ باداوین."

ترایان لەسەر قەرەوێڵە ڕاکشابوو و ڕووی لە دیوار بوو.

"بەو ڕەفتارەترا دیارە دۆستایەتیمان ناکەی."

کۆنە شارەدار تووڕە ببوو: "تۆ کاتی دکتۆر و یاکوبسن بە فیڕۆ دەدەی. ئێمە دەبێ خەمی بیست هەزار بەندی بخۆین، نەک یەک کەسی یاخی. تۆ بە فیڕۆدانی کاتی ئێمە زیان بە بەندییەکانی دی دەگەیەنی. تۆ یەک کەسی و ئەوان بیست هەزار کەس. واز لە کێشەی تاکەکەسی بێنە. ئێمە هەموومان کەس‌وکارمان هەیە، خەم و خەفەتمان هەیە، ئەگەر هەموومان وەک تو بکەین بزانە کار بە کوێ دەگا. تۆ بیر لە کۆمەڵ ناکەیەوە، تۆ خۆپەرستی. من خۆم بە پێی ویستی یاکوبسن ڕاهێناوە کە پیاوێکی ڕۆمانسی و وەک گشت ئەمریکییەکان دێموکراتە، من لەو ڕۆژانەی دواییدا بە چەنە چەن لەگەڵ تۆ لانیکەم پێنج کاتژمێرم کات بە فیڕۆ داوە کەهی بیست هەزار کەسە، ئەوە کەڕێتییە."

ترایان وەڵامی دایەوە: "ئێوە لە خەمی هیچ بەندییەکی ئۆردووگادا نین، بەڵکو لە خەمی ئەوەدان ئامێری کارەکەتان پەکنی نەکەوێ. واتە ئێوە لە خەمی شتێکی غەیرە ئینسانیدان. دەبێ ئەوە بزانن ناکرێ مرۆڤان وەک ئامێری تایپ و ئەرشیڤ و ژمارە بە شولکێک لێبخوڕن. ئەو مرۆڤانە لە گۆشت و خوێن دروستکراون و تێکەڵاویکن لە بیر و باوەڕ و خەم، برسێتی و گومان و بیرکردنەوە، بەڵام ئێوە نە لە خەمی گۆشتیاندان نە لە خەمی خوێنیاندا، چونکە ئەوانە مەسەلەی شەخسین و هەست پێنەکراون، هەر وەک کارتان بە هیوا و گومانیشیان نەداوە، لەبەر ئەوەی ئەوانەش مەسەلەی شەخسین، ئێوە تەنیا لە خەمی ژمارە و فۆرمولاندان. خۆ ئێوە هیچکام لە بەندییەکان وەک شەخس ناناسن. ئێوە هەرگیز لە خەمی یەک یەکی زیندانییەکاندا نین، ئەی چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن خەمخۆری بیست هەزار کەسن؟" گاڵتەجارییە. تۆ و یاکوبسن پابەندی لایەنە گشتی و مەسەلە ئەبستراکتەکانن نەک مرۆڤ. من لە روانگەی ئێوەوە ژمارەیەکم لەو بیست هەزارە کەم دەبمەوە. بۆیە بیری ئەوە کە کاتی خۆتان بۆ من بە فیڕۆ داوە، ئاوا تووڕەی کردوون. ئێوە وەک تاکێک منتان بە لاوە گرنگ نییە، هەر وەک تەنانەت ژنی خۆشتان وەک مرۆڤێکی تاک و سەربەخۆ قەبووڵ نییە. ئەوان بۆ ئێوە هاوسەر یان کابان یاخود دایکی منداڵانە و ئێوە هەرگیز لە تێکڕای وجوودی ژن نەگەیشتوون. لە کاتێکدا ئەو وجوودێکی گشتییە و لە وردە پاژان پێکهاتووە. ئێوە تەنانەت خۆشتان نەناسیوە. ئەگەر یەک لەو بەندییانەتان ناسیان ئەودەم واتان هەست نەدەکرد کە کاتی خۆتان لەگەڵ بە فیڕۆ داون. ئێوە تەنیا ئەو تاقمە مرۆڤانە دەناسن کە هەموو بوونیان بۆ یەک رەهەند دابەزیوە، بەڵام ئەوانە ئیدی مرۆڤ نین. وەک مۆرەی تەختەنەرد ئەگەر تەنیا لایەکی مابێ ئیدی مۆرە نییە.

پەرستار گوتی ئامبولانس ئامادایە.

ترایان گوتی: "دەمەوێ ماڵاوایی لە هاوڕێکەم یوهان مۆریتس بکەم."

تۆ بۆت نییە لەگەڵ بەندییەکانی دیکە بدوێی."

ترایان پشتی لە کۆنە شارەدار کرد. پەرستارەکان لە چەرچەفێکیاز وەرپێچا و وەک بەستەیەک لە ئۆتۆمبێلەکەیان هاویشت. ئامبولانسەکە پەنجەرەی داخرابوون، بەو حاڵەوە ترایان دەیزانی یوهان ئێستا لە دەوروبەری نەخۆشخانەیە و ئاگای لەوە. ترایان بە خەیاڵ بە روویدا پێکەنی و گوتی: "ماڵاوا."

## (١٥٠)

"دوو ئەمریکی بەندییەکی شێتیان هێناوەتە ئێرە."

سەرۆکی نەخۆشخانەی زیندان کارل سیرۆهە لە خەو رابوو. لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشت و لەبەر رووناکیی گڵۆپ چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد. کاتژمێر یەکی نیوەشەو بوو. ئەو پەرستارەی هەواڵەکەی هێنابوو یارمەتیی دا جلەکانی بکاتەوە بەر. سەرۆکی نەخۆشخانە بە مرومۆچی ژوورەکەی بەجێ هێشت. هەمیشە رادەوەستان نەخۆشەکان ببنە سەد کەس، ئینجا پێکەوە دەیانهێنانە نەخۆشخانە. تەنانەت ئەوانەی حاڵیان شر و خەتەر بوو، دەبوایە چەند هەفتە راوەستن تا ژمارەی نەخۆشەکان لە سەد هەڵبوێرێ، جا بە شێوەی ئۆتۆماتیکی نەخۆشخانە وەری دەگرتن. لە سەرەتای ئەو ساڵەوە دوو ریزپەڕ هەبوون و ئەوە جاری سێهەم بوو.

سەرۆکی نەخۆشخانە کاتێ گەیشتە نووسینگە پرسی: "ئەوە چ شێتێکە کە بەو نیوەشەوە ناردوویانە؟"

پەرستارەکە لە وەلامدا گوتی: "وێدەچێ حاڵی زۆر شڕ بێ. هەڵبەت من هێشتا دەموچاوم نەدیوە، لەبەر ئەوەی تا ئێستا هەر خەوتووە. لەوەوە کە دوو ئەمریکی بەو نیوەشەوە خۆیان تووشی ئەو ئەزیەتە کردووە دەبێ حاڵی خراپ بێ."

لە دەرێ هەوا تۆف و بەند بوو. پزیشک کە لە جێگای گەرموگوڕ هاتبووە دەر، کاتێ لاپەڕەی تەحویل وەرگرتنی ترایانی ئیمزا کرد، دەلەرزی. ئەمریکییەکان سواری ئامبولانس بوونەوە و رۆیشتن. پزیشکیش

خۆی خزانده ناو جێگاکەی و چاوپۆشی لە دیتنی نەخۆشەکە کرد. سەرمای بوو، بەڵام لە بیری نەچووبوو ئەمر بکا خێرا نەخۆشەکە ببەنە بەشی تایبەت.

ترایان کۆرۆگا نەیدەزانی لە کوێیە. تەنانەت ئاگای لەوەش نەبو تەگەریان پەنچەر بووە و هەندێ وە درەنگ کەوتبوون. حیسابی زەمانی لە دەست چووبووە دەر. تەنیا کاتێ چاوی هەڵهێنابوو دیتبووی لەسەر برانکارە و دەیبەنە نەخۆشخانە. لەو کاتەدا چاوی بە ئاسمان کەوت. ئاسمان ساو و پڕ ئەستێرە بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "کادز! پاشان بە زەردەخەنەوە چاوی لەو رێگا رووناکە بڕی. ئینجا وتەی کۆنە شارەداری کەوتەوە بیر: "لەوێ بە زۆر، خواردنت دەرخوارد دەدەن." ترایان بڕیاری دابوو تا مردن بەرەنگاری بکا: "تا هۆشم بە لای خۆمەوە بێ نە هیچ دەخۆم و نە هیچ دەخۆمەوە."

ئەو پەرستارەی هەڵیانگرتبوو کە گوێیان لە وشەی "کادز" بوو پێکەنین گرتنی و برانکارەکەیان دانا. یەکیان لە ترایان چووە پێشەوە و بە گاڵتەجاڕییەوە پێی گوت: "ئێستا گەیشتوویە کاکێشان ها؟" ترایان گوێی نەدایە ئەو گاڵتەیە. چاوی لێک نابوونەوە. دوای چرکەیەک هەستیکرد لە سەر قەرەوێڵەی دادەنێن.

## (١٥١)

ترایان چاوی هەڵهێنا و لە دەوروبەری خۆی روانی. چرایەکە بە تێل دەوری گیرابوو، پەنجەرەش بە میلی قایم تەنرابوو. ژوورەکە چوار تەختی تێدابوون. دوو نەخۆش لە پەنا یەکتر دایشتبوون و قسەیان دەکرد. هەر دووکیان یۆنیفۆرمی ئەڵمانییان لەبەردا بوو. کاتێ ترایانیانٚ هێنابووە ژووری ئەوان هەر سەریشیان هەڵنەهێنابوو. هەر دووکیان گەنج دیار بوون. قەرەوێڵەکەی دیکەش نەخۆشێکی لە سەر خەوتبوو. لێفەکەی بەسەر خۆی هەڵکێشابوو. لە لای بەرەوەی تەختەکەی پێڵاوە زلەکانی

وەدەر کەوتبوون. ترایان لە خۆی پرسی بۆچی کابرا پێڵاوی لە پێدان؟ پەرستارێک بە بەرگی سپییەوە لە تەنیشتی دانیشتبوو. سەری لە هی شمیت دەچوو. کەللەسەرێکی چوار سووچ و ناقوڵا. ماسولکەی دەموچاوی وەک مردبن وا بوو. چاوەکانیشی بێ ڕۆح و شووشەیی بوون، بەڵام ئەوە سەری مردوویەک نەبوو، بەڵکو سەری مرۆڤێکی پێوە بوو کە قەت نەژیاوە. پەرستارەکە هەستا و چووە لای ترایان.

"دەی، تۆ چ چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕیەوە؟"

وەک گەورەیەک کە ئامۆژگاریی منداڵێ بکا دەستێکی وەبەر چەناگەی ترایان دا. ترایان وەڵامی نەداوە و سەری لەبەر دەستان راپسەکاند.

"دەی، دیارە چیرۆکت پێ نییە. دیارە لە تاقمی کەمدوێیانی."

پەرستارەکە لەگەڵ ئەو وتەیەدا دەستێکی لە روومەتی ترایان دا، درێژەی دایێ: "ئەگەر حەزت لێیە هیچ مەڵێ و بە تەونە جاڵجاڵۆکەی ناو مێشکت گەمە بکە!" ئینجا چووە لای دەرگاکە و لە جێگای خۆی دانیشتەوە.

## (١٥٢)

ترایان لێوی خۆی گەست و گوتی: "منیان هێناوەتە شێتخانە! لەبەر ئەوە لەسە مانگرتن لە خواردن سوور بووم."

لە پڕ بێهێزی و سستی لەشی هیچی نەما و حەزی بەربەرەکانی هەموو گیانی داگرت: "من لە شێتخانەم. پلانەکەیان خرا نییە. تا ئێستا فرتوفێڵێکی وام نەبیستووە. تەنانەت کە باسی ئەشکەنجەی زیندانی رووسەکانیان دەکرد. گشت پزیشکانی زیندان و مامۆستاکانی زانکۆ لە گرتووخانە ئیمزایان کردووە من شێتم. مەبەستیان ئەوەیە بیسەلمێنن من عەقڵم تێکچووە بۆیە مانم لە خواردن گرتووە. من بەرنگاریان دەبمەوە."

نینۆکی لە گۆشتی لە پێ راکرد: "دەبێ پێیان بسەلمێنم لەوپەڕی ژیریدام."

بە لەرزە لەرز و کاتێ دەستی بە دیوار دەگرت چووە لای پەرستارەکە.

"ئۆهـ هاتی چیرۆککەم بۆ بگێڕیەوە. دەمزانی دواجار بۆمان دەگێڕییەوە."

پەرستار بە توورەییەکی تایبەتەوە پێکەنی.

"کەسێک کە چیرۆکی بۆ گێڕانەوە پێنەبێ ڕێگەی ناکەوێتە ئێرە، بەڵام بوچکەڵە، من ئێستا تاقەتم نییە گوێت لێ بگرم. تۆ دواتر چیرۆکەکەتم بۆ بگێڕەوە. سبەی، دووسبەی، مانگێکی تر، ساڵی داهاتوو... خۆ کاتمان زۆرە."

پەرستارەکە سەری بە سەر ڕۆژنامەکەدا ڕۆگرتەوە و ویستی دەست بە خوێندنەوە بکاتەوە، بەڵام کە زانی ترایان هەروا لەوێ ڕاوەستاوە، بە سەر ئاماژەی بە قەرەوێڵەکەی کرد و گوتی: "هەهانێ... قەرەوێڵەکە لەوێندەرە. بڕۆ بۆخۆت لێی بنوو. کارت بە تەختەکانی دیکەش نەبێ. تێگەیشتی؟"

"دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم."

"دەزانم دەتەوێ شتێک بپرسی، بەڵام من پێم ناکرێ، ئێستا بڕۆ بنوو. تۆ دەبێ کوڕێکی ئاقڵ بی، قەمچییەکە پەیدا دەبێ. "ئینجا قەمچییەکی تایبەتی سواران لە ژێر تەختەکەی هێنا دەرێ و نیشانی ترایانی دا.

## (١٥٣)

ترایان زانی قسەکردن بێ کەڵکە، هەر چیشی گوتبا بە گوێی کەسدا نەدەچووە خوارێ، لەبەر ئەوەی پێیان وا بوو زادەی مێشکی شێتێکن. بۆیە ترایانگەرایەوە سەر تەختەکەی.

"بە بەند کردنیشمەوە نەوەستان، هێنایانمە شێتخانە."

ترایان چاوی لێکنا. بیری لەوە دەکردەوە لەمەوپاش چ رەفتارێک بگرێتە بەر، بەڵام ئیدی نەیدەتوانی بیر بکاتەوە. هەر بەو حاڵەوە کە دەستی کردبوونە مست خەوی لێکەوت.

"هەستە."

ترایان خەونووچکەی لێ تێکچوو. هێشتا بە تەواوی خەوی لێنەکەوتبوو. هەر ئەو پەرستارەی بە برانکار هێنابووی لە سەر سەری راوەستابوو. بە دەنگ ناسییەوە.

"چیت لە گیرفاندایە بمدەیە."

ترایان هەستایەوە دانیشت و گیرفانەکانی پشکنین. قامکی دەلەرزین. دەسرۆکەیەکی لە گیرفان دەرهێنا و دایە پەرستارەکە. لە گیرفانەکەی دیکەشی پاپێکی دەرهێنا. پاپەکەشی دایە. وێنەیەکی بچکۆلانەی ئانتۆنیۆسی پیرۆزیشی لە گیرفانی تەنیشتیدا بوو.

سەیرێکی کرد و ئەویشی دایە.

"هیچی دیکەت لە گیرفاندا نییە؟"

"نا، هەر ئەوە بوو."

پەرستار تێی راخوڕی: "دەستت هەڵبڕە."

ترایان دەستی تا ئاستی سینگی بەرز کردنەوە. چاوی دەتگوت پەردەیەکی نەبەدییان پێ هەڵکێشراوە. هەرچەند تەقەللای دا نەیتوانی دەستی لەوە بەرزتر بکاتەوە.

"بەرزتر."

"ناتوانم، حاڵم باش نییە، ئێستا بەردەبمەوە..."

پەرستار بە جووڵەیەک دەستی ترایانی بەرز کردنەوە. ترایان لە سەر نێوچاوانی هەستی بە قورسایی دەستەکانی کرد کە بەقەد شاخێکی بەردین گران بوو. هەر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات رۆژێک لە رۆژان دەستەکانی ببنە ئەو بارە قورسە. تەنانەت نەیدەتوانی لاشیان ببا.

پەرستارەکە هەموو گیرفانەکانی پشکنین. ترایان هەستیدەکرد کە ئەو دەستە بێگانەیە نەک هەر گیرفانەکانی بەڵکو بن پێست و ناو گۆشتی جەستەشی دەپشکنی.من "ئێستا دەتوانی دەستت بهێنیە خوار."
پەرستار دەستی ترایانی لەسەر سەری هەڵگرتن و بەریدانەوە: "ئێستا قەیتانی پێڵاوەکانت بکەوە."
پەرستاری چاودێری ژوورەکە گوتی: "لێی گەڕێ. چاو لێکە چۆن رەنگی سپی هەڵگەڕاوە. بە هەر دووکیان ترایانیان لەسەر تەختەکەی درێژ کردەوە، پێڵاوەکانیان لە پێ داکەندن و قەیتانەکانیان لێ دەرهێنان. ئەمجارە پانتۆڵەکەشیان داخزاند، دۆخینکەیان لێ دەرکێشا و هەڵیانگرت، پاشان نۆرەی چاویلکەکەی هات.
ترایان پاڕایەوە: "چاویلکەکەم لێ مەستێنن." ترایان زلکوێر بوو.
"بەڵێ، دەتهەوێ بە پارچە شووشە چاویلکە دەمارەکانت هەڵببڕی؟"
"من بەبێ چاویلکە هیچ نابینم."
"لێرە پێویستت بە دیتن نابێ."
پەرستارەکە چاویلکە و پایپ و وێنەکەی لە دەسرۆکەکە گرێدان. ئەوە دوامین دارایی ترایان بەو دنیایەدا بوون. پەرستارەکە دەسرۆکەکەی برد و رۆیی.

## (١٥٤)

"هەستە بڕۆ."
یەکەم بەیانی بوو لە شێتخانە بوو. ترایان چاوی بە قاپێکی پڕ لە سووپ کەوت کە پەرستارەکە بۆی راگرتبوو.
"ناخۆم."
"ئەگەر پێت وایە لێرە بە کەیفی تۆ دەجووڵێنەوە بزانە بە هەڵەدا چوویە؟"
پەرستارەکە چووە لای ئەو نەخۆشەی بە پێڵاوەوە نوستبوو و لێفەی بە سەر خۆی هەڵکێشابوو. لێفەکەی لە سەر هەڵدایەوە. پیرەمێردێکی

ریش چەرموو خەوتبوو و دەموچاوی لە نێو سەرینەکەدا شاردبۆوە. پیرەمێردەکە سەری هەڵبڕی و بە چاوی تۆقیو و نائاسایی سەیری دەوربەری خۆی کرد. ئینجا بە دەنگێکی کزەڵۆکەوە گوتی: "چیتان دەوێ؟" دیسان سەری بردەوە نێو بالیفەکە.

"باوکە بوچکەڵە هەستە شتێک کاوێژ بکە!"

لەو کاتەدا دوو شێتە لاوەکەش هاتنە لای پیرەمێردەکە و جووت پاڵیان وێک دا. دەتگوت دەترسین لە یەکدی جوێ ببنەوە. پەرستار پێی گوتن: "سەگی پەتکراو، زوو بیگرن."

پەرستار دەتگوت سەگان دەنگ دەدا. یەک لە دوو "سەگە پەتکراوەکە لە دواوەڕا رۆبووە بن پیلی پیرەمێردەکە. پەرستارەکە بە دەم پێکەنینەوە گوتی: "لە سەرەخۆ، لە سەرەخۆ، ئاگادار بە تێکی نەشکێنی."

پیرەمێردەکە لە قوڵپی گریانی دا. چەناگەی لە سینگی چەقاند و چاوی لە زەوی بڕی. "دەمت بکەوە، پیری خەرفاو. دایکت مەمکەمژەی بۆ هێناوی!

پیرەمێرەدەکە محکەمتری چەن بە سینگییەوە نووساند و شێوەلاکەی لەسەر یەک داگرتن.

"لمۆزی بکەنەوە، بەڵام زۆر ئاگادار بن."

"سەگی پەتکراو" لەملاو ئەولای تەختەکە چۆکیان دادا. پەنجەیان دە بەر زاری پیرەمێردەکە نا و لێکیان کردەوە. پەرستاریش کونە تفینکی گرتن. بە دەستەکەی تریشی سووپی لە ناو دەمی کرد. پیرەمێرد سووپەکەی نێو دەمی بە دەموچاوی سەگی پەتکراودا پرژاند. هەر دووکیان پێکەنین. پەرستارەکە کەوچکێکی دیکەی سووپ وێگێرا. ئەو جارەیان نەیتوانی بیتفێنێتەوە. خواردنەکە گەیشتە قورگی و ناچار بوو قووتی بدا، دەنا دەخنکا. بە کەپۆیدا نەیدەتوانی هەناسە بدا، لەبەر ئەوەی پەرستارەکە هەروا توند گرتبووی.

پیرە بلماندی: "خنکا...م."

ئەو کارە دووپات بۆوە. پیرەمێردەکە هەر دەینالاند. وەختابوو بخنکێ و لە ژێر دەست و مەچەکی دوو سەگی پەتکراودا گرمۆڵە ببوو. "خۆ بینیت پیرە لە چ حاڵێکدایە؟" پیرەمێردەکە رەنگی وەک جاو سپی هەڵگەڕابوو. ترایان چاوی نووقاند هەتا چیدی ئەو دیمەنە نەبینێ.

"چ بوو، ترسای؟" پاشان پەرستارەکە بە شێوەیەکی تایبەتەوە گوتی: "ئێستا نۆرەی تۆش دێ."

هەر دوو سەگی پەتکراو پێکەوە گوتیان: "دەبێ خواردن بدەینە ئەویش؟"

"ئەگەر بە ئەدەب نەبێ ناچارین."

سەگی پەتکراو ئیدی وازیان لە پیرەمێردەکە هێنا. بە تامەزرۆییەوە لە قورگ و چەناگەی ترایانەوە رامان. ترایان داهاتەوە و قاپە سووپەکەی دەست داێ. ئینجا بە پەلە دەستی بە خواردنی کرد. دوای ئەوەی قاپەکەی بەتاڵ کرد گوتی: "هەقیانە، کەسێک دوای ئەوەی دەیهێننە شێتخانەش هیچ نەخوا، بەڕاستی شێتە. شێت خۆ نازانن مان لە خواردن بگرن. من شێت نیم، بۆیە چێشتەکەم خوارد، بەڵام ئەوە هەرگیز بەو مانایە نییە دەستم لە بەربەرەکانی هەڵگرتبێ."

## (١٥٥)

ترایان لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەبێ پێیان بسەلمێنم خاوەن عەقڵ و هۆشم." سەری پیس دێشا. ئەو چێشتەی ئاودیوی گەدەی کردبوو وەک قورقوشم قورس بوو، بەڵام هێزی وەبەر خۆی نا و هەوڵیدا زەردەخەنەیەکیش بهێنێتە خۆی. بەم جۆرە چووە لای پەرسیارەکە گوتی: "دەمەوێ قسە لەگەڵ دکتۆری ئەم بەشە بکەم."

ڕاوەستە کاتی سەردانی دکتۆر دەتوانی قسەی لەگەڵ بکەی."

"زووتر ناکرێ؟"

"نەخۆشەکانی ئەم بەشە بۆیان نییە جگە لە کاتی سەردانی دکتۆر قسەی لەگەڵ بکەن."

"تێگەیشتم، پزیشک گوێ ناداتە داوای شێتێک، بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە من شێت نیم."

"ئەدی بۆچی تۆیان هێناوەتە ئێرە." "بۆ ئەوەی دەستم پێ لە مان گرتن لە خواردن هەڵبگرن. خۆ پێشتر بۆم باس کردووێ. ئێستاش خواردنم خوارد. کەوابوو هۆیەک نەماوە منی پێ بە شێت لە قەڵەم بدرێ. ئەگەر هیچم نەخواردبا، ئێوە ئەو کارەی منتان نەک وەک نارەزایەتییەکی بچووک، بەڵکو وەکو شێت بوونی من لێکدەدایەوە، بەڵام ئێستا هەموو شتێک روون و ئاشکرایە."

ترایان زانی پەرستارەکان گوێی نادەنێ.

"ئێوە سەرەڕای ئەوەی دیتتان شێوم خوارد، هەر بە شێتم دەزانن؟"

ترایان دەنگی دەلەرزی.

پەرستارەکە بە بۆلە بۆڵەوە گوتی: "برِۆ سەر تەختەکەتِ و لێم گەڕێ با رۆژنامەکەم بخوێنمەوە."

"بەڵام کاتێک پێتان دەڵێم شێت نیم..."

"زۆر راستە. زۆر راستە!، بەڵام ئێستا برِۆ سەر تەختەکەت و ئارام بگرە. لێرە دەبێ ئاقڵ بی، دەنا قەمچییەکە دەکەوێتە کار!"

## (١٥٦)

ئەو رۆژە دکتۆری بەشەکە نەهاتە سەردانی نەخۆشان. جەنگەی نیوەڕۆیە پەرستارەکان یەک لە دوو "سەگی پەتکراو"یان بردە دەرێ و دوای نیو کاتژمێر بە برانکار هێنایانەوە. برانکارەکەیان لە نێوەڕاستی ژوورەکە دانا. کونە تفینکی نەخۆشەکە کە لۆکەیان تێئاخنیبوو، دەلەرزین. رەنگی بە رووانەوە نەمابوو. کەفێک شین بە لالێویدا دەهاتە خوارێ. لێوی دەلەرزی.

ترایان پرسی: "چ بەلایەکیان بەسەر هێناوە؟"

"سەگی پەتکراو"ی دیکە کە رەفیقەکەی بەو حاڵە گرژەوە بینی یەک بە خۆی پێکەنی. لەو کاتەدا دەنگی لە وەڕینی سەگ دەچوو. سینگی نەخۆشەکە لە حەوا مابۆوە. وەک ئەوەی ئامێرێکی کە وە جووڵەی دەخا لە کار کەوتبێ. ماسولکەی دەست و پێی هەر لەخۆوە دەلەرزی. دەتگوت پەیوەندییان بە لەشیەوە نەماوە. رەنگی بە پێستییەوە نەمابوو و هیچ لە پێستی بوونەوەری زیندوو نەدەچوو. هەموو جەستەی لە بووکەڵەیەک دەچوو بە شێوەیەکی میکانیکی لە جووڵەدا بێ. تەنیا نیشانەی زیندوو بوونی ئەو کەفە شینە بوو کە هەڵیدەخڕاند و دەرژایە سەر رانکار.

ترایان دووپاتی کردەوە: "چ بەلایەکیان بە سەر سەگی پەتکراو هێناوە؟"

پەرستارەکە گوتی: "هیچ نییە. تەنیا دەرزییەکی لێدراوە."

"چ دەرزییەک؟ بۆ ئاوا گینگڵ دەدا؟"

"تۆ زۆر دم بەردووکەی، کوودەڵەی خۆم، تۆش تاقیدەکەینەوە. سبەی نۆرەتە."

"من؟"

ترایان کاتێ چاوی لەو بوونەوەرە کرد کە ماسولکەکانی نەدەحەجمین، زەندەقی چوو.

"پێت سەیرە؟ بڕوا ناکەی؟ ئەوی لێرە بێ ئەو دەرزییەی وێدەکەوێ."

پەرستارەکە تۆپە لۆکەی کونە تفینکی نەخۆشەکەی گۆڕین چەند شەپازللەی لە بناگوێی دان، بەلام سەگی پەتکراو هیچ دژکردەوەیەکی نەبوو.

"ئێستا خەنجەری لێبدەی ئاگا ناکا. تا ئەو شۆکەی هەبێ هەست بە هیچ ناکا. ئێوە ئەو دەرزییەتان پێویستە. ئەو دەرزییە ئەعسابتان دەخاتە جموجوڵ. چاو لێکە دەماری ئەو پیاوە چۆن کەوتۆت ژیمناستیک!"

ترایان لە سەر قەرەوێڵەکەی دانیشت و سەری لە نێو دەستان گرت. دەرگا کرایەوە. ترایان داچڵەکا، بەلام دکتۆر نەبوو. پەرستارێک بوو هاتبوو سەگی پەتکراوی دیکە ببا. پەرستارەکە دەستی سەگی پەتکراوی

گرت و لەگەڵ خۆی بردییە دەرێ. زۆری پێنەچوو ئەویشیان لە سەر برانکار هێنایەوە و لە ناوەڕاستی ژوورەکە لە پەنا هاوەڵەکەیان دانا. کونە تفینکی ئەویشیان بە لوکە ئاخنیبوون. ئەویش کەفە شینی گۆرینی بە لالێویدا دەهاتە خوارێ و لەشی هەڵدەچۆقا. ئینجا سەرەی پیرەمێردەکە هات. دوای کەمێک ئەویشیان بەو حاڵەوە هێنایەوە. ترایان چاوی لە لەشی هەر سێکیان بڕی کە بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن پێکەوە و بە ڕیتمێکی هاوبەش هەڵدەبەزینەوە. ترایان دیسان پرسی:

"باشە ئەوە چ دەرزییەکە؟

"کاردیازۆڵ. بۆ شۆکی دەمار و پاڵاوتنی مێشک لە شێتی زۆر باشە."

پەرستارەکە دەستی کردە پێکەنین. ترایان ئەو جارەش چاوی لە لەشی ئەو سێ کەسە کردەوە. هەڵچۆقانیان میکانیکی بوو، وەک مرۆڤی دەسکرد. ژیان لە ناو لەشی ئەو سێ بوونەوەرەدا، لەو جووڵە و هەڵبەز دابەزە میکانیکییە ماسولکەکانیاندا چڕ ببۆوە. ئیرادە و هەست و ڕۆحیان مردبوو.

ترایان وای هاتە بەر چاو کە لە بەر دەمیدا دیمەنی ژیانی مرۆڤ لە کۆمەڵگای تەکنەلۆژیدا دەبینێ. ژوورەکە لەبەر چاوی لێک ڕەوییەوە، هێندە بەرین و بەرهەراو بوو کە ئەورووپا و سەرانسەری ڕۆژئاوا و دواجار هەموو دنیای داگرت.

ئیدی ئێستا ئەم ژوورە تەنیا سێ کەسی بە جووڵەی وەک یەکی دەستکرد و کردەی ئۆتۆماتیکی تێدا نەبوو، بەڵکو تێکڕای بەرەی مرۆڤی تێدا بوو. دیمەنێکی سامناک بوو. ئەو دیمەنە بیری ورووژاند. وای هاتە بەر چاو کە شمیتی کۆنە شارەدار لە گرتووخانەی کۆرن وستهایم هەر بەو ڕیتمە شەیتانییە سەمای دەکرد. ستوان یاکوبسن و (براون)ی فەرمانداری شاری ڤایمار و دکتۆر ئابرامۆڤیچی هەر هەموویان لەگەڵ گرمەی توندی ئامێری جاز و شۆکی کاریازۆڵەوە هەڵدەپەڕن. هەموو دنیا نوقمی ئەم هەڵبەز دابەزە ببوو.

ترایان دەموچاوی خۆی بە دەستان داپۆشی و هاواری کرد:

"من نامەوێ... من نامەوێ..."

## (١٥٧)

پزیشک بە دڕدۆنگییەوە چاوێکی لە ترایان کرد و گوتی: "لە راپۆرتی نەخۆشییەکەیدا باسی مانگرتن لە خواردن نەکراوە. ئەگەر تۆ مانت لە خواردن گرتبا، بێگومان لەو کاغەزەدا دەنووسرا، کەچی تێیدا نووسراوە: نەخۆشیی سەختی دەروونی، نیازی خۆکوشتن، رق و تووڕەیی زۆر، ترس لە راوەدوونان. هەر ئەمانە و بەس. ئیدی ببڕای ببر باسی مان گرتن لە خواردن نەکراوە. مان گرتن لە خواردن نیشانەی ساغیی عەقڵ و هۆشە. دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکەی تۆ لە لایەن دوو مامۆستای زانکۆوە پشتڕاست کراوەتەوە. من بڕوا بە کێ بکەم؟ بە تۆ یان دوو پرۆفیسۆرەکە؟"

دکتۆر لەوە دڵنیا بوو کە ترایان بەسەرهاتەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆخۆی هەڵبەستووە و تێکی خستۆتەوە: "تۆ دڵنیای هاوسەرەکەت لە زیندانە؟ من پێم وا نییە هەر ژنیشت هێنابێ. باشە ئەڵقەی زەواجت کوا؟"

"لە کاتی پشکنیندا لە ئۆردووگا لێیان ستاندووم."

"لەوانەیە وا بێ، بەڵام بەڵگەت بە دەستەوە نییە. من ناچارم بڕوا بەو شتە بکەم کە لە راپۆرتەکەدا نووسراوە. تۆ نابێ لێم دڵمەند بی. من تا بەڵگەیەکی پێچەوانەی ئەمەم دەست نەکەوێ ناچارم بە پێی یاسا بجووڵێمەوە. من ناچارم گوێ نەدەمە گوتەکانی تۆ. هاوسەرەکەی تۆ لە زیندان نییە. هەر لەوانەیە ژنت نەهێنابێ. باوکت لە گرتووخانەدا نەمردووە و بۆخۆشت لە خۆڕا نەگیراوی."

ترایان وەڵامی دایەوە: "مرۆڤ چۆن دەتوانێ بە خەڵکی بسەلمێنێ شێت نییە. هەر قسەیەک، هەر هەڵسوکەوتێکت کە جاران زۆر ئاسایی بوون ئێستا دەبنە هۆکار و نیشانەیەک بۆ شێتی. هەموو وتە و ئاخاوتن و رادەربڕینێکی لە ژیانی رۆژانەدا ئاسایی و تەنانەت بە نیشانەی زیرەکی و پیتۆڵی لە قەڵەم دەدرێ، لەم شێتخانەیە وەک نیشانەی شێت بوون لێک

دەدرێتـەوە. سـنووری نێـوان شـێتی و ژیـری لێـرە زۆر دیـار نییـە. بـەو حاڵەشەوە من دەبێ پێتان بسەلمێنم شێت نیم."

ترایـان رووی کـردە دکتـۆر و گـوتی: "دکتـۆر تکـات لێدەکـەم یارمـەتیم بدە."

"من چیم لە دەست دێ؟"

"بڕوا بە قسەکانم بکە."

"پێم وا نییە کەڵکێکی بۆت هەبێ."

"نامەوێ پێم بڵێی بڕوات پێدەکەم. دەمەوێ بەڕاستی متمانەم پێ بکەی و داواکاریشم بمخەنە ژێر پشکنینێکی وردی پزیشکییەوە."

داواکارییـەکـەی دوایـەت زۆر نابـەجێیـە. فـەحسی پزیشکی بـەهـەرحـاڵ ئەرکی منە، بەڵام لە بارەی داواکەی ترت من بڕوا بە شتێک دەکەم کە راستییەکەیم بۆ ئیسپات بووبێ. بەبێ بەڵگە و ئیسپات بوون شتی وا نابێ.

"ئاخۆ وەک مرۆڤێک بڕوا بە قسەی من دەکەی؟"

"من خزمەتکارێکی زانستم."

دکتـۆر زۆر جـەختی لـە سـەر ئـەو رستـەیـە کـردەوە: "ویژدانـی کـاریی پیشەکەم رێگام پێنادا بەبێ بەڵگە و ئیسپات کردن متمانە بە قسەی هیچ کەس بکەم."

## (١٥٨)

بڕیـار درا ترایـان بخرێتـە ژێـر پـشکنینی وردی پزیشکییەوە. سـەرەتـا خوێنیان لە دەماری هەر دوو دەستی گرت. ئینجا نۆرەی خوێن گرتن لە سەری قامکان هات. جارێکیش لـە دەمـاری دەستان. ئـەوجـار تـەواوێکیـان خوێن لێگرت. ترایان خۆشی بێ و ترشی بێ خۆی بە دەست تاقیکارییـەوە دا. مرۆڤ لە هەموو جێگایەک دەبێ خوێنی خۆی بدا. لە هەموو جێگایەک، بەڵام هەر بە خوێن لێگرتنـەوە نـەوەسـتان. دەرزییـەکی درێژیان لـە پشتە سەری راکرد و چەند دڵۆپ ئاوەکییان لە نوخاعی گرت. ترایـان ددانی بـە

جەرگی خۆیدا گرت و نەیگوت وە. کارێکی یەکجار بە ئێش و ئۆف بوو، بە تایبەت کە دوو جار دووپات بۆوە، بەڵام ئەو دەیزانی مرۆڤ نەک بە خوێنی بەڵکو بە ڕۆح و مێشکی خۆشی بێ دەبێ کەفارەت بدا. دەنا خەڵکانی دی مافی ژیانی نادەنێ. ئازای لەشیان ورد ورد فەحس کر. بنانگوێ، پیسایی و ترشاوی گەدە و هەر هەموویان لە ژێر میکرۆسکۆپ سوێ دا.

پزیشکەکان ئینجا هانایان برد بەر رادیۆلۆژی. تیشکیان لە کاسەسەر و هێسکی هەموو لەشی، بەش بە بەش، هەڵگرت. پزیشکەکان لە برینێک دەگەڕان کە زیرەی نائومێدانەی بۆ گەیشتن بە ماف و دادپەروەری لە مرۆڤێک هەستاندبوو. ئەو برینە لە جێگایەکی دیکە بوو، بەڵام پزیشکەکان دەیانویست لە لەشی ترایاندا بیدۆزنەوە. هەموو ماسولکە و دەماریان یەک یەک پشکنین تا جۆری دژکردەوەی هەر یەکەیان بۆ دەرکەوێ. ئەژنۆ و دەست و گەدە، شتاقیان نەبواردن. گوییان لە ترپەی دلی گرت.

هەوڵیاندا چڵۆڵەترین قووڕە قووری ریخۆڵەی تۆمار بکەن. گوێی سڵی پزیشکەکان شاراوەترین بەرزی و نزمیی تەوژمی خوێنیان دەرخست. ترایانیان سەر لە نوێ وەزن کردەوە. بەژنیان پێوا، پانایی قەفەزەی سینگ، درێژایی باسک و دەست و قاچەکانیان پێوا. داوایان لێکرد دەمی بکاتەوە، ئینجا دەستیان بە ژماردنی ددانەکانی کرد و یەک بە یەک، بە چەکوچێکی بچووک فەحسیان کردن. مۆڤ چۆن چاو لە نانی کرواوی دەکا ئاوا زمانیان معاینە کرد. بە کورتی: "گشت ترایان"یان وەکو کەرستەیەک کە لە بەکارهاتنی دوودڵ بن، تاقیکردەوە و فەحسیان کرد.

جا ئەوجار نۆرەی پشکنینی دەروونی بوو. پزیشکێک بەیانیان و نیوەڕۆیان و ئێواران، جار هەبوو شەوانەش، دەیدواند. ترایان هەر وەڵامێکی دکتۆری دابایەوە بە وردی یادداشت دەکرا.

پزیشکەکان لەو وەڵامانەدا بە دوای نیشانەیەکی شێتی دەگەڕان.

داوایان لێکرد تەواوی بیرەوەریی خۆی لەگەڵ دایک و باوکی، سەردەمی منداڵی و بیرەوەریی لەگەڵ خوشک و برایانی ـ کە ترایان هەر

نەیبوون - بگێڕێتەوە، دیارە بیرەوەریی ئەو ژنانەش کە ناسیونی. ترایان کە بۆخۆی شارەزای کوێرەڕێی ئالۆز و پلۆزی نەستی مرۆڤ بوو - پزیشکەکانیش هەر لەوە دەگەڕان - تا توانی بۆی باس کردن.

ڕۆحی ترایان رووت بۆوە. وەکو ئەوەی دەرکەی کۆنە یەغدانێکیان کردبێتەوە کە پڕە لە شرە جلوبەرگی پەرپووت و چڵکن، پزیشکەکان بە نێو تان و پۆی بیرەوەرییەکانیدا شۆڕ بوونەوە و سڵیان لە وردترین و شەخسیترین یادەوەرییەکانی نەکردەوە. تا سەرەنجام پشکنینەکە کۆتایی پێهات.

پزیشکەکە بە ترایانی گوت: "تۆ تەواو ساغی. هەڵبەت کۆمپلێکسی زیانبەخش و ئاسەواری کەم خۆراکی و کەمیی ڤیتامین و دواجار کەم کێشیت تێدا دەبینری، بەڵام لە رووی دەروونییەوە ساغ و سەلیمی. خڕۆکی سوورت هەندی کەمە، رەفیسکەت هەندێ ئاوساون و ددانیشت خراپن کە هەمووی ئەمانە هی کەم خۆراکییە. نەبزیشت رێکوپێک لێنادا کە ئەوەشیان هی شەکەتیی زورە. چەند پەڵەی بێ مەترسیشت لە ریخۆڵەدا دەبینرێن، بەڵا ئەمانە هیچیان زۆر گرینگ نین."

"ترایان پرسی "سەرەنجام قەناعەتتان هات کە من شێت نیم؟ ترایان شل و شەکەت ببوو. وەک مەسیح لە کێوی ئورشەلیم: "تکا دەکەم تا زووە لێرەم ببەنە دەرەوە.

"تۆ دەبێ بچیە بەشی پزیشکی، لەبەر ئەوەی میزاجت زۆر لاواز بووە."

"من حەز دەکەم بگەرێمەوە ئۆردووگا."

"داوایەکی ژیرانە نییە.

"بەڵام من دەمەوێ هەرچی زووترە بچمەوە ئۆردووگا."

دوای حەوتوویەک ترایان گەڕابۆوە ئۆردووگا. کۆڵێکی بەڵگەنامە و پشتڕاست کردنەوە پێبوون کە دەیسەلماند نە شێتە و نە رۆژێک لە رۆژان کەللەیی بووە. چاوی لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە نریقەیان دەدا، بەڵام لەشی لەبەر ئازار و ماندوویەتی وەک سێبەرێکی لەرزۆکی لێهاتبوو.

## (١٥٩)

ترایان گوتی: "ڕەشبگیری ئۆتۆماتیکی جۆرە شێوازێکە، بەڵام هۆکارێک نییە بۆ گرتنی خەڵک. بۆئەوەی مرۆڤ بخەنە بەند و وەک پیاوکوژ و تاوانباران لەگەڵی بجولێنەوە و بەرە بەرە لە ناوی بەرن، دەبێ بەڵگە و هۆکارێکیان بە دەستەوە بێ. ئەو مرۆڤە دەبێ بەڕاستی تاوانێکی کردبێ.

من چ تاوانێکم هەیە؟ ژنەکەی من چ تاوانێکی لێ ڕوویداوە؟ بابم بۆ دەبوو بگیرێ؟ یوهان چی کردووە؟ کاتێک من ئەو پرسیارانەم بە نائومێدییەوە دەکردن، ئێوە هاواری منتان بە شێتی لە قەڵەم دا. کاتێ هاواری مرۆڤ بۆ گەیشتن بە حەق و ئازادی بە شێتی بزانرێ، ئیدی هەموو شتێک تەواو دەبێ. ئەو مرۆڤە ئەگەر هەموو ئیمکاناتە تەکنەلۆژییەکانیشی لەبەر دەستدا بن هێشتا دادی نادەن."

ستوان یاکوبسن جگەرەیەکی داگیرساند. هەر کە ترایان لە شێتخانە گەڕابۆوە لە دووی ناردبوو و ئێستا پەشیمان بوو: "ئێوەی ئەورووپی زۆر دڵناسکن. هەمووتان وان."

"ڕەنگە وا بێ. دڵناسکی هەڵەیەکی گەورەیە، بەڵام ئەو تراژیدیایە کە بە پێکەنینێک سەرپۆش لە سەر دوا هەلچوقانی مرۆڤ دابنێ زۆر جەرگ-بڕترە. ئەوە لە هەڵەیەکی ئاسایی یان شێت بوون گەلێ سامناکترە.

"من هەوڵمدا کارێکت بۆ بکەم، بەڵام نەمتوانی. داوام کردبوو بەرت بدەن."

"زۆر چاک باوەڕ دەکەم کە تۆ هەوڵتداوە و هیچت پێ نەکراوە. ئێوە هەرگیز هیچتان لە دەست نایە. هەرگیز. ئیدی هیچ کەس ناتوانێ مرۆڤێکی دیکە و تەنانەت خۆی ڕزگار بکا. مرۆڤ کەمینەیە و تازە هیچی لە دەست نایە. مرۆڤ زنجیری ئاسنینی لە دەست و پێدایە. تەنانەت تۆش لە ناو ئەو زنجیرەدای. هەر ئێستا کەلەپچەی بۆروکراسی لە دەستی تۆ دراوە. ئەوە تاقە دیارییەکە لەو شارستانیەتە درۆیینەوە پێمان براوە: کەلەپچە."

"بڕۆوە ئۆردووگا و بۆخۆت ئیسراحەت کە، لەوەش گرینگتر شێت بازاڕی وەدەر مەنێ."

"من تەنیا کاریک دەکەم کە مرۆڤ دەبێ لە دوا کاتژمێرەکانی مێژوودا ئەنجامیبدا."

"تۆ دیسان چوویەتەوە ناو ئەو بیر و خەیاڵانەوە. حەز ناکەم لەو وەزعەتدا ببینم. ئەرێ سیغار دەکێشی؟"

"زۆرم حەز لێیە."

ترایان جغارەیەکی ئاگر دا.

"جەنابی یاکوبسن تۆ تووشی ئەو هەستە نەبووی، ئێمە تەماشاچییەکی سەیر و سەمەرەین، گەرچی شانۆیەکە کۆتایی هاتووە؟ ئێمە هۆڵەکە چۆڵ ناکەین؟ ئەو خێلەسەرییە هیچ سوودی نییە. دواجار دەرماندەپەڕێنن. تا دوایین کەس. هەر چەند بین. دەیانەوێ هەوای هۆڵەکە بگۆڕن و کورسییەکان ریکوپیک بکەنەوە. ئەم قارەیە پێویستی بە هەوای نوێ هەیە، چونکە بەو زووانە شانویەکی تازە دەست پێدەکا. مێژوو دەورگێڕانی خۆی دەست پێدەکاتەوە. شانۆگەریی دوێنێ مێژووی "داواکاری" بوو. لەو شانۆیەدا مرۆڤەکان بە داواکارییەکانیانەوە روویان لە نووسینگەی غولامەکان دەکرد و داوایان لی دەکردن لێیان خۆش بن، بەڵام داواکەیان بۆ هەڵوەشانەوەی حوکمی لە سێدارەدان رەتدەکرانەوە. واتە نەدەخوێنرانەوە و شانۆکە هەروا درێژەی دەکێشا و لە شانۆکەدا Heppy end لە ئارادا نەبوو. سبەی شانۆگەرییەکی دی دەست پێدەکا کە ناوی "بالتی میکانیکی"یە. ئەم شانۆگەرییە بەبێ بەشداریی مرۆڤ پێشکەشدەکرێ. تەنیا مرۆڤی دەسکرد و ئامێر و غولام دێنە سەر شانۆ، بەڵام من ئەم شانۆگەرییە نابینم. ئەو شانۆگەرییە زۆر درەنگ دەست پێدەکا و من پێراناگەم تەماشای بکەم. تۆ بلێتت بۆ راگیراوە، بەڵام تەنیا بۆ شەوانی سەرەتا بەرنامەکە رادەگیرێ!"

## (١٦٠)

ترایان ڕاست بە ڕاستی دەروازەی ئۆردووگا تووشی یوهان مۆریتس بوو. یوهان زۆر زویر و زگار دیار بوو. هەر کە چاوی بە ترایان کەوت فرمێسکی هاتنە خوارێ.

"ئەگەر وا با خەمت دەبووم؟"

"تا گڵەبانی چاویان دەکردم هەر خەفەتبار دەبووم."

یوهان یەک بە خۆی دەستی ترایانی گوشی: "کە تۆیان برد نەمتوانی ماڵاواییشت لەگەڵ بکەم. نەیانهێشت بێمە ناو نەخۆشخانە. چەند جار هەوڵمدا، بەڵام بێ سوود بوو. دەی تۆیان بردە کوێ؟"

"شێتخانە."

یوهان بە سەر سوڕمانەوە دەستی بە دەموچاوی گرت و بە واق وڕمانەوە چاوی لە ترایان بڕی.

"نا... چۆن شتی وا دەبێ؟ شێتخانە؟"

"بەڵێ، شێتخانە."

ئینجا ترایان دەستی بۆ باخەڵی برد و کیسە تووتنێکی دەرهێنا و دایە یوهان.

"ئێ ئێ، کەواتە لەو شوێنە بووی؟ بەستەزمانە هەی."

لەسەر عەرزی گەرم و بە هەتاو سوور بووەوەی پەنا دەروازەکە دانیشتن و دەستیان بە هەڵپێچانی جغاران کرد.

"تۆ پایپەکەی منت حەز لێیە، وا نییە؟"

"پیاو ئەگەر پایپی هەبوو شتێک پەیدا هەر دەبێ پێی بکێشی. پایپ هەموو خرتوخاڵێکی پێ دەکێشرێ، تەنانەت تووتنی قونچکە جغاران کە تازە بە کەڵکی ئەوە نایەن جغارەیان لێ هەڵبەستی. بۆیە ئەو کاتانەی پایپم نەبووە دەستەشکاو بووم. لە گرتووخانە بەبێ پایپ ژیان زەحمەتە."

ترایان پایپەکەی بۆ راداشت و گوتی: "من ئەو پایپەت دەدەمێ. ساڵێکی تەواو بێ ناوبڕ لە ناو ددانەکانمدا بووە. دیارە زۆربەی وەختان بە بەتاڵی."

"من تازە هیچ ناکێشم. ئەوە دوایین سیغارە کە بە بای دەکەم."

"دکتۆر پێی گوتووی نابێ بکێشی؟"

"نا بۆخۆم چیدی حەز ناکەم."

یوهان پایپەکەی لێ وەرگرت و خەریکی پەستاوتنەوەی بوو.

"زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام هەر کات باتدایەوە سەر جغارە کێشان من پایپەکەت دەدەمەوە. تەنیا بەو مەرجەشت لێ وەردەگرم کە بە راستی تەرخی کەی."

"بە راستی تەرکی دەکەم. یوهان بزێکی هاتێ. بەقای پێنەدەکرد: "من چەند جاران سوێندم خواردووە تازە لێوی لێنەدەم کەچی هەر چوومەتەوە سەری. تەرخ کردنی بەڕاستی زەحمەتە."

"دەزانم، بەڵام من وازی لێ دێنم."

ترایان سیغارێکی داگیرساند و یوهانیش پایپەکەی. بە بێدەنگی قومیان لێدەدان. ترایان چاویلکەی لەچاو دەرهێنا و وەک بۆ دواجار تێی بڕوانێ ئاوا بە سۆز و خۆشەویستییەوە چاوی تێبڕی. لە دارای دنیایە و هەموو کەلوپەلی کە پێی بوون، ئەو چاویلکەی مابوو. کیسە تووتن، کاتژمێری مەچەک، ئەڵقەی دەزگیرانەتی، قەڵەم پەندان و قەڵەمی دار، هەر هەموویان بەرە بەرە لێ ئەستاندبوون، بەڵام چاویلکەکەی هێشتا پێمابوو. خاچێکی چکۆڵەشی پێبوو، کە باوکی مرد لە سەر تەرمەکەی دانا تا لەگەڵی بنێژرێ. نەریت وا بوو قەشەی ئۆرتۆدۆکسیان لەگەڵ عەباکەی و وێنەیەکی پیرۆز دەناشتن، بەڵام باوکی ترایان عەبای تایبەتی عیبادەتی پێنەبوو. قەشە کە مرد فانیلەیەکی ئەمریکی لەبەردا بوو کە وشەی P.Wی لەسەر سەردەستەکانی نووسرابوون. کاتێ ناشتیان تەنانەت کراسیشی لەبەردا نەبوو، چونکە هەر تاقە کراسێکی هەبوو ئەویش یوهان بۆی شوشتبوو.

ماوەی مردن و بردنی تەرمەکەشی ئەوەندە کەم بوو یوهان وێڕانەگەیشت کراسەکەی بهێنێتەوە کە بۆ وشک بوونەوە لە حەوشەی ئۆردووگا هەڵیخستبوو.

باش بوو ترایان پێڕاگەیی خاچەکەی بکاتە مل. لەوانەیە بە خاچەکەوە بە خاکیان سپاردبێ، لەوانەشە هەڵیانگرتبێ. کێ چووزانێ!

ئێستا ترایان تەنیا ئەو چاویلەیەی هەبوو، واتە جگە لە وجوودی خۆی سامانی ئەوەندە بوو. جەستە و چاویلەکەی تەنیا و دواهەمین شت بوون کە خاوەنیان بوو. چاویلکەکەی بە خەمێکی قووڵەوە دایە یوهان و گوتی:

"حەز دەکەی لای خۆت رایگری؟"

"بۆ بەبێ چاویلکە دەبینی؟"

"من بەبێ چاویلکە هیچ نابینم، بەلام ئاوا باشترە. چیدی چاویلکە لە چاو ناکەم."

"ئەمن زۆرم پێ سەیر بوو تۆ چۆن بە شەو و رۆژ دەتوانی چاویلکەت لە چاودا بێ. دەزانی قەت بێ چاویلکەم نەدیبووی؟"

"ئەگەر پێش من ئازاد کرای ئەو چاویلکەیە بدەوە بە هاوسەرەکەم. رەنگبێ زوو نەیبینییەوە، بەلام تا یەکتر دەبینن لە لای خۆت رایگرە. مەعلووم نییە کەنگێ تووشی ژنەکەم دەبی. لەوانەیە زۆر درەنگ لە رۆمانیا... ئاگادار بە چاویلکەکە نەشکێ."

یوهان چاویلکەکەی لێ وەرگرت و تێیەوە راما. هەستی بەوە کردبوو ترایان شتێکی لێ دەشارێتەوە. بە خۆڕایی نەبوو دەمێ دی پایپەکەی دابۆیە و ئێستا چاویلکەکەی. "بۆ دەترسی؟ من هەر داوای ئەوەم لێکردی چاویلکەکەم بۆ راگری. ئەمن تازە لە چاوی ناکەم، پێشم خۆش نییە کەوێتە دەست خەڵک. لە ژیانمدا بەو چاویلکەیەوە زۆر شتم دیوە. بۆیە زۆرم بە لاوە خۆشەویستە. بەو چاویلکەیەوە بوو یەکەم جار چاوم بە ژنەکەم کەوت. هەر بەو چاویلکەیەوە تەماشای هەزار کچی جوانم کردووە. بەو چاویلکەیەوە گەلێ نیگار و پەیکەر و مۆزەخانە و شاری جۆراوجۆرم

دیون. بەو چاویلکەیەوە چاوم لە ئاسمان بڕیوە. هەر بەو چاویلکەیەوە سەدان کتێبم خوێندوونەوە. بەو چاویلکەیەوە مردنی باوکی خۆمم بینی و هەر بەو چاویلکەیەوەش تۆ و هاوڕێیانی دیکەم دیتن و ناسین.

هەر بەو چاویلکەیەوە نوشوستی ئەورووپا و مەرگی خەڵکەکەیم لە برسان و لەناو قات و قڕیدا بینی. بەو چاویلکەیەوە سوێم دایە گرتن و ئەشکەنجە و مەرگی درێژخایەنی مرۆڤان. هەر بەو چاویلکەیەوە مەرگی قاڕەیەکم بە خەڵک و یاسا و بیر و باوەڕ و هیواکانیانەوە دی. من مەرگی ئەو قاڕەیەم بە چاوی خۆم دەدی، بەڵام ئەورووپا ئاگای لە هیچ نەبوو و نەیدەزانی لە ژێر زەختی گرتووخانان و لە ناو چرنووکی یاسا تەکنەلۆژییەکانی کۆمەڵگایەکدا دەخنکێ کە بەرەو وەحشیەت دەڕوا.

ئەو قاشوولکانە چاوی من بوون. هەندێ جار لەگەڵ چاوی خۆم لێمدەگۆڕان. واتە قەت لە یەکتر دانەدەبڕاین. من بەو شووشانەدا تا شاتێک کە دەکرا شت ببینی، سەیری زۆر شتم کرد، بەڵام لەمڕۆوە نامەوێ هیچ ببینم. جاڕز بوومە. ئەو شانۆگەرییە زۆری خایاند. ئەگەر چاویلکەشم لە چاو بێ جگە تێکڕوخان، تێکڕووخانی مرۆڤان، تێکڕووخانی وڵاتان، تێکڕووخانی کڵێسان، تێکڕووخانی ئاواتان چیدی نابینم. من بەو دوو شووشەیە خاپوور بوونی وجوودی خۆم دەبینم کە سیمبۆلی هەموو خاپوور بوونێکە. من سادیک نیم. بۆیەش چاوم بەرایی نادا ئەو هەموو کاولکارییە ببینم. لەوە زیاتر بەرگە ناگرم کە تەنیا وێران بوون ببینم. لە ناو دار و پەردووی ئەو نغرۆ بوونەدا سەربازی نوێ ڕاست دەبنەوە و ئەو ڕۆژە، ئەمڕۆیە. ئەوانە دانیشتووی تازەی دنیان. پێشکەوتنی ئەمانە بە خێرایی گوڕ دەبەستێ. ئەوانە هەر ئێستا بە دانانی خانووی زیندانان بناغەی شارستانیەتی خۆیان داڕشتووە. من بەش بەحاڵی خۆم ناتوانم بەشداری پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئەو شارستانیەتە بم، چونکە دەبێ تەنیا تەماشاوانێک دەوری دەبێ.

بڕوانە چ گەمەیەکی تاڵە! تەنیا شتێکی لەو هەموو پشکنینانەدا لێیان نەستاندووم ئەم چاویلکەیە بوو. ئەوە نیشاندەدا کە ئەمن تەنیا مافی چ رۆڵێکم هەبووە. چار هەبوو لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئەو سەربازانە پیاوەتیم لەگەڵ دەکەن کە ئەو چاویلکانەم لێ ناستێنن، بەڵام ئەوە چاکە و پیاوەتی نەبوو. سادیزم بوو. ئەوان نەک هەر لە خۆیانەوە دەورەکەی منیان وەک تەماشاوانێک دەستنیشان کردووە، بەڵکو هەر بۆخۆشیان بۆیان دیاری کردووم دەبێ چی ببینم: گرتووخانان! من بوم نییە بێجگە لە گرتووخانە و شێتخانە و ئۆردووگا و سەرباز و تێلبەندی دوور و درێژ، هیچ ببینم. بە خۆڕایی نییە چاویلکەکەم زایە دەکەم. من بەو شێوەیە چاو لە شتێ دەپۆشم کە تاقە شتێکە لێیان قەدەغە نەکردووم. ئەو شووشانەش وەک چاو وان. واتە سەیر و سەمەرەترین و بە نرخترین شتی دنیا، بەڵام تا ئەو کاتەی مرۆڤ لە ژیاندا دەورێکی هەبێ، بەڵام ئەگەر وای لێهات کە لە بارەی مەرگ و ژینی خۆتەوە چت بە دەست نەما یان جار ناچارێ بزنەڕێیەکیان بۆ ژیان پێ هێشتییەوە، ئیدی هەبوونی ئەو چاوە شووشەییانە گاڵتەیەکی بێتامە. باشە تو قەت مردوویەکت بە چاویلکەوە دیوە؟"

"کاک ترایان خۆ تۆ هێشتا نەمردووی."

"ئا ئەمەیە. نەمردن تاکە هیوایەکە کە ئێمەی بەسەر پێوە ڕاگرتووە، بەڵام هیوا قەت جێی ژیان پڕ ناکاتەوە. هیوا گیایەکە تەنانەت لە نێو قەیرانیش شین دەبێ."

"بەڵام ئێمە هەروا دەژین."

"واتە ئێمە هیواداریین بژین."

یوهان بە دڕدۆنگییەوە سەیری ترایانی کرد. وە بیری هاتەوە کە لە شێتخانەوە هاتۆتەوە. ترایان بۆخۆی پێی گوتبوو.

"مەترسێ یوهان. من شێت نیم. جێی داخە تۆش وا بیر بکەیەوە. تۆ پێت وایە من هێشتا دەژیم. ئەگینا دەبوو مردبام. واتە دەتبینی کە چاوم

دەکەونە سەر یەک، دلّم لە لێدان دەکەوێ، لەشم سارد دەبێتەوە و تۆ بە سەر تەمی مندا دێی، بەڵام کوڕی بابم مردووی وا هەن تەرمیان لە پاش بەجێ نامێنێ. قارە دەمرن بێ ئەوەی تەرمیان بکەوێ. تەنانت ئایین و وڵاتیش هەر وان. مرۆڤیش جاری وایە ئاوا دەمرن، بەر لەوەی بە کەوتنی تەرمیان بیسەلمێنن مردوون. ئێستا کە تۆ هەست بە مردنی من ناکەی نیشانەی ئەوە نییە زیندووم. تێبگەی؟"

چەند دڵۆپ فرمێسک بە سەر کوڵمەی یوهاندا خلۆر بوونەوە.

"بۆ دەگری یوهان؟

"تۆ نەخۆشی کاک ترایان."

"دەتەوێ بڵێی قسان دەپەرێنم و ئەقڵم تێکچووە، وایە؟"

من شتی وا ناڵێم کاک ترایان، شتی وا چۆن دەبێ؟"

"بەڵام تۆ دڵنیای من شێتم، هەر بۆیە دەگری. لە خۆڕا مەگری برام، من شێت نەبوومە، تەنانەت لە هەموو وەختان ژیرترم."

"بەڕاستی کاک ترایان؟"

"دڵنیا بە یوهان، من ئاوەزم لە جێی خۆیەتی."

"من نەمگوت شێت بووی، بەڵکو لە دڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە سەرت بێشێ. ئەخر لەمێژە زەوادت نەبریوە، لەو جێگایەی لێی بووی لەوانەیە ئازاریان دابێ. خو رەنگت پەریوە. چەند لاواز بوویە. باشە چۆن دەتوانی وا بیر بکەیەوە کە من بۆ یەک ساتیش بە مێشکمدا بێ کە تۆ..."

یۆهان دیار بوو وشەی (شێت)ی دە زاریڕا نایێ.

ترایان سیغارێکی هەڵبەست و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەو مرۆڤانەی شارستانیەتی رۆژئاوا تێکی شکاندوون و هاڕیونی بە رووخانی ئەو شارستانیەتە سەریان تێدا دەچێ. کەسێک بەرگەی ئاوابوونی شارستانیەتی ئاوها بگرێ لە مەسەلە جەرگبڕەکانی ناکا. مرۆڤی وا موڵکی شارستانیەتی تەکنەلۆژییە. وەک یاکوبسن کە ئەمی بە شێت دەزانی یان فەقیرۆکە و بەستەزمانێکی وەک یوهان مۆریتس کە هێشتا لە قۆناغی

غەریزە رواڵەتییەکاندایە. خۆ یوهانیش ئەوی پێ شێت بوو. یوهان و یاکوبسنیش مرۆڤێکیان پێ شێتە کە تا سەر ئێسقان ئەشکەنجەی رۆحی دراوە. تەنیا کەسێکی تێگەیی کە مەسەلەکە فشار و ئازاری رۆحییە نەک شێت بوون، ئەلیو نوورای هاوسەری بوو. هەر نوورا بوو کە خۆڕاگریی لە بەرامبەر کارەساتی چەند هەزار ساڵە ئاویتەی خوێنی خۆی و هاونەژادەکانی ببوو و دەیتوانی بەرگەی درامی سامناکی "لەناو چوونی شارستانیەتی ئەورووپا" بگرێ.

هاونەژادەکانی، لە چنگی فیرعەون و بەڵاکانی لە کاتی رۆنانی ئەهرامی میسر، لە ئەشکەنجەی ئیسپانییەکان، دوور خستنەوە لە رووسیا و دواجار گرتووخانەکانی ئەڵمانیا دەرباز ببوون و ئێستا خۆیان لە هەمبەر شارستانیەتی تازەی تەکنەلۆژیدا رادەگرت. ترایان لەو بارەوە دڵخۆش بوو. بە پێکەنینەوە بە یوهانی گوت:

"پایپەکەت بکێشە، چاویلکەکەش بەرەوە خێوەت. خۆت دەزانی دەبێ بە ساغی بیدەیە ژنەکەم."

یوهان پایپ بە دەمەوە، بە هەنگاوی چەپ و چوێر و شانی داتەپیو بەرەو خێوەت بۆوە. ترایان وای دەهاتە بەرچاو کە یوهان لە حەوشی ئۆردووگا رێ ناکا، بەڵکو بە هەنگاوە خوار و خێچەکانی سەدە یەک لە دوای یەکەکانی مێژوو دەبڕێ، بە هەموو شتێک نامۆ و، بێ ئاگا لەو شتانەی لە دەوروبەر روو دەدەن، سەر هەڵدەبڕێ و تەماشای ئاسمانی شین دەکا، بێئەوەی تاقە یەک جار لە خۆی بپرسێ ئاسمان بۆ شینە؟

ترایان لەبەر خۆیەوە گوتی: "یوهان مۆریتس و ئەلیو نوورا وێست، ئەو دووانە دەمێنن، تەنانەت بەرگەی دنیای تەکنەلۆژیی رۆژئاواش دەگرن، بەڵام هەر تا ماوەیەکی کەم. کەس هەتا سەر خوی راناگرێ. لەوانەیە تەنیا شەوانی سەرەتای ئەو شانۆگەریە بەرگە بگرن. رۆژێکیش کە تەنانەت بەهێزترین و خێلەسەرترین کەسانیش فەوتان، ئینجا لە باکوور و باشوور و رۆژهەڵات و رۆژئاواوە دنیا دەبێتە مەیدانی تەڕاتێنی مرۆڤی دەسکرد.

## (١٦١)

یوهان لە نێو خێوەتاندا بزر بوو. ترایان هەستا. پاشماوەی جگەرەکەی فڕێ دا و بەرەو دەروازەی گەورە وەڕێکەوت. لە پێش دەروازەکە حەوشەیەکی بچووکیان هەڵبڕیبۆوە و چوونە ناوی بۆ بەندییان قەدەغە بو. ترایان ئەوەی دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا بەوپەڕی دڵنیاییەوە، بێ هیچ دوودڵی و پەلەیەک هەنگاوی دەنا. هەنگاوەکانی زۆر لە هەنگاوی کەسێ دەچوون کە دوای کاری رۆژانەی بەرەو ماڵ دەبێتەوە، دەزانێ پەلەی ناوێ، بەڵام لاق هەڵدەگرێ. ئەو بەندییانەی لەو کاتەدا لە حەوشەی ئۆردووگا بوون ـ هەمیشە سێ چوار هەزار کەس لە حەوشەکە ـ ئاگادار بوون کە بەندییەک پێی ناوەتە عەرزی حەرام. تێکڕا، هوروژمیان هێنا لای تێلبەندەکان تا باشتریان چاو لێبێ. سەرەتا وایان زانیبوو یان دکتۆرە یان یەکێ لەو بەندییانەیە کە لە نووسینگە کاریاندەکرد، چونکە هەر ئەو دوو تاقمە بۆیان هەبوو بەو ڕێگا یاساغ کراوەدا بڕۆن. زیندانییەکان دەیانویست بە هەز نرخێک بێ بزانن چ روو دەدا. لە ئۆردووگا هەرچی روویدابا هەزاران چاو بە تامەزرۆییەوە تێی رادەمان. ئەو چاوانەی شل ببوون هێندەی سەیری هەمان دیمەنی دوێنێ بکەن، تینووی شتی نوێ بوون. ئەوە پێداویستیی سروشتیی رۆحی مرۆڤە کە لە شتی دووپاتە وەڕەز دەبێ و بە دای ڕووداو و دیمەنی نوێدا دەگەڕێ. بۆیە پێ نانە عەرزی حەرامی بەندییەک ئاوەها سەرنجی هەزاران کەسی بۆ لای خۆی راکێشابوو. تەنانەت ئەگەر پزیشکێک بەوێندا رابردبا سەرەڕای ئەوەی بۆی هەبوو بەوێدا تێپەڕێ، هێشتا بە ڕووداوێک لە قەڵەم دەدرا. چونکە بەهەرحاڵ کارێک دەکرا کە ئەو هەموو ئاپۆرایەی لێ مەنع کرابوو. ترایێن دەیزانی هەزاران چاوی تێبڕاون و دەشیزانی لەهستانییەکانی ناو بورجی پاسەوانیش بە سەرسوڕمانەوە چاویان لێیەتی، بەڵام هەروا دەڕۆیی. ترایان تەنیا بەو هەنگاوانەی کە نیشانەی بڕیاری لێبڕاوانەی کەسێک بۆ

تێپەڕین لە هەموو کەند و کۆسپێک بوون، نەدەچووە پێشەوە؛ بەڵکو هەنگاونانەکەی لە هەمان کاتدا کە قورس و قایم بوو، خۆ بادانی هەنگاوی مرۆڤێکیش بوو کە چێژێکی زۆری لە ژیان وەردەگرت، بەڵام ترایان کۆرۆگا چێژی لەو هەنگاونانە وەرنەدەگرت. دەیزانی هەستێکی دەروونی بەرەو ئەو کارەی پەلکێش دەکا، بۆیە هەنگاونانەکەی وەک ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێل یان هەنگاونانی ئەو کەسانە نەبوو کە کوێرکوێرانە هەموو چێژ وەرگرتنێک لە خۆیان حەرام دەکەن. ترایان بە چاوی ئاوەڵاوە ملی نابوو. بێ چاویلکە بە زەحمەت پێش خۆی دەدی، بەڵام چاوی هۆش و دڵی چاک دەیبینی و بەو چاوە ڕێگاکەی، ئامانجەکەی و خەم و خۆشییەکانی خۆی دەدیتن. ئەگەر مەخلووقێکی دیکەش خاوەنی چاوی دڵی لەو چەشنە بایە، خەمێکی قووڵ، بەڵام تەنکی لە هەنگاونانی ترایان بە سەر لمی ڕێگاکەدا و بەرەو تێلبەند و ئێشکگری ئۆردووگا دەبینی. ئەوە پەژارەی مرۆڤایەتی بوو دوور دەکەوتەوە. زۆر دوور دەکەوتەوە، بەڵام چاوێکی وا بتوانێ خەمێکی وا بخوێنێتەوە لەوێ نەبوو. چاوی حەسحەسە لەهستانییەکە و چاوی بەندییەکان هەر ئەوەندەیان دەدی کە ترایان خەریکە لە تێلدڕەکان نزیک دەبێتەوە. ئەو کارە قەدەغە بوو. دەبایە لانیکەم مەتر و نیوێک لە تێلدڕک بکشێنەوە. زیندانییەکان دەستیان کردنە ساباتی چاوان هەتا بچووکترین هەڵسوکەوتی ترایان نەبوێرن. هەندێک وەک چۆن مرۆڤ لە کاتی تەماشاکردنی پێشبڕکێیەکی خۆش یان سەیر کردنی فیلمێکی پڕ لە ڕووداو و یا خوێندنەوەی کتێبی پۆلیسدا، لە حەژمەتان نینۆکی دەستیان دەکرتاندن. کابرای لەهیستانی لە سەر قوڵغی پاسەوانییەوە بڕوای نەدەکرد ئەوی دەیبینی ڕاست بێ. ڕەنگە ئەویش ویستبێتی نینۆکی دەستی بکرتێنێ، بەڵام چەکی لە ناو دەستیدا بوو. هەر دەستی بەرز کردەوە چەکەکەش لەگەڵی بەرز بۆوە.

کوتوپڕی بیری کەوتەوە کە پێی سپێردراوە هەر کە بەندییەک لە تێلبەند نزیک بۆوە تەقەی لێبکا. بەم جۆرە پەنجەی بە پەلاپیتکەوە نا.

گوللەیەک دەرچوو. لە کاتی ئاگردانیدا بوو کە بە هەڵەی خۆی زانی. لەهیستانییەک بەبێ سێرە لێگرتن هاویشتبووی، بەڵام یەکێک کە تەقە دەکا دەبێ سەرەتا سێرە بگرێ. یاسا وای دەگوت و ئەویش چاک شارەزای یاسا و ڕێسا بوو. تەنانەت نەستیشی ئەو یاسا و ڕێسایانەی دەزانی. بۆیە هەر لە خۆوە هەڵەکەی ڕاست ببۆوە، لەگەڵ جاسووسەی تفەنگەکەی جووت کرد. ترایان گوێی لە تەقەی یەکەم بوو و بێ ناوبڕ هی دووەمیش، ئاورینگێک بە پێش چاویدا تێپەڕی. ئینجا شەکەتییەکی گەرم و خۆشی لە لەشیدا هەست پێکرد. وەک بە هەوای بەند و بەستەڵەکی زستان خۆی خزاندبێتە ژوورێکی گەرموگوڕ و گڵاسە شەرابێکی گڕداری خواربێتەوە وا بوو. هەستی بەود کرد شتێکی گەرمی بە دەستیدا دێتە خوارێ. پاشان لەشی هەڵلەرزی. ئینجا کەوتە سەر عەرزی گەرمی پەنا تێلبەندەکان. بەبێ هیچ دەنگ و هەرایەک، وەک جلێ کە لە جلکاوێز بەر دەبێتەوە، کەوتە سەر زەوی.

ترایان سەیر زگی بە لەشی خۆی سووتا کە وا بێ جووڵە لە سەر خاک کەوتبوو. ئەو جەستەیە باشترین هاوەڵی بوو. ترایان لەو لەحزەیەدا تێگەیی کە چەندی خۆش ویستووە. ئەمجا بیری لە نوورا و لە باوکی کردەوە کە ئەوانیش بە قەد بەدەنی هاوەڵی بوون. وێنە نوورا، وێنەی دایکی، هی یوهان، هی گیۆرگ دامیان و چەند وێنەی دی پاش ئەوەی ڕەنجی ڕۆحی ترایانیان ڕاکێشا، بەر بوونەوە. وەکو تابلۆی شێوەکاری بە هەڵکێشانی ئەو بزمارەی لە دیواری قایم کردوو، دەکەوتنە خوارێ. بە بەربوونەوەی ترایان ئەو وێنانەش گشتی بەربوونەوە. ڕۆحی ئیدی نەیدەتوانی هیچ زیندەوەرێک ببینێ. هێزی ئەوەی نەمابوو. دوا ئەندامی جەستەی کە شوێنەوارێکی ژیان و بەربەرەکانی لەگەڵ مەرگی تێدا مابوو، سەری بوو کە بۆ ماوەیەکی کورت هەروا لە حەوا ڕاگیرابوو. نێوچاوانی بۆ چرکەیەک لە سەر خۆڵەکە هەڵگرت، بەڵام دیسا لە بن سەریدا کەوتەوە زەوی. سەری لە نێو خاک ڕاکرد. دەتگوت لە نێو خاکەکەدا لە

بیرەوەرییەکانی دەگەڕێ. ترایان دەیزانی لەو ساتەوەختەدا گەرەکیەتی چ بڵێ، بەلام هیچی نەگوت. نزایەک کە زۆری حەز لێدەکرد. خوێندنی ئەو نزایەشی وەک هەموو خەونەکانی دیکەی وەدی نەهات. نزایەکی کورت بوو. ئەگەر چەند سات، تەنیا چەند ساتی بە دەستەوە مابا وێکڕا لەگەڵ راینا ماریا ریلکە[1]دا دەیگوت:

ئەی خاکی خۆشەویست

بێ ناوونیشان رووم لە تۆ ناوە

لە رێگایەکی دوورەوە.

ڕوخسار و لێوەکانی وەک پێتی خوێن سوور و پڕ لە خولیا و خۆشەویستییەکی دەروونی لە خاکی گەرم خشا. یوهان مۆریتس لە حەوشەی ئۆردووگا راوەستابوو. خەریک بوو لە بانگ بدا، بەلام توند دەستی بە دەمیەوە گرت و کڕ بوو. کەس بۆی نەبوو هاوار بکا. چاوی لێکنان و خاچێکی رەسم کرد.

## (١٦٢)

چوار رۆژ دوای مەرگی ترایان، یوهان مۆریتس نامەیەکی سۆزانای پێگەیی. سۆزانا نووسیبووی:

"یانیی خۆشەویستم، رەنگە تۆ پێت وا بێ من مردووم. نۆ ساڵی رەبەقە نە ئەمن هەواڵی تۆم هەیە و نە تۆ هەواڵی من دەزانی. زۆر جار لە بەر خۆمەوە گوتوومە نەماوی. چەند جار ویستوومە لە کڵێسە نوێژووی مردووت بۆ بکەم، هەر وەک ئەو نوێژە کە بۆ مردووان دەکرێ، بەلام نەمدەکرد. دڵم خەبەری دابوو کە تۆ نەمردووی و ئێستا زۆر خۆشحاڵم کە نوێژی مردووم بۆ نەکردووی. چونکە نوێژی مردوو بۆ زیندووان شومی خراپە. بەڕێز برۆسە ئەندامێکی خاچی سووری سویسرا ناونیشانی

---

١- شاعیری رۆمانتیکی ئەڵمانی.

تۆی دامێ. ئەو پێی گوتم کە تۆ چەندین ساڵە لە گرتووخانەی. من زۆر شوکری خودام کرد کە تۆی لە نەبوو داینەوە. چەندین جار لە بارەگای خوا پاڕامەوە ئەوی سەبەبکاری گرتنی تۆ بوون بیانباتە سەر کڵەی جەحەندەمێ، چونکە ئەتۆ نە دزی و نە پیاوکوژ. ئەان بەبێ سووچ و تاوان لە زیندانیان کردووی. دەبێ زۆر شتت بۆ بگێڕمەوە. لەو ساڵانەی دواییدا زۆر شتمان لەسەر هاتووە کە بە نامە ناگێڕدرێتەوە. تۆ دڵنیام لەوە تووڕە دەبی کە من ئێستا لە ئەڵمانیام. دەزانم ئەوەشت پێ ناخۆش دەبێ. ماڵ و حاڵ و مووچە و مەزرام بە جێ هێشتووە و منداڵم هێناونە وڵاتی غەریبی. بۆیە دەمەوێ بەسەرهاتەکەت بۆ وەگێڕم.

تۆ دوو ڕۆژ پاشی جێژنی پاک ڕۆیشتی. خەڵکی دێ دەیانگوت جەندرمەکان بە زەبری تفەنگیان بردووی، بەڵام من باوەڕم پێنەدەکردن، چونکە ئەوەی تۆ لە هیچدا نەبووی. چوار حەفتەش تێپەڕیبوو، هەموو ڕۆژێ نانم دەکرد و دەمگوت دێتەوە. دەمگوت بە زگی برسی دەگەڕێتەوە. کە نانەکە دەمایەوە دەمدایەوە منداڵان و نانی دیکەم دەکرد بۆ ئەوەی کە هاتییەوە نانی گەرم بخوی. نازانم بۆ، هەمیشە دڵم دەیگوت تۆ دێیەوە. هەموو ڕۆژێ چاوم لە ڕێگا بوو. دەمگوت لەوانەیە بە شەو بێیەوە، بۆیە شەوانە دەرگەم گاڵە نەدەدا، هەتا لە پشت دەرگا نەمێنییەوە، بەڵام یانی خۆشەویستم، تۆ هەر نەهاتییەوە. ئیدی نانم بۆ نەکردی، چونکە ئاردمان لێ بڕا، بەڵام هەر چاوەڕوانت بووم. ڕۆژێکی تەڕی بەهارێ، دەوروبەری جێژنی پاک، سەرۆکی ژاندرمان هات و گوتی تۆ جوولەکەی و ماڵەکەت دەستی بە سەردا دەگیرێ. ئەوەشی پێ گوتم ئەگەر کاغەزێک، کاغەزی تەڵاق وەرگرتن لە تۆ ئیمزا بکەم ئەوا ماڵەکە دەبێتە هی من و منداڵەکان. منیش ئیمزام کرد، بەڵام تەڵاقم لە تۆ وەرنەگرتووە. هەر چاوەڕوانت بووم.

کە رووسەکان هاتن مامۆستا کۆرۆگا و خەڵکێکی زۆریان گوللەباران کرد. من و ئاریستیزیان دایکت بڕیارمان دا قەشە لە دارستاندا بشارینەوە.

لە ڕێگایە تووشی کاروانێک ماشێنی ئەڵمانەکان بووین و مامۆستامان تەسلیمی وان کرد تا بیبەنە نەخۆشخانە. نازانم کارێکی باشمان کرد یان نا بەڵام نەدەبوو لێبگەڕێین مامۆستا بمرێ. بۆ سبەینێکەی مارکۆ گۆڵدنبێرگ لە سەر ئەوە بە گوللە دایکتی کوشت. ئەوان دەیانویست منیش بە دەردی وی بەرن، بەڵام من زوو ڕوبوومە منداڵان و هەڵاتم. هەتا توانیم لە چنگی ڕووسان هەڵاتم، بەڵام ئاخیرەکەی لە ئەڵمانیا کاتێ شەڕ براوە کەوتمە دەستیان. گوللەبارانیان نەکردم. بە پێچەوانەوە زۆر لەگەڵم بە باشی جووڵانەوە، ئەوان نان و چوکلێتیان دایە منداڵەکانت، لەبەر ئەوەی منداڵی ئەڵمانان نەبوون. تەنانەت منیش هێندێکم لەو نانو جلوبەرگەی دەدرایە ڕووسەکان پێ برا. ئەودەم خەفەتم لەوە دەخوارد کە لەبەر ڕووسان لە فانتانا هەڵاتووم. چوار ڕۆژ تێپەڕی. چاوەڕێ بووم چاک بمەوە، لەبەر ئەوەی نەخۆش بووم. دەمەویست هەر زوو بگەڕێمەوە گوندەکەی خۆمان. شەوێ یەکێک لە پەنجەرەی دا. سەربازانی ڕووس بوون. دەرگەیان لە گرێژەنە برد و وە ژوور کەوتن. کون بە کون لە ژنان دەگەڕان. کچی خاوەن ماڵەکەیان دیتەوە و هێنایان. ئەو کچە چاردە ساڵە بوو. ئینجا مەشروبیان بۆ هێنایین. دەمانچەیان لە سەر ڕاگرتین ئەگەر نەخۆنەوە دەتانکوژین. پاشان لە سەریان کردین ڕووت بینەوە. ڕووت و قووت. منداڵەکان هەر دووک لەودیو بوون. لەبەر خۆمەوە گوتم بمرم باشترە لەوەی خۆم ڕووت بکەمەوە. سەربازەکان تەنوورە و کراسەکەیان لەبەر دادڕیم. پاشان دەستدرێژییان کردە سەر من و کچەکە. تا کازیوەی بەیانی بە نۆرە خەریکم بوون. چونکە مەشروبم نەدەخوارد بە زۆری بە گەروویاندا دەکردم، دوایە لە گوێشیان کردم. بمبوورە یانی گیان کە ئەو شتانەت بۆ دەنووسم. ناتوانم هیچت لێ بشارمەوە. کاتێ وە هۆش خۆم هاتمەوە ڕووسەکان ڕۆیشتبوون و منداڵەکان وەک لە دەوری جەنازەیەک بن ئاوا دەیانزیڕاند.

شەوی دواتریش رووسەکان سەر لە نوێ هاتنەوە، هەمان دەستوور دەستیان پێ کردەوە. دیسان کچی خاوەن ماڵیان هێنا و بە زۆر لە زەوییان داین. کە رۆیشتن منداڵەکانم دەست دانێ و لە ژێرزەمینێک خۆم شاردەوە، بەڵام دیتیانمەوە و شەوی سێهەمیش ئەو کارەیان لەگەڵ کردین، بەڵام ئەوێ شەوێم هیچ بە بیر نەماوە، چونکە هەر دەستیان کردمێ من دڵم لە خۆ بۆوە. دوو حەفتەی رێک ئەو بەزمە بوو. چەند جار لە سەربان و لە کوگا و لە قوونەبانی ماڵێ خۆم حەشار دەدا، بەڵام هەر زوو دەیاندیتمەوە. یەک شەویش نەمتوانی لەبەر دەستیان قوتار بم. چەند جار ویستم خۆم بکوژم، بەڵام کە تەماشای منداڵەکانم دەکرد، دەستی ئەوانم کوورِ بوو. خۆ باوکیشیان نەبوو. باشە ئەو تفیلە بەستەزمانانە لە وڵاتی غەریبایەتی چییان بەسەر دەهات؟ من ئێستا ئەگەر ماوم لە پێناوی ئەوانە و لەو رۆژەوە بۆخۆم مردووم. ئینجا لە چنگی رووسان رامکرد و رووم کردە رۆژئاوا. سەرەتا چوومە لای ئینگلیزەکان و دوایەش لای ئەمریکییەکان. ئێستاش لای ئەوانم. لە رێگادا چەند جاری دیکەش لە داوی رووسان کەوتم و هەموو جارێش لاقەیان کردم، بە بەر چاوی منداڵەکانەوە. پێش ئەوەی بگەمە ناوچەی ئینگلیزان سێ رۆژ لە دوو دەڤەری سەر سنوور رایانگرتم و شەو و رۆژ هەدایان پێ نەدام. دواجار زگم لێیان پڕ بوو. ئێستا زگەکەم پێنج مانگەیە. پرس بە تۆ دەکەم من چ بکەم؟ بۆ بنووسەوە ئاخۆ دوای ئەو کارەساتەی بە سەرم هاتووە بە ژنی خۆتم دەزانی و دەگەرێیەوە لام؟ من بە چاوی بە فرمێسکەوە بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەروانی وەڵامی تۆم تا بزانم دەبێ چی بکەم؟ سۆزانا

یوهان نامەکەی تا کۆتایی خوێندەوە، بەڵام هەروا بە دەستییەوە بوو. وەک لە خەودا بێ، زرینگەی زەنگی فراوینی کەوتە بەر گوێ. لە جێی خۆی نەبزووت و هەروا لەسەر قەرەوێڵەکەی مایەوە. روانینی، ئەوی لە چاو لێکردنی‌را دەخوێنرایەوە و جۆری راکشانی لە سەر تەختەکە... بە جاری پاکی گۆرابوو. ئیدی یوهان مۆریتسس دەمێ دی نەبوو. ببووە

کەسێکی دی. رۆح و جەستەی وەک تەلێک بوو کە وزەی بەهێزی کارەبای پێدا رەت بووبێ. خۆڵەمێشێکی کەم نەبێ چی تری لە وجوودی بۆ نەمابۆوە. یۆهان مۆریتس، نەمابوو. دەرزیشیان لە قالبی راکردبا بێگومان ئاگای لێنەبوو. نە دەیزانی برسیەتی چییە و نە تینویێتی. لە یەک کاتدا دەیتوانی بگری و پێشبکەنێ. چونکە ئیدی هەستی بەوە نەدەکرد سەرێکی زیندووی پێوەیە. راست بۆوە و لە خێوەتەکە دەرپەڕی. بێ-ئەوەی بزانێ دەچێتە کوێ سەری خۆی هەڵگرت.

دوور و نزیکی تێلبەندەکان، بێئەوەی نیازی بێ و بە گوێرەی راهاتن، راوەستا. ئەگەر لەوێ تێپەڕیبا وەک ترایان کۆرۆگا دابێژ دابێژیان دەکرد. بەڕاستی پەکی پێ نەکەوتبوو، بەڵام حەزی لەوە نەبوو لە تێلبەند تێپەڕێ، هەر وەک زیندوومانەوەشی مەبەست نەبوو. ئیدی هیچ شتێکی مەبەست نەبوو.

لەو دیوی تێلدڕووەکان دوو ئەمریکی خەریکی وێنەگرتن بوون. یۆهان لە جێی خۆی نەبزووت. هیچ ئاگای لە سەربازەکان نەبوو، بەڵام کاتێ سەربازێکی دیکە هاتە پێشەوە وە خۆی هاتەوە و بە دەنگێکی کزەڵۆکە گوتی: "سیترۆڵ تۆ لێرە چی دەکەی؟"

سەربازە ئەمریکییەکە سەری سوڕما. لە کاتێکدا رووی کامێراکەی لە یوهاندا بوو چاوی لێ چکۆڵە کردنەوە و لێی ورد بۆوە. سیترۆڵ بوو. هەمان کارمەندی نووسینگەی ئۆردووگای جوولەکان لە رۆمانیا. سیترۆڵ، هەر ئەو کەسەی لەگەڵ دکتۆر ئابرامۆڤیچی، پێکەوە هاتبوونە بوودایێست. یوهان و سیترۆڵ یەکتریان ناسیبۆوە.

کاتێ یوهان مۆریتس بۆ دووەم جار گازی کرد، سیترۆڵ کامێراکەی بە چاویەوە نا و خۆی لە پشت کامێراکەدا شاردەوە و وای نیشاندا کە وێنەی یوهان دەگرێ. یوهان هەروا کە لە پشت تێلبەندەکان راوەستابوو چاوی لێبوو کە سیترۆڵ و دوو جوندییە ئەمریکییەکە سواری جێبێک بوون و لێیاندا رۆیشتن، بەڵام کاتێ مەودایەک دوور کەوتنەوە سیترۆڵ

ئاوڕێکی دایەوە ئەو جێگایەی یوهانی لێ ڕاوەستابوو. کەچی بە پەلەپرووزێ ڕووی لێ وەرگێڕایەوە. یوهان لە دڵی گران نەهات. ڕۆژان بوایە و هەڤاڵێکی کۆنی، خۆی لێ خەشیم کردبا دینی پێنەدەما.

یوهان تا شلوکوت بوو لەوێ ڕاوەستا. لەناکاو دەستێکیان لە شانی دا. "مۆریتس خۆت حازر کە دەڕۆین."

یوهان ئاوڕی دایەوە. پێی وا بوو ئازاد دەبێ. بریسکەی هیوای لە چاوان هەستا. لە سەردەستەکەیانی پرسی: "ئازادم دەکەن؟"

"نا، بە داخەوە موریتس."

"ئەدی دەمانبەنە گرتووخانەیەکی دی؟" "دەمانبەنە نۆرنبێرگ[1]."

یوهان بە شێوەیەکی وا کە گوایە پەکی پێنەکەوتووە، سەری بادا. لە مێژ بوو دەیزانی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەگەڵ ئەفرادی ئێس.ئێس خراوەتە لیستی تاوانبارانی شەڕەوە. ئاسایی بوو ئەویشیان دەبردە نۆرنبێرگ. ئەو جێگایەی تاوانبارانی وەک گۆرینگ، ڕۆدۆڵف هێس، ڕۆزنبێرگ و کەسانی دی لێ گیرابوون. ئێستا گوێی بە هیچ نەدەبزووت. تەنانەت ئەگەر لە سێدارەشیان دابا، پەتیان لە ملی کردبا یان بە هەر ئامرازێکی دی کوشتبایاتن. بە نێو تێلدڕکاندا دوو جار چاوی لە ئاسۆ بڕی. سەردەستەکەیان دەستێکی لە شانی دا و گوتی: "نیو کاتژمێری دی وەڕێدەکەوین."

یوهان چرتەی نەکرد.

"زوو کەلوپەلان تێکنێ، دەرفەتمان کەمە. سەری کاتژمێر یەکی نیوەڕۆیە دەڕۆین."

"من هیچ کەلوپەلم نین."

"یەعنی هیچت نییە بیهێنی؟"

"هیچ."

---

١- نۆرنبێرگ: شارێکی ئەڵمانیا کە دوای بڕانەوەی شەڕ و داگیرکردنی ئەڵمانیا بوو بە شوێنی دادگایی کردنی تاوانبارانی شەڕ.

"بەتانییەکەشت ناهێنی؟"

"نا."

سەردەستە لە لای خۆیەوە وای بە خەیاڵدا هات ئەگەر یوهان بەتانییەکەی نەوێ، لەوەی وێوە دەبێتە خاوەنی دوو بەتانی و خەوی خۆشتر دەبێ، بەڵام هەر زوو ئەو بیرە خۆپەستانەیەی لە خۆی پرینگاندەوە و گوتی:

"تۆ دەبێ بەتانییەکەت بهێنی. زیندانی نۆرنبێرگ سارد و شێدارە. لەوێ دوور بکەوێتەوە گوتی: "کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ دەکەوینە رێ."

یوهان دیسانیش هەر لە جێی خۆی نەبزووت. لە جێی خۆی چەقیبوو و نووکی پێی لە سەر لەو هێڵە سپییە دانابوو کە شوێنی قەدەغەی بۆ بەندییەکان دەستنیشان دەکرد.

سەری کەڵەموستی پێی بە ئەسپایی جووڵایەوە و لە هێڵە سپییەکە تێپەڕی. یوهان سەری هەڵبڕی. کابرای پۆڵۆنی لە بورجی دیدەوانییەوە چاوی تێبڕیبوو. یوهان هێڵە سپییەکەی نەبەزاند. هەروا لەوێ راوەستابوو و قامکی لاقی بە خەتە سپییەکەدا دەهێنان. یوهان وێڕای "تاوانبارانی شەڕ"ی ئۆردووگا بەرەو نۆرنبێرگ بەرێ کەوتبوو. نامەی سوزانا و کەل-وپەلی یوهان لە خێوەتەکەدا بەجێ مابوو. هاوڕێکانی هەوڵیاندا نامەکە بخوێننەوە، بەڵام پێیان نەخوێندرایەوە. نامەکە بە زمانی رۆمانی نووسرابوو و سەریان لێ دەرنەدەکرد. پەڕی کاغەزەکە زۆر تەنک بوو. زیندانییەکان کردیانە چەند پارچەی بچووک و بە نێو خۆیاندا دار و پەخشیان کرد. پاشان جغارەیان لێ هەڵپێچاو تێکڕا دووکەڵیان بە با دا.

# بەشی کۆتایی

## ئینتەر میتسۆ

دواجار یوهان مۆریتس لە زیندان بەربوو. سێزدە ساڵی رەبەق لە بەنددابوو. لەو ماوەیەدا گەلێ گرتووخانەی دیتوون. ئێستا ژن و منداڵەکەی دۆزیوەتەوە. کاتژمێر دەی شەوێیە. یەکەم نانی شەوە لەگەڵ بنەماڵەکەی دەیخوا. یوهان لە نان خواردن بۆتەوە و ئێستا لە سووچێک دانیشتووە و لە منداڵەکانی راماوە. چاوی لە پیتەر بڕیوە کە ئێستا پازدە ساڵەیە و چاوی لێ ناترووکێنێ. بە دەستان چاوی خۆی هەڵدەگلۆفێ تا دڵنیا بێ ئەوەی دەیبینێ خەون نییە. لەگەڵ ئەوەشدا بڕوا ناکا ئەوە کوڕی وییە، هی یوهان مۆریتس بێ. پیتەر چاکەتێکی شینی ئەمریکی لەبەردایە. سیغار دەکێشێ. دوو چاوی لە چەشنی چاوی بابی پێوەن. پیتەریش بڕوا ناکا ئەو پیاوە رەقەڵە قژ ماش و برنجەی لە پەنای دانیشتووە باوکی بێ، بەڵام بەهەرحاڵ هەر دووکیان دانیشتووی ناو یەک ژوورن، بۆیە هەوڵدەدا خۆی لەگەڵ رێک بخا.

"ئەمن قسە لەگەڵ سەرۆکەکەم دەکەم... لەوانەیە بتوانم لەو کارخانەیەی من کاری تێدا دەکەم، کاریکیش بۆ تۆ بیبینیتەوە."

پیتەر ئەو قسەیەی وەک کەسێک کرد کە سەری کیسەی خێرۆمەندیی کردبێتەوە. یوهان زەردەخەنەی دێتێ.

"ئەگەر من پێ بڵێم سەرۆکەکەم دڵنیام قەبووڵی دەکا. دیارە ئەو کرێکاری نەشارەزا دانامەزرێنێ، بەڵام ئەگەر پێی بڵێم باوکی منی خاترما دەگرێ."

یوهان ئێستا چاوی لە نیکۆلای دووەم بڕیوە. نێکۆلای چۆتەوە سەر دایکی. وەک وی سوور و سپی و ناسک و نەرمونۆڵە. ئینجا یوهان سەیری منداڵەکەی دی دەکا. ئەو منداڵە چوار ساڵانەیە، لە یوهان نییە.

بەڵکو بەرهەمی کەیف و نەهەنگی رووسانە. یوهان سۆزانای بەخشیوە. ئاخر خەتابار نەبووە. یوهان سیغارێک هەڵدەکا. هەر کە گەیشتبۆوە، پیتەر پاکەتێکی دابۆیێ. یوهان زۆر هیلاکە، بەڵام هیچ حەز ناکا بخەوێ. ژوورەکە تەنیا دوو قەرەوێڵەی لێن. سۆزانا و منداڵە چکۆڵەکەی لە سەر قەرەوێڵەیەک دەنوون و ئەویش بە تەنیا لە سەر قەرەوێڵەیەک. کوڕەکانیش لە عەرز جێگای خۆیان رادەخەن.

پیتەر دەڵێ: "جارێ قەیدی نییە. دوایە ژوورێکی دیکەش بە کرێ دەگرین، یان چرپایەک دەکڕین."

کوڕەکان جێیان راخستووە و وا خەریکن بەرگیان دادەکەنن. یوهان هێشتا لە پەنا مێزەکە دانیشتووە و خۆ کوشم هەڵێناوە. بە وردی سەرنجی داوەتە هەڵسوکەوتی پیتەر و نیکۆلای. بە زمانی ئەڵمانی "شەوباش" بە باوکیان دەڵێن. ئەگەر بە زمانی رۆمانیایی پێیان گوتبا، یوهان پتریش خەنی دەبوو، بەڵام ئەوان رومانیاییان بە سەر و گوێ شکاوی دەزانی.

سۆزانا منداڵە چکۆڵەکەی خەواند. یوهان لەبەر خۆیەوە دەڵێ: "بەچکە رووس."

منداڵێکی جوانە. قژی زەرد و دڵڕفێنە. بەڵام یوهان لێی نەبانە. لە نامەیەکدا لە ئۆردووگاوە بۆی نووسیبوو کە ئەو منداڵە بە فرزەندی خۆی دەزانێ. لەگەڵ ئەوەشدا سۆزانا کە دەزانێ یوهان چاوی لە منداڵە قژ زەردەکەیەتی، خەفەتی پێوە دەخوا. منداڵەکەی لە جێگا رۆدەکا، وەک ئەوەی بیهەوێ حەشاری بدا. بۆ ساتێک، سۆزانا لە ناوەڕاستی ژوورەکە لاقان دەگرێتەوە. بێئەوەی بزانێ دەبێ چی بکا. ئینجا بەرامبەر بە مێردەکەی لە پەنا مێزەکە دادەنیشێ. دەزانێ یوهان شل و شەکەتە، بەڵام ناوێرێ پێی بڵێ بنوو. سۆزانا لەمەڕ هەموو ئەو شتانەی روویانداوە خۆی بە خەتابار دەزانێ. گرتن و ئەو هەموو ساڵەی زیندان. ئەو بیرە وەهای رەگ لە گیانیدا داکوتاوە ناتوانێ خۆی لێ دەرباز بکا.

تەنانەت کە رووسەکان ئەو پەندەیان بەسەر هێنا، ئەوەش بە گوناهی خۆی دەزانێ. بەرگەی سەیرکردنی یوهان ناگرێ. سۆزانا هەواڵی هەبوو دێتەوە. چێشتی بۆ لێنابووو قەرەوێڵەی بۆ ئامادە کردبوو. یوهان کە هاتەوە هێندە برسی بوو ئەوی وەبەر دەستی کەوت لرفی دا و نیوێکی جغارەکانی پیتەریشی کێشان.

منداڵەکان نوستوون. سۆزانا سەری هەڵدێنێ. نیگایان تێکدەئالقێن و بۆ ساتێک تێکدەگیرسێن. دیارە ناتوانن لێک جیا ببنەوە.

"ئەوە هەر هەمان کراس نییە کە ئەو شەوە لە بەرتدا بوو؟"

"یوهان چاوی بڕیوەتە کراسە کراسە شین و یەخە تەسکەکەی. ئەوە هەمان کراسە کە سۆزانا لە شەوی کوژرانی دایکی بە دەستی یۆرگ یۆردان لەبەریدا بوو. هەر بەو کراسەوە یوهان هەڵیگرتبوو، بردبوویە لای دایک و بابی، ئاریستیزیاش راینەگرتبوو. هەر بەو کراسەوە بردیە هۆدە بچووکەکەی ماڵی قەشە کۆرۆگا. سەرەتا سۆزانا هەر ئەو کراسەی هەبوو. دەیشورد و لەبەری دەکردەوە. شەوانەش دایدەکەند و بە رووتی دەخەوت. دوای ماوەیەک کراسێکی دیکەی بۆخۆی دروو، بەڵام ئەو کراسە شینەی وەک باشترین و جوانترین کراس هەر راگرت. مێردەکەشی زۆری ئەو کراسە پێ جوان بوو. ئەو ماوەیەی سۆزانا ئەو کراسە شینەی هەبوو، خۆشترین و جوانترین ساتەکانی تەمەنی خۆیان رابواردبوو.

"کاتێ تۆ لە فانتانا نەمای، ئیدی ئەم کراسەم نەکردەوە بەر. سوێندم خوارد تا تۆ نەگەڕێیەوە لەبەری ناکەم. سێزدە ساڵ ئەو کراسەم لەگەڵ خۆم گێڕا. چونکە هەمیشە چاوەڕوانت بووم. ئەورۆ ئەوە دووبارە دە بەرم کردۆتەوە. سۆزانا دوای ئەو وتانە چاو لە زەوی دەبڕێ. شەرم دەکا، بەڵام دیسان سەری هەڵدێنێ و نیگایان تێکهەڵدەنگوونەوە. یوهان زۆری پێ خۆشە سۆزانا لە سەر کۆشی خۆی دابنێ و بە گوێیدا بچرپێنێ: ئۆخەی سۆزانا، دەزانی دڵم چەند بۆی دەکورکاندی، بەڵام هیچ

ناڵێ. جغارەیەکی دی دادەگیرسێنێ. چاوی بە منداڵەکان دەکەوێ کە خەوتوون. چاوێکی دی لە سۆزانا دەکا. سۆزانا هیچ نەگۆڕاوە. دیارە وردە گنجی کەوتوونە دەموچاوی، قژی تاڵی سپییان تێکەوتووە و مەمکی کەمێک داچۆڕاون. لەگەڵ ئەوەشدا هەمان سۆزاناکەی جارانە. یوهان قەت پێی وا نەبوو جارێکی دی چاوی هەر بەو سۆزانایە بکەوێتەوە، سۆزاناکەی فانتانا، سۆزانای سێزدە ساڵ لەمەوبەر.

بە سۆزانا دەڵێ: "دەمەوێ پیاسەیەک بکەم."

"دەکرێ دەگەڵت بێم؟"

یوهان وەڵامی ناداتەوە، بەڵام رادەوەستێ سۆزانا باڵاپۆشەکەی هەڵگرێ. بە پێدزە لە ژوورەکە دەچنە دەر بۆئەوەی منداڵەکان وە ئاگا نەیەن. کەم تا کورتێ شەرم لێکدی دەکەن. کاتێ بە پلیکانانددا دادەگەڕێن دوو جار شانیان بەر یەک دەکەوێ. تا ماوەیەکی زۆر هیچ ناڵێ. شەوەزەنگە. یوهان حەز دەکا شەقامی سەرەکیی شار ببینێ. سۆزانا چاوساغیەتی. لە پێش جامخانەیەک سۆزانا دەستی یوهان دەگرێتە ناو دەستی خۆی و دەیهەوێ ئەو پێڵاوەی پێ نیشانبدا کە بە تەمایە بۆی بکڕێ. دیسان ملی رێگا دەگرنەوە، بەڵام دەستیان هەروا لە ناو دەستی یەکتردایە. لە گەڵێ جامخانانەوە رادەمێنن. تا ئەو ساتەوەختە بە یەک وشە نە باسی گرتووخانەیان کردووە نە ئی ماڵ و حاڵیان لە رۆمانیا و نە هی رابردوو. دەیانەوێ بەبێ کولاندنەوەی برینان و بیر خستنەوەی یادەوەریی تاڵ، ئەو شەوەیان بەسەر بەرن.

"دوو رۆژ دەحەسێمەوە، ئینجا وە دوای کار دەکەوم."

بەم جۆرە یوهان سەری قسان دەکاتەوە: "لەوانەیە پیتەر بتوانێ لە کارخانەکەیان کارێکم بۆ بدۆزێتەوە."

"تۆ دەبێ تا چەند هەفتەیەک بحەسێیەوە، پاشان بە کاوەخۆ بە دوای کارێک دەکەوی. تۆ هێشتا زۆر کز و بنێسی. من و پیتەر داهاتمان هەیە. من کڕیاری چاکم هەن. توندتر دەستی یەکتری دەگوشن. یوهان بەوە

شادی لە دڵی دەگەڕێ کە سۆزانا لە خەمیدایە و دەیەوێ چەند هەفتە پشوو بدا. لە شار وە دەر کەوتوون. هەر دووک لای جادەکە مێرگە و تاریکانێکی ئەنگوستەچاوە. یوهان دەڵێ: "دەڵێی فانتانایە." و هەروا دەڕۆن. هەر دووکیان شەوانی فانتانایان دێتەوە یاد. خوێندنی کوندەبوویان دێتەوە یاد. هەر دووکیان بیر لە یەک شت دەکەنەوە.

یوهان خەریکە پێ دەگرێتەوە: "لاقم دێشێ. دەڵێی چی، تۆزێک دانیشین؟"

لەسەر فریزەکە دادەنیشن. یوهان چەند جاری دیکەش دەڵێ: "دەڵێی فانتانایە." پاشان لەسەر گازی پشت رادەکشێ. دەستان لە بن سەری دەنێ. دوای کەمێک وەردەسووڕێ و دەموچاوی لە نێو گیا و گوڵ رادەکا.

"ئەو گیایە بۆنی چەند خۆشە، سۆزانا. هەر دەڵێی گژ و گیای پشت ماڵەکەی ئێوەیە. وەبیرت دێ، ئەو جێگایەی ژوانگەمان بوو؟"

سۆزانا بۆ گیاکە دادەنەوێ. بۆنی پێوە دەکا. دڵی وە تەپوکوت کەتووە. یوهان دەستی لە سەر شانی دادەنێ. هەر بەو حاڵە دەمێننەوە و جووڵەیان لێ دەبڕێ. لێک دەسڵەمنەوە. تەنیا دەستی یوهان بە شانی سۆزانا کەوتووە. زات ناکەن تخونی یەکدی بکەون.

"لە زیندان زۆرم غەریبی دەکردی..."

چەند ئەستێرەیەک لە ئاسمان دادەگرن. سۆزانا تێیان هەڵەڕوانێ و پاشان بێئەوەی یوهان پێبزانێ نەختێکی لێوە نزیک دەکەوێ. سۆزانا شەرمی نەشکاوە. "لێم دڵمەند مەبە سۆزانا، لە زیندان هەمیشە بە رووتی لە خەویم دەهاتی. زیندانی هەموو وان. نامەوێ لێت بشارمەوە، دەزانی، تۆم بە رووتی لەسەر گژوگیا دەهاتە بەر چاو. وەک ئەو کاتە. ئەو هاوینە، خۆشترین ماوەی ژیانم بوو."

سۆزانا پتر دێتە پێش. سەری وە باسکی یوهان دەکا، یوهان دەست بە قۆڵیدا دێنێ. ئینجا بە پشتیدا و دواجار دەست بۆ مەمکی دەبا.

"با کراسە جوانەکەت گنجاوی نەبێ."

سۆزانا دەیەوێ بڵێ گنجاوی نابێ، بەڵام وا ناڵێ.

"کراسەکەت داکەنە. وەک ئەو کاتانەی فانتانا." سۆزانا خێرا کراسەکەی هەڵدەکێشێتە سەر سەری: دەڵێی دەیەو دەموچاوی لێ بشارێتەوە. دوای ساتێک رووت دەبێتەوە. لەشی وەک مەرمەڕی سپی لە نێو گژوگیادا دەبریسکێتەوە. هێشتا لێک دوورن، بەڵام باهۆیەک پڕی پێدا دەکا: "تۆ هەر وەک خۆتی. بە موو نەگۆڕاوی. وەکو ئەودەم، لە نێو باخچەکەدا. باشە چۆنە هیچ نەگۆڕاوی؟"

"وا نییە، من پیر بوومە، تۆ هیچ نەگۆڕاوی."

یوهان زیاتری بە خۆیەوە دەگوشێ. سۆزانا خۆی بڕێک دەکێشێتە دواوە.

"ئێستاش راست وەک ئەودەم لێم دەکشییەوە. دەڵێی هیچ سێزدە ساڵمان نەکەوتۆتە نێوان."

ئەو بیرە بە مێشکی سۆزاناشدا دێ. یوهان دەیکشێنێتەوە لای خۆی.

هەناسەیان تێکەڵ دەبن. یوهان دەیگەوزێنێ. وەکو جاری جاران. سۆزانا بە چرپە پێی دەڵێ: "تۆ بۆنی گژوگیای فانتانات لێوە دێ. تۆ هەمیشە بەرامەی گژوگیا و خەرمای تازەت لە لەشی دێ. من هەمیشە لە بیری تۆدا بووم. سوێند دەخۆم. شەو و رۆژ لە خەیاڵم بووی. سوێندت بۆ دەخۆم. تۆ خورەتاوی من بووی. مێردی من بووی، ئاسمانم بووی. تەنیا تۆ."

یوهان دەزانێ سۆزانا راست دەکا. سۆزانا هەمیشە هی ئەو بووە. تەنیا هی ئەو. گەرمایی لەشی و دڵەتەپە و هەموو شتێ، ئەو راستییە دەردەبڕێ. یوهان دەزانێ بۆ وی وەک هەتاوێکی بە تین وایە. ئاسمانیەتی. دەزانێ سۆزانا تەنیا لە بیری ئەودا بووە و چاوەڕوانی کردووە. یوهان ترسی نەماوە. لەگەڵ هەڵاتنی یەکەم گزنگی خۆر

هەڵدەستن. کەمێک بە خۆیاندا دەشکێنەوە. سۆزانا دەڵێ: "ئێمە خۆ وەک سێزدە ساڵ لەمەوبەر جحێڵۆکەیەک نین، دەبایە زووتر بچینەوە ماڵێ."

یوهان پێدەکەنێ. بڕیار دەدەن سبەی شەویش بێنەوە هەمان جێ. یوهان دەڵێ: "تازە هەموو شەوێ دێینەوە ئێرە. ئێرە دەڵێی فانتانایە. وا هەست دەکەم لە فانتانایین و ئەوەی ڕوویدا، خەون و خەیاڵێک بووە و بەس."

کە دەگەڕێنەوە ماڵێ هەر دووکیان خۆشحاڵن. هەست بە بەختەوەری دەکەن. چیتر نامۆیی لێک ناکەن و شەرمیان لە یەکتر شکاوە. یوهان دەستی دەهاوێتە ناوقەدی. سۆزاناش بە حەز و ڕووی خۆشەوە ڕێی ئەو کارەی دەداتێ.

"من ئیدی هەست بە ماندوویەتی ناکەم. سبەی لەگەڵ پیتەر وە دوای کار دەکەوم. بە خۆڕایی بۆ بێکار بم؟ دوو هۆدە بە کرێ دەگرین. منیش پارە پەیدا دەکەم. وەی کە بەختەوەر دەبین."

لەبەر دەم جامخانەی دوکانێک ڕادەوەستن.

"یەکەم مووچە وەربگرم ملوانکەیەکت بۆ دەکڕم. ئەو یاقووتە سوورانەت پێ جوانن؟ سۆزانا سەرەتا چاوێک لە یاقووتەکان و چاوێک لە یوهان دەکا. نازانێ چی بڵێ. هەر ئەوەندە دەزانێ کە خۆشبەختە. خەونەکانی وە دی هاتوون. یانی گەڕاوەتەوە و دەیهەوێ ملوانکەی بۆ بکڕێ. بە یوهان دەڵێ: "قەت لێک جیا نابینەوە."

"ئەگەر سبەی کارم دەست کەوێ چوارشەممە ملوانکەکەت بۆ دەکڕم."

یوهان سۆزانا لە ئامێز دەگرێ و ماچیدەکا.

"لەماڵێ ناتوانم ماچتکەم. لەوانەیە منداڵەکان پێمان پێبکەنن. پێیان وایە پیر بووینە، بەڵام ئێمە پیر نین، وایە؟ پیر نین." لەبەر دەرگای ماڵەوە ئیڤایەک بە تیشکاوێژی بە هێزەوە ڕاوەستابوو. یوهان دڵی کەوتە خرت و پرت. دەستی بۆ گیرفانی برد. پێناس و بەڵگەنامەکانی پێبوون، بەڵام

هەر دەترسا. ئیڤاکە هەر لەو ئیڤایانە بوو کە لە گرتوخانە دیبتبوونی. هەمان تیشکی بێبەزەیی و زۆردار لە تیشکاوێژییەکانیانەوە هەڵدەستا. یوهان لەوە دڵنیا بوو کە پێناسەکەی یاساییە، لەوەش دڵنیا بوو تیشکی تیشکاوێژی هەموو دنیا وەک یەک وان.

سۆزانا گوتی: "بۆ دەلەرزی؟"ی وەلام نەبوو. پەلەی بوو زووتر بگاتەوە ماڵێ. لە ڕارەوی ماڵێ لووت و بزوت تووشی دوو پاسەوانان هات کە وەدرە کەوتن. منداڵەکانیان لە خەو هەستانمدبوون، بە پیتەریان گوتبوو دەبێ هەموویان کاتژمێر حەوتی بەیانی ئامادەی ڕۆیشتن بن و نابێ لە پەنجا کیلۆش زیاتریان شت پێت بێ. کە یوهانیان دی دووپاتیان کردەوە: "سەری کاتژمێر حەوت دەبێ لەسەر جادە بن." "سۆزانا پرسی: "دەمانبەنە کوێ؟" "هەموو بیانییەکانی خەڵکی ئەورووپای ڕۆژهەلات دەگیرێن. ئەم کارە زیاتر لایەنی سیاسی هەیە. هاونیشتمانەکانی ئێوە هێشتا لەگەل هاوپەیمانان لە جەنگدان. مەترسن، لە گرتوخانە ناخۆشی بەسەر نابەن. خواردنی ئەمریکی دەخۆن. ئەوە زیاتر بۆ ئیحیتات دەکرێ. کەواتە نابێ بترسن. لە ڕاستیدا ئەوە بە گرتن ناژمێرێ.:"

یوهان لە گژفکران ڕاچوو. جارێکیان داوایان لێکردبوو بۆ فەرماندەی سەربازیی شار بگێڕێتەوە کە چۆن پێنج فەڕەنسی ڕزگار کردوون. ئەو دەم بە موو لە ڕاستی لانەدابوو هەر لە سەر ئەوەش چەندین ساڵ زیندانی کرا. ئێستا ئیدی متمانەی بە هیچ کەس و هیچ شتێ نەماوە. هەر ئەو کۆڵەپشتییەی هەژدە کاتژمێر لەمەوبەر لە زیندانی "داخائووو" وە هێنابوویەوە دەست دایە و ویستی ماڵاوایی لە منداڵانی بکا.

کاتێ پیتەر دیتی باوکی خەریکە هەڵێ ملی لە پێکەنین نا. پیتەر ئینگلیزییەکی پاراوی دەزانی و لایەنگری ئەمریکا بوو.

"بابە بۆ کوێ ڕادەکەی؟ دەبەنگ مەبە. من ئەمریکییەکان باش دەناسم و برادەریی ئەمریکیم زۆرن. زۆربەی شەوان پێکەوەین. ئەمریکی کە دڵنیامان بکەنەوە مەسەلەی گرتن و زیندان لە ئارادا نییە، قسەکەیان

راستە. ئەگەر مەسەلەیەکی سیاسی بێ بەشە خۆراکی ئەمریکی، قاوەی حەسڵ، جغارە و چوکلێت و لە هەمووی گرنیگتر کاری زۆرە ملێ لە گۆڕێ نییە. تۆ ئەمریکیت نەناسیوە!"

یوهان بیر لەو شتانە دەکردەوە کە خۆی دەیزانین. ئەوی بەسەری هاتبوو و چێشتبووی. چاوی لە پیتەر بڕی. دڵی نەدەهات خەیاڵە خۆشەکانی لێ تێکبدا. بۆیە دەنگی نەرد و وازی لەباس کردنی ئەزموونەکانی خۆی هێنا. کۆڵە پشتییەکەی لە کۆڵی کردەوە و داینایە سەر مێزەکە.

تۆ راست دەکەی پیتەر. راکردن گەوجێتییە." پیتەر بەمانای هاوڕێیەتی و خۆشەویستی دەستێکی لە پشتی باوکی دا:

"ئێمە وەک خۆبەش دەچینە ناو سوپای ئەمریکاوە. کە رووسەکانمان تێکشاندن دەگەڕێینەوە رۆمانیا ئەوە شەڕی نێوان شارستانییەت و پاشکەوتوویی و بەربەریەتە. بابە تۆش دەبێ ببیە خۆبەخش."

یوهان ئیدی هۆشی لە کوڕەکەی نەبوو. بیر لە تەلە دڕکاوییەکانی داخائوو هێل بروونێکۆرن وێست هایم دارموشتادئۆهردۆرف زیگلهایم، و... تێلبەندی گەلێ زیندانی دیکە دەکردەوە. ئەو زیندانانەی یوهان تێیاندا چەندین جار لە برسان وەختبوو بمری. وای هەستدەکرد تێلدرووییەکی لە دڵی رادەچێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: "تەنیا هەژدە کاتژمێر ئازاد بووم و ئێستا وا گرتوخانەیەکی تر چاوەڕێمە. ئەو جار ئیدی بە تاوانی جوولەکە بوون، رۆمانی، مەجەڕ، ئەڵمانی و ئێس ئێس بوون ناگیریم؛ بەڵکو بە تاوانی ئەوەی خەڵکی وڵاتێکی ئەروپای رۆژهەڵاتم."

چاوی پڕ بوون لە فرمێسک.

"بابە بە تەمانی کەلوپەلان تێکنێی؟"

هەیاڵی سەفەر پیتەری خستبووە سەر زەوق.

یوهان وەڵامی دایەوە: "من سازم. سێزدە ساڵە جگە لە گوێزەگوێز چی دەم نەدیوە. لە ئەردوگاکەوە بۆ ئۆردووگایەکی تر. سێزدە ساڵە

بەردەوام ماڵ بە گوڵو لەسەر سەفەرم. تۆش ئەوە دەبینی زۆر بە داخەوە، بەڵام ئەو شتێکە گشت مرۆڤەکان ناچارن فێری بن." یوهان سەیری سۆزانای کرد و گوتی: "ئەو چەند کاتژمێرە ئازادییە چەندە خۆش بوو. ئێستا با بمرم. قەت نەمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە کە جارێکی دی چەند کاتژمێری وەها بە تام و چێژ دەبینەوە. وەک ئەو کاتەی فانتانا. وانییە سۆزانا؟" ئەپیلۆگ

میسز گۆرۆگا دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم."

ئەلیو نوورا ئەو فایلانەی بە دەستییەوە بوون لە سەر مێزەکەی دانان و چاوی لە ستوان لویس کرد. کابرا لاقی هاویشتبووە سەر لاقی، لەسەر کورسی پاڵی دابۆوە و سیغاری دەکێشا. لویس سەرۆکی نووسینگەی تۆمارکردنی ناوی سەربازە خۆبەخشە ئەورەپییەکان بوو. ئەلیو نوورا شەش مانگ بوو وەک وەرگێڕ لە نووسینگەی لویسدا کاری دەرکرد. ئەلیو نوورا چاوی بە گۆرەوییەکانی کەوت کە لە بەلەکی داخزیبوون و لە دڵی خۆیدا گوتی: " ئەو پیاوە جیری گۆرەوەییەکەی بۆ توند ناکا؟ بۆ هەمیشە دوولینگانە بەسەر کورسیدا دینێتەوە؟ وەک دەریاوانان کە لە ئسکەلە لەسەر بارێک دادەنیشتن. خۆ لویس زانینگەی دیوە و لە بنەماڵەیەکی خانەدانیشە. ئاخۆ دەبێ کۆمەڵگایەک تا ئەو رادەیە هەوساری پساندبێ کە پیاوان سڵ لە رووتکردنی لاق و لەتەریان لای ژنان نەکەنەوە؟"

هەموو جارێ کە لویس بە جغارەی لالێویەوە سڵاوی لێدەکرد یان وەک هێسک بخەیتە بەردەم سەگ وەها فایلی دەهاوێشتە سەر مێزەکەی، ئەلیو نوورا پێی وابوو زللەیەکی لە لاچاوی دەدا، بەڵام ستوان لویس لە ئەندێشەی دڵی نوورا بێئاگا بوو. بە پێچەوانەوە پێی وابوو نوورا سەرسامیەتی، بەڵام چاوی نوورا هەمیشە تۆزێک تراساو و دیار بوون.

"گوێم لێتە."

"میسز گۆرۆگا مێردم پێدەکەی؟" سۆزان دوای ئەو وتەی زیاتر بە کورسییەکەدا رۆچووە خوارێ و جۆلانەی بە کورسییەکە دەکرد.

کورسییەکە لەسەر دوو پێچک ڕاوەستابوو. "نەخێر، مێردت پێ ناکەم، میستەر لویس." "نەخشی دیکەت بۆ داهاتوو بە دستەوەیە؟" "هیچ نەخشەی دیکەم بە دەستەوە نییە، بەلام وەلامم نایە." نوورا فایلێکی لێک کردەوە، بەلام ئێدی نەیدەتوانی بە هێمنی کاربکا. چاوی لە فایلەکە بوو، بەلام خەیالی لە شوێنێکی دیکە بوو. نوورا دوو ساڵ زیندانی کێشابوو، پاشان وەک چۆن هەر لە خۆوە گرتیان هەر ئاوا لە خۆوەش بەریان دا.کاتێ لە زیندان بەر بوو نە دینارێکی هەبوو و نە جلوبەرگ، نە زێڕ وتەنانەت ئەلقەی بووکێنیشیان لێ ئەستاندبوو. دەستیان لەبەر ملک و ماڵەکەشیدا گرتبوو. لەپڕ کەوتبووە سەر ساجی عەلی. پێیان ڕاکەیاندبوو ترایان مردووە، خۆی کوشتووە. هەر ئەوەندەی لێ دەزانی. ببڕای ببر ئامادە نەبوو بچێتە ناوچەی ڕوسەکان. نەشیدەتوانی لەوێ دەرباز بێ، بە ناچاری لە ئەڵمانیا مایەوە. ماوەیەک وەک وەرگێر لە ڕۆژنامەیەکدا کاریکرد. پاشان فەرمان درا هەموو کەسانی خەڵکی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات بگرن. بە شێوەی ئۆتۆماتیکی. ئەو جارەیان مەسەلەکە فەرقی هەبوو. ببووە وەرگێڕ و سکرتێری سەرۆکی نووسینگەی تۆمار کردنی ناوی خۆبەخشە بیانییەکان. نوورا دەستوەسەر بوو. بەشە خۆراک و مووچەشی وەردەگرت. کاتی بێکاری خەریکی نووسین دەبوو. ڕۆمانی کاتژمێر بیست و پێنجی تەواو دەکرد. ئەو ڕۆمانەی ترایان نەیتوانیبوو تەواوی بکا. توانیبووی چارە پاژی سەرتای ڕۆمانەکە لە فەوتان ڕزگار بکا. حەزی نەدەکرد بیر لە داهاتوو بکاتەوە. تاکە ئاواتی ئەوە بوو ڕۆمانەکە تەواو بکا. لە ڕاستیدا نووسنی ئەو کتێبە وەک نەخشەی داهاتووی نەبوو، ئەم کارە ڕاکردنێک بوو لە بیر داهاتوو. هەموو وجوودی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کردبوو. ئەو کارەی خۆشی دەویست. هەوڵیدابوو شێوازی تایبەتی ترایان تێبگا و شاماوەکەی بەو جۆرە بێ کە ترایان دەیوست. بەم جۆرە هەر لاپەڕەیەکی دەینووسی هەستیدەکرد پێ لە ترایان نزیکتر دەبێتەوە.

وای دەهاتە بەرچاو کە ترایان لە پەنای دانیشتووە و پێکەوە رۆمانەکە دەنووسن. پێشتر ترایان گەلاڵەی گشتیی کتێبەکەی بە نوورا گوتبوو. ئێستا ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا بە پێی هەمان گەلاڵە کاری مێردەکەی درێژە پێبدا. سوتوان لویس دوای کەمێک بێدەنگی گوتی: "ئۆکەی، ئاخۆ دەکرێ هوی رازی نەبوونت بزانم؟"

"ئەگەر زۆر مکووری بزانی، بەڵێ، لەبەر جیاوازیی زۆری تەمەن."

ستوان لویس پێکەنی و گوتی: "من ساڵێک لە تۆ گەورەترم. پێناسەکەتم دیتووە. باشە تۆ چۆن دەتوانی جیاوازیی تەمەن کۆسپیی سەرڕێگای شوکردن دابنێی؟ئەگەر پیرتریش بام دیسان شتێک."

"تۆ بەهەڵەدا چووی." "توش گاڵتە دەکەی. باشە چەند ساڵی؟" "باشتر نییە باسی شتێکی دیکە بکەن؟"ۆو "نا، تا تەمەنی خۆتم پێنەڵێی، نا." "کارێکی جوان نییە پرسیاری تەمەن لە ئافرەتێک بکەی و بە تایبەت لەسەر داواکەشت سوور بی، بەلام من تەمەنی خۆمت پێدەڵێم. من نۆسەد و شەست و نۆ ساڵم، بەلام لە بیرت نەچێ ژن هەمیشە خۆیان چۆلە دەکەنەوە. بۆیە لە راستیدا من لەوانەیە زیاتریش بم."

"ئۆکەی، میسز میتوسالیم."[1]

ستوان بە پێکەنین خۆی خەنی کرد، بەلام ئەلیۆنوورا هەروا جیددی مایەوە. لویس پێی وابوو ئێستا ئیدی نوورا داواکەی بە جێ دێنێ، بەلام وەلامی "نا"ی نوورا بەردی خاترجەمی وە بن سەری دا. "مستەر لویس، تکایە زویر مەبە، بەلام راستییەکەی ئەوەیە من تەنانەت ناتوانم بیست و چوار کاتژمێریش لەگەل تۆدا بژیم."

"من تێناگەم." "بۆیە دەمویست هۆیەکەت لا باس نەکەم. ئەوە زۆر ئاساییە کە تۆ لە وتەی من تێنەگەی. من هەزاران ساڵ ئەزموون و نائومێدی و خەمم جێهێشتووە و سەرجەمی ئەوانە وجوودی ئەورۆکەی منیان دارشتووە. لەکاتێکدا ئێوە خاوەنی ئێستا و داهاتوون،

---

١- بە پێی گێرانەوەی ئینجیل" میتو سالیم کە باوە گەورەی بینادەمە ٩٦٩ساڵ ژیاوە.

ڕەنگبێ، لەبەر ئەوەی لەوبارەوە گومانم هەیە. لەبەر ئەوەی مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ حوکمی تەواو بۆ داهاتوو بدا."

ستوان لویس لە کاتێکدا دەنگی کەمێ تووڕەیی پێوە دیار بوو، گوتی: "زۆر دەروێشانە بوو." "گوێ بگرە، میستەر لویس. من کەسێکی ئەورووپیم: باشە من دوای ئەوەی باسی ئەڤینم لە پێتراركا و گۆتەی بایرۆن و شکسپییر بیستووە، داوای ئەوەی کەسێکی وەک ترایان کۆرۆگا لە بارەی عەشقەوە لەگەڵم دواوە، پاش ئەوەی گوێم لە لەرەی دەنگی گۆرانیبێژە عاشقەکەکان گرتووە و بە چاوی خۆم دیومە لە بەردەممدا وەک کۆیلەی شاژنێک هاتووتە سەر چۆک، دوای ئەوی شازادە و فەمانڕەوەکان لە تاوی من دەستیان لە گیانی خۆ شۆردووە یان ماڵ وسامان و تەخت و تاجی خۆیان هاویشتۆتە بەر پێ من، دوای ئەوەی لەگەڵ ڤالێری و ریلکە و دانونزیو و ئەلۆت لەبارەی ئیشق و ئەمەگدارییەوە دواوم، چۆن دەتوانم وەڵامی ئەرێ بدەمەوە داخوازییەکەی تۆ کە لەگەڵ دووکەڵی جگەرە لە دەموچاوت کردم؟" "کەواتە دەبێ من ببمە گۆتێ و کۆرد بایرۆن یان پێتراكا، هەتا بتوانم داخوازی لە ژنێک بکەم ببێتە هاوسەرم؟"

"نا مسیتەر لویس تۆ پێویست ناکا ببیە پوشکین و ریلکە هەتا بتوانی ژنێک بکەیە هاوسەری خۆت. تۆ هەر ئەوەند بەسە ئەو ژنەت خۆش بوێ." "ئێمە هەردووکمان وەک یەک بیر دەکەینەوە. کێ گوتوویە من تۆم خۆش ناوێ.؟" ئەلیو نوورا بە ماناوە پێکەنی: "ئەوین جۆرێک شێتییە. لەوانەیە ئەوەت بیستبێ."

"لەو بارەشەوە لەگەڵت هاوڕام. ئەوین جۆرێک شێتییە." "بەڵام تۆ قەت شیاوی وەها شێتییەک نی. نەک هەر تۆ بەڵکو هیچکام لە خەڵکانی کۆمەڵگەیەکدا دەستدەکەوێ کە بڕوای وا بێ ژیانی هەر مۆرڤێک تەنیا جارێکە و هیچ شتێ جێگای ناگرێتەوە، بەڵام کۆمەڵگای ئێوە بە پێچەوانەوە پێی وایە دەکرێ شتگەلێ ببنە جێگرەوەی مرۆڤ ئێوە بەو

چاوەی تەماشای مرۆڤ و یەک لەوانیش ژنی دڵخوازتان ناکەن کە مەخلووقێکی سەربەخۆیە و ئەفرێنراوی دەستی خوا و سروشتە و تەنیا جارێک دێتە گۆرەپانی ژیان. بەلای ئێوەوە هەر مۆرڤێک ئەڵقەیەکە لە بەرهەمێکی زنجیرەیی. بەم جۆرە لە روانگەی تۆوە بایەخی ژنێک بێ ئەملاولا بە قەد ژنێکی دیکەیە. بەو جۆرە بیر کردنەوەوە ئێوە قەت ناتوانن ئەویندار بن، بەلام ئاشقەکانی کۆمەڵگای من دەزانن ئەگەر نەتوانن دڵی دڵخوازی خۆیان بڕفێنن، ئیدی ناتوانن ئەوینی خۆیان بەرنە ناو دڵێکی دی و زۆر جار لەو پێناوەدا گیانی خۆیان دەکەنە قوربانی. عەشقی ناکامیان ئیدی ناتوانێ دێگرەوەیەک بۆخۆی قەبووڵ بکا. پیاوێک کە منی بەڕاستی خۆش بوێ ئەو هەستەم تێدا زیندوو دەکاتەوە کە لە هەموو دنیادا من تاکە ژنێکم کە دەتوانم بەختەوەری کەم، تەنیا من. ئەو پیاوە بە ئایانی دەتوانێ پێم بسەلمێنێ کە من تاکە ئەوینی ویم و نموونەم لە دنیادا دەست ناکەوێ و من دڵنیا دەبم وایە. پیاوێک ئەگەر نەتوانێ هەستی ئەوەم تێدا بورووژێنێ کە من لەکەس ناچم، منی خۆش ناوێ. ژنێک ئەگەر ئیسپاتی کرد ئەو بانگەشەی خۆی کە کەسی لەداخوازیدا نەبینێ لە راستیدا دیارە دڵداری پیاوەکە نییە. منیش تا لەوە دڵنیا نەبم پیاوێک خۆشی دەوێم مێردی پێناکەم. باشە میستەر لویس تۆ دەتوانی لەوە دڵنیام بکەیەوە؟ بە راستی بڕوات وایە کە ئەمن تاقە ژنێکم بەلای تۆوە و هیچ ژنێکی دی ناتوانێ جێگای من بگرێتەوە؟ نەخێر دڵنایم ئەگەر من مێردت پێنەکەم ژنێکی دیکە دەدۆزییەوە بیکەیتە هاوسەری خۆت."

"وایە. لەگەڵ ئەوەشدا پێمناخۆشە جوابی رەفزت لەمستی نام. بەڕاستی بەداخەوە." "وا چاکترە. خەریکی کاری پیرۆزی دایەرە بین میستەر لوویس!"

ئەلیو نوورا ئینجا چاوێک لە فایلەکان کرد و گوتی: "ئەفرادی ئۆردووگا تێکڕا دەیانەوێ خۆبەخشانە خزمەت بکەن. هەمویان، تەنانەت

منداڵ و ژن و پیرەمێردەکانیش. هەموو دەیانەوێ لە بەرەی ئێوەدا بجەنگن."

ئیندا بزەیەکی هاتێ. دەیان هەزار کۆچبەری بیانی کەوتنەوە بیر کە لە ترسی رەشەکوژی و زەبروزەنگی رووسان هەڵاتبوونە رۆژئاوا. پەنایا بردەبووە بەرناوچەی ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسا و ئینگلیز وئەمریکا. لە کاتی راکردندا قەت بیریان لەوە نەدەکردەوە رادەکەنە کوێ. هەر هێندەیان دەزانی دەبێ لە بەر چنگی رووسان هەڵێن. راکردن لە ترس و تیرۆر و مردن و ئەشکەنجە. هەروا بە چاوبەسراوی روویان لەو ناوچانە کردبوو. هەر ئەوەندەیان دەزانی رێگەی گەڕانەوەیان نییە. گەڕانەوە واتە تاریکی و مەرگ و جەزەرەبە و ئازار.

ئەمریکییەکان ئەو راکردوانەیان گرتبوون. کۆچبەرەکان هیچ بەوە تووڕە نەبوون. بووە مایەی دڵخۆش بوون کە گەیشتوونە "وڵاتی ئایدیال." ئەوان چاوەڕانیی یەک شتیان لە چارەنووس هەبوو، ئەویش راکردن لەبەر دەستی رووسان بوو. ئێستا کە ئەو ئاواتەیان هاتبووە دی چ دەبێ با بێ. ملکەچی چارەنووس بوون و ئەو حاڵەتە تەسلیم و رەزایە ببووە هۆی ئەوەی تووڕەییان لە بەند کردنی ئەمریکیەکان بنیشێتەوە."

لەو سەروبەندەدا دەنگۆی جەنگ بڵاو بۆوە. جەنگی سێیەم. راکردووەکان برسی وڕووت و بێ داشندار و دیل بوون. ئەمانە نان ئاسایش و کار و ئازادییان دەویست،بەلام ئەگەر دەستیشیان نەکەوتبان متەقیان نەدەکرد. ئەوەی گرنگ بوو لە چنگی رووسان قوتار ببوون. ئەمریکییەکان گفتیان دابو هەر کەسێکی خۆبەخشانە بچێتە ریزی سوپای وڵاتانی رۆژئاواوە، ئازادی بکەن. بەو جۆرە هەموو پیاوەکان وەک خۆبەخش ناوی خۆیان نووسی، نەک لە پێناوی جەنگ، بەڵکو بۆ ئەوەی چیدی دیل نەبن و برسێتی نەچێژن.

ستوان لویس بە نوورای گوت: "پێشوازییەکی بێوێنەیە. ئەو حەقیقەتە کە دەوڵەتانی رۆژئاوا لە دژی رۆژهەڵاتی پاشکەوتوو هەڵیانکێشاوەتە

شیر، خەڵکی لێکدی نیک کردۆتەوە. ئێسا هەمووڵا لەوە گەیون کە لەم ساتەوەختە ناسکەی ژیاندا دوو ڕێگامان لەبەر ماون: مەرگ یا سەرگەوتن.
ئەو جەنگە دروستکەری سەردە و چاخانە. جەنگێکە مێژوو هەرگیز بەخۆیەوە نەدیوە. بەربەرەکانیی ڕۆژئاوا لە دژی ڕۆژهەڵاتی پاشکەوتوو. ئەوە یەکەم جەنگی راستەقینەیە." لویس دەستی لێک خشاندن: "بەشداریکردن لەو جەنگەدا شەرەفێکی گەرەیە سەرکەوتنمان مسۆگەرە. هەموو دنیا پێش دەکەوێ و ئیدی جەنگێکی دی رووناداتەوە. بەرەی مۆرڤ دەگاتە پێشکەوتن و ئارامی."
نوورا گاڵتە جاڕانە پێکەنی.
" چییە خۆشحاڵ دیار نی. دیارە بەو کردەوە مەزنەی ڕۆژئاوا دڵگەش نی. نەکا لایەنگری بەلشەڤیکان بی؟ تۆ تاکە کەسێکی کە هیچ خۆشحاڵیت دەرنەبڕیوە. "هیچ کەس هەست بە دڵخۆشی ناکا. ئەوە تۆی لە خەیاڵی خۆتدا خۆشحاڵییەکی وا لەو خەڵکەدا دەبینی." "واتە ئەو هەموو خۆبەخشەی لێرەن بە گیان و دڵ دژی بەلشەڤیزم نین؟" "با، ئەوانە بەتەنێ دژی بەلشەڤیزمن و هیچی تر. واتە حەز دەکەن لە شوێنێکی ئارام و دوور لە قڕە و کوشت وبڕ بژین. ئەوانە دەیانەوێ چیدی برسی نەبن. نەکوژرێن و جەزرەبە و ئازار نەدرێن. ئەو کارەشیان لە رووی باوەڕێکی سیاسییەوە نییە. ئەوە تەنیا خەباتی مرۆڤانە لە دژی ملهۆڕی و توندوتیژی و کوشتار."
"دەی منیش هەر وا دەڵێم. مەگەر. ئەو قسە بەو مانایە نییە کە ئەوان بە دڵوداو بڕوایان بەو ئامانجانە هێناوە؟ ئێمە لە پێناوی ئازادی، ئارامی و دیموکراسیدا دەجەنگین." "هەوڵبدە وشەکانتان لە مانا بەتاڵ نەکرێنەوە، میستەر لویس. ئەم جەنگە، وەک دەڵێن جەنگی سێهەم بەربەرەکانی ڕۆژئاوا دژی ڕۆژهەڵات نییە. هەر لەجێدا ئەم خەباتە بە مانای راستەقینە و قامووسی، واتای جەنگ نادا، هەر چەند لە قوتبی

باکوورەوە تا باشوور مەیدانی شەر بێ. ئەو جەنگە تەنیا شۆڕشێکی ناوخۆیە لە دنیای پیشەسازی رۆژئاوادا. تەنیا مشتومڕێکی سادەیە کە پەیوەندی بە رۆژئاواوە هەیە.

"بەڵام ئێمە بەهەر حاڵ لە دژی رۆژهەڵات دەجەنگین، خانمی کۆرۆگا. لە دژی هەموو وڵاتانی ئەورەپای رۆژهەڵات." "بەهەڵەدا چووی. ئێوە ـ مەبەستم رۆژئاوایە ـ بە دژی لقێک لە سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆتان شەڕ دەکەن." "بەڵام ئێمە دژی رووسیا دەجەنگین." "رووسیا دوای شۆڕشی کۆمۆنیستی بۆتە پێشکەوتووترین لقی شارەستانییەتی تەکنەلۆژیی رۆژئاوا، رووسیا هەموو یاساکانی ژیانی لە رۆژئاوا وەرگرتوون و مووبەموو بەکاری کردوون. شکۆی مرۆڤی هێناوەتەوە سەر سفر، ئەوەش وانەیەک لە رۆژئاواوە فێری بووە.ڕووسیا تا ئەو جێیەی بۆ دڕندە و بەربەرێک سواوە لاسایی رۆژئاوای کردۆتەوە. تاقە شتێکی رژێمی کۆمۆنیستی بە تەواوی لە وڵاتی رووسیای بۆ بەمیرات ماوەتەوە، ترس و تۆقاندن و ملهوڕییە. جگە لە خوێنمژی و ملهوڕی رووسیا هەرچییەکی هەیەتی لە رۆژئاوای وەرگرتووە و ئێستا ئێوە لەگەڵ لایەنەکەی دیکەی شارستانییەت واتە لەگەڵ لقی کۆمۆنیستی کۆمەڵگای تەکنەلۆژیی رۆژئاوا دەجەنگن. بۆیە جەنگی سێهەم تەنیا شۆڕشێکی ناوخۆیە. شۆڕشێک کە هەر لە یەکەم لەحزەوە لە هەموو شتێ زیاتر بنەماکانی شارستانییەتی تەکنۆلۆژیی رۆژئاوای وەک لەرزین خستوون. ئێستا دەستەیەک لە ئەوروپییەکان بە دژی دەستەیەکی دی کە کۆمۆنیستیان پێدەگوترێ، لە شەڕدان. ئەوش بێجگە لە شەڕی ناوخۆی نێوان دوو دەستەی یەک کۆمەڵگا، هیچی تر نییە. ئەگەر حەز بکەی دەکرێ ئەو ململانێیە لە زۆر رووەوە لەگەڵ شۆڕشی چینایەتی و پیشەسازی ١٨٤٨ بەروەارد بکرێ. رۆژهەڵاتی دنیا ئاگا و دەستی لەو کێشە و هەرایەدا نییە. هیچ کەسی بەدەر لە کۆمەڵگای رۆژئاوادا دەستی لەو شۆڕشەدا نییە. جا لەبەر ئەوەی شۆڕشەکە، شتێکی تەواو

ڕۆژئاواییە، لە پێناوی بەرژەوەندیی مرۆڤاندا ناکرێ، جەنابی لویس، لەبەر ئەوەی سیستەمی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا هەر لە بنەڕەتدا مرۆیی نییە.˝
˝هیچ سەرم لێدەر ناچێ.˝

˝زۆر ئاسانە. حەز و خولیاکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا نەک هەر لەگەڵ ویست و داخوازی مرۆڤان ناگونجێ بەڵکو تەواو پێچەوانەیانە. لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا مرۆڤ وەک مەسیحییە بەراییەکان کە لە زیندان و ئەشکەنجەدا بوون، خراوەتە پەراوێزی ژیانەوە. مرۆڤەکان خۆیان لە بەر چاو بزر دەکەن. لەبەر ئەوەی مافی هاتنە ناو کۆمەڵگایان نییە. تەنانەت لە مافی کاری بەکۆمەڵیش بێبەش کراون. هیچ شوێنێ هی ئەوان نییە. شارستانییەتەکەی ئێوە تەنانەت خاچی کڵێسەی بە مێزی دایرە گۆڕیونەوە. ئەو کەسانەی هێشتا˝مرۆڤ˝ن ناچارن خۆ مەڵاس بدەن. ئەگینا دەبێ بە پێی ڕێوشوێنی میکانیکی و تەکنیکی ئامێرەکان بژین. ئەمرۆ، بوونی مرۆڤ بو یەک ڕەهەند خولاسە کراوەتەوە: ڕەهەندی سۆسیالیزم. مرۆڤ بووە بە ˝غولام.˝ ئەمەش چەمکێکی ترە نەک ئینسان. کۆمەڵگای تەکنەلۆژی ئاگای لە بوونی ئینسانان بڕاوە. ئەو کۆمەڵگایە مرۆڤ تەنیا وک چەمکی ئەبستراکتی ˝غولام˝ دەناسێ. باشە کۆمەڵگایەک کە خەڵکی خۆی نەناسێ چۆن دەتوانێ بە ناوی ئەوانەوە شۆڕش بەرپا بکا؟ ئەو شۆڕشەی ئێستا کە گشت تایبەتمەندییەکانی ڕۆژئاوایین کاری بە چارەنووس و حەزی مرۆڤان بە مانای کەسانی سەربەخۆ و لێک جیاواز نییە. لەمێژساڵە مرۆڤ لە ڕوانگەی ئێوەوە کەمایەتییەکی پرۆلیتاریی کۆمەڵگاکەتانە.

هەر وەردیانێکیش جەنگەکە بباتەوە، فەرقی نییە، مرۆڤی کۆمەڵگاکەی ئێوە هەمان بوونەوەری ڕەنجبەر و زەحمەتکێش دەمێننەوە.˝ ˝بەڵام زیندانەکانی ئەم گرتوخانەیە بە پێی ویستی دەروونی خۆیان خۆبەخشانە ئامادەن بێنە ڕیزی ئێمەوە تۆ زۆرت شوول لێ هەڵکێشاوە. نامەوێ هەڕەشەت لێ بکەم، بەڵام بەڕاشکاوی پێت دەڵێم. بە هەموو توانامەوە

دژی قسەکەی تۆم. هەر خۆبەخشێک تەنیا وتەنیا لە رووی حەزی تاکەکەسی خۆیەوە دێتە ئێرە."

"رێگای دەرباز بوونی تر لە بەردەم مرۆڤاندا نەماوە. ئەوانە لە زیندانێکدان کە هەر چوار لای بە گڕ و بڵێسە دەورە دراوە و تەنیا رێگایەکی بۆ چوونە دەر هەیە. ئەو رێگایەش داواکاریی چوونە رێزی سوپای ئێوەیە. هەر ئەوەت، داوانامەیە، ئێمە هەموو رۆژێ لە گرتووەکانی وەردەگرین. هەر داوانامەیەک وەکو هاواری نائۆمێدانەی مرۆڤێک وایە کە رووی لە تاکە رێگای دەربازبوون کردووە کە هەیە. نەک هەر راکردوو و کۆچبەرەکانی ئەورووپای رۆژهەلات، بەڵکو هەموو خەڵکی ئەورووپا داوانامە دەنێرن."

تۆ بە هەڵەدا چووی. تاکە رێگای دەرباز بوون لەو ئاگرەی باسی دەکەی هاتنە ناو رێزەکانی سوپای ئێمە نییە. ئەوان دەتوانن بچنە لای روسەکانیش، بەلام بۆ ناچنە وێ؟ بۆ دێنە لای ئێمە؟

"نا، ناردنی مرۆڤان بۆ لای روسەکان،وەکو ئەوە وایە لە مار بڕەونەوە و بەسەر ئەژدیهادا بکەون. یان بەسەر دیوارێکی نغرۆدا باز بدەنە ئەودیو، ئەودیویش چاڵێک بێ پڕ لە گڕ و گڵپەی ئاگر."

میستەر لۆیس بە نووڕای گوت: "تۆ بە چاوێکی رەشبینانەدا دەڕوانییە هەموو شت. خۆبەخشەکان وەک تۆ بیر ناکەنەوە. ئەوان لە خوایان دەوێ ئێمە داوانامەکانیان لێوەربگرین. لە پێناوی ئامانجەکانی ئێمە کە ئامانجی وانیشە تا داوا دڵۆپی خوێن دەجەنگن. ئەمان باشترین سەربازی ئێمەن. هێندە بەسەر دەرگاکە بکەیەوە، جا دەزانی چەندە چاوەڕوانن. سەدان و بگرە هەزاران کەس. هەموویان تەمەننا دەکەن خۆبەخشانە لە پێناوی ئامانجی مەزنی شارستانییەت بچنە خەزا. گشتی ئامادەن گیانی خۆیان لە رێگەی سەرکەوتنی مەزنی دوارۆژ ببەخشن. ئەو سەرکەوتنە بەختەوەری و شارستانییەت و نان وئاشتی و دیموکراسی بۆ خەڵک بە دیاری دێنێ. بڕوام پێناکەی.؟

"نا، خەڵک بڕوای بەو جەنگە نییە. دیارە لەونەیە تەواو وەک من بیر نەکەنەوە. ئەوانە بە هۆی ئەو هەموو چەرمەسەری و قوڕبەسەرییەی بەسەریان هاتووە فکر کردنەوەیان لە بیر چۆتەوە، بەڵام هەموویان هەستێکی وەک منیان هەیە. وەک من ئازار دەچێژن و وەک من نائومێد و تێکشکاون. هەموو ئەورووپا هەستی وەکو هەستی منە."
"وا باشە راستییەکانمان لەبەر چاو بێ، خاتوو کۆرۆگا. من پێت نیشان دەدەم ئەو خەڵکە بۆ هاتنە نێو ریزەکانی ئێمەوە چەند لە زەوق و دڵخۆشن. نموونەیەک بەسە. نموونەیەک هەروا لە گۆترە دەیهێنمەوە."
ستوان لویس هەر هەستا و دەرگای نووسینگەی کردەوە.
"بڕوانە خاتوو کۆرۆگا، ئەوڕۆ زیاتر لە پێنجسەد کەس لە نۆرەدا وەستاون."
لویس قامکی بۆ ریزی دوور و درێژی جەماوەرەکە راداشت و گوتی:
"هەر ئەوەی یەکەم دەگرین."
میستەر لویس ئاماژەی بە یەکەم کەسی سەرەگرتوو کرد بێتە ژوورەوە. کابرا بەتەنێ نەبوو، ژن و سێ منداڵی لەگەڵ بوون. سەری رەشی کابرا لە لاجانگیڕا بۆز ببوو. گووپی پێکدا قەپیو، چاوی گەورە و بز، بەڵام یەکجار خەمبار بوون. ئەلیو نوورا کە چاوی کابرای دی لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەو حاڵەتە خەفەتبارە، گەورەیی رۆحی خاوەنەکەی نیشاندەدا."
ئەو پیاوەی لەبەر دەم ئەلیو نوورا و لویس وەستابوو کرێکارێکی سادە بوو، بەڵام لە چاوانیڕا باری دەروونییەکەی دەخوێنرایەوە و ئەمە نیشانەی گەورەیی و بەرزی بوو. خەم و پەژارەکەی ئاسایی نەبوو، خەمێک بوو کە لە رۆحییەوە هەڵدەقوڵی.
ژنەکەی تەنیشتیشی کراسێکی شینی لەبەردا بوو کە زۆر فشوفۆڵ بوو. پرچی زەردی، تاڵ تاڵ داوی سپیی تێکەوتبوو، زۆر جوان بوو. هەر لەشی نەبوو وا جوان بێ، هەموو وجوودی بە خەرمانەیەکی جوانیی

ژنانە دەورە درابوو. ئەلیو نوورا گەلێکی حەز دەکرد وەک خوشکان بە روویدا پێبکەنێ، بەلام ئەو چاوی لە زەوی بڕیبوو و وەک مێردەکەی خەم و ترسی لێدەباری.

کوڕە لاوەکە چاوی وەک هی باوکی رەش بوون، بەلام خەمی لە چاواندا نەدەبینرا. روو هەڵمالاوانە چاوی لە نوورا بڕیبوو. کوڕەکەی تر قژ زەرد بوو و سەری داخستبوو. دەتگوت هەر لەوێش نییە، وێدەچوو خەون ببینێ. بچووکترین منداڵیان چوار ساڵێک دەبوو. کاڵۆلی زەردی زێڕین و ئاڵۆزکاو و چاوی دەتگوت قاشوولکەی شینن. ئەلیو نوورا بۆی ساغ نەبۆوە ئەو منداڵە کوڕە یان کچ. هەر هێندەی دەزانی وەک فریشتان جوانە.

ستوان لویس بە نوورای گوت: "چاو لێکە، خێزانێک بە خڕی بوونەتە خۆبەخش. لێیان بپرسە بزانە وەک تو بیر دەکەنەوە؟ چیت پێ خۆشە لێیان بپرسە. ئەوجا خۆت راستیت بۆ دەردەکەوێ."

"پێویست ناکا لێیان بپرسم. من نامەوێ بزانم ئەو مرۆڤانە چ خەم و مەراقێکیان لە دڵدایە. خەمی خۆمم بەسە. ناچارم مەکە برینی خەڵکی بکولێنمەوە. هەر ئەو پرسیارە رۆتینیانەیان لێ بپرسە. من حەز ناکەم ئاگاداری وەزعیان بم."

"بەلام من تکات لێدەکەم، چی حەزت لێیە لێیان بپرسە."

"باشە."

دوا رستەی ستوان لویس بۆنی ئەمرکردنی لێوە دەهات. ئەلیو نوورا دیسان چاوی بە کابرا کەوت کە کلاوەکەی بە دەستییەوە گرتبوو و لەبەر دەرگا راوەستابوو. نیگایان تێکهەڵنگووت:

"ناوت چییە؟" "یوهان مۆریتس، تکا دەکەم خۆم و ژن و منداڵەکەم وەک خۆبەخش وەربگرن. تکا دەکەم هەموومان وەربگرن. من خۆم لەبەر هەڵکشانی پێوستم بە ئیزنی تایبەتی ئێوە هەیە . من زۆر پیرم. تەمەنم لەوەی بۆ وەرگتنی خۆبەخشانتان دیار کرد و وتی، زێدەترە،

بەڵام هەست دەکەم گوڕ و تینم تێدا ماوە. بۆ بەدبەختی کوڕەکانیشم تەمەنیان کەمە و هێشتا نەگەیشتوونە تەمەنی یاسایی، بەڵام کوڕی بوێر و باشن. ئێمە هەروەک لە پاکاتەکاندا نووسراوە دژی بەلشەڤیزمین. هەر وەک لە پاکاتی ئێوەدا نووسراوە بڕوامان بە سەرکەوتن هەیە. تەنیا لە رووی تەمەنەوە مەرجەکەمان نییە. بۆیە تکام لە ئێوە لۆتفێکمان پێ بفەرموون. ئەگەر وەرمان نەگرن تێدا دەچین. لەوە زیاتر بەرگە ناگرین."
کوڕە گەورە چاوی رەشەکە، ئانیشکی لە باوکی کوتا. دەیویست تێی بگەیەنێ وە سەرقسەی زیادی پەڕیوە.

یوهان مۆریتس کڕ بوو. سوور هەڵگەڕا. تێگەیی نەدەبوو قسەکانی دوایە بکا. هەڵەیەکی گەورەی کردبوو. لەوانە بوو لەبەر ئەو قسانە داواکەیان رەتکردبایەوە. بە حاڵەتێکی پارانەوەوە سەیری ئەلیو نوورای کرد و گوتی: "رجاتان لێدەکەم وەرمانگرن. ئێمە کرێکاری ئازا و بەکارین."

پیتەر هێندێک شتی دیکەشی فێر کردبوو بیانڵێ، بەڵام یوهان حەزی نەدەکرد بیانلێتەوە. زاتی نەدەکرد بڵێی بڕوای بە سەرکەوتنی شارستانیەت، بە رۆژئاوا و بە زۆر شتی تر هەیە. وای هەستدەکرد ناتوانێ ئەو شتانە بڵێی. زمانی گوی نەدەکرد. کوڕەکەی زۆری لێ تووڕە بوو و لەوانە بوو دوای چوونە دەر لەگەڵی بەشەڕ بێ. دیسان بە پارانەوەوە چاوی لە ژنەکەش چاوی لەو بوو. بێدەنگییەکی دوور و درێژ زاڵبوو. ژنەی پشت مێزەکە چاوی دلۆڤان و گەرموگوڕ و گەش بوون. ئینجا ژنی یوهان مۆریتس چاوی لەو ژنە قژخورماییە بڕی و منداڵەکانیش هەروەتر. ژنە قژ خورماییەکەش لە ناو بێدەنگیدا چاوی لێنەدەتروکاندن. ستوان لویس وەدەرکەوت. ئەلونوورا هەروا واق و وڕما چاوی لە پیاوەکەی بەرامبەری بڕیبوو. دواجار بێدەنگی شکاند: "تۆ ترایان کۆرزوگا- ت دەناسی؟"

یوهان بە جارێ دڵی داخورپا: "ئێمە پێکەوە بووین."

حەزی نەدەکرد باسی ئۆردووگا بکا، لەبەر ئەوەی پیتەر لەو بارەوە جەختی لێکردبۆوە.

"ئێمە تا دوا سات پێکەوە بووین. لەگەڵ ئەو و مامۆستا کۆرۆگا. من تا ئەو کاتەی بەدبەختییەکە روویدا لە پەنا کاک ترایان بووم. ترایان تاکە کەسێک بوو من بیناسم ئاوا پاک بێ. مرۆڤ نەبوو، پیاوچاک بوو. تۆش کاک ترایانت دەناسی؟"

"من هاوسەری ئەوم." یوهان پاڵی وە دەرگاکە دا. رەنگی بە رووانەوە نەمابوو. گیرفانی لە دەسرۆکەیەک پشکنی، بەڵام چی تێدا نەبوو. دەستی وە شووشەیەک کەوت. چاویلکەی ترایان بوو. هەر ئەو بەیانییە لە گیرفانی نابوو تا کیسەیەکی قایشی بۆ دروستبکا. دەترسا بشکێ. لە دڵی خۆیدا گوتی پێویست ناکا کیسەی بۆ چێبکا و لە سندووقی بنێ. چاویلکەکەی لەسەر مێزی ئەلیو نوورا دانا: " ئەوە چاویلەکەی کاک ترایانە."

دەنگی تەواو گۆڕابوو: "کاک ترایان پێش مردنی وێی دام تا بیدەمەوە تۆ. هەر راست پێش ئەوەی..."

یوهان مۆریتس دەنگی لەرزی. چیدی قسەی پێ نەکرا. دیسان دەستی بە پشکنینی گیرفانی کرد و ئەوجارە قایشێکی وەبەر دەست هات کە بۆ چێکردنی قاوغی چاویلکە داینابوو. لە گیرفانی دەرهێنا. نەیدەزانی چ بکا. بۆ ئەوەی کارێکی کردبێ پارچە قایشەکەی لە پەنا چاویلکەکە دانایە سەر مێز.

"دەمویست قاوغێک بەو قایشە بۆ چاویلکەکە چێبکەم، هەتا نەشکێ."

قایشەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرتەوە: "وا چاکە هەر چاکیشی بکەم. لە ئۆردووگا کاتی دەستبەتاڵیم زۆرە. چاویلکەکە قاوغی هەبێ چاکتر دەمێنێ. ئاوا باشترە و ناشکێ."

میستەر لویس لە کاتێکدا پێی دەنایە ژووری گوتی: "ئێستا پێی لێدەنێی کە ئەوانە بە راستی خۆبەخشن و بە دڵ و داو دێن؟" ئەلیو

نوورا کۆکەیەکی کرد. وەک ئەوەی شتێکی لە گەرووی مابێ. دواجار بە دەنگێکی نووساو گوتی: "بەڵێ هیچ گومانم نەما. ئەوانە هەموویان سەرەرای ئەوەی تەمەنیان تەقازا ناکا لەسەر ئەوە مکوورِن ئاسانکارییان بۆ بکەین. تیکڕا دەیانەوێ بچنە ریزی سوپاوە. خانەوادەیەک بە خری."

لویس بزەیەکی رەزامەندی هاتە سەر لێو.

"داوکەیان جێبەجێ دەکرێ. فۆرمەکان ئامادە بکە. ئێستا دەمەوێ بۆ رۆژنامە وێنەیەکیان بگرم، هی خێزانێکی تەواو."

ستوان لویس ئەمەی گوت و چووە لای منداڵە بچکۆلەکە و دەستی بە سەریدا هێنا. ئینجا بە سۆزانای گوت: "تەنانەت ئەو منداڵەش دژی رووسانە. وا نییە؟"

سۆزانا چاوی لە زەوی بڕی. دواجار بیری کەوتەوە کە دەبێ وەلامێک بداتەوە.

"بەڵێ، ئەو منداڵەش دژی رووسانە."

زۆر بە ئەسپایی وای گوت. دەترسا یوهان گوێی لێبێ. هەر واش دەرچوو. سۆزانا لێوی خۆی گەست.

ئەلیو نوورا فۆرمەکەی پڕ کردەوە: "شەوێ هەمووتان وەرنە لای من. حەز دەکەم چی لە بارەی ترایانەوە دەزانن پێم بڵێن."

نیگای ئەلیو نوورا لێڵ بۆوە: "ئێستا تکایە وەلامی پرسیارەکانم بدەنەوە تا بتوانم فورمەکان پڕ بکەمەوە. تۆ لە ساڵی ۱۹۳۸ەوە لە کوێ بووی؟ هەمووم پێ بڵێ. هیچ مەترسە. داواکارییەکەت جێبەجێ کراوە."

کورە گەورەی یوهان لە خۆشیان بزەیەکی هاتێ. سەرکەوتبوو. تەنانەت منداڵە چکۆلەکەش خۆشحاڵ بوو. شەگەلاتێکی میستەر لویسی دەمژی و دەموچاوی لە خۆشییان گەشابۆوە. تەنیا سۆزانا چاوی لە زەوی هەڵنەدەگرت.

میستەر لویس جانتای کامێراکەی کردەوە. دەیویست لە کاتێکدا یوهان وەلامی پرسیارەکانی بداتەوە وێنەیەکی تێکڕایی خێزانەکەیان بگرێ. حەزی دەکرد شتەکە واقیعی بێ. یوهان وەلامی پرسیاری ئەلیو نوورای دایەوە:

"ساڵی ١٩٣٨ لە ئۆردووگای جوولەکان بووم لە رۆمانیا. ساڵی ١٩٤٠ لە گرتووخانەی رۆمانییەکانی مەجەرستان. ساڵی ١٩٤١ لە ئۆردووگای مەجەڕەکانی ئەڵمانیا. ساڵی ١٩٤٥ لە زیندانێکی ئەمریکی بووم. پێرێ لە بەندیخانەی داخائوو ئازاد کرام. سێزدە ساڵی خشت لە زیندان بووم و ئێستاش هێناویانمەتە ئێرە."

میستەر لویس گوتی: "Keep Smiling."

هاوێنەی کامێراکەی لە سەر یوهان و ئەندامانی تری خێزانەکەی رێک کردبوو. یوهان چاوی لە ئەلیو نوورا کرد و بیری سەدان کیلۆمەتر تێلبەند کەتەوە کە لە زنیدانە جۆراوجۆرەکاندا دیتبوونی. کە ستوان لویس دەیدواند سەری هەڵنەبری. سەرباری هەموو دەردان ئینگلیزیشی نەدەزانی.

"زیندان، زیندان، زیندان. لە ماودی ئەو سێزدە ساڵەدا چی دیکەم نەدیوە. لە ساڵی ١٩٣٨ەوە تا ئێستا."

"Keep Smiling."

ستوان لویس دووپاتی کردەوە.

یوهان تازە بەوەی زانی لویس لەگەڵ ئەویەتی. لە ئەلیو نوورای پرسی: "ئەو ئەمریکییە دەڵێ چی؟"

"ئەمرت پێدەکا پێبکەنی."

یوهان چاوێکی لە چاویلکەکەی ترایان کرد. ترایانی هاتەوە بەر چاو. لە پەنا تێلبەندان خەریکی پەلەقاژەی مردن بوو. سەدان کیلۆمەتر تێلبەندی هاتەوە بەر چاو کە هەردەم لە دەوری کێشرابوو. قاچە براوەکانی قەشە کۆرۆگای بیر هاتەوە. ئەوەی لەو سێزدە ساڵەدا بە

سەری هاتبوو هەمووی کەوتەوە یاد. سەیری سۆزانای کرد. ئینجا سەرنجی منداڵە بچووکەکەی دا. لە ناخیدا هەستی بە تاریکان کرد. فرمێسکی لە چاوان هەڵقوڵی. ئێستا کە ئەمریان پێدەکرد پێبکەنێ، ئیدی نەیدەتوانی پێبکەنێ. هەستی دەکرد خەریکە وەک ژنێک لە پرمەی گریان بدا. نائومێدی هەموو گیانی داگرتبوو. هەموو شت کۆتایی پێهاتبوو، لەوە زیاتر بەرگەی نەدەگرت. هیچ مرۆڤێک لەوە زیاتر بەرگە ناگرێ. ستوان لویس هاوێنەی کامێراکەی لەگەڵ یوهان رێکخست و گوتی:

"Keep Smiling! Keep Smiling!"



کۆنستانتین گۆرگیۆ لە سالّی ١٩١٦ لە
رۆمانیا لە دایکبووە، سەرباری رۆمان
یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی ولاّتەکەی.
گۆرگیۆ وەك ئەمینداری کاروباری
رۆشنبیری لە وەزارەتی دەرەوەی رۆمانیا
کاری کردووە، لە سالّی ١٩٤٤ کە سوپای
سوور-سۆڤیەت-رۆمانیای داگیرکرد،
گۆرگیۆ ئەوی جێ هێشت، دواجار لەسالّی
١٩٤٨لەفەرەنسا نیشتەجێ بوو، لە کەنیسەی
ئەرسەدۆکسی رۆمانیا لە پاریس، کاهین
بووە و لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.
رۆمانی (کاتژمێر بیست و پێنج) بۆچەندین
زمان وەرگێڕدراوە. تیایدا (یۆهان)ی
پالّەوانی رۆمانەکە مەینەتەکانی شەڕ،
پێنج سالّ دەیخاتە نێو توندوتیژترین ژیان،
دواجار ئەفسەرێکی گۆستاپۆ-نازی-داوای
لێ دەکا ژیاننامەی بنووسێتەوە تا لێی
بکۆلێتەوە، (یۆهان) خوێندەواری نییە،
هاورێ-رۆماننوس-یەکی بۆی دەنووسێتەوە
ئەویش گوێی لە بەسەرهاتی خۆی دەبێ
دەست بە گریان دەکا، هاورێکەی لێی
دەپرسی:-بۆدەگرییەی، ئەویش دەلێ:-
تەسەورم نەکرد تا ئەو ڕادەیە زولّمم لێ
کرابێ.





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەریوەبەرایەتی گشتی
روزنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەریوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

٢٠١١

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری